# تاڤگەی هەقیقەت

(بەشێک لە بەرهەمەکانی دوکتور قاسملوو)

بەرگی دووهەم

کۆکردنەوەی: کاوە بەهرامی

# تاڤگەی هەقیقەت

(بەشێك لە بەرهەمەکانی دوکتور قاسملوو)

بەرگی دووهەم

کۆکردنەوەی: کاوە بەهرامی

**ناوی کتێب:** تاڤگەی هەقیقەت

**کۆکردنەوەی:** کاوە بەهرامی

**پێداچوونەوە:** عیرفان رەهنموون، کەریم پەرویزی

**رووبەرگ:** کەریم پەرویزی

**پیتچنین و مونتاژ:** ئومید مەندومی

**چاپ:** رەشەمەی ١٣٨٤ی هەتاوی - سلێمانی

پێشکەشە بە:

گیانی پاکی بــرای خۆشەویســتم کــاك "عبداللــه بــهرامی" ئەندامی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کــە لــە ٢٩ی بانەمەڕی ١٣٦٣دا لە ئاوایی نرگسلە سەر بە ناوچەی دیواندەرە، لــە شەڕێکی نابەرابەردا بەدەست سەربازانی جەهلو نادانی شەهید کرا.

# پێرست

## فەسڵی سێهەم:

## فەسڵی چوارەم:



## فەسڵی پێنجەم:

## پێشەکی

بەرگی دووهەمی کتێبی تاڤگەی هەقیقەت کە بەشێك لە بەرهەمەکانی ڕێبەری مەزن دوکتور قاسملووی لەخۆ گرتووەو هەندێك لە وتووێژو چاوپێکەوتنەکانو چەند وتارێکی ئەو ڕێبەرە زاناو بلیمەتە دەگرێتەوە، کەوتە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز. بابەتو نووسراوەکان یا ئەو بابەتانە کە لە نەواری جۆراوجۆر پیادە کراون دەستکاری نەکراوە مەگەر لەو کاتەدا کە پیادەکراوی نەوارەکان شێوازی نووسینیان پێدرابێو لە گۆڕین لە حاڵەتی قسە کردن بۆ نووسین هێندێك دەستکاری کرابێ، ئەویش بەجۆرێك کە نێوەڕۆکی بابەتەکە نەگورێ. واتە کە جوملەبەندییەکان ڕاست کراونەتەوە، دەقی قسە یا نووسراوەکان بە ئەمانەتەوە بلاکراونەتەوە.

لە بەرگی یەکەمدا ناوی کەس یا کەسانێك لە باسەکانی شەهید دکتور قاسملوودا هاتووە لەم بابەتانەی ئەم بەرگەشدا لەوانەیە نێوی کەسێك یا لایەنێکی تێدا بێ، لە بەرگی پێشوودا بەتایبەت لە قسەکاندا ناوی کەس یا لایەن هاتووە لەو بارەوە لە ڕێگای جۆراوجۆر پێوەندیان پێوەکردم، گلەییان دەکرد کە دەبوا نێوەکان یا ئەو بابەتانە یان هیچ نەبێ ئەو پاراگرافە لابرابا. من بە ئەمانەتەوە وتەو بلاوکراوەکانی شەهیدی مەزن دکتور قاسملوو بلاو دەکەمەوە، ئەمانەتداریم لە بابەتو نووسراوەکاندا پاراستووەو دەیپارێزم. ئەو حەقە نە بە خۆم نە بە کەسی دیکە نادەم دەست لە دەقەکان وەربدا. باسو ڕەوانگەی ڕێبەری حیزبی دێموکرات مێژووی سیاسی گەلی کوردو حیزبی دێموکراتە، ئەملاو ئەولا کردن لە ژیانی سیاسیی مرۆڤەکاندا زۆرە؛ ڕەنگە کەس یا لایەنێك بە لە بەرچاو گرتنی هەلومەرجی ئەو سەردەمە کە

ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی ڕواڵەتی حکوومەتێکی خەڵکی بە خۆوە دەگرت، لەو سەردەمەدا بە بیروبۆچوونی جۆراوجۆر (وەك حکوومەتی ئیسلامی نیزامێکی شۆڕشگێڕە) خۆی لەگەڵ ڕێکخستبێو ئێستا بە کردەوە بۆیان دەرکەوتووە کە ڕێژیمێکی دژی گەلی‌یەو هەزاران کەس ئێستا وەك ئۆپۆزیسیۆنی ڕێژیم هەڵوێست دەگرن کە ڕەنگە لەو سەردەمەدا خزمەتیان بەو ڕێژیمە کردبێ. کەوابوو هێنانی بابەتەکان وەك خۆی نیشاندەری ئەوەیە کە حیزبی دێموکرات لە بواری هەڵوێستی سیاسی لە هەر سەردەمێکدا چۆن لەگەڵ بەرامبەری هەڵسوکەوتی کردووەو ئەوە کە کەسو لایەنەکان بەو قەناعەتە گەیشتوون کە ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی دژی‌گەلی‌یە! جێگای خوشحاڵی‌یە. پێویستە لە هەڵوێستی ئێستایان ڕێز بگیرێ بەتایبەت لە سەرەتای دەست پێکردنی خەباتی گەلی کورد دژی کۆماری ئیسلامی بە ڕێبەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ئەو ڕێژیمە بۆ چەواشەکردنی شۆڕشی گەلی کورد سیمایەکی سەیروسەمەری لە بەرامبەر بیروڕای گشتی لەخۆ نیشان دەداو ژێستی ئازادیخوازیو ڕزگاریی گەلانی بەخۆوە دەگرت، ئەو دیمەنە بوو بە هۆی ئەوە کە چەند کەسایەتی لە ڕاستی‌یەکان دور بکەونەوە، کۆمەڵەنەشریاتێکی فەرهەنگی کە دەسکەوتی شۆڕشو هێزی پێشمەرگەیە لە ڕەوانگەی ئەوانەوە بە ئازادیخوازیی کۆماری ئیسلامی سەیریان کرابێ. کە چی ئێستا بۆیان دەرکەوتووە ئەگەر لە "ڕوزنە"یەکەوە لە نێو کوردستانی ئێراندا ڕۆژنامەو گۆڤارێك لە بواری فەرهەنگی دەردەچێ زیاتر بەرهەمی‌خەباتی پێشمەرگەو هەڵوێستەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ژێر تیشکی ڕێنوێنی‌یە بەنرخەکانی دکتور قاسملووی هەمیشە زیندوویەو بە ئاکام گەیشتووە. بۆیە لە بواری سیاسی‌یەوە حیسابی ئەمڕۆ لەگەڵ ڕابردوو بەراورد ناکرێ.

لە سەر ناوی ئەم کتێبە کە بۆ ناوی تاڤگەی هەقیقەتی لە سەر دانراوە؟ هێندێك کەس لە ڕێگای نامەو چەند کەسێکیش ڕاستەوخۆو لە هەندێ سایتیشدا باسیان لە سەر چۆنیەتیی دیاریکردنی ئەم ناوە کردووە، هێندێك کەس ئەم ناوەیان پێ موناسیب نەبووە، دەستەیەکیش لەو پەیوەندی‌یەدا داوای ڕوون کردنەوەیان کردووە.

دکتور قاسملوو بۆ کورد لە دایك بوو و لە پێناو ئامانجەکانی گەلی کورددا گیانی بەخت کرد، زاناییو قەڵەم بەدەستیو زمانزانیو دیپلۆماتبوونی بۆ هەموو لایەك

روونو دیار بوو، وەك مرۆڤێكی پایەبەرزی كورد لە كۆڕو كۆمەڵەكاندا دەدردوشایەوە، بۆ بیروڕای گشتی كەسایەتییەكی ناسراو بوو. دكتور قاسملوو ناوێنەیەكی بالاَنوێنی دێموكراسیو پێناسەی حیزبی دێموكراتو خەباتی نەتەوایەتیی كورد بەگشتیو كوردستانی ئێران بەتایبەتی بوو. راستی ئەوەیە داخوازەكانی گەلی كورد لە هەموو پارچەكانی كورستان داخوازیەكی رەوانو هەقیقەتێكی روونە كە كورد نەتەوەیەكە لەو نەتەوانە كە لە قەرنی بیستەمدا هەروا لە ژێردەستیدا ماوەتەوەو یەكێك لە مافخوراوو بەشخوراوترین گەلانی بندەستە. كەوابوو بۆچوونی دوكتور قاسملوو لە پێوەندی لەگەڵ ئازادیو دێموكراسیو داخوازی رەوای گەلی كورددا هەقیقەتێكی بێئەملاو ئەولاو حاشا هەڵنەگرەو مێژوو سەلماندویەتی دكتوری شەهید بۆ گەیشتن بەو ئامانجە لە شێوە جۆراوجۆرەكانی خەبات كەڵكی وەركرتووە. بۆچوونو رێبازو تێكۆشانی لەو بوارەدا هەقیقەتە، ئەگەر ئەوە وەك رووبارێك لە چەندین تاڤگە پێكهاتووە كە لە جێگایەك یەك دەگرنەوە تەشبیه بكرێ. داخوازەكانی قاسملوویش بەشێك لەو تاڤگەیە كە دەچێتە رووباری هەقیقەت كە گەلانی بندەست رزگار دەكا. داخوازەكانی گەلی كورد ئازادیو دێموكراسیو دابینبوونی مافی نەتەوایەتیو خەبات دژی زۆرداریو چەوسانەوەیە. تاڤگەیەك لە هەقیقەتە كە لە بۆچوونو نووسینو روانگەی دكتور قاسملووی شەهیددا خۆ دەنوێنێ.

بۆچوونەكانی دكتور قاسملوویش تاڤگەی رەبارێك بوو كە لە دەریای "بیكران"ی هەقیقەتەوە سەرچاوەیان دەگرتو بە درێژایی تەمەنی پڕ لە شانازیو سەرفەرازی خۆی خەباتی هەمەلایەنەی بۆ كردو ئێستاش حیزبی دكتور قاسملوو درێژەدەری رێبازی پڕ لە سەروەری ئەو شەهیدە سەرفرازیە. هیوادارین ئەم روونكردنەوە تا رادەیەك بتوانێ وەلاَمدەری پرسیاری هاوڕێیان بێ.

كۆمەڵێك لە هاوڕێیان ئەركی تایپو پێداچوونەوەی ئەم كتێبەیان وەئەستۆ گرت كە بریتین لە كاك عیرفان رەهنموونو كاك كەریم پەرویزیو كاك ئومید مەندومی كە زەحمەتیان جێگای رێزو سوپاسە.

سپاسی بێپایانی كاك حەسەنی شەرەفی جێگری سكرتێری گشتیی حیزبی دێموكراتی كوردستانی ئێران دەكەین كە ئەركی پێداچوونەوەیەكی ئەم كتێبەی وەئەستۆ گرت.

پێویستە بگوترێ ئەو بەرهەمانەش کە پێشتر بڵاوبوونەتەوە یانێ ("دکتور قاسملوو ڕێبەرێکی مۆدێڕنو شۆڕشگێڕێکی دێموکرات"و بەرگی یەکەمی "تاڤگیەی هەقیقەت") بە هەولۆ تێکۆشانی کاک سیروان جەلالی لە دەرەوەی وڵات چاپ کراونەتەوە کە جێگای ڕێزو پێزانینە، چاوەڕوانیی چاپو بڵاوکردنەوەی بەرگەکانی دیکەشی لێدەکەین.

کاوە بەهرامی

ڕەشەمەی ١٣٨٤ی هەتاوی

## فەسڵی یەکەم:

# بەشێک لەو وتووێژو وتارانەی دوکتور قاسملوو کە لە رۆژنامەی "کوردستان"دا چاپو بڵاو کراونەتەوە

- گۆڤاری "لیبراسیون"
- گۆڤاری "الصیاد"
- گۆڤاری "الیوم السابع"
- "فصلی در گل سرخ"
- رۆژنامەی "کوردستان"

➢ راگەیەنەکانی رۆژئاوا

➢ پەیام بەبۆنەی ٢ی رێبەندان

➢ رۆژنامەی "کوردستان"

➢ وتووێژی رۆژنامەیی لە ئیسپانیا

➢ گۆڤاری "٢٦ی سەرماوەز"

➢ گۆڤاری "الدستور"

➢ گۆڤاری "راه ارانی"

# وتووێژی ڕۆژنامەی "لیبراسیۆن" لەگەڵ هاوڕێ دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوودا*

لیبراسیۆن: ڕێبەری یەکێك لە بزووتنەوە گرنگەکانی گەلی کورد، عەبدولڕەحمان قاسملوو، سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، بێ هیچ پێچو پەنایەك کردەوەکانی حیزبی کرێکارانی کوردستان (پ.ك.ك) ڕەت دەکاتەوە، ئەو لە هەوەڵ ڕۆژەکانی مانگی ژووئیەدا، یانێ دوای هەوەڵ کوشتاری دێهاتییەکانی کوردستانی تورکیەو هەروەها کوژرانی بەرپرسی کۆمەڵەی کرێکارانی کوردستان لە فەرانسە کە "پ.ك.ك" بەرپرسایەتیی بەڕێوەبردنی هەردووك ڕووداوی وەئەستۆ گرتوە، ئەم وتووێژەی لەگەڵ ئێمە کردوە.

**عەبدولڕەحمان قاسملوو:** شێوەی کارو کردەوەکانی پ.ك.ك هیچ پێوەندییەکیان بە واقعییەتی بزووتنەوەی کوردەوە نیە. نە کاری بێقاعیدە دژی خەڵکی ئاسایی لە کوردستانی تورکیەو نە کوشتنی کوردەکان لە ئورووپا. ڕوومای واقیعیی بزووتنەوەی ئێمە کە لەگەڵ دابو نەریتی گەلەکەمان یەك دەگرێتەوە، ڕوومایەکی دێموکراتیو ئینسانییە. هەم لە ئێرانو هەم لە عێراقدا ڕێکخراوە کوردییەکان پێگەیەکی بەرینیان لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا هەیە کە بێگومان ئەو تاقمە کوردە لە تورکیە نیەتی.

---

* ڕۆژنامەی "کوردستان" ژمارەی ١٣٠، خەرمانانی ١٣٦٠

بەڵام هەموومان لە بەرامبەر مەسەلەی کورددا بە شێوەی هاوبەش بەرپرسایەتی‌یەکمان بە ئەستۆیە، بیروڕای گشتی لە ئورووپا رەنگە جیاوازی‌یەك لە نێوان رێکخراوە کوردەکان‌و ئەو وڵاتانەی کە ئەوان تێکۆشانیان تێیاندا هەیە دانەنێ. هەر ئەوەندە دەستەیەك تەنانەت ئەگەر زۆر چووکیش بێ، کارێکی نائاسایی بکا، هەموو بزووتنەوەی کورد بە بەرپرس دەناسرێ. پ.ك.ك دەبێ تێبگا کە ناکرێ بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی پیرۆز رێگای ناڕەوا هەڵبژێردرێ، بێ‌ئەوەی ئامانجەکە زیانی قورسی وێ بکەوێ. رەوتی تازەی رووداوەکان لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا نیشان دەدا کە هیچ کاتێك تیرۆریزم نەیتوانیوە دەسکەوتێکی موسبەتی بۆ بزووتنەوە رزگاریخوازەکان هەبێ.

**لیبراسیۆن:** ئەوە راستە کە ئێوە هیچ کات کاری تیرۆریستی‌تان نەکردوە، بەڵام چاپەمەنی‌یەکانی تورکیە باسی یارمەتیی بزووتنەوەی ئێوە بە "پ.ك.ك"یان کردوە، لەو بارەوە چ دەڵێن؟

**عەبدولڕەحمان قاسملوو:** ئەوە راست نیە ئێمە هیچ پێوەندی‌یەك‌و هیچ شتێکی هاوبەشمان لەگەڵ پ.ك.ك نیە. ئێستا هەشت ساڵە لە کوردستان شەڕی چریکی هەیە. لەو ماوەیەدا هیچ کاتێك ئێمە هێرشمان نەکردۆتە سەر خەڵکی ئاسایی. دووپاتی دەکەمەوە ئەو چەشنە کارانە بە هیچ شێوەیەك پاساو ناکرێن.

کاتێك هەواڵی ئەو قەڵاچۆیە بڵاو بۆوە، من سەرەتا پێم وابوو کە پیلانێك لە لایەن حکوومەتی تورکیەوە لەگۆڕێدایە تا بەو شێوەیە وڵامێکی هەڵوێستی پارلەمانی ئیستراسبۆرگی سەبارەت بە ژینۆسایدی ئەرمەنی‌یەکان‌و بوونی مەسەلەی کورد دابێتەوە. بەڵام هەر وەك بۆخۆتان دەزانن پ.ك.ك لە رێگای برۆکسێلەوە بەرپرسایەتیی ئەو کوشتارەی وەئەستۆ گرت. بێگومان حکوومەتی تورکیە بۆ ئەوەی بزووتنەوەی کورد بێ‌ئیعتیبار بکا، میلیتاریزەکردنی لەرادەبەدەری کوردستان پاساو بداو خۆی وەك مودافیعی ئازادی‌و مافەکانی خەڵك نیشان بدا. لەو رووداوە کەڵك وەردەگری.

**لیبراسیۆن:** ئەگەر ئێوە نین کێیە یارمەتی پ.ك.ك دەکا؟

**عەبدولڕەحمان قاسملوو:** لە پلەی یەکەمدا ڕێژیمی خومەینی، دوای ئەو بە پێی هێندێك زانیاری دەبێ پ.ك.ك لە دیمەشقیش کە هێندێك لە ڕێبەرە ئەسڵییەکانی لەوێن یارمەتییەك وەرگرێ.

**لیبراسیۆن:** ئێوە ئوسوول و سوننەتی هاوبەشتان بۆ بزووتنەوەکانی کورد لە وڵاتە جۆراوجۆرەکان لەنەزردایە. بەڵام دوو ڕێکخراوی ئەسڵیی کورد یەکیان بزووتنەوەی ئێوە واتە "ح.د.ك.ئـ"و ئەوی دیکە یەکیەتیی نیشتمانی جەلال تاڵەبانی لەگەڵ مەسەلەیەك بەرەوڕوون. ئێوە لە لایەن عێراقەوە پشتیوانیتان لێ دەکرێو دژی ڕێژیمی ئێران خەبات دەکەن کە یارمەتی بە بزووتنەوەی تاڵەبانی دەکا. لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا دەکرێ قسە لە یەکیەتیی مەسەلەی کورد بکرێ؟

**عەبدولڕەحمان قاسملوو:** دیارە ئەم وەزعە شتێکی تازە نیە. بەداخەوە ئەوە ناکامی وەزعی ژێئۆپۆلیتیکی کوردستانە کە بێجگە لە سوریەو یەکیەتیی سۆڤیەت بەشی ئەساسی خاکەکەی لە نێوان سێ وڵاتی ئێران، عێراقو تورکیەدا دابەش کراوە.بەڵام سەبارەت بە پێوەندیی نیوان یەکیەتی نیشتمانیو حیزبی دێموکرات، ئێمە نەك هەر شەڕێکمان لەگەڵ یەکتر نیە بەڵکوو لە رادەیەکی بەرینتردا پێوەندی باشمان لەگەڵ هەموو ڕێکخراوەکانی کورد لە تورکیە بێجگە لە پ.ك.كو هەروەها ڕێکخراوە عێراقییەکانیش هەیە. ئەو کارە لە ڕەوتی سیاسیی کوردەکان لە عێراقدا دیاردەیەکی تازەیە. بێجگە لەوە ئێمە لە هەمان کاتدا کە لە دەخاڵەتکردن لە کاروباری نێوخۆی ڕێکخراوەکانی دیکەدا خۆ دەپارێزین، لە نێوان خۆماندا ئەوەمان وەك ئەسڵێك قبووڵ کردوە کە ئەگەرچی بە پاراستنی سەربەخۆیی بڕیاردانەوە دەکرێ لەگەڵ ئەو وڵاتانە کە کوردیان تێدا دەژی پێوەندی دامەزرێندرێ، بەڵام هەرگیز نابێ کارێك بە دژی بزووتنەوەی کوردەکانی ئەو وڵاتە بکرێ. وەختێك ئێمە هاوپێوەندیی خۆمان لەگەڵ هەموو بزووتنەوە رزگاریخوازە نیشتمانییەکانی سەرانسەری جیهان رادەگەیەنین، شتێکی سروشتییە کە ئەم مەسەلەیە لە کوردستان هەر قسەی تێدا نیە.

**لیبراسیۆن:** بەپێچەوانەی بزووتنەوەکانی دیکە، ئێوە داوای سەربەخۆیی کوردستان ناکەنو تەنیا باسی خودموختاری دەکەن.

**عەبدولڕەحمان قاسملوو:** ڕاستە، داوای ئێمە لە سنوورەکانی ئێران تێناپەڕێ. دیارە زۆر کورد هەن کە ئاواتەخوازی حکوومەتێکی سەربەخۆن و ئەوەش مافی خۆیانە، بەڵام سیاسەت دەبێ لەگەڵ واقیعییەتەکان ڕێك بخرێ. سەربەخۆیی کوردستان بە مانای لەت کردنی لانیکەم سێ وڵات لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستە کە دەتوانن بیر لە ئاکامەکانی بکەنەوە کە وابوو ئێمە لایەنگری خودموختارین و هەروایش دەمێنینەوە.

**لیبراسیۆن:** ئێستا وەزعی کوردستانی ئێران چۆنە؟

**عەبدولڕەحمان قاسملوو:** من لە هەر کاتێکی دیکە خۆشبینترم. شەڕی پارتیزانی شکڵێکی زۆر کاریگەری بەخۆوە گرتوە. ئێستا ئێمە دەتوانین زۆر زەبری توند لە پێگە نیزامییەکانی ڕێژمی خومەینی لە کوردستان بدەین. ورەی هێزە ئێرانییەکان زۆر لە خوارەوەیە و موبالەغەم نەکردوە ئەگەر قسە لە ئیحتیمالی گۆڕانی پارسەنگی هێزەکان بکەم کە ئەوە بە مانای گەیشتن بە قۆناخێکی تازەتر بۆ هێزەکانی ئێمەیە.

**لیبراسیۆن:** نەزەرتان سەبارەت بە توندبوونی تازەی ناکۆکییەکانی نێوان فەرانسە و ئێران چۆنە؟

**عەبدولڕەحمان قاسملوو:** لەو بارەوە من تەنیا بە شێوەیەکی گشتی دەتوانم نەزەر بدەم. کۆماری ئیسلامی ڕێژیمێکە کە لەگەڵ ڕێژیمەکانی دیکە جیاوازیی هەیە. ئەو ڕێژیمە ڕێز بۆ هیچ ئەسڵێك بۆ هیچ میعیارێك و بۆ هیچ قانوونێکی نێونەتەوەیی دانانێ. ڕێبەرانی ڕێژیم لە ئەسڵێکی مەزهەبیی خۆیان کە "تقیه" یانی "شاردنەوەی مەبەست"ە زۆر کەڵك وەردەگرن.

ئێوە ناتوانن وەك لایەنێکی جێگای متمانە حیسابیان لەسەر بکەن. بێجگە لەوەش بە بڕوای من پیاو نابێ هیچ کاتێك لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا کە بارمتە دەگرن و پەنا بۆ تیرۆریزم دەبەن، تەسلیم بێ. بێگومان جارێك تەسلیم بوون زۆر تەسلیم بوونی دیکەی بەدواوە دەبێ.

# وتوویێژی گۆڤاری "الصیاد" لەگەڵ سکرتێری گشتی کاك دوکتور قاسملوودا*

گۆڤاری "الصیاد" یەکێك لە گۆڤارە گرینگ‌و پڕ خوێنەرەکانی زمانی عەرەبی‌یە کە لە شاری "لندن" بە زمانی عەرەبی دەردەچێ. ماوەیەك لەمەوبەر خانمی "هدی الحسین" کە یەکێك لە نووسەران‌و راپۆرتدەرانی ئەم گۆڤارەیە، وتوویێژێکی لەگەڵ سکرتێری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، دوکتور قاسملوو لە کوردستان ئەنجام داو راپۆرتێکی لەم بارەوە لە گۆڤارەکەی‌دا بە چاپ گەیاند، کە ئێستا چەند بەشێك لەو راپۆرتە بۆ ئاگاداریی خوێنەرانی خۆشەویست چاپ دەکەین.

## خۆزگە بە زمانی کوردی دەتبیست!

دەڵێن رۆژێك عەرەبێك پیاوێکی کورد دەبینێ، کە لە سەر بەردێك دانیشتوەو هۆڕ هۆڕ دەگری. کابرای عەرەب هۆی گریانەکەی دەپرسێ. دێهاتییە کوردەکە وەلاّم دەداتەوە کە لە دوورەوە دەنگی پیاوێکی لێ گوێ بووە کە بە ئاوازێکی دڵگیر ئاهەنگێکی کوردی دەڵێ‌و ئەم مەسەلەیە هەستی ئەوی بزواندوە. پیاوی عەرەب لێی دەپرسێ: لەو گۆرانی‌یەدا چ شتێك هەبووە کە ئاوا تۆی تێك داوە؟ دێهاتی‌یە کوردەکە دەڵێ: گۆرانی‌یەکە ئاوایە؛ چۆلەکە باڵی کردەوەو هەڵفڕی بەلاّم پێش ئەوەی زۆر دوور بێتەوە، پێم گوت سلاّوی من بە خاوو خێزانم بگەیەنە. عەرەبەکە دەڵێ: لەم وشانەدا هیچ شتێکی وای تێدا نیە کە پیاو وەگریان بخا. دێهاتی‌یە کوردەکە وەلاّم دەداتەوە:

---

* ئەم وتوویێژە لە رۆژنامەی "کوردستان" ژمارەی ١٠٦، لە پووشپەڕی ١٣٦٤دا چاپ کراوە.

**"بەلاّم خۆزگە ئەوانەت بە زمانی کوردی گوێ لیّ دەبوو." خانمی "هدی الحسینی" بۆ ئەوەی چیرۆکی خەباتی کوردەکان لە زمانی خودی ئەوانـەوە ببیسـێ بـۆ مـاوەی دوو حەوتوو سەری لە کوردستان داوە. ئەو لەو ماوەیەدا لە نێـو کێوەکـانی کوردسـتاندا لەگەڵ رێبەرانی کورد وتوویژی کردو لە نیزیکـەوە لەگـەڵ گـیروگرفتو مەسـەلەکانی کوردستانو ناوچە ئاشنا بـوو. دەسـکەوتی ئـەم سـەفەرە روونکردنـەوەی مەسـەلەی کوردە. مەسەلەیەك کە زیاتر لە نیو سەدەیە لە ئێرانو عێراقو تورکیـەدا کـەمو زۆر هەورازو نشێوی بڕیوە.**

چەند رۆژێك لە کوردستان، چیاکانی کوردستان سەنگەری حیزبی دێموکرات، ئـەو پێشمەرگانەی کە بە شێوەی تازە فێر دەکرێن. کوردستانی ئێرانو عێراق ناوچەیـەکی کوێستانیو پڕ ئاوە، کە زۆر وەك لوبنان دەچێ. کاتێك بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ دوکتور "عبدالرحمن قاسملو" سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئـێران، بـەرەو سنووری نێوان ئێرانو عێراق وەڕێ کەوتین، هەوا سارد بوو، بەهار تـازە دەسـتی پـێ کردبوو، بارانێکی نەرم رووخساری گولاّنی دەشوشت. دەفتەری سیاسی لە نێـوان دوو کێو دایە، هەر چەند رێگا تووشو دوورو درێژ بوو، بەلاّم سەفەر لـەو ناوچەیـەدا زۆر خـۆش بـوو. هیـچ وامـان بـە بـیردا نـەدەهات کـە ئـەوا خەریکـە بچینـە بنکـەی رێکخراوێکی ئوپۆزسیۆن کە شەش ساڵە لە دژی رێژیمی ئێران خەبات دەکـا. بەشـێك لە رێگا ئیسفالتو بەشێکی دیکەی خـاکیو زۆر دژوار بـوو. بـە ئـاخری رێگاکـەدا مـەجبوور بووین لـە ماشین دابـەزین، چونکـە لـەو بەشـەی رێگاکـەدا تەنانـەت تەراکتۆریش نەیدەتوانی بڕوا. هـەموو رۆژێ دەوروبـەری ئێـوارە دەفتـەری سیاسـی کۆبوونەوە دەکا. لەم کۆبوونەوانەدا ئاڵوگۆڕەکانی نێوخۆی کوردستان لێك دەدرێنەوە. حەوتووی جارێك دوکتور قاسملوو لە چێشتەنگاودا لەگەڵ دەسـتەیەك پێشـمەرگە کـە بەرەو مەئمووریەت لە نێوخۆی کوردستان دەڕۆن دادەنیشێو قسـەیان لەگـەڵ دەکـا. دوکتور قاسملوو دەڵێ: ئێمە نامانهەوێ لە ئێران جیابینـەوە، هەرچـەند دەڕوانـین لـە رێژیمی ئێستادا ویستەکانمان وەدی نایەن. دوکتور قاسملوو کـە بـاوەڕێکی قووڵـی بـە دێموکراسی هەیە، ئەوەی لە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکدا بەتەواوی نیشان دەدا. ئـەو بە شێوەیەکی ئاسایی چەك هـەڵناگرێ. ئـەندامانی دەفتـەری سیاسـیو کادرەکـانی دیکەو پێشمەرگەکان پێکەوە لە جێگایەك نان دەخۆن. بەلاّم ئەوانە هـەر کـەس بـە

ئیشتیای خۆی خۆراکێکی ساکار ساز دەکا. لە دەفتەری سیاسیو جێگاکانی دیکەی جێگیربوونی پێشمەرگەکان، پاکو خاوێنی بە ڕادەیەکی باش دەپارێزرێو پێشمەرگەکان لە ئاوی لوولەکێشی کەڵك وەردەگرن. پێوەندی لە نێوان بنکەکانی حیزبدا بە هۆی تەلەفوونەوە دەگیرێ. لە ڕێگای بێسیمەوە لەگەڵ ئوروپاش تەماسیان هەیە، دوکتورەکانی فەرانسەیی بە یارمەتیی پزیشکی نێونەتەوەیی بە کەڵك وەرگرتن لەم پێوەندیی بێسیمی‌یە دەتوانن لەگەڵ ناوەندی خۆیان لە ئوروپا پێوەندی بگرن. بۆ شام میوانی دوکتور قاسملوو بووین. لە کاتی نان خواردندا دوکتور قاسملوو بە ڕووخۆشی‌یەکی تایبەتی‌یەوە کە هەیەتی، فەزایەکی شادی پێکهێنابوو. ئەو ڕێبەرێکە کە جێگای ڕێزی هەموانە. شەخسێکی خاوەن ئەزموونو سیاسەتمەدارێکی هەڵکەوتوویە؛ ڕووخۆشەو لەگەڵ خەڵك زۆر تێکەڵاوە. هەر چەند زۆر باش دەزانێ چ مەقامو جێگایەکی هەیە، هیچ کاتێك نایهەوێ خەڵکی بە لەبەرچاو گرتنی هیچ قەیدو بەندێك لەو بارەیەوە مەجبوور بکا. بەیانی بەرەو چیاکان وەڕێ کەوتین، تا لەگەڵ دەستە بە دەستەی پێشمەرگە کە لە چیاکاندا جێگیرن چاومان پێك بکەوێ. زۆربەیان ئەو تفەنگانەیان بە دەستەوەیە کە لە ئەرتەشی ئێرانیان بە تالان گرتوون. یەکێك لە دەستەکان تۆپێکی دژی هەوایی لە ئیختیاردا بوو کە بە شانازی‌یەوە نیشانی ئێمەی دەدا. ئەم چەکەشیان لە ئەرتەشی ئێران بە غەنیمەت گرتبوو. لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستاندا حیزبی دێموکرات قوتابخانەی کردوونەوە کە لەواندا بە زمانی کوردی دەرس دەگوترێتەوە. دوکتور قاسملوو لە نێو قسەکانی‌دا ئیشارەی بە یەکەمین کۆماری کورد لە ساڵی ١٩٤٦دا کرد. دەی‌گوت هەر چەند ئەو کۆمارە تەنیا نیزیکەی ساڵێك خۆی ڕاگرتو دامەزرێنەرەکەی "قازی محەممەد" ئیعدام کرا، بەڵام بە ڕووخانی ئەم کۆمارە، ئامانجەکانی ئەو هەرگیز لە بیر نەچووەو حیزبی دێموکرات درێژەی بە خەباتی خۆی دا. حیزبی دێموکراتی کوردستان ڕێکخراوێکی سیاسیی غەیرە مەزهەبی‌یە. دوکتور قاسملوو لە سەر لایەنەکانی دێموکراتیکی حیزب زۆر پێ دا دەگرێ، دوکتور قاسملوو کە لە بابێکی کوردو دایکێکی ئاسووری هاتۆتە سەر دونیا لە ئیشارە بە هاوپەیمانیی سروشتی لەگەڵ نەتەوەکانی مەسیحی مەزهەبدا دەڵێ: نووسەری کۆماری مەهاباد لە براکەم دەپرسێ نەزەرتان لە سەر هاوپەیمانی لەگەڵ مەسیحی‌یەکان چیە؟ براکەم وەڵام

دەداتەوە: زۆر موافیقین. دایکی من ئاسووریو (مەسیحی)یە. دوکتور قاسملوو وێڕای دوان لە سیاسەتو شەڕو زۆر مەسەلەی جیددیی دیکە دەستی کرد بە خوێندنەوەی هێندێك شێعر بە زمانی کوردی. ئەوانەی لەوێ بوون داوایان لێ دەکرد ئەو شێعرانە بۆ من وەرگێڕێتەوە چونکە دیار بوو ناسکیو جوانی‌یەکی زۆریان تێدایە. پێشمەرگە کوردەکان، پاش تەواوبوون لە عەمەلیاتی نیزامی، بە شێوەیەکی ئاسایی وەختی خۆیان بە خوێندنەوەی سروودو شێعری کوردیو چاخواردنەوە رادەبوێرن. شاییو هەڵپەڕکێی کوردیشیان زۆر پێ خۆشە. لە کوردستانی ئێران لکێك لە رێکخراوی موجاهیدینی خەلق هەر وەها رێکخراوێکی سیاسیی دیکە بە ناوی کۆمەڵە هەن. ماوەیەکە کۆمەڵە ناوی ئەسڵیی خۆی گۆڕیوەو بۆتە بەشێك لە حیزبی کومۆنیستی ئێران. ئەم رێکخراوەیە شتێکی جیاواز لە حیزبی توودەیە. نیزیکەی ٩٥٪ی ئەندامانی حیزبی کومونیستی ئێران لە ئەفرادی کۆمەڵە پێك هاتون. کۆمەڵەیی‌یەکان هیچ کام لە وڵاتانی سوسیالیستیو حیزبە کومۆنیستەکانی دنیایان قبووڵ نیە. زۆر چەپاژۆو توندو تیژن. ئەم رێکخراوەیە هێندێك گیروگرفتی بۆ حیزبی دێموکرات پێك هێناوە. بە باوەڕی دوکتور قاسملوو ئەندامانی حیزبی کومۆنیستی ئێران کە هەموویان لاوی کەم ئەزموونن هێندێك شت دەزانن کە هیچ پێوەندی‌یان بە راستی‌یەکانی کۆمەڵی کوردەواری‌یەوە نیەو لە بەرامبەردا لەو شتانەی کە دەبێ ئاگادار بن بێ‌خەبەر ماونەوە. دوکتور قاسملوو دەی‌گوت: ئەم تاقمە زۆر جار ناوی رێکخراوی خۆیان گۆڕیوە. لە سەرەتادا ناوی "یەکیەتیی جووتیاران"یان لە سەر رێکخراوەکەیان دانابوو. پاش ماوەیەك ناوی کۆمەڵەیان لە سەر خۆیان دانا. ئەم ناوە ناوی پێشووی حیزبی دێموکرات بوو. دیسان هێندەی پێ نەچوو رێکخراوی خۆیان کردە بەشێك لە حیزبی کومۆنیستی ئێرانو ئێستا عینوانی کۆمەڵە پاش "حیزبی کومۆنیستی ئێران" لە نێو پەرانتزدا دێ. بە نەزەری دوکتور قاسملوو، ئەم رێکخراوە نەخشی حیزبێکی کومۆنیستی وەئەستۆ گرتوە کە لە ئامانجو هەڵوێستەکانی خەڵك تێ‌ناگەن، ئەوان کەمایەتی‌یەکی زۆر کەم لە کوردستانن کە دەیانهەوێ لەوێ ئیرادەی خۆیان بەسەر خەڵکدا بسەپێنن. لە سەرەتاوە دامەزرێنەرانی ئەم رێکخراوەیە خۆیان بە مائۆئیست دادەنا. پاش ماوەیەك هێندێك بیرو بڕوای نەتەوەیی‌یان لە خۆیان نیشان دا، بەڵام دوایە لە نەتەوەپەرستی رەخنەیان گرتو ئێستاش خۆیان بە مارکسیستی

شۆڕشگێڕ لە قەڵەم دەدەن. مارکسیستێك کە لەم دنیایەدا هیچ حیزبێکی کومۆنیستیان قبوول نیە. لە نێو کۆمەڵەیی‌یەکان‌و خەڵکی کوردستاندا زۆر جار تێکهەڵچوون رووی داوەو هەموو جارێ حیزبی دێموکراتی کوردستان ناچار بووە دەخالەت بکا. چونکە ئامانجی بناغەیی حیزب دابینکردنی دێموکراسی بۆ خەڵکی کوردستانەو لەو باوەڕەدایە کە هیچ کەس حەقی نیە زۆر لە خەڵکی کوردستان بکا. وەزعی کۆمەڵەو حیزبی دێموکراتی کوردستان بەم جۆرەیە؛ بە باوەڕی کۆمەڵە، کۆماری ئیسلامی‌و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هەردووکیان نوێنەری بورژوازین‌و لەبەر ئەوە هیچ جیاوازی‌یەکیان لە نێواندا نیە. ئەگەر کۆمەڵە ناچار بێ لەگەڵ یەکێك لەو دوانە شەڕ بکا، پێی باشترە لە کۆماری ئیسلامی واز بێنێ‌و لەگەڵ حیزبی دێموکراتدا شەڕ بکا. ئەوان دەڵێن جووڵانەوەی کوردستان گرینگی‌یەکی وای نیە؛ چونکە روانگەی خۆیان زۆر بە بەرزترو دوورتر لەم جووڵانەوەیە دەزانن. لە بابەت شێخ عیزەددینی حوسەینی‌یەوە دەبێ بڵێین کە دەنگۆی دامەزراندنی حیزبێکی کوردی لە لایەن ئەوەوە راست نیە، بۆخۆشی ئەوە وەدرۆ دەخاتەوە. تەنیا دەفتەرێکی بچووکی داناوە. لە رابردوودا لایەنگری ئەو لە کۆمەڵەدا بە رادەیەك بوو کە خەڵك پێیان دەگوت "شێخی سوور"! حیزبی دێموکرات بە عینوانی شەخسیەتێکی سیاسی ـ مەزهەبی رێز بۆ "شیخ عزالدین" دادەنێ. دوکتور قاسملوو دەڵێ: ماوەیەك لەمەوبەر کە شێخ هاتبوو بۆ دیدەنیی من چەند مەسەلەیەکم وەبیر هێناوە. ١- خۆی بە رێبەری گەلی کورد دانەنێ، چونکە لەم رێگایەدا ناتوانێ سەرکەوتنێك بە دەست بێنێ. حیزبی دێموکرات رێبەری جووڵانەوەی ئێستایەو سیاسەتی ئەم حیزبە لە سەر پایەی رێبەرایەتیی بەکۆمەڵ دامەزراوەو پاڵ وەیەك فەرد نادا بە ناوی رێبەر. ٢- ئەگەر بێلایەنی ریعایەت بکاو لەم یا لەو رێکخراوی سیاسی پشتیوانیی بێئەملاو ئەولا نەکاو نەخشێکی بێلایەن بەرێوە بەرێ دەتوانێ زۆر شەخسیەتێکی بەکەڵك بێ. دوکتور قاسملوو دەی‌گوت ئێمە هەموو کاتێك لە "شیخ عزالدین"مان ویستوە کە بێلایەنیی خۆی بپارێزێ. بەڵام شێخ لە رابردوودا ویستوویەتی خەڵك بۆ لای کۆمەڵە هان بداو لە کاتی هەڵبژاردن‌و شتی وادا داوای لە خەڵکی کردوە کە لایەنی کۆمەڵە بگرن. دوکتور قاسملوو لە سەر ئەو مەسەلەیە پێ دادەگرێ کە شێخ لە پێش شۆڕشدا بە سەمبولی رووحانییەتی سوونی لە کوردستان‌و شەخسیەتێکی مەزهەبیی کورد

حیساب دەکراو لە بەرامبەر خومەینی قەراری گرتبوو. دوو ڕێکخراوی کۆمەڵەو فیدایی‌یەکان دەیانویست ئەو لە بەرامبەر حیزبی دێموکراتدا ڕاست بکەنەوەو بۆیە لە هەر جێگایەك دوکتور قاسملوویان دەدی دروشمیان دەدا کە "ڕێبەری ئێمە شێخ عێزەدینە" بەڵام ئەو کەسانە ئێستا شێخیان بەجێ هێشتوە هەرچەند شێخ هەر وا لە ریزی موخالیفەکانی رێژیمدا ماوە. حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بەهێزترین ڕێکخراوی سیاسی لە کوردستانی ئێرانە. ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٧٣دا دروشمی "خودموختاری بۆ کوردستانو دیموکراسی بۆ ئێران"ی وەك دروشمی ستراتیژیکی خۆی دیاری کرد. ئەم دروشمە زۆر لە مێژە بۆتە دروشمێکی جێگای پەسند بەشێوەیەکی بەربڵاو. پاش رووخانی شا، حیزب زۆر هەوڵی دا لە ڕێگای ئاشتی‌خوازانەوە بە ئامانجەکانی خۆی بگا، بەڵام "آیت الله خمینی" وشەی خودموختاریی قبووڵ نەکرد، چونکە بە بڕوای ئەو ئەم وشەیە لەگەڵ نێوەڕۆکی ئیسلام یەك ناگرێتەوە. "آیت الله خمینی" لە ساڵی ١٩٧٩دا گەلی کوردی بە کافر داناو لە دژی ئەم گەلە جیهادی ڕاگەیاندو بەم جۆرە شەڕی ڕێژیمی تازە لە دژی خەڵکی کوردستان دەستی پێ‌کرد. حیزبیان هەڵوەشاوە ڕاگەیاندو سێڵاوی هێزەکانی ڕێژیم بەرەو کوردستان وەڕێ کەوت. بەڵام پاش چەند مانگ خومەینی ڕای‌گەیاند کە دەوڵەت دەبێ بۆ هەڵسەنگاندنی ویستی کوردەکان لەگەڵ ئەواندا وتوویژ بکا. کوردەکان ئەم پێشنیارەیان قبووڵ کرد، چونکە حیزب هەمیشە چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردستانی لە ڕێگای ئاشتی‌خوازانەوەو بە ڕێگای سیاسی‌دا پێ لە هەموو ڕێگاکان باشتر بووە. بێجگە لەوەش وەرزی سەرمای زستان لە پێش بوو. حیزب پێشنیاری چەك دانانی کە لە لایەن ڕێژیمەوە دەکرا قبووڵ نەکرد. لە خاکەلێوەی ساڵی ١٩٨٠دا سەرۆك کۆماری ئەو کاتەی ئێران، "ابوالحسن بنی‌صدر" دەستووری بە ئەرتەشی ئێران دا کە هێرشێکی بەربڵاوو هەموو لایەنە لە دژی گەلی کورد دەست پێ بکا. دەزانین شوورای نیشتمانیی بەرگری، کە حیزبە موخالیفەکانی لە دەوری یەك کۆ کردەوە "مەسعوود ڕەجەوی" سەرۆك کۆمار "بنی‌صدر"و "قاسملوو"ی لە تەنیشت یەکتر دانا. حیزبی دێموکرات لە ماوەی شەش ساڵ شەڕی بەرگری‌دا، زیاتر لە ٣ هەزار کەسی لە پێشمەرگەکانی خۆی لەدەست داوەو لەم ماوەیەدا گەلی کورد دەورو بەری ٤٠ هەزار کەس کوشتەی داوە. هۆی سەرەکیی بەجێ هێشتنی شارەکان لە لایەن

پێشمەرگەکانەوەو پاشەکشەی ئەوان بۆ کێوەکان ئەم تەلەفاتە قورسە بوو. ئێستا حیزب بەینی دە تا دوازدە هەزار کەس پێشمەرگەی ڕێکوپێکی هەیە. هەزاران کەس لە هێزی بەرگریش‌دا بۆ کاتی پێویست ئامادەن. لە ڕاستی‌دا زۆربەی خەڵکی کوردستان (ئێران) چەکدارن. ڕێژیم دەیهەوێ خەڵکی کوردستان چەکدار بکاو ئەوان لە بەرامبەر پێشمەرگەکاندا دانێ. بەڵام زۆربەی ئەم جۆرە کەسانە دەچنە نێو پێشمەرگەکان. لە حاڵی حازردا حیزبی دێموکرات بە دوو هۆ نایەوێ ژمارەی پێشمەرگەکانی خۆی زیاد بکا: یەکەم ئەوەی کە ئێستا نیزیکەی ٢ ساڵە کە حیزب شێوەی شەڕی پارتیزانیی گرتوەتە پێش. ئیدی بەرگری لە ناوچە ڕزگارکراوەکان بە واتای رابردوو مەعنای نیە. لەم شێوە لە شەڕی بەرگری‌دا زیادکردنی ژمارەی پێشمەرگەکان گیروگرفتی زۆر لە بواری تەداروك‌و تەیارکردنی ئەواندا تووشی حیزب دەکا. تاکتیکی تازە بەتەواوی بەکەڵك بوونی خۆی نیشان داوە. لەم نەوعە لە شەڕی بەرگری‌دا پێشمەرگەکان لەڕاستی‌دا لە هەموو جێگایەك هەن‌و لە هیچ جێگایەکیش دیار نین. دووهەم لە نەزەر ئابووری‌یەوە حیزب دەبێ چەك‌و پێداویستی‌یەکانی دیکەی پێشمەرگەکان ئامادە بکاو ئامرازەکانی پێوەندی گرتن، خۆراك‌و جلوبەرگی ئەوان دابین بکا کە خەرجێکی زۆرە. لە حاڵی حازردا نەزەری حیزب ئەوەیە کە چۆنیەتیی بەربەرەکانێ کردنی پێشمەرگە بەرێتە سەر. بەم مەبەستە فێرگەیەکی نیزامیی کردۆتەوە. کەسانێك کە دەیانهەوێ بێنە نێو ریزەکانی پێشمەرگە دەبێ لانی‌کەم سێ مانگ ئامووزشی نیزامی ببینن. لە قۆناغەکانی رابردووی شەڕی بەرگری‌دا، پێشمەرگەکان بە شێوەی جەبهەیی لەگەڵ هێزەکانی دوژمندا شەڕیان دەکرد، ئەم شێوەیە هەم بۆ پێشمەرگەکان‌و هەم بۆ پشتیوانیی گوندەکان زیانی هەبوو. ئێستا مەگەر لە هێندێك حاڵەتی پێویستدا، پێشمەرگەکان هێرش ناکەنە سەر پایەگاکانی دوژمن. لەم قۆناغەدا بە شێوەیەکی ئاسایی پێشمەرگەکان ستوونەکانی دوژمن لە کەمین دەخەن‌و لێیان دەدەن‌و پاش تێك شکاندنی ئەوان دەست بەسەر چەکەکانیاندا دەگرن‌و پاشان جێگای کەمینەکە بەجێ دێڵن. سەربازە بە دیل گیراوەکان زۆرتر هەر لە جێگای شەڕەکەدا ئازاد دەکرێن. چونکە بە باوەڕی ئەمان سەرباز بە دڵی خۆی نەهاتوە، بەڵکوو بە زۆر ناردوویانەتە کوردستان. سەرباز مەجبوورە دەستووری فەرماندەی خۆی بەرێوە بەرێ... بەسیجی‌یەکان، منداڵیش فەوری ئازاد دەکرێن. بەڵام

دەرەجەدارەکان، ئەفسەرەکانو بەتایبەتی پاسدارە دیلەکان رادەگرنو ئەگەر ئیمکانی هەبێ لەگەڵ پێشمەرگە دیلەکان دەیانگۆڕنەوە. هێندێك جار ژمارەی ئەسیرەکانی دوژمن بە رادەیەك زۆر دەبێ کە راگرتنی ئەوان بۆ حیزب، بەتایبەتی لە باری ئابووریو جێگای راگرتنەوە، زۆر زەحمەت دەبێ. ئەفسەرانو فڕۆکەوانە ئەسیرەکان زۆر بە کەمی ئازاد دەکرێن. یەکێك لە فڕۆکەوانەکانی هێزی هەوایی کە فڕۆکەکەی بە هۆی ئاوری پێشمەرگەوە خرابووە خواریو پاش دەرمان کردن لە نەخۆشخانەی حیزب ئازاد کرابوو، پاش ئازادبوون نامەیەکی سوپاسی بۆ حیزب نووسی. زۆر لە دیلە ئازاد کراوەکانیش بە نهێنی دەگەڕێنەوەو داوا دەکەن لە کوردستان بمێننەوە. هەر ئێستا هێندێك ئەفسەری دیل لە زیندان هەن کە دەیانهەوێ لە زیندان بمێننەوەو نایانەوێ ئازاد بکرێن. کوردەکان دەڵێن لەبەر ئەوەی کە لە نێو نەتەوەکانی ئێراندا، تەنیا کوردەکانن کە دەستیان داوەتە خەباتی چەکدارانە لە دژی رێژیم، رێژیم توانیویەتی زۆربەی هێزەکانی خۆی بۆ کوردستان تەرخان بکا. بەپێی ئامارێك کە چەند مانگ لەمەوبەر لە لایەن حیزبەوە ئامادە کراوە تا ئەو کاتە رێژیم ٢٠١٩ پایەگاو ٢٣ پادگانی نیزامیی لە کوردستان جێگیر کردوون. پێوەندیی گەلی کورد لەگەڵ گەلانی دیکەی ئێران زۆر باشە، زۆر کەس لە نەتەوە جیاوازەکانی ئێران پەنایان بۆ کوردستان هێناوە. لە ریزی پێشمەرگەکانی حیزبدا ئێرانیی غەیری کوردیشی تێدایە. ئەم کەسانە شانبەشانی پێشمەرگەکان لە دژی هێزەکانی رێژیم بەشداری دەکەن. ئەم جۆرە کەسانە پاش سەلماندنی نییەت پاکیی خۆیان، دەتوانن لە ئۆرگانە جۆربەجۆرەکانی حیزبدا کار بکەن. هەر ئێستا ئێرانیی غەیرە کورد لە ئورگانی زۆر گرینگی نیزامیدا چالاکییان هەیە. لە رابردوودا ئازەرییەکان جوولانەوەکانی دێموکراتیکیان لە ئێراندا رێبەری دەکرد. بەڵام ئێستا کوردەکان جێگای ئەوانیان گرتۆتەوە. هەڵبەت ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆ، سەرەڕای بوونی تەشکیلاتێکی رێکوپێکی حیزبی دێموکراتی کوردستان، هۆی دیکەشی هەیە: ئازەرییەکان نەك تەنیا لە ئازەربایجان بگرە لە رادەی ئێرانیشدا ئابووریی وڵاتیان لە دەست گرتوە. بوونی مەزهەبی هاوبەش لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ناوەندییش لە سازانی ئەوان لەگەڵ حکوومەتی ناوەندیدا شوێنەواری هەبووە. بەشێکی کەم لە ئازەربایجانییە رووناکبیرەکان چوونە نێو فیرقەی دێموکرات (کە بەشێك لە حیزبی توودەیە)و بێجگە لە هەمووی ئەوانیش رێبەرانی مەزهەبیی

ئازەربایجان نایانهەوێ ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆ لە وەزعی ئێستادا پێك بێ. بەلووچەکان لە هەموو نەتەوەکانی دیکە زۆرتر ئامادەیی‌یان هەیە. ئەوان کە لە ناوچەکانی نێوان ئێران، پاکستانو ئەفغانستاندا دەژین، پێوەندی‌یەکی باشیان لەگەڵ ئێمەدا هەیە. هەر ئێستا ژمارەیەك لە بەلووچەکان سەرگەرمی ئامووزشی نیزامین. ئەوانیش وەك حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دروشمی: "دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ بەلووچستان"یان هەڵگرتوە. ئەوانیش خوازیاری مافە نەتەوەیی‌یەکانی خۆیانن. ئەگەر گوێنەدانی حکوومەتی ناوەندی بە کوردستان لە تەواوی بوارەکانیاندا واقیعییەتێکە، ئەم واقیعییەتە لە بابەت بەلووچستانەوە زۆر ناخۆشترە. لەم رووەوە بەلووچەکان خوازیاری باشترکردنی وەزعی کۆمەلایەتیو ئابووریی خۆیانن. مەزهەبەکەشیان هیچ یارمەتی‌یەك بە پێکەوە بەستنی ئەوان لەگەڵ رێژیمی دەسەلاتدار ناکا. بەلام سەبارەت بە تورکمەنەکانو عەرەبەکان؛ پاش شۆڕش جوولانەوەی تورکمەنەکان لە لایەن فیدایی‌یەکانی خەلقەوە رێبەری دەکرا. بەرپرسانی ئەم جوولانەوەیە هەڵەی زۆریان کرد. ئاخرەکەی رێژیم بە ناردنی هێزی نیزامی جوولانەوەی گەلی تورکمەنی سەرکوت کرد. رێبەرانی ئەوانی ئیعدام کردو هەر ئێستا تورکمەنەکان بە "روالەت" ئارامن. پێوەندیی نێوان تورکمەنەکانو کوردەکانی لە سنوورێکی زۆر بچووکدایە. سەبارەت بە عەرەبەکان دەبێ بڵێین کە شەڕی نێوان ئێرانو عێراق زۆر مەسەلەی گۆڕیون. چینی مام ناوەندیی عەرەب لەگەڵ رێژیمی ئێراندا هاوکاری دەکەنو دەستکورتەکانی عەرەب مەیلیان بۆ لای عێراق هەیە. جوولانەوەی دێموکراتیی ئەوان هێزێکی ئەوتۆی نیە. یەکێك لە گیروگرفتە گەورەکانی ئەوان ئەمەیە کە ناوچەی ئەوان بۆتە مەیدانی شەڕی هێزەکانی ئێرانو عێراق. وەزعی جوغرافیایی ئەوان کە بەگشتی دەشتەو کێوی تێدا نیە، لە باری ئیستراتیژیکی‌یەوە زۆر بە زیانی ئەوانە. بەرگریی گەلی کورد تەنیا پشتی بە ورەی خەباتگێڕیو خووی شەڕکەریی ئەوان نەبەستوە، بەڵکوو چیاکانی کوردستانیش هەمیشە وەك پارتیزانێکی جێگای باوەڕ کاری خۆیان کردوە. پێشمەرگە کوردەکان ئەگەر ئێستە یان ئەو دۆڵیان لە دەست دا، دەتوانن بچنە ناوچەیەکی دیکەی کوێستانیو لە داوێنی چیاکان، ئەم دۆستە هەمیشە وەفادارانە خۆیان لە بەلا دوور بخەنەوە. لە حاڵی حازردا حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵ حیزبو رێکخراوەکانی دیکەی ئێرانی لە

شوورای نیشتمانیی بەرگریدا هاوپەیمانە. بەڵام جەوی دەسەڵاتدار بەسەر ئەم شوورایەدا جەوێکی یارمەتیدەر نیە.

لە چاوپێکەوتنێك کە لەگەڵ سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، دوکتور عەبدولرەحمان قاسملوودا هەمبوو، دەیگوت شوورا لەگەڵ گیروگرفتی زۆر بەرەورووبە. بەتایبەتی لە نێوان ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵقو حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێراندا لە سەر زۆر مەسەلە ناکۆکی هەیە. لە بابەت بەهانەی موجاهیدینەوە دوکتور قاسملوو دەیگوت: "وتوویژ لەگەڵ ڕێژیم لە بناغەوە بە بێکەڵك دەزانێ چونکە ئەم ڕێژیمە بە خودموختاریو دێموکراسی بچووکترین باوەڕی نیە. شەڕی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی لە دژی گەلی کورد بە ماوەیەکی زۆر پێش شەڕی نێوان ئێرانو عێراق دەستی پێکردبوو، مومکینە شەڕ لەگەڵ عێراق تەواو بێ، بەڵام ڕێژیمی ئاخوندی بە شەڕ دژی کوردەکان هەروا درێژە دەدا." دوکتور قاسملوو ئیشارەی بە کوردەکانی عێراق کردو گوتی: هەر کاتێك دەوڵەتی عێراقو یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان لەویان بوێ، حازرە نێوبژیگەرییان لە بەیندا بکا. بە باوەڕی ئەو، ئەوانەی کە قسە لە دامەزراندنی یەك دەوڵەتی سەربەخۆی کورد دەکەن، لەگەڵ واقیعییەتەکاندا تا رادەیەکی زۆر بێگانەن. دوکتور قاسملوو باوەڕی بە خەبات لە پێناوی وەدەستهێنانی خودموختاریدایەو جیاوازیخوازیو جیابوونەوە لە ئێران بەتوندی ڕەت دەکاتەوە. پاش هێندێك لێکۆڵینەوە لە کوردستانو پاش ماوەیەك وتوویژ لە هەر کەلێنو قوژبنێکدا بە ڕەسمی لەگەڵ دوکتور قاسملوو وتوویژم بە یەکەمین پرسیار دەست پێکرد.

**الصیاد:** با لە سەر شوورای نیشتمانیی بەرگری، کە حیزبو ڕێکخراوەکانی ئوپۆزسیون لە نێو خۆیدا کۆ دەکاتەوە، باس بکەین، ئایا بوونی ناکۆکی لە نێو ئەندامانی شوورا زیانهێنەر نیە؟

**دوکتور قاسملوو:** چوونی ئێمە بۆ نێو شوورا لە ئەنجامی باوەڕێکەوە بوو کە هەمان بوو. ئێمە هەرچەند ڕێکخراوێکین کە زۆرترین چالاکیمان (بە بەراورد کردن لەگەڵ تەواوی ڕێکخراوەکانی دیکە) لە ئێراندا هەیەو ڕێکخراوێکین کە بە هێزی نیزامی، لە ڕێژیمی خومەینی دەدەینو لە سەر ئەو باوەڕەین کە دەتوانین ڕێژیم لاواز بکەینو لە درێژخایەندا پێداویستییەکانی رووخانی ئەو پێك بێنین، بەڵام ناتوانین جێگای ئەو

گرینەوە. بۆیە بەتەنیایی لە توانامان‌دا نیە ببینە ئالترناتیڤ. لەبەر ئەوە بەتەواوی روونە کە دەبێ لە بیری وەدەستهێنانی هاوپەیمان‌دا بین. ئەم مەسەلەیە لە ئوسوولەکانی بیرو باوەڕی ئێمەوە سەرچاوە دەگرێو بە هیچ شێوەیەك لایەنی تاکتیکی نیەو وەك ئیستراتیژیی ئێمە بە حیساب دێ. لەبەر ئەم هۆیە بوو کە چووینە نێو شوورا. لێرەدا هێندێك گومانو شك پێك هاتوە کە هۆی بناغەیی‌یەکەی خودی شوورایە. شوورایەك کە بناغەکەی لە سەر "میثاق"ێك دامەزرا کە لە نێوان موجاهیدینو "بنی‌صدر"دا دارژابوو! بەلام هەلومەرجی مێژوویی پێکهاتنەکەی پێویست دەکرد. دوو مەسەلەی بناغەیی بوونە هۆی چوونی ئێمە بۆ نێو شوورا؛ یەکەم ئەوە کە شوورا پێی لە سەر لایەنەکانی دێموکراتیکی مەسەلەکان دادەگرتو دووهەم ئەوەی کە خودموختاریی کوردستانی قبوول بوو. هەر وەك دەزانی دروشمێك کە ماوەیەکی زۆر بۆتە دروشمی ئەسلیی حیزبی ئێمە. "دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان"ە. ئەم دروشمە لە ئوسوولەکانی شوورادا هەبوو. ئێمە هەر کارێك کە لە دەستمان هات بۆ باشترکردنی شوورا ئەنجامان دا، بۆ ئەوەی بتوانێ بە ئامانجەکانی خۆی بگا یەکێك لە پێشنیارەکانی ئێمە ئەوە بوو کە بۆ ئەوەی ئیمکانی بەشداری‌کردنی تەواوی رێکخراوو شەخسیەتەکانی دژی رێژیم لە شووراداو هاتنی ئەوان بۆ سەر رێگای خەباتی یەکگرتوو بۆ رووخاندنی رێژیم پێك بێ، شوورا دەبێ چوارچێوەیەکی عەمەلی دیاری بکا. لەم شوورایەدا سەلتەنەتخوازان جێگایان نابێتەوەو هەر لە سەرەتای کاریشەوە هاوکاری لەگەل سەلتەنەتخوازانو هاوکارانی رێژیمان رەت کردەوە. بەلام بێجگە لەوان هێندێك رێکخراو هەبوون کە دەیانویست بێنە نێو شووراو بەداخەوە موجاهیدین لە سەر رێگای هاتنی ئەوان کۆسپیان ناوە. موجاهیدین تا ئێستا سیاسەتێکی تایبەتی‌یان گرتۆتە پێش تا شوورا هەر وا لە ژێر چەتری پێناسی موجاهیدین‌دا بێ. ئێمە دەمانهەوێ کە شوورا پێناسێکی سەربەخۆ لە موجاهیدینی بۆ دروست بێ تا بتوانێ شەخسییەتو رێکخراوەکانی دیکەش بۆ لای خۆی راکێشێ، چونکە بۆ رووخاندنی رێژیم دەبێ تەواوی رێکخراوو شەخسییەتەکانی موخالیفی ئەو (بێجگە لە سەلتەنەتخوازان) لە یەك ریزدا کۆ بنەوە. دەتوانم بلێم لە حالی حازردا ٩٠٪ی ئێرانی‌یەکان موخالیفی رێژیمی خومەینین. بەلام رووخانی ئەم رێژیمە لە رێگای هەلبژاردنی ئازادەوە ئیمکانی نیە بەلکوو بۆ وەدەست هێنانی

ئامانجێکی ئەوتۆ تەنیا رێگا خەباتی چەکدارانەیە. لەم لاشەوە خەڵکی شارەکان دەستیان بە چەك راناگاو ناتوانن چەکدار بن‌و شووراش ئەوەندە سەرنج راکێش نیە. مەسەلەیەکی دیکە ئەوەیە کە "بنی‌صدر" و دۆستەکانی موجاهیدی هەروا پێ لە سەر ئیسلامی بوونی ئامانجەکانی خۆیان دادەگرن. بە یەقین دەتوانین بڵێین کە زۆربەی ئەندامانی حیزبی دێموکرات موسڵمانن. ئێمە هەموو رۆژێ بەرنامەی رادیۆیی خۆمان بە بڵاوکردنەوەی چەند ئایەت لە قورئان دەست پێ دەکەین. بەڵام هەر لەو کاتەش‌دا حیزبی ئێمە حیزبێکی غەیرە مەزهەبی‌یەو باوەڕی بە جیایی دین لە دەوڵەت هەیە. گرینگی ئەم مەسەلەیە کاتێك روونتر خۆی نیشان دەدا کە سەرنج دەینە ئەوەی لە ئێراندا پەیڕەوانی مەزهەبی شێعەو سوننی‌و ئەوانەی باوەڕیان بە دینەکانی مەسیحی، یەهوودی، زەردەشتی‌و هی‌تر هەیە. هەڵبەت هەر لە سەرەتای کارەوە ئەم گیروگرفتانە لە شووراداهەبوون، بەڵام ئێمە باوەڕمان ئەوە بوو کە وردە وردە لە نێو شووراداڕێك دەکەوین‌و تا رادەیەکیش پێشکەوتنمان بەدەست هێنا. بۆ وێنە شوورا لە سەر سێ مەسەلەی زۆر گرینگ بە تەوافوق گەیشت: یەکێك لەوان بەرنامەی دەوڵەتی کاتی‌یە. بە باوەڕی من ئەم بەرنامەیە دەتوانێ جێگای پەسندی هەموو رێکخراوەکانی دێموکراتیك‌و غەیرە مەزهەبی بێ. دوای ئەو گەلاڵەی ئاشتی نێوان ئێران‌و عێراق‌و گەلاڵەی خودموختاریی کوردستانمان پەسند کرد. پاش رۆیشتنی بەنی‌سەدر لە شوورا رێگای بەرین بوونەوەو پێشکەوتنی شوورا زیاتر ئامادە بووەو دەکرێ ئەو زۆرتر دێموکراتیزە بکرێ. ئێستا دەتوانین بۆ راکێشانی شەخسییەت‌و رێکخراوە سیاسی‌یەکانی دیکە دەرگای شوورا بکەینەوە بەڵام بەداخەوە وادیارە کە موجاهیدین نایانهەوێ لەم بارەیەوە بچنە پێش. بەڵکوو دەیانهەوێ شوورا هەر بەم شێوەیە بێڵنەوە نە وەك دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئەودا لەدەست بدەن. لێرەدایە کە جیاوازیی بیروڕای ئێمە دەست پێ دەکاو لە هەلومەرجێکی ئاوادایە کە ئێمە بە بوونی پێوەندی لەگەڵ رێژیمی کۆماری ئیسلامی تاوانبار دەکەن.

**الصیاد:** ئایا پێوەندی‌تان لەگەڵ رێژیم هەیە؟

**دوکتور قاسملوو:** هیچ پێوەندی‌یەکمان لە نێودا نیە. رێژیم زۆر جار داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئێمە کردوە، لە مانگی گەلاوێژی رابردوودا لە یەکێك لە ناوچە رزگار کراوەکانی کوردستان، چاوپێکەوتنێك لە نێوان ئێمەدا رووی دا. هەیئەتێك لە

لایەن رێژیمەوە بۆ وتووێژ لەگەڵ حیزب هاتبوو. لەم وتووێژانەدا یەکێك لە ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزبی ئێمە بەشداریی هەبوو. بەڵام ئێمە بە کردەوە لەگەڵ ئەوان دانەنیشتین. تەنیا کارێك کە کردمان ئەوە بوو کە شەرتەکانی خۆمان پێ راگەیاندن؛ وتووێژ دەبێ بە رەسمیو بە ئاشکرا بێ، ئێمە بە هیچ شێوەیەك نامانهەوێ هیچ مەسەلەیەك لە گەلی خۆمان بشارینەوە. ئەوان پێشنیاریان کرد کە قورئانی کەریم بە حەکەم قبووڵ بکەینو هەرچی ئەوبڵێ باسی لە سەر بکەین، بەڵام مەسەلە لە روانگەی ئێمەوە ئاوا نەبوو و هیچ مەیلێکمان لە سەر وتووێژ لە چوارچێوەی مەسەلەکانی دینیدا نیە. ئێمە بەرنامەیەکی سیاسیمان هەیە، کە بەپێی ئەو "دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان"مان هێناوەتە گۆڕێ. بۆ ئەم بەرنامەیەو لە پێوەندی لەگەڵ ئەودایە کە حازرین وتووێژ بکەین. ئەو کاتە رامان‌گەیاندو گوتمان تەقەوەستاندن قبووڵ ناکەین لە پێشدا وتووێژ دەکەین، ئەگەر شەرتەکانی ئێمەتان قبووڵ نەکرد، سەرەڕای درێژەدانی شەڕیش دەتوانین لە وتووێژدا بچینە پێش. ئێمە ئاگامان لە نییەتی راستەقینەی ئەوان هەبوو و دەمانزانی بە چ مەبەستێك ئەو پێشنیارەیان کردوە. ئەوان دەیانویست بۆ ماوەیەکی کاتی شەڕی کوردستان راگرن تا بتوانن بەشێکی گەورە لە هێزەکانی ٢٠٠ هەزار نەفەریی جێگیر لە کوردستان بنێرنە بەرەکانی شەڕ لەگەڵ عێراق. ئەوان دەیانویست کوردستان ئارامو بێدەنگ بێ تا بتوانن هێزەکانی جێگیر لە کوردستان لە جێگاکانی دیکە بەکار بێنن.

**الصیاد:** ئایا بیر ناکەنەوە کە لە بناغەدا ئەگەر حازر بن وتووێژ بکەن، ئەمە بە خاڵی لاواز بۆ ئێوە بەحیساب دێ، چونکە لە ئەساسدا رێژیم باوەڕێکی بە وتووێژ نیەو ئەم مەسەلەیەی تەنیا بۆ ئەوە هێناوەتە گۆڕێ کە حیزبی ئێوە لاواز بکا، ئێوە وا لێبکا کە دەست لە بەرگریکردن هەڵگرنو پاشان کە ئێوەی بە تەنیا هێشتەوە هەوڵ بدا بە سەرتاندا زاڵ بێ؟

**دوکتور قاسملوو:** بە بێشك ئامانجی رێژیم هەر ئەوەیە. پاش ئەو چاوپێکەوتنە، رامان گەیاند کە لەگەڵ ئەم رێژیمە ناتوانین بە هیچ نەوعە ئامانجێکی سیاسی بگەین. لەم رووەوە تەنیا رێگایەك کە لە پێشمانە رووخاندنی رێژیم لە رێگای خەباتی چەکدارانەوەیەو ئەم کارە هەتا سەر درێژە دەدەین.

**الصیاد:** ئایا بیر ناکەنەوە کە شووراى نیشتمانیی بەرگری لە داهاتوودا رێگا لەم جۆرە وتووێژانە بگرێ؟

**دوکتور قاسملوو:** گوتم کە بۆ لەنێو بردنی هەر جۆرە شكو گومانێك راگەیاندراوێکمان بلاو کردەوە. موجاهیدین لە مەیان دەویست راگەیەنین کە ئەم وتووێژانە بە هیچ شێوەیەك جیددی نەبوون. ئەم کارەمان کرد. بەلام لێرەدا لەگەڵ گیروگرفتی دیکە رووبەڕووین. ئێمە دەمانگوت هەمیشە مافی ئەوەمان هەیە کە بەپێی قازانجی خۆمان لەگەڵ هەر رێژیمێكدا وتووێژ بکەین. هەڵبەت ئەمە بەو مانایە نیە کە دەمانەوێ هەر ئێستا کارێکی وا بکەین، لە داهاتوودا هەموو کارەکانی خۆمان لەم بارانەوە لەگەڵ شوورا دێنینە گۆڕێ؛ لەگەڵ ئەوان بیرورا دەگۆڕینەوەو نەزەریان لێ وەردەگرین؛ بەلام لە هەر حاڵدا ئەوە بۆخۆمانین کە دەبێ لە سەر وتووێژکردن یا نەکردن بڕیار بدەین، تەنانەت لەگەڵ ئەم رێژیمەش. چونکە هەر وەك بۆ ئەندامانی شووراشم روون کردەوە، حیزبێك کە خەباتێکی ئاوا قورسو پانو بەرینی بەدەستەوەیە جارجار پێویستی بە تەقەوەستاندنێکی کاتیش دەبێ، تا بتوانێ بحەسێتەوە. سەرەڕای ئەوەش جاری وایە مەسەلەی وتووێژ هۆیەکە بۆ لاوازکردنی رێژیم.

**الصیاد:** ئێوە هەر ئێستا گوتتان پاش چاوپێکەوتنی مانگی "ئوت" راتان گەیاندوە کە لەگەڵ رێژیمی ئێران وتووێژ ناکەن مەگەر شەرتەکانی ئێوە قبووڵ بکەن؟

**دوکتور قاسملوو:** راستەو ئێمە هەر وا لە سەر هەڵوێستی خۆمان راوەستاوین. بەلام موجاهیدین هەڵەی دیکەشیان کردوە، گوتیان کە رێژیمی دەسەلاتدار بەسەر ئێراندا وتووێژی لەگەڵ حیزبی دێموکرات رەت کردۆتەوە. ئێوە لە سەر رەوشتی رێژیمی تاران ئاگاداریتان هەیە کە چەند ئیددعای بێبناغە دێننە گۆڕێ. لە کاتێکدا کە رەفسەنجانی رای‌گەیاند هەرگیز لەگەڵ ئێمە وتووێژ ناکەن، من بە مەسئوولییەتەوە رادەگەیەنم کە پاش چاوپێکەوتنی ئێمە لە مانگی "گەلاوێژ"ی رابردوودا زیاتر لە جارێك هاتونو داوای وتووێژ لەگەڵ ئێمەیان کردوە؛ بەلام ئێمە وتووێژمان قبووڵ نەکرد. بۆ یەکەم جارە کە ئەم مەسەلەیە دەدرکێنم، بۆیە ئەوەی کە موجاهیدین دەی‌نووسن بەتەواوی ناڕاستە. ئێمە دەزانین کە رێژیم دەیهەوێ وتووێژ بکا. بەلام هەر لەو کاتەشدا ئاگاداری ئەوەین کە ئەمە لە تاکتیکێك زیاتر نیە، چونکە ئێستا لە

وەزعێکی زۆر دژواردان. ئارام کردنەوەی کوردەکان بە هەر حاڵ بە نەوعێك سەرکەوتن بۆ ڕێژیم بە حیساب دێ. ئێمە لەو مەسەلەیە ئاگادارین، لەبەر ئەوە ئاگاداری خۆمانین کە فریوی ڕێژیم نەخۆین.

**الصیاد:** ئایا لەو باوەڕەدا نین کە ڕێژیم لە بوونی ناکۆکی نێوان ئێوەو شوورا کەڵك وەردەگرێ؟

**دوکتور قاسملوو:** ئامانجی ڕێژیم تێکدانی ریزەکانی یەکگرتووی موخالیفەو دەبێ ئێمە خۆ بپارێزین کە لەو تەڵەیە نەکەوین، بەڵام بەداخەوە موجاهیدین لەو داوە کەوتون.

**الصیاد:** ئەگەر ڕێژیم خودموختاری بۆ کوردستان، بە بێ دێموکراسی لە ئێراندا، قبووڵ بکا، ئایا ئێوە قبووڵی دەکەن؟

**دوکتور قاسملوو:** ئەمە لە فەرزکردنێك زیاتر نیە. فەرز بکەین ڕێژیم بەم شێوەیە ویستی ئێمە قبووڵ بکا. دەبێ بە ئێوە بڵێم کە لە نێوان خودموختاریو دێموکراسیدا پێوەندییەکی لەپسان نەهاتوو هەیە. بۆچی ئێمە دێموکراسیمان بۆ ئێران دەوێ؟ بە دوو هۆ؛ یەکەم ئەوەی کە حیزبی ئێمە ئیمانی بە دێموکراسی هەیەو لە سەر ئەم بناغەیە دامەزراوە، باوەڕی ئێمە ئەوەیە کە بە بێ جێگیرکردنی دێموکراسی لە ئێران هەر مەسەلەیەك کە پێوەندی لەگەڵ ئازادییەکانو مافەکانی ئینسانی لەم وڵاتەدا بێننە گۆڕێ، شتێکی بێکەڵك دەبێ. ئێمە بۆ ئازادی خەبات دەکەین. دووهەم بۆ ئەوەی کە خودموختاری لە درێژخایەندا زەمانەتێکی بۆ بەردەوامبوونی هەبێ. لە کورتخایەندا تەنیا زامنی پاراستنی ئەو چەکی پێشمەرگەکانە، بەڵام لە درێژخایەندا تەنیا زامن بۆ بەردەوامبوونی ئەو، دێموکراسیی واقیعی لە ئێراندایە. هەر کاتێك گەلانی دیکەی ئێران ببنە خاوەنی ئازادییە دێموکراتییەکانو مافەکانی خۆیان، هیچ مەترسییەك هەڕەشە لە کوردستان ناکا. "دێموکراسی بۆ ئێران" مەسەلەیەکی گشتییە. بەڵام خودموختاری بۆ بەشێك لە وڵاتی ئێمە ئێران مەسەلەیەکی تایبەتییە. هەر لەو کاتەدا کە دێموکراسی شوێن لە سەر خودموختاری دادەنێ، خودموختاریش شوێن دەخاتە سەر دێموکراسیو ئەوە واقعییەتێکی حاشا هەڵنەگرە. بەرنامەیەك کە ئامانجی ئێمەیەو لە ڕێگای وەدیهێنانی ئەودا خەبات دەکەین لەراستیدا چوار ئوستانی ئێران دەگرێتەوە. وەدیهاتنی ئەو بەرنامەیە خەتەرێکە بۆ

ڕێژیمی دەسەڵاتدار بەسەر ئێراندا. چونکە ئەوە کە ئێمە توانیومانـــە لـە بەشێك لـە ئێراندا تەمرینی دێموکراسی بکەین بە بێشك شەپۆلەکانی ئەم دێموکراسـی‌یە بـەرەو بەشەکانی دیکەی ئـێران دەکێشـێن. غـەیری ئـەم بەشـە لـە پرسیارەکەتان لەگـەڵ بەشەکانی دیکەی ئەو موافیـق نیـم. قبووڵکردنـی خودموختـاری لـە لایـەن ڕێژیمـی خومەینی‌یەوە بەواتای پاشەکشەیە، خومەینی زۆر جار گوتوویەتی ئەگەر ڕێژیمەکـەی یەك هەنگاو پاشەکشە بکا، دەڕووخێ. جگە لەوەش چۆن دەتوانین بەگەلی کورد بڵێین: ڕێژیم خودموختاریمان دەداتێ (ئەوەی کە ئێمە دەمانهەوێ) بەڵام قبووڵی ناکەین؟ لەم حاڵەتەدا چ هۆیەکمان بۆ شەڕکردن بەدەستەوە دەبێ؟ چەند سەعاتێك لەمەوبەر لەگەڵ ژمارەیەك لە پێشمەرگەکان خوداحافیزیم دەکرد، پێم گوتـن لـەم خەباتـەدا سێ هـۆ بەقازانجی ئێمە کار دەکەن. ئەگەر لەم سێ هۆیە بەشێوەیەکی ئاقڵانە کەڵك وەربگرین هیچ کەس ناتوانێ تێکمان بشکێنێ:

یـەکێکیان پشـتیوانیی گـەل لـە خـەباتی ئێمەیـە. ئـەوەی دیکـە سیاسـەتێکی واقیع‌بینانەیە کە دایم بەسەر ڕێڕەوی سیاسـیی ئێمـەدا دەسـەڵاتی هـەبووەو سـێهەم پێشمەرگەکانمان. هەڵبەت لەم نێوەدا پشتیوانیی گەلەکەمان بناغـەی مەسـەلەکەیەو پێشمەرگەکانیشمان لە دڵی گەل هاتوونەدەر. لـەم ڕووەوە ئەگـەر ڕێژیمـی خومـەینی خودموختاریمان بداتێو گەلەکەمان ڕازی بێ، قبووڵی دەکەین.

**الصیاد:** دەگەڕێینەوە سەر فـەرزەکانو یـەکێك لـەوان دەکەینـە پرسـیار. ئەگـەر ڕێژیمی ئێران، ویستی ئێوە لە بواری خودموختاریو دیموکراسی‌دا وەدی بێنێ، بەڵام لە ئێوەی بوێ کە لە دژی عێراق شەڕ بکەن هەڵوێستی ئێوە چۆن دەبێ؟

**دوکتور قـاسملوو:** یـەکێك لـە لایەنـەکانی جێگـیرکردنی دێموکراسـی لـە ئـێران بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی ئازادە. لەو حاڵەتەدا ئێمە لە دژی شەڕ ڕەئـی دەدەیـن. لـە حاڵی حازردا زۆربەی خەڵکی ئێران دژی شەڕن.

**الصیاد:** لە عێراق دەڵێن: تاڵەبانی درێـژە بـە پێوەندی‌گرتـن لەگـەڵ کوردەکـانی تورکیەو سوریەدا دەداو ئەم مەسەلەیە لەگەڵ هەلومەرجی نێونەتەوەیی ئێستا، کە بە هۆی شەڕەوە بۆ عێراق پێش هاتوە، یەك ناگرێتەوە. نەزەری تۆ لەم بارەوە چیە؟

**دوکتور قاسملوو:** لەو باوەڕەدا نیم کە ئەم مەسەلەیە بناغەیی بێ. ئەمن بە درێژی لە مەسەلەکە ئاگادار نیم، بەڵام دەبێ لەبەر چاو بێ کە پێوەندیی نێـوان کوردەکـانی

ولاتەکان مەسەلەیەکەو دەخالەت لە کاروباری ئەواندا مەسـەلەیەکی دیکـە. پێـم وا نیە تالەبانی هەلوێستێکی ئاوای هەبێ. بۆ وێنـە ئێمـە دەخالـەت لـە مەسـەلەکانی نێوخۆیی تورکیەمان قبوول نیەو مەسەلەی کوردەکان لەو ولاتـەدا بـە مەسـەلەیەکی تەواو پێوەندیدار بە تورکیەوە دەزانینو لەودا دەخالەت ناکەین. ئێمە لـە چوارچێـوەی ئێراندا بۆ خودموختاری خـەبات دەکـەین، نیازیشـمان نیـە لـە ئـێران جیاببینـەوەو "ئێرانی"ن؛ بەلام بێ ئەوەی دەخالەت لە کاروباری نێوخۆی ولاتـەکاندا بکـەین، لـە خەباتی گەلی کورد پشتیوانی دەکەین.

**الصیاد:** ئایا دەولەتێکی سەربەخۆی کوردتان لە داهاتوودا لە نەزردایە؟

**دوکتور قاسملوو:** دەتانهەوێ بلێن داخوا ئێمە تووشی خەیالات بوویـن؟ ئێمـە لـە سیاسەتدا ئەهلی خەیالات نین، بـەلکوو واقیعبینـین. پێشـتر گـوتم: سیاسـەت واتـە هونەری مومکین. ئێمە باوەڕمان بە سیاسەتە نەك بە خەیال. جـاری وایـە کـوردی وا دەبینی کە خەیالی پێکهێنانی دەولەتێکی سەربەخۆ دەکـا. هەلبـەت ئێمـە نـاتوانین پێشی خەونبینینی خەلك بگرین. لە بیرمە کە پێنج سـال لەمەوبـەر چوومـە ئۆسـلۆ (پایتەختی نۆروێژ). لەو کاتەدا هێندێك کوردی تورکیەو سووریە منیان دەعوەت کرد تا وتووێژێکم لەگەلیان هەبێ. کۆبوونەوەو مەجلیسێکی رێکوپێکیان هەبوو. وەختێك چوومە نێویان، دروشمێکم دی بـەم نێوەڕۆکـە: "جێگـیر بـێ کوردسـتانی سـەربەخۆ، یەکگرتوو و سوسیالیست" وەختێك خوێندمەوە لیێـان پرسـیم: "ئایـا ئـەم دروشمـە پەسند دەکەی" گوتم: "بەلێ زۆرم پێ خۆشە". گوتیـان: "ئـەی بۆچـی ئـەم دروشمـە ناکەنە دروشمی حیزبەکـەتان؟" وەلامـم داوە: "ئێـوە ئێسـتا ١٢ نەفـەر دانشـجووی کوردی دانیشتووی ئۆسلۆنو دەتوانن دروشمێکی ئاوا بێننـە گـۆڕێ، ئێمـە تـەنیا ١٢ هەزار پێشمەرگەمان هەیەو توانای هێنانە گۆڕی دروشمێکی ئاوامان نیە!" چەند سـال لەمەوبەریش لەگەل بەنیسەدر قسەم کرد پێی گوتم: "ئێـوە ئێسـتا خودموختاریتـان دەوێ، ڕەنگە نەسلی داهاتوو بەم ویستە ڕازی نەبێو سەربەخۆیی بـوێ" پێـم گـوت: "جەنابی بەنی سەدر! ئایا ئەتۆ خۆت بەرپرسی نەسلی داهاتوو دەکەی؟ ئەمن کە خۆم بە بەرپرسی نەسلی داهاتوو نازانم. ئەمن لە نەسلی خودموختـاریو دیموکراسـیمو بـۆ ئەو خەبات دەکەم. ئەوەی کـە نەسـلی داهـاتوو شـتێکی دیکـەی بـوێ گـیروگرفتی ئێستای من نیە." لە سیاسەتدا دەبێ واقعییەت لە نەزەر بگیرێ. خودموختاری لـە

روانگەی ئێمەوە تاکتیك نیە، مافی دیـاریکردنی چارەنووسە. چونکـە دیـاریکردنی چارەنووس شکڵی جۆراوجۆری هەیە. یەکەمین شکڵی ئــەو سـەربەخۆیی‌یە. هەڵبـەت ناکریٚ بڵێین هەر نەتەوەیەك کە بە سەربەخۆیی گەیشــتوە بـە خۆشـیو بـەختیارییش گەیشتوە؛ لە دنیادا هێندێك نەتەوە هـەن کـە مـافی دیـاریکردنی چارەنووسـیان بـە شێوەی فیدراڵی بەدەست هێناوە. وەك نەتەوەکانی یەکیەتیی سۆڤیەتیو یوگۆسلاڤیو هی واش هەن خوازیاری خودموختارین. شکڵ گرینگ نیە. ئەوەی گرینگە نێورۆکـە. هەر کاتێك گەلی کورد لە ئێراندا بە مافێکی ئەوتۆ گەیشتو لەو راستی‌یە گەیشـت کە ئیدی لە ژێر ستەمدا نیەو ئەوە بۆخۆیەتی لە چارەنووسی خۆیدا دەخاڵـەت دەکـا. بە پێداگرتنەوە دەبیٚ بڵێم کە لە حاڵەتی ئاوادا گرینگ نیە کە ئایا گـەلی کـورد بـە خودموختاری گەیشتوە یان بە سەربەخۆیی. چونکــە هـەردووکیان بـە کـردەوە یـەك نێوەرۆکیان هەیە. بۆچوونی ئێمە لە سەر مەسەلەکان ئاوایە. ئێمە دەبیٚ شــکلێك لـە مافی دیــاریکردنی چـارەنووس هـەلبژێرین کـە لەگـەڵ ویسـتی گەلەکـەماندا یـەك بگرێتەوە. قسەکردن لە سەر یەکگرتوویی کوردستان مەسەلەیەکی ساکار نیــە، هـەر چەند ئەوە مافی نەتەوەی کوردە. باس کردن لە "ماف" شتێکەو گەیشتن بەو شتێکی دیکەیە. چەندین سەدەیە کە بۆ بوونی مافی "تەلاق" بۆ ژنان خەبات دەکەین؛ بــەلاٚم بە هیچ شێوەیەك بەو مانایە نیە کە هەموو ژنەکان (هەر کــە ئـەو مافـەیان دەست کەوت) کەڵکی لیٚ وەردەگرن. لە کوردستاندا رێکخراوێکی سیاسی هەرچەند بچووکتر بیٚ دروشمی دوورەدەستتر دێنێتە گۆڕیٚ. لە لایەکی دیکەوە لە دنیادا ئێستا هێندێـك دەوڵەت هەن کە گەلەکانیان لە برســان دەمـرن، لـە حاڵـەتی ئـاوادا سـەربەخۆیی چ قازانجێکی هەیە؟ ئێمە لە نێو رێکخراوی نەتەوە یــەکگرتووەکاندا نوێنـەرمان هـەبیٚو خاوەنی ئالاٚی خۆشمان بـین، بـەلاٚم نەتەوەیــەکی رۆژەڕەشو هـەژار بـین چ قــازانجێکی هەیە؟ ئەمن پێم باشترە کە نەتەوەیەك تێر بیٚو ئەوەش بزانیٚ کە بەســەر چارەنووسـی خۆیدا دەسەلاٚتی هەیە هەر چەند ئالاٚو نوێنەری لە رێکخراوی نەتــەوە یـەکگرتووەکان نەبیٚ.

**الصیاد:** پێوەندیی ئێوە لەگەڵ عێراق چۆنە؟

**دوکتور قاسملوو:** لەڕاستی‌دا رێژیمی دەسەلاٚتدار بەسەر ئێراندا لە پێشدا شەڕی لـە دژی ئێمە دەست پیٚکرد پاش ئەوە بوو کە شەڕیٚ نێوان ئێرانو عێراق دەستی پیٚکرد.

لە ئێراندا هێندێك ڕێكخراوی سیاسی هەبوون كە بە خۆش خەیاڵی‌یەوە لە دژی عێراق، شان بە شانی هێزەكانی خومەینی چوونە شەڕ. ئێمەش ئێرانیین‌و لەو كاتەدا كوتمان: "حازرین لە سەربەخۆیی‌و سنوورەكانی وڵات دیفاع بكەین، بەڵام بۆ ئەو كارە هێندێك شەرتمان هەیە: ئەگەر دەوڵەت بە بوونی گەلی ئێمە ئیعتراف بكاو خودموختاریمان بداتێ، لەو حاڵەدا بۆ دیفاع لە ئێران دڵخۆشییەكی وامان دەبێ كە ناتوانین لێی لادەین." ئێستا ئێمەو عێراقی‌یەكان بەكردەوە لە خەبات دژی ڕێژیمی خومەینی‌دا كەوتووینە یەك لا. لەو ڕووەوە دەڵێم: كەوتووینە یەك لا كە ئامانجی هەردووكمان یەكەو ئەویش ڕووخاندنی ڕێژیمی خومەینی‌یە. بەڵام دیارە لە زۆر لایەنی دیكەوە پێكەوە جیاوازیمان هەیە. خومەینی لە پێش دەست پێكرانی شەڕ لەگەل عێراق لە دژی ئێمە شەڕی دەست پێكرد. ئەم ئیمكانەش هەیە كە شەڕی نێوان هەر دوو وڵات تەواو بێ، بەڵام ڕێژیمی خومەینی لە دژی ئێمە درێژە بە شەڕ بدا. بە هەر حاڵ، لە حاڵی حازردا عێراق یارمەتیمان دەدا كە هێندێك پێداویستیی خۆمان لە ڕێگای خاكی ئەو وڵاتەوە دابین بكەین‌و سەردڕای ئەوەش لە ڕێگای عێراقەوە یارمەتی‌یەكانی پزیشكی‌و ئینسانی بە ئێمە دەگەن. دوكتورەكانی ئەندامی ڕێكخراوە بەشەردۆستەكانیش هەر لەم ڕێگایەوە دێن.

**الصیاد:** مانای ئەم قسانە ئەوەیە كە ئێوە لە سەر پێوەندیی خۆتان لەگەڵ عێراق دڵنیان. بەڵام ئەگەر شەڕی ئێران‌و عێراق تەواو بێ ئایا دەزانن چ دێتە پێش؟

**دوكتور قاسملوو:** لە سیاسەتدا پێكەوە هاوكاری دەكەن‌و ئەوە لە دڵداری‌دایە كە دڵنیایی‌یان لە یەكتر هەیە. ئێمە سیاسەت دەكەین نەك دڵداری. ئێمە حیزبێكی سەربەخۆین‌و سەربەخۆیی خۆمان لە هەموو شتێكی دیكە خۆشتر دەوێ. ئەوەی بۆخۆمان بە قازانجی بزانین جێبەجێی دەكەین. هیچ كەس ناتوانێ نەزەری خۆی بەسەر ئێمەدا بسەپێنێ‌و تا ئێستاش هیچ كەس نەزەری خۆی بەسەر ئێمەدا نەسەپاندوە. دەلیلێكیشی نیە كە لە داهاتوودا ئێمە بەرەو شەڕ لەگەڵ عێراق بكێشێ. ئێمە لەم بارەوە وەزعێكی تایبەتیمان هەیەو تەنیا حیزبێكین كە ئەو وەزعە تایبەتیەمان هەیە. ئێمە لەگەل عێراق پێوەندی‌یەكی باشمان هەیەو لەگەڵ یەكیەتیی نیشتمانیی كوردستانیش‌دا پێوەندیی دۆستانەمان هەیە. ئەم پێوەندییانەمان نەشاردۆتەوەو هەردووك لاش بەتەواوی لەو پێوەندییانە ئاگادارن‌و هەر لەو كاتەش‌دا هیچ كام لە

لایەنەکان لە ئێمەی نەویستوە کە لە دژی ئەوی دیکە شەڕ بکەین. ئەوەی کە لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا سیاسەتێکی روونت هەبێ، کارێکی دژوارە چونکە لە تەواوی بوارەکاندا لەگەڵ گیروگرفتی زۆر بەرەوڕوو دەبی. بەڵام من لەو باوەڕەدام کە ئێمە تا ئێستا لەو بارەوە سەرکەوتوو بووین. بۆ وێنە هەر کاتێك دوو لایەن لە منیان ویستوە نێوبژێوی بکەم، هەردووك لا هاتوونە لای ئێمە بۆ وتووێژ، بەڵام هەر کاتێك کە کاریان کێشاوەتە شەڕو لێکدان لە جێگایەکی دیکە ئەو کارەیان کردوە.

# وتووویژی گۆڤاری "الیوم السابع" لە گەڵ سکرتێری گشتیی حیزبەکەمان هاوڕێ دوکتور "عبدالرحمان قاسملو"*

لە ڕۆژەکانی ١١ تا ١٣ی مانگی ئوکتوبر (١٩ تا ٢١ی مانگی ڕەزبەر) هاوڕێ دوکتور "عبدالرحمن قاسملو" سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە کۆنگرەی حیزبی سوسیالیستی فەرانسەدا لە شاری "تولوز" وەك مێوان بەشداری کرد. لەو کۆنگرەیەدا هاوڕێ "قاسملوو" چاوی بە زۆر لە کاربەدەستانی حکوومەتی فەرانسەو شەخسییەتە سیاسییەکانی فەرانسەیی و هەروەها هەیئەتی نوێنەرانو وڵاتانو ڕێکخراوە سیاسییەکانی جیهان کە لە کۆنگرەدا بەشدار بوون کەوتو لە سەر وەزعی ئێرانو کوردستانو خەباتی گەلەکەمان وتوویژی لەگەڵ کردن. لەگەڵ نوێنەرانی چەندین ڕۆژنامەو گۆڤاریش وتوویژی هەبوو کە یەکێك لەوان، گۆڤاری "الیوم السابع"ـە سەر بە ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین کە بە زمانی عەرەبی لە پاریس دەردەچێ.

دەقی ئەو وتوویژە لە ژمارەی ٧٨ی گۆڤاری ناوبراو، کە لە ڕێکەوتی ١٩٨٥/١١/٤دا چاپ کراوە بەم جۆرەیە:

---

* ئەم وتوویژە لە ڕۆژنامەی "کوردستان" ژمارەی ١٠٩ لە خەزەڵوەرو سەرماوەزی ١٣٦٤دا بڵاو کراوەتەوە.

## وتوویژ لەگەڵ ڕێبەری کوردستانی ئێران

### قاسملوو: ڕێژیمی خومەینی لە تەنگانەدا

**"وەزعی ئوپۆزیسیونی ئێرانی بە جۆرێك نیە کە بە دڵخواز بێ. بەڵام لە کوردستان بەربەرەکانێ لە گۆڕێ دایە. بە جۆرێك کە بەشێکی پانو بەرین لە کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی ڕێژیمدا نیە."**

"عبدالرحمان قاسملو" سەرۆکی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، یەکێکە لە سیماکانی ئوپۆزیسیونی ئێران. هەواڵنووسی گۆڤاری "الیوم السابع" کە بۆ بەشداری لە کۆنگرەی حیزبی سوسیالیستی فەرانسە لە شاری "تولوز" بانگهێشتن کرابوو ئەو وتوویژەی خوارەوەی لەگەڵ کردوە.

پ: وێدەچێ وەزعی نیزامی لە کوردستاندا پاش ئالوگۆڕی ئەم دواییانە شێوەیەکی ڕاوەستانو بێدەنگی بەخۆیەوە گرتبێ. ئایا هێزی نیزامیی ئێوە کە بۆ ماوەیەك ئەساسی لە فشارنانی ڕێژیم بوو بە حالەتی خۆی ماوەو چوارچێوەی تێکۆشانی ئێوە تەسك نەبۆتەوە؟

و: بە هیچ جۆر. ڕاستە ئێمە هێندێك گیروگرفتمان بۆ هاتۆتە پێش، بەڵام لە توانامان‌دا هەیە لە هەر نوختەیەکی کوردستاندا هێرش بکەین. لێرەدا پێویستە وردبوونەوەو چاوپێداخشانێکی وەزعی جوغرافیای ناوچەکە بکرێ. کوردستان لە باری نیزامییەوە بەکردەوە سێ جۆر ناوچەی هەیە:

یەکەم: ئەو شوێنانەی ڕێژیم بە تەواوی میلیتاریزەی کردونو نێزیکەی دووسەد هەزار کەس لە ئەرتەشیو پاسدارو بەسیجیو جاش لە ٢٥٠٠ پێگەی نیزامیدا جێگر کردوە. دیارە پادگانەکان لە نێو شارەکان دان کە لە ٢٣ شاری کوردستاندا جێگیر بوون، بەڵام دیسان ئەمە بەو مانایە نیە کە شارەکانی کوردستان بە تەواوی کەوتوونەتە ژێر کونترۆڵی ڕێژیم. بەڵکوو لە هەر کاتو ساتێکدا هێزەکانی ئێمە دەتوانن نفووز بکەنە نێو شارەکان. بەڵام زیاتر لە عەمەلییاتی نێو شارەکان خۆدەپارێزن بۆ ئەوەی بیانوو نەکەوێتە دەست ڕێژیم بۆ زیاتر سەرکوت کردنی خەڵکی بێدیفاعی نێو شارەکان.

دووهەم: ئەو ناوچانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدایەو تا ئێستا هێزەکانی ڕێژیم نەیانتوانیوەو ناتوانن نفووزیان تێدا بکەن.

سێهەم: ئەو ناوچانەی کە تێکەڵاون، یانی هێندێك شوێن ئەرتەش‌و پاسداری لێ‌یەو هێندێکیش هێزەکانی ئێمەی لێیە. هێزەکانی ڕێژیم بە ڕۆژ ڕێگا ئەسلییەکان‌و نوختە موهیمەکان دەگرن، بەڵام بە شەو کونترۆڵی لە دەستی پێشمەرگە دایەو هاتوچۆی خۆیانی تێدا دەکەن.

پ: نێزیکەی ساڵێك لەمەو پێش حیزبی دێموکراتی کوردستان لە شووری نیشتمانیی بەرگری چووەدەر، لەو کاتەدا "مسعود رجوی" بەرپرسی شوورای ڕێبەری موجاهیدین ئێوەی تاوانبار کرد بەوە کە لەگەڵ ڕێژیمی خومەینی وتووێژتان هەیە. ئایا وتووێژەکەی ئێوە لەگەڵ ڕێژیم ڕاستە؟ ئەگەر ڕاستە بە کوێ گەیشتووە؟

و: ئێمە بۆ وتووێژ دەست پێشخەر نەبووین. ڕێژیمی ئێران دەیهەویست وتووێژ لەگەڵ ئێمە بکا. ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە بێجگە لە چاوپێکەوتنێك کە چۆنیەتیی شەرتەکانی وتووێژی ئێمە لەگەڵ ڕێژیمی تێدا باس کراوە، هیچی‌تر نەبووە. ئێمە هەر لە هەوەڵێشەوە چاوەڕوان نەبووین ئەو چاوپێکەوتنە هیچ نەتیجەیەکی بێ. چوونکە شەرتە سیاسی‌یەکانی ئێمە ڕوون‌و ئاشکران‌و بە شێوەیەکن کە ئەو ڕێژیمە بە هیچ جۆرێك قبووڵیان ناکا. شەرتەکانی ئێمە بە کورتی لەو دوو خاڵەدا کۆدەبنەوە: دێموکراسی بۆ ئێران‌و خودموختاری بۆ کوردستان. قسەکە لە سەر ئیسلام نیە. ئێمە ڕێز بۆ ئیسلام دادەنێین. بەڵام مەسەلە ئەوەیە کە ئێمە خۆمان بە خاوەن حەق دەزانین‌و داخوازمان هەیە، داخوازە سیاسی، کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییەکانی ئێمەش لەگەڵ فەلسەفەو نێوەڕۆکی ڕێژیمی ئێران یەکتر ناگرنەوەو ئەم ڕێژیمە هیچ شتێك کە بە مەیلی نەبێ قبووڵی ناکا.

پ: ئەگەر پێتان وابوو وتووێژ لەگەڵ ڕێژیم هیچ فایدەیەکی نیە، بۆچی سوور بوون ئەو پێوەندی گرتنە لەگەڵ ڕێژیم کە بوو بەهۆی ئەوە ئۆپووزیسیونی ئێرانی تووشی قەیران بکەن؟

و: ئێمە بە خەڵکی دیکە ئیجازە نادەین دەستمان ببەستن. کێشە لە سەر وتووێژ نیە. ئێمە دەمانهەوێ لە سەر مافی سەربەخۆ بڕیاردانی خۆمان بەرامبەر بە شوورا پێ دابگرین. ئازاد بوون بۆ وتووێژ بەو مانایە نەك بە مانای پاشەکشە یان بە مانای ژێر باری هیچ کەسێك. بەڵگەش بۆ ئەوە قبووڵ نەکردنی داواکانی ڕێژیمە. لێرەدا دەتوانم بڵێم‌و ڕابگەیەنم کە ئێمە هەوەڵێن کەس بووین لە بەربەرەکانێ لەگەڵ

ڕێژیمی خومەینیدا لەو باوەڕەدام لە داهاتووشدا ئاخرین کەس دەبین کە بەربەرەکانێ خۆمان لەگەڵ ڕێژیمی خومەینی هەردەمێنێ. کەوابوو بۆچوونی شووڕای نیشتیمانیی بەرگریو کێشەی سەرۆکی ئەو شوورایە "مسعود رجوی" لەگەڵ ئەسڵی سەربەخۆ بڕیاردانی ئێمە ناتەبایی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا موجاهیدین بە بەشێك لە هێزی ئوپۆزیسیونی ئێرانی دادەنێین. کە دەکرێ هاوکارییان لەگەڵ بکەین، بە شەرتێك کە ئەوانیش سەربەخۆیی ئێمە قبوول بکەن. بەڕاشکاوی دەڵێینو با لە کەسیش شاراوە نەبێ کە ئێمە لە حاڵی حازردا بەهێزترین ڕێکخراوین لە نێو تەواوی ئوپۆزیسیونی ئێراندا. هەروەها لەگەڵ ئەوەی حیزبێکی ناوچەیین، بەڵام بەکردەوە گەورەترین هێزێکین کە لە بەرامبەر ڕێژیم دا ڕاوەستاوین، با ئەوەش بڵێین سەرەڕای ئەوە کە زۆربەی خەڵك لە ئێراندا ئەم ڕێژیمەی قبوول نیە. بەڵام لە حاڵی حازردا هیچ بەربەرەکانێیەکی نیزامی بەکردەوە دژی ڕێژیم بێجگە لە کوردستان نیە. ئاشکرایە کە ئەمڕۆ ڕێژیم لە باری سیاسییەوە بە تەواوی تەریك کەوتۆتەوە. کەوابوو وەختی ئەوە هاتووە کە ئوپۆزیسیۆنی ئێرانی یەك بگرێو لە چوارچێوەیەکی بەرینترو عادلانەتر لە پێشوو کۆبێتەوە. ئەو یەکگرتنە دێموکراتییە لە حاڵی حازردا پێویستە هەموو ئوپۆزیسیۆنی ئێرانی لە بەرامبەر ڕێژیمی خومەینیدا پێکی بێنێ، دەبێ ئەم شوعارە سەرەکییەی ئێمە، "دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان"ی قبوول بێ کە ئەوە خۆی هەنگاوێکە بۆ ڕەت کردنەوەی ئوپۆزیسیۆنی سەر بە ڕێژیمی پاشایەتی.

پ: ئایا ئەم نەزەرەی ئێوە "شاهپور بختيار" سەرۆك وەزیری پێشووی ئێران جیا دەکاتەوە؟

و: ئەوە پێوەندیی بە خۆیەوە هەیە. ئەگەر بە ئاشکرا واز لە شاپەرستەکان بێنێ، مومکینە هاوکاریی لەگەڵ پێك بێ.

پ: بێجگە لە چوونەدەری ئێوە لە شووڕای نیشتیمانیی بەرگریدا گیروگرفتی دیکەش بووە. ئەویش کێشەی نێوان "مسعود رجوی" و "بنیصدر"ە. "مسعود رجوی" بوختانو تومەت هەم بۆ "بنیصدر" و هەم بۆ ئێوە هەڵدەبەستێ پێوەندیی ئێوە بە "بنیصدر"ەوە لە چ پلەیەك دایە؟

و: ئەمڕۆ هیچ پێوەندییەك لە نێوان ئێمەو "بنیصدر"دا نیە.

پ: شارەزایانی مەسایلی سیاسی پێیان وایە کە حکوومەتی ئێران هیچ سەرکەوتن و پێشکەوتنێك لەشەڕ لەگەڵ عێراقدا ناتوانێ وەدەست بێنێ. پێتان وایە چارەنووسی ڕێژیمی خومەینی تا چ ئەندازە بە شەڕی خەلیجەوە بەستراوتەوە؟

و: تا رادەیەکی زۆر ڕێژیمی خومەینی تووشی بنبەستێکی گەورەی نیزامی بووە. دەیهەوێ درێژە بەشەڕ بدا، لە درێژەدانی شەڕیشدا پێویستە سەرکەوتن وەدەست بێنێ ـ با سەرکەوتنێکی بچووکیش بێ ـ بەلاّم تا ئێستا سەرکەوتنی وەدەست نەهێناوە، چونکە توانای کۆکردنەوەو راکێشانی خەڵکی بۆ بەرەکانی شەڕ لە دەست داوە. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئەم مەسەلەیە پاڵی بە ڕێژیمەوە نەناوە بەرەو ئاشتی. چونکە ملڕاکێشان بۆ ئاشتی لەگەڵ فەلسەفەی ناردنەدەرەوەی بەناو شۆڕشی ئیسلامی یەك ناگرنەوە. من مادام خومەینی مابێ لەو ڕێژیمە بە دوور دەزانم کە مل بۆ ئاشتی رابکێشێ، چونکە ئاشتی ئاسۆیەك دەردەخا کە خومەینی و ڕێژیمەکەی لێی دەترسن. وەزعی ئابووریی ڕێژیم پاش لێدرانی جەزیرەی خارك بە توندی بەرەو شپرزەیی دەڕوا. وەزعی سیاسیش هەر لەو پێوەندییەدا دەگۆڕێ. لەگەڵ ئەوەشدا راستییەکەی ئەوەیە کە من هیچ هێزێکی سەرانسەری لە ئێراندا نابینم کە بتوانێ ئەو ڕێژیمە تێکەوە پێچێ. ئەگەر لە سەرتاسەری ئێراندا سێ شوێنی دیکە وەك کوردستان بووبا، وەزعەکە زۆر دەگۆڕا. بەلاّم بەداخەوە ئێمە لە بەربەرەکانێی نیزامیدا لەگەڵ ڕێژیم تەنیاین.

پ: لە بارەی مەسەلەی کوردەوە لە نێو کاربەدەستانی حکوومەتدا هیچ فەرقێك دەبینی؟

و: "هاشمی رفسنجانی" لە چەندین کاناڵی جۆربەجۆردا هەوڵیدا پێوەندیمان لەگەڵ بگرێ. بەلاّم ئێمە رامانگەیاند کە دەبێ وتووێژکە رەسمی بێ. جا لە لایەن نوێنەری حکوومەتەوە بێ یا نوێنەری خودی خومەینی. دیسان دووپاتی دەکەینەوەو شکێکیشمان لەوەدا نیە کە ڕێژیمی خومەینی بە هیچ جۆر مل بۆ ئەو ئامانجەی ئێمە: دێموکراسی و خودموختاری راناکێشێ.

پ: ئێوە دەڵێن کوردستان تەنیا ناوچەی بەربەرەکانێیە. بەلاّم وادیارە ئوپۆزیسیۆنی کورد وەك ئوپۆزیسیۆنی ئێرانی لەنێو خۆیدا تووشی گیروگرفتو

دووبەرەکی بووە. لەم دواییانەدا، چەند تێکهەڵچوونی چەکدارانە لە نێوان حیزبی دێموکرات و کۆمەڵەی چەپی‌دا رووی داوە؟

و: بەڵێ، بەداخەوە چەندین تێکهەڵچوون لەگەڵ کۆمەڵە رووی داوە. بەڵام بە مانای دووبەرەکی نیە. ئێمە نوێنەری زۆربەی نیزیك بە تەواوی گەلی کورد لە کوردستانی ئێرانین. ئەوەی راستیە لە سیاسەتی کۆمەڵە ناگەم. ئەوان دەیانهەوێ ئەوە بە سەر ئێمەدا بسەپێنن کە شەڕ لەگەڵ بورژوازی دەکەن لە کوردستاندا. بەڵام خۆ ئێمە بورژوازی نین. ئێمە جووڵانەوەی رزگاریخوازیی کوردستانی ئێران رێبەری دەکەین. هیچشمان لە کۆمەڵە ناوێ بێجگە لەوە ئەو بسەلمێنێ کە حیزبی دێموکراتی کوردستان، جووڵانەوەیەکی شۆڕشگێرانەیە. ئەوەش لەبەر ئەوە نیە کە پێویستیمان بە سەلماندنی کۆمەڵە هەبێ لەو بارەوە، بەڵکوو بە خاتری داهاتووی کوردستانە.

پ: ....

و: .....

پ: لەو باوەڕەدان کە تورکیە رۆژێك لە رۆژان دەخاڵەت لە کوردستانی ئێراندا بکا؟

و: سیاسەتی دوژمنانەی حکوومەتی تورکیە لەگەڵ گەلی کورد ئاشکرایە. بەڵام ئەم سیاسەتەش چوارچێوەیەکی دیاریکراوی هەیە. من ئەو جۆرە دەخاڵەتەی بە دوور دەزانم و زۆر دەلیل هەیە کە تورکەکان لەو کارە دەگێڕێتەوە.

یەکەم: ئێمە خاوەنی دەسەڵاتێکی بەهێزین لە کوردستاندا، بەتایبەتی لە ناوچەی شیمال لە سنووری ئێران و تورکیەدا. کەوابوو هەرواش هاسان نیە رێژیمی تورکیە بتوانێ لەگەڵ هێزەکانی ئێمە رووبەڕوو بێ.

دووهەم: رێژیمی تارانیش ئەو دەخاڵەتەی قبووڵ ناکا. پاشانیش دەبێ ئەوەمان لە بیر بێ کە سنووری ئێران و تورکیە لە یەکیەتیی سۆڤیەتی نێزیکە. هەر جۆرە دەخاڵەتێکی ئەوتۆ مەترسی بەدواوە دەبێ بۆ یەکیەتیی سۆڤیەت، بەتایبەتی لە لایەن دەوڵەتێك کە ئەندامی پەیمانی ناتۆیە. بە پێی بەندی شەشەمی رێککەوتننامەی سۆڤیەتی و ئێران کە لە ساڵی ١٩٢١دا بەستراوە یەکیەتیی سۆڤیەتی حەقی دەخاڵەتی هەیە لە بەرامبەر هەر دەست درێژی‌یەك بۆ سەر ئێران کە مەترسی بۆ سنووری هەر

دوو لای لیٚ بکریٚ. ئەو ریٚککەوتننامەیە لە نەزەر یەکیەتیی سۆڤیەتییەوە تا ئیٚستا هەر لە جیٚگای خۆی ماوە.

# وتووێژی "عاطفه گرگین" لەگەڵ دوکتور قاسملوو
# لە پاییزی ١٣٦٥دا*

پ: باشە بەڕێز قاسملوو لە کوێوە دەست پێ بکەین؟
و: لە هەر کوێوە تۆ مەیلت لێ بێت، فەرموو.
پ: وا باشترە لە کوردستانەوە دەست پێ بکەین. فەرموون بڵێن ئاکامی شەڕی حەوت ساڵەی ئێوە لەگەڵ ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیی ئێران تا ئێستا بە کوێ گەیشتووە؟

و: هەر وەك دەزانی ڕاست حەوت ساڵە کوردستان لە بەرامبەر هێرشی نامرۆڤانەی ڕێژیمی خومەینیدا بەربەرکانێ دەکا، لە ماوەی ئەم حەوت ساڵەدا چەندین قوناغی جۆراوجۆرمان تێپەڕ کردوە، بەڵام گرینگ ئەوەیە کە خەڵکی کوردستان ئاڵای شۆڕش و تێکۆشانیان لە کوردستانی ئێراندا هەروا شەکاوە ڕاگرتووەو بەخۆشییەوە ڕێژیمی خومەینی سەرەڕای هەوڵو تێکۆشانێکی لە ڕادەبەدەر نەیتوانیوە خۆڕاگریی کوردستان تێك بشکێنێ. لە لایەکی دیکەوە کوردستان بە تەنیایەو ڕێژیم توانیویەتی بەشێکی زۆری هێزی چەکداری خۆی لەوێ کۆ بکاتەوە. کاتێك ڕێژیمی خومەینی لە ساڵی ١٣٥٨ بۆ یەکەم جار شەڕی دژی خەڵکی کوردستان دەست پێکرد، لەڕاستیدا هەموو کوردستان و هەروەها شارەکان لە ژێر کونترۆڵی پێشمەرگەکاندا بوو، دوای

* "فصلی در گل سرخ" لاپەڕەی ٢٢ تا ٥٤

راگەیاندنی جیهاد لە لایەن خومەینییەوە لە گەلاوێژی ١٣٥٨ لە شەڕی ٣مانگەی یەکەمدا، ڕێژیم شکستی خواردو پێشمەرگەکان دیسان هاتنەوە نێو شارەکان. لە نەورۆزی ١٣٥٩دا ڕێژیم شەڕێکی دیکەی دەست پێکرد کە تا ئەمڕۆ بەردەوامە. ئێمە بەهۆی باری ئابووری‌و نیزامییەوە ناچار بووین شارەکان بەجێ بهێڵین، بۆ ئەوەی هەر کات لە نێو شاردا تێکهەڵچوونی نیزامی پێکدەهات، ڕێژیم بەهۆی پادگانەکانی نێو شارو دەورووبەری شارەوە خەڵکی بێدەسەڵاتی قەتڵ‌و عام دەکرد. لە لایەکی دیکەوە شارەکان لە گەمارۆی تەواوی ئابووریدا بوون، ڕێژیم نەیدەهێشت خواردەمەنی‌و سووتەمەنی‌و تەنانەت دەرمانیش بێتە نێو کوردستان. ئێستا ئێمە لە شاخەکانی کوردستاندا جێگیرین. ڕێژیم هێزێکی زۆری بە کار دەهێنا تا بە تەواوی بە سەر کوردستاندا زاڵ بێ، بە پێی ئەو زانیارییانەی لە بەردەست دایە، نزیکەی ٢٠٠٠٠٠ سەرباز، پاسدار، بەسیجی‌و جاش ـ واتە ئەو کوردانەی کە لەگەڵ ڕێژیم هاوکاری دەکەن کە بە خۆشییەوە بەرە بەرە ڕادەیان کەم دەبێتەوە ـ لە کوردستاندا جێگیر بوون. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ڕێژیم نە توانای دەست بەسەرداگرتنی تەواوەتی کوردستانی هەیەو نە دەشتوانێ چاودێری بکا. ئێستا لە کوردستان دەتوانین سێ جۆر مەنتەقە دیاری بکەین:

مەنتەقەی یەکەم ئەو شوێنانەی کە گرینگ‌و ئیستراتژیکن وەك شارەکان‌و هێندێك شوێنی‌تر کە لە ڕوانگەی شەڕەوە دژی خەڵکی کوردستان‌و هەروەها لە ڕوانگەی شەڕ دژی عێراق بۆ ڕێژیم دایە. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا کۆماری ئیسلامی بە تەواوی دەسەڵاتی لەم شوێنانەدا نیە، ئەزموونی ئێمە ئەوەیە هەرکات پێشمەرگە بیهەوێ دەتوانێ بچێتە نێو شارەکان، بەلام ئەم کارە کەمتر دەکرێ، بۆ ئەوەی هەروەها کە باسم کرد هەر کات تێکهەڵچوونی نیزامی لە شارەکاندا پێکدەهات، ڕێژیم خەڵکی بێدەسەڵاتی دەکردە نیشانە، بەلام هێزی پێشمەرگە جاروبار بۆ پارێزگاری لە خەڵك‌و پاراستنی وردی خۆراگریی ئەو خەڵکەو هەروەها بۆ زەبر وەشاندن لە بنکە نیزامییەکانی ڕێژیم دزەیان دەکردە نێو شارەکان. بۆ نموونە لە ماوەی ٢ مانگی ڕابردوودا توانییان بچنە نێو شارەکانی شنۆو کامیاران‌و عەمەلیاتێکی زۆر سەرکەوتوانەیان بەجێ گەیاند.

مەنتەقەی دووهەم، ئەو مەنتەقانەن کە ئێمە پێیان دەڵێین مەنتەقەی تێکەڵاو، لەو شوێنانە ڕێژیم لە سەعاتی ٨ی بەیانی تا ٥ی پاش نیوەڕۆ ڕێگاکان دەخاتە ژێر چاوەدێریی بۆ هێنانو بردنی نەفەراتو کەرەسەی نیزامی، سەرانسەری جادەکان بەهۆی بەکارهێنانی نیگابان دەخاتە ژێر چاوەدێریی خۆی، زۆرجاران نیگابانو پارێزەری ڕێگاکان (تأمین جادە) کەوتوونەتە بەر هێرشی پێشمەرگەو زەبری قورسیان وێ کەوتوە، بەڵام لە سەعاتی ٥ی نیوەڕۆ تا ٨ی بەیانی کە هێزەکانی ڕێژیم دەچوونەوە نێو موڵگەکانی خۆیان دیسان ئەم شوێنانە دەکەوێتە ژێر چاوەدێریی هێزی پێشمەرگە، لەم شوێنانەدا هاتوچووی پێشمەرگە کارێکی بەزەحمەت نەبوو، لەوە کەڕێین کە زۆربەی نەفەراتی ئەو موڵگانەی کە لە کوردستاندان بە پێی وتەی بەناوبانگ هەڵسوکەوتیان دەکرد، واتە سەیریان دەکردن، بەڵام نەیان دەبینی. مەبەست ئەوەیە کە لە هاتوچووی پێشمەرگەکان ئاگادار بوون، بەڵام بۆ پاراستنی گیانی خۆیان ئەو ڕاستیەیان قبووڵ کردبوو، ئەگەر پێشمەرگەکان هێرش نەبەنە سەر موڵگەکانیان، ئەوە ئەوانیش کاریان بە هاتووچۆی پێشمەرگەکانەوە نەبێو لەوانەیە بە تەنیا ٥٪ی ئەو موڵگانەی ڕێژیم کە خاوەنی بایەخی ئیستراتیژیکنو پاسدارە "حزب اللهی"یەکان فەرماندەهیو سەرپەرستییان دەکرد، کە هێندێك جار تەقە لە پێشمەرگەکان دەکەن پێشمەرگەکانیش وەڵامی بەرامبەر بە تەقەکانیان دەدەنەوە. مەبەست ئەوەیە کە بوونی سێ هەزار پایگای (موڵگەی) ڕێژیم لە هیچ بارێکەوە توانای نەبووە، پێش بە هاتوچووی پێشمەرگەکان بگرێ.

مەنتەقەی سێهەم بە تەواوی لە ژێر چاوەدێریی هێزی پێشمەرگە دایەو زۆرتر لە قەراخی سنوورەکاندا لە باشووری کوردستان لە سنووری عێراق تا باکوور لە سنووری تورکیە درێژە دەکێشێ. لە زۆربەی ئەم مەنتەقانەدا هێزی پێشمەرگە بە دەسەڵاتی تەواو جێگیرن. بۆ نموونە شاری نەوسوود لە سەرەتای شەڕەوە تا ئێستا لە دەست پێشمەرگە دایە، ڕێژیم لەگەڵ ئەوەی لەم دواییانەدا هێرشێکی بەربڵاوی بۆ گرتنەوەی نەوسوود دەست پێکرد، بەڵام هیچ سەرکەوتنێکی وەدەست نەهێنا.

بەگشتی وەزعی سیاسیی ڕێژیم لە کوردستاندا بۆ بەڕێوەبەرانی جێی ناهومێدییەو ئێستاش دوای حەوت ساڵ کۆماری ئیسلامی نەیتوانیوە چووکترین جێ‌پێ‌یەك لە نێو خەڵکی کوردستاندا بۆ خۆی بکاتەوە. لەم ناوچەدا خەڵکی شارەکان

بەگشتی لە نوێژی هەینی کە ڕێژیم پێکی دەهێنێ کەمتر بەشداری دەکەنو خۆدەبوێرن. تەنانەت کەسایەتی‌یەکی کورد نابیندرێ کە هاوکاری لەگەڵ ڕێژیم بکا. هێندێك لە پیاوە ئایینی‌یەکانی پێشتر پێیان وابوو کە دەتوانن لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەی کە خۆی بە ئیسلام دەزانێ هاوکاری بکەن، ئێستا بەو ئاکامە گەیشتوون کە هاوکاری لەگەڵ دەسەڵاتی ئاخوندی‌دا بە هیچ قیمەتێك مسۆگەر نیە. بە تەنیا ژمارەیەکی کەم مەلای پلەی دوو و سێی کوردستان نەبێ کە بە ناوی پێش‌نوێژی ڕۆژی هەینی (امام جمعه) دیاری کراون، بەڕواڵەت لەگەڵ ڕێژیم پێك‌هاتوون، بەڵام ئەم کەسانەیش لە هەوڵۆ تەقەلای ئەوەدان کە لە ڕێگەی جۆراوجۆرەوە بە پێشمەرگەکان بڵێن کە ئەوان لە رووی ناچاریو زۆرەوە بەناو لەگەڵ ڕێژیمن بەم شێوەیە هیچ دەستەو تاقمێکی سیاسیو کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا نادۆزینەوە کە لەگەڵ ڕێژیم هاوکاری بکا. لە ژێر شوێندانانو نفووزی هێندێك لە سەرۆك عەشیرەکان، لە سەرەتای شەڕەوە تاقمێك بە ناوی جاش دژی گەلی کورد، هاوکاریی ڕێژیمیان دەکرد کە بە خۆشییەوە ڕادەی ئەو جۆرە کەسانە ڕۆژبەڕۆژ کەم دەبنەوە، لە بەشی باکوورو ناوەندی کوردستان ڕادەی ئەو جۆرە کەسانە زۆر کەم بوونەتەوە لە باشووری کوردستان کە نزیکی ٢٠ تا ٢٥٪ی خەڵکی شیعەن هەر لە سەرەتای شەڕەوە ڕێژیم لە هەوڵدا بووە لە هەستی ئایینی ئەوان کەڵك وەرگرێو دەبێ ئەو ڕاستی‌یە قبووڵ بکەین کە تا ڕادەیەك لەو بارەوە ڕێژیم سەرکەوتنی وەدەست هێناوە، بەڵام هەر ئێستا ئەوانیش وەك زۆربەی خەڵکی ئێران نێوەرۆکی ڕێژیمیان بۆ دەرکەوتووەو روویان لە کۆماری ئیسلامی وەرگێڕاوەتەوە، بەم شێوەیە ڕێژیم لە باری سیاسی‌یەوە بە تەواوی لە کوردستاندا تەریك ماوەتەوە. پاش بە کوشتدانی چل هەزار کەسو حەوت ساڵ شەڕ پێگەیەکی خەڵکیی بەدەست نەهێناوە، نە چووکە، نە گەورە.

پ: چ داهاتوویەك بەدی دەکەی بۆ گەلی کورد؟

و: داهاتووی گەلی کورد بە جیاواز لە داهاتووی گەلانی ئێران نازانین، داهاتووی گەلی کورد بەستراوەیە بە لەبەین چوونی کۆماری ئیسلامی‌یەوە. لە سەرەتای شەڕی سێ مانگەدا کاتێك تازە چووبووینە کوێستانەکان هاوڕێیانی حیزبی لە منیان دەپرسی مانەوەو تێکۆشانی ئێمە لە شاخدا چەندە دەخایەنێ، لە وڵامدا پێم وتن بیستو پێنج ساڵ، ئەو کاتە وڵامەکەی من هێندێك بە گاڵتەیان بە حیساب دەهێنا،

ئێستا حەوت ساڵی تەواو لەو پرسیارە تێدەپەرێ، ئێستاش ئەگەر ئـەو پرسـیارەم لێ بکەنەوە ناڵێم هەژدە ساڵی دیکە من ئێستا لەوە پێشتر گەشبینترم. بـۆ ئـەوەی کـە پێشمەرگەکانو خەڵکی کوردسـتان نیشـانیان داوە کـە چـەندە خۆڕاگـرنو سـەردڕای هەلومەرجی سەختی ئابووریو زەختـی نـیزامی تـا چ رادەیـەك ئامـادەن فیداکـاری بکەنو یاریدەری شۆڕش بـن. هـەر ئـەم فیداکـاریو لـە خۆبردووییـە کـە پووچـەڵ کـەرەوەی هێرشـەکانی سیاسـی، نـیزامی تەنانـەت هێرشـی رۆحـی رێژیمـە. ئێمـە داهاتوویەکی درەوشاوەمان لە پێش دایە، خاوەنی ئەم داهاتووە گەشە هەموو گەلانی ئێرانن، بۆ ئەوەی هەر ئێستا کاتی چوونە سەری ئاستی شۆڕش دەستی پـێکردوە کـە مزگێنیدەری کۆتایی هاتنی قوناغێکی تاڵو تراژیکمان پێ دەبەخشێ.

پ: ئێوە ئێستا لە قۆنـاغی شـەڕی (جبهـەای)یـەوە ڕووتـان لـە شـێوەی شـەڕی پارتیزانی کردوە، داخوا پێشمەرگەکان توانیبێتیان خۆیان عادەت دابێت بە تـاکتیکی شەڕی پارتیزانی؟

و: لە کۆنگرەی شەشەمی حیزبدا کە سێ ساڵ پێش بەسـترا، دوای کۆکردنـەوەی ئەزموونەکانی پێشوو، بەو ئاکامە گەیشـتین کـە بوونـی ۲۰۰ هـەزار کـەس هـێزی چەکداری رێژیم لە کوردستاندا بە لەبەرچاوگرتنی ئیماکانـاتی بـەربلاو کـە هەیانـە، ئێمە ناتوانین بە ۱۲ هەزار پێشمەرگەو ئیمکانـاتێکی کـەم لـە شـەڕی (جبهـەای)دا بەردەوام بین، هەر بەم هۆیەوە بڕیارماندا تاکتیکی شەڕو کاری نیزامیمـان بگۆڕیـن. ئێوە دەزانن کە هەر ئاڵوگۆڕێك، کەموکووڕی لە رێی دایەو سەختیی خۆی هەیـە، لـە چوونە پێشی ئەم ئـاڵوگۆڕەدا هێندێـك جـار تووشـی زەرەرو زیـانو زەبـر وێکـەوتن هاتووین، بەڵام بە هەوڵو تێکۆشانێکی زۆر توانیمان پرۆسەی ئاڵوگۆڕەکە کۆتایی پـێ بهێنین.

ئێستا پێشمەرگەکانی ئێمە ئوسووڵی شەڕی پارتیزانییان قبووڵەو فـێریش بـوون، ئەو شەڕانەی کە لە بەهاری رابردوودا دەستی پێکرد، ئەوە نیشان ئەدەن کـە دوژمـن زیاتر لە جاران زەبری وێدەکەوێ، بەپێچەوانـەیش ئێمـە باشـتر دەتوانـین هێزەکانمـان بپارێزین، لە لایەکی دیکەوە وردەی هێزەکانی رێژیم کز بووە، نەك وەك جاران ئیمانیان بە خەتی ئیمام ماوەو، نە ئامادەن کە شەهید بن. پێشتر لە ئێستا هێزەکانی رێژیم تا ئاخر گوللە شەڕیان دەکرد، بەڵام ئێستا خێرا خۆ بەدەستەوە ئەدەن، هەر لەم راسـتادا

پێشمەرگەکان دەتوانن لە ماوەی چەند کاتژمێردا بە دانی کەمترین زەرەرو زیان دەست بە سەر مولگەیەکی ١٠٠ ـ ١٥٠ کەسی‌دا بگرن.

پ: سیاسەتی ئابووری‌و نیزامیی کۆماری ئیسلامیی ئێران لە کوردستاندا چۆن هەڵدەسەنگێنن، داخوا ڕێژیمی ئێران لەم مەنتەقەدا دەستی بە ئامانجەکانی خۆی گەیشتوە؟

و: ئامانجی بنەڕەتیی ڕێژیم بریتی‌یە لە سەرکوتی جووڵانەوەی گەلی کورد، بەڵام زۆربەی دەسەڵاتدارانی ڕێژیم بەو ئاکامە گەیشتوون کە گەیشتن بەو ئامانجەیان بۆ جێبەجێ نابێت، ڕێژیم بە گشتی لە باری سیاسی‌یەوە لە کوردستاندا شکستی خواردوە، لە باری ئابوورییشەوە نەیتوانیوە ئێمە بخاتە ژێر گوشار، بە دوو هۆ: یەکیان ئەوەیە کە کوردستان لە باری کشتوکاڵەوە، پێویستی بە دەرەوەی کوردستان نیە، واتە (خودکفا)یە بەزۆریش بەشێك بووە کە بەروبوومی کشتوکاڵی ناردۆتە باقی شوێنەکانی دیکەی ئێران. دووهەم: ئەوە کە کوردستان کەوتۆتە سنووری دوو وڵاتی عێراق‌و تورکیەوە کە لە کوردستاندا زۆر کەلوپەلْ بە شێوەی قاچاخ دەتوانی بە ئاسانی بەدەست بێنی کە بەدەستهێنانیان لە بەشەکانی تری ئێران لە باری ئابووری‌یەوە لە قەیران دایەو زۆربەی کەلوپەلە پێویستەکانی یا بە زەحمەت بە دەست دێت یا زۆربەی خەڵك توانای کڕینیان نیە.

پ: ئەوە ڕاستە کە کوردستان لە لایەن جمهووریی ئیسلامییەوە بە تەواوی میلیتاریزە کراوەو نزیك بە ٣هەزار مۆڵگەی جێگیر کردوە؟

و: بەڵی هەروەهایە کە دەیڵێی، لە ڕاستی‌دا هیچ ناوچەیەکی دیکە غەیری باشوور کە لە سنووری عێراق نێزیکەو بە ناوچەیەکی شەڕی تەواو دێتە ژمار وەك کوردستان میلیتاریزە نەکراوە، ئەڵبەتە کوردستان زەمانی شایش هەر میلیتاریزە بووە، بەڵام ئێستا بە وتەی رادیۆ تاران ٣هەزار مۆڵگەی نیزامی لە کوردستاندا هەیە. لەم مۆڵگانەدا نێونجی ٥٠ تا ٦٠ کەس چەکداری ڕێژیمی تێدا جێگیرەو وا دێتە بەرچاو کە هێزەکانی لەم مۆڵگانەدا کەم دەکاتەوە، بەڵام دەستی لە مۆڵگەکان نەداوە، واتە وەك خۆیان ماون. بۆ ئەوەی لە بەرەکانی شەڕی عێراق‌و ئێراندا پێویستیی بە هێزی ئینسانییە. بەڵام بەهۆی ئەوەی کە زەبری زۆری وێ کەوتوە لە لایەن پێشمەرگەکانەوە دیسان لە فیکری ئەوە دایە کە مۆڵگەکانی لە کوردستاندا پڕهێزتر بکاتەوە.

پ: بەم وەزعەوە ئەبێ شەڕکردنی پێشمەرگەکان زۆر سەختتر بوو بێت، چونکە زەبری پێشمەرگەکان لە هێزی داگیرکەر توندو تیژترو کار تێکردنیان زیاترە؟

و: هێزی رێژیم لە سەرەتای شەڕدا خاوەن ورەیەکی باش بوون، بەڵام ئێستا کەیتەوە ورە بەهێزەیان نەماوە، لە لایەکی‌ترەوە پێشمەرگەکان پاش حەوت ساڵ شەڕ فێری ئوسووڵی شەڕی پارتیزانی بوونەو خۆیان باشتر رێك خستووە. (سازماندهی)پێشتر پێشمەرگەکان هەموو جۆرە رێك خستنێکیان رەت دەکردەوە، بۆ ئەوەی ئەوەیان بە سیاسەتی زاڵمانەی دەوڵەتی ناوەندی دەزانی. ماوەیەکی زۆری کێشا تا ئێمە بتوانین لە باری نیزامییەوە بەو جۆرەی پێویست بوو پێشمەرگەکان رێك بخەین. لەوانەیە ئێستا رادەی پێشمەرگەکان لە چاو پێنج ساڵ پێش هەندێ کەمتر بێت. بەڵام لە باری چۆنیەتی‌و لێهاتوویی‌و دەست پێڕاگەیشتن بە فنوونی شەڕو هەروەها چوونەسەری ئاستی سیاسی‌و فکریی ئەوان، پێشمەرگەکانی ئەمڕۆی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە چاو چوار پێنج ساڵی پێشتر هەڵناسەنگێندرێن. ئەمە هۆیەکی بنەرەتیی سەرکەوتنی پێشمەرگەکانە، هۆیەکی بنەرەتیی دیکە پشتیوانی کردنی خەڵکە لە حیزب‌و پێشمەرگەکان، من پێموابێ ٩٠٪ی خەڵکی کوردستان بە هەموو ئیمکاناتیانەوە،و بە گیان‌و دڵ پشتیوانی لە پێشمەرگەکان دەکەن، بەم هۆیە پێشمەرگەکان لە نێوخۆی کوردستاندا بە باشی دەپارێزرێن‌و کەمتر لە لایەن دوژمنەوە زەبریان وێ دەکەوێ.

پ: لە روانگەی تاکتیکییەوە چ پێوەندییەك هەیە لە نێوان بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کوردو بزووتنەوەی سەرانسەریدا؟

و: بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد هەر چەندە بە تواناش بێت، لە باشترین کاتدا دەتوانێ رێژیم لاواز بکا، هەلومەرجی رووخاندنی پێك بێنێ، بەڵام بەتەنیاو لە هیچ بارێکەوە ناتوانێ ئالترناتیف بێت. هەر بەم هۆیەوە ئێمە هەموو کاتێك لە هەوڵی ئەوەدا بووین کە پێوەندیی نێوان بزووتنەوەی گەلی کورد لەگەڵ گەلانی دیکەی ئێراندا بپارێزین، بەداخەوە نەمانتوانیوە ئەم پێوەندییە نێوخۆیی‌و ئۆرگانیکە رێك بخەین. کاتێك لە شوورای نیشتمانیی بەرگریدا بووین، وامان بیر دەکردەوە کە شوورا بە کردەوە ئەم ئەرکە مێژوویی‌یە لە ئەستۆ دەگرێ‌و لەڕاستیدا دەبێتە پردێك بۆ پێوەندیی نێوان بزووتنەوەی گەلی کوردو گەلانی دیکەی ئێران. هەروەك دەزانین

ئێمە لەم ئەزموونەدا شکستمان هێنا، بەڵام دەتوانین ئەم راستیە لە لای ئێوە ئاشکرا بکەین، کە لە نێوخۆی ئێرانەوە زۆر کەسایەتیو رێکخراوی نێوخۆی ئێران لەگەڵ ئێمە پێوەندی دەگرنو دێنە لامانو لەگەڵمان چاوپێکەوتن دەکەنو بروسکەو پەیاممان بۆ دەنێرنو پێمان دەڵێن ئێمە هیوامان بە کوردستانە، ئێمەش وەڵامیان دەدەینەوە، ئێمەش هیوامان بە گەلانی ئێرانە.

پ: ئێوە باسی (ئوپوزیسیونی) نێوخۆی ئێرانتان کرد کە پێوەندیتان لەگەڵدا هەیە. من پێم وایە لەوانەیە مەبەستتان (نهضت آزادی)و ئاغای بازرگانە، راستە؟

و: ئێمە لەگەڵ (نهضت آزادی‌و آقای بازرگان) هیچ پێوەندییەکمان نەبووە.

پ: دەکرێ رای خۆتان لە سەر (نهضت آزادی)و خودی ئاغای بازرگان دەربڕن؟

و: رای ئێمە بەگشتی لە سەر (ئوپۆزسیۆنی) ئێران روونە، ئێمە لەگەڵ هەر هێزێکی ئوپۆزسیۆن کە دژی رێژیمی خومەینی بێتو بۆ دووبارە ساخ کردنەوەو زیندوو کردنەوەی نیزامی پاشایەتی تێنەکۆشێ ئەوە ئامادەین لەگەڵیدا هاوکاری بکەین، هەروەها (ئوپۆزسیۆن) دەبێ باوەڕی بە (پلۆرالیزمی سیاسی) هەبێت، ئێمە پێمان وایە کە دوای تێپەڕاندنی دوو رێژیمی ملهوڕو زاڵم واتە، نیزامی پاشایەتیو رێژیمی خومەینی کاتی ئەوەیە کە لە ئێراندا رێژیمێکی دێموکراتیك بێتە سەرکار بەو شێوەیە ئێمە لەگەڵ هیچ هێزێکدا کە لایەنگری دیکتاتۆری بێ، هاوکاری ناکەینو دیکتاتوری بە هەر شکلێك بێ قبووڵی ناکەین. بەڵام ئەوەی کە پێوەندیی بە خودی ئاغای بازەرگانەوە بێ ئەوەیە کە ئەوان نەخشیان هەبووە لە هێنانە سەرکاری رێژیمی خومەینیدا، ئێستاش ئێمە هیچ شكو گومانێکمان لە نێهزەتی ئازادیو ئاغای بازەرگان نیە، پێشینەی ئەوانمان بە باشی لە بیرە، بەڵام لە هەمان کاتدا لە هەر چەشنە نەیاری‌یەك لەگەڵ رێژیمی خومەینیدا پێشوازی دەکەین.

پ: بەڕێز قاسملوو سەیر کەن من ئێستاش حاڵی نەبووم ئەو رێکخراوو کەسایەتی‌یانەی کە لە نێوخۆی وڵاتەوە لەگەڵ ئێوە چاوپێکەوتنیان بووەو پەیامیان بۆ ناردون کام هێزانەن؟

و: مەبەستی من ئەو هێزانەن کە بۆ رووخاندنی رێژیمی خومەینی تێدەکۆشن، هەروەها لەو چەشنە هێزانە لە نێوخۆی ئێراندا هەن، ئیزنم بدە ناویان نەهێنم.

پ: هەروەك دەزانن رێژیمی حاكم بە سەر وڵاتەكەماندا رۆژانێكی پڕ لە قەیران بە سەردەبات، ئەم قەیرانە هەموو وڵاتی داگرتوە. قەیرانی ئابووری، فەرهەنگیو سیاسی پێتان وا نیە كە ئەم دەسەڵاتە كۆتاییەكانی تەمەنی خۆی تێپەڕ دەكا. ئێوە بڕواتان بە راپەرینێكی چەكدارانە هەیە یا خەڵكی؟

و: "گرگین خانم" سەیركەن، من لەو كەسانە نیم كە لەپێشدا ئەوە دیاری بكەم كە بڵێم رێژیمی خومەینی بە چ شێوەیەك دەڕووخێ، هەروەها لەو بڕوایەدام كە ئەم رێژیمە لە رێگای هەڵبژاردنی ئازادو نووسینی چەندوتار لە دەرەوەی وڵات ناڕووخێ. دەڵێم لە رێگای (زاڵبوونەوە) ئەم رێژیمە لە بەین بچێ، ئێستا ئەم زاڵبوونە راپەڕینی چەكدارانە لە نێو شارەكاندا دەبێ یا تێكەڵێك لە شەڕی چەكدارانەی شاری لەگەڵ شەڕی پارتیزانی لە دێهاتەكانداو مانگرتنو خۆپێشانداندو ڕاپەرینی خەڵكی لە نێو شارەكاندا، لەو بڕوایەدام ناكرێ لە پێشدا ئەمە دیاری بكرێ. بەڵام سەبارەت بەوە كە داخوا ئەو رێژیمە دەڕووخێ ئەویش لە رێگای زاڵبوون بە سەریدا من هیچ لە شكو گوماندا نیم كە رێژیم لە قەیرانێكی قووڵ دایە. رێژیم بەو شێوەیە كە ئێوە فەرمووتان لە باری ئابووری، سیاسی، نیزامیو فەرهەنگییەوە لە قەیران دایە، رێژیم جگە لەوە كە نەیتوانیوە هیچ كام لە كێشەو گیروگرفتەكانی چارەسەر بكا، تەنانەت ئەو گیروگرفتانەشی زیاتر كردوەو بەپێچەوانەی ئەوەی هەندێ لە رێكخراوو نەفەراتو نوێنەرانی وڵاتە رۆژئاواییەكان لە نێوخۆی وڵاتدا ئیدیعای دەكەن، رێژیم لە هیچ بارێكەوە "تثبیت" نەبووە. ئەم رێژیمە لە باری نیزامییەوە بە تەواوی بە بنبست گەیشتوە، نە دەتوانێ كۆتایی بە شەڕ بهێنێو نە دەتوانێ سەركەوتن بە دەست بهێنێ، لە روانگەی سیاسیشەوە ناكۆكییە نێوخۆییەكان پەرەی سەندوەو بەهۆی بوونی گیروگرفتی زۆری كۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسیو نیزامی بناخەكانی رێژیم لەرزۆك بووە. هاتنە خوارەوەی نرخی نەوتو رادەی ناردنیشی (صدور) بۆخۆی هۆیەكی دیكەی پەرەسەندنی ناكۆكیی نێوخۆییە.

٩٥٪ی داهاتی (ارزی) وڵاتی ئێمە لە رێگای ناردنی نەوتەوە دەست دەكەوێ. بە پێی پێشبینی، ئەمساڵ داهاتی نەوت كەمتر لە یەك لە سێی داهاتی ساڵی پێشوو دەبێ. سەرجەم ئەم هۆكارانە رێژیمیان زۆر لاواز كردوە، بەڵام داخوا بۆ رووخانی رێژیمێكی زاڵمی سەدەكانی ناوەڕاست ئەمە بەس بێ؟ بەڕای ئێمە نە، بەڕای ئێمە

بەداخەوە ئێستا لــە سەرانســەری ئــێراندا هــێزێکی ئــەوتۆ نیــە کــە بتوانــێ ڕێژیــم بڕووخێنێ، بە بێ رووده‌رباییست دەبێ ئەمە بڵێین بۆ ئەوەی کە ئەگەر نەیڵێین ئــەوجار ناتوانین وەك پێویست هەوڵ بدەین بۆ درووست کردنی هێزێکی ئەوتۆ. بەهــەرحاڵ رای ئێمە ئەوەیە ڕێژیم جێگیر نەبووە ("تثبیت نشــده"). لــە هــەمان کــاتدا ئێمــە دژی ئەوەین کە ڕێکەوتی رووخانی ڕێژیم دیاری بکەین. هێندێك لەم ماوەیــەدا شــوعارێك دووپات دەکەنەوەو دەڵێن: "ڕێژیم لە سەرەو لێژیی رووخــان دایــە." ئێمــە دژی ئــەم شوعارەین. سەرەولێژیی رووخان چەندین ساڵ ناخایەنێ.

پ: با سەبارەت بــە دۆســتانی پێشــوو، ڕێکخــراوی "مجاهدین خلــق"، شــوورای بەرگریی نیشتمانی بدوێین. "شورای ملی مقاومت" هەر وەك ئەو ڕێکخــراوە دەڵــێ، دەتوانێ بەو زووانە ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی بڕووخێنێ؟ ئایا ڕێکخراوی موجــاهێدین بەو هێزە چەکدارەی کە هەیەتی دەتوانێ هێنانەدیی ڕاپەڕینێکی جەماوەری بێ؟

و: خۆ مەسەلە سیاسییەکان بە دانی شوعارو دانانی ئاوات‌و ئارەزوو لە جێگــەی ڕاستییەکان، چارەسەر ناکرێن. هەموو کەس بۆی هەیە، ئــاوات‌و ئــارەزوویی هــەبێ، بەڵام لە سیاسەتدا تۆ لەگــەڵ ڕاســتی‌یەکاندا ڕووبــەڕوویت. کــاتێك ئێمــە تــاوتوێی وەزعی ئێران دەکەین بەو ئاکامە دەگەین کە نەتەنیا ڕێکخراوی موجاهێدین بــەڵکوو هیچ ڕێکخراوێکی‌تر بەتەنیایی، تەنانەت حیزبی دێموکراتیش ـ کە کارامەترین هێزی نێوخۆی وڵات بە حیساب دێ ـ ئێستا ناتوانێ ڕێژیم بڕووخێنێ‌و ببێ بە ئاڵتێرنــاتیڤ. پێشتر ڕێبەرانی موجاهێدین کاتیان دیاری دەکرد، بۆ رووخانی ڕێژیــم بــەڵام هیچیــان ڕاست دەرنەهاتن، بەڕای من لــە هەلومــەرجی ئێســتاداو بــە لەبــەر چاوگرتنی ئــەو زەبرانەی کە ئەم ڕێکخراوە لە نێوخۆی وڵاتدا وێی کەوتووەو هەروەها گــیروگرفتێکی زۆری سیاسی کە لەگەڵی بەرەوڕوو بووە، لە داهاتوویەکی نێزیکدا ناتوانێ لە ئــێراندا دەسەڵات بەدەستەوە بگرێ.

پ: ڕێکخراوی موجاهێدینی خەڵکی ئێران‌و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئــێران ٢باسکی سەرەکی‌و چەکداریی جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی ئــێرانن، ئایــا لــە پێنــاوی ئامانجە هاوبەشەکانتاندا، لە هەوڵی ئەوەدا نین کە دیسان پێکەوە دەست بە تێکۆشان بکەن؟

و: ئەزموونێ کە ئێمە لە شوورای بەرگریی نیشتیمانیدا، بەدەستمان هێنا زۆر بەکەڵك بوو، ئێمە هەروەها کە وتوومانە، هەمیشە حازرین لەگەڵ تەواوی هێزەکانی ئوپۆزسیۆندا کە لایەنگری نیزامی پاشایەتی نەبن هاوکاری بکەین، ئێمە حازرین لەگەڵ سازمانی موجاهێدین هاوکاری بکەین، بەلام ئەم هاوکارییە دەبێ لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی نوێدا بێو بەهۆی پێکهاتنی دوو لایەنەوە جێبەجێ ببێت. کۆنگرەی ٧ی ئێمە لە سەرماوەزی ١٣٦٤دا پێی لە سەر ئەوە داگرت کە حیزبی ئێمە حازرە هاوکاریی رێکخراوی موجاهێدین بکا، بەلام لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا، بۆ ئامانجی دیاریکراوو روونو من دیسان ئەمەش دووپات دەکەمەوە، بەلام بۆ ئەو هاوکارییە رێکخراوی موجاهێدین دەبێ دەستپێشخەری بکا، هەروەها چاو بخشێنێتەوە بە کردەوەکانیدا بە نیسبەت حیزبی ئێمەو باقیی رێکخراوو هێزەکانی دیکە لەو چەند ساڵەی رابردوودا هەیبووە.

پ: ئێوە لەو باوەڕەدان کە لە بارودۆخی شێواوی سیاسیی ئێراندا کوودیتا بکرێ؟ ئەگەر بکرێ ئەم کوودیتایە بە قازانجی کێ دەبێ؟

و: لە هەلومەرجی ئێستادا هیچکام لەو هێزانەی کە مەبەستیان رووخانی رێژیمی خومەینییە توانای کوودیتایان نیە، هەروەها دەبێ بگوترێ هەر هێزێکی سیاسی بە پێی نێوەرۆكو ئامانجەکانی خۆی رێگای جۆراوجۆری بۆ رووخانی رێژیم هەڵبژاردوە، بۆ نموونە ئێمە شۆڕشی چەکدارانەو جەماوەری دەکەین، رێکخراوێکی دیکەش باسی راپەرینی چەکدارانە دەکا. تەنیا هێزێك کە رێگەی دیکەی نیە غەیری کوودیتا سەڵتەنەت خوازەکانن، بۆ ئەوەی لە نێو خەڵکدا پێگەیەکیان نیە، نێوەرۆکی ئەوان بە شێوەیەك نیە بیانهەوێ لە رێگەی راپەرینی جەماوەری، مانگرتنو خۆپێشاندانەوە دەسەلات بەدەستەوە بگرن، ئەم رێگایانە هیچ کات لەگەڵ شێوەی بیر کردنەوەیاندا یەك ناگرێتەوە. بەم هۆیە هیچ رێگەیەك نیە بۆ ئەوان غەیری کوودیتا نەبێ. کوودیتا دەبێ بەهۆی هێزی نیزامی ("ارتش")ەوە جێبەجێ بکرێت. بەلام هێزی چەکداری وڵات ("ارتش") لە هەلومەرجی ئێستادا توانای کوودیتای نیە، "ارتش" ئێستا مەسئوولی شەڕ لەگەڵ عێراقەو لەگەڵ خەڵکی کوردستانیش، لە لایەکی دیکەشەوە بەرپرسایەتییە گرینگەکانی ئەرتەش لە دەستی ئاخوندەکان یا نوێنەرانی سوپای پاسداران دایەو، لە رێگەی ئیدارەی بەناوبانگی عەقیدەتی ـ سیاسییەوە چاودێری

تەواوی لیّ دەکریّ. ئەمێنێتەوە، سوپای پاسداران ئەگەر بێتو "ارتش" کوودیتا بکا، لیبڕاوانە بەربەرەکانێی لەگەڵ دەکا. لە پێشیدا دەوەستێ. بەڵام خودی ئەم سوپایە کە فەرماندەکانی هێندێك ئاواتیان لە مێشکدایە، تا کاتێ خومەینی لە مەیدان لا نەچووە، هیچ کردەوەیەك لە خۆ نیشان نادەن بۆ وەدەست هێنانی دەسەڵات.

پ: بە چ هۆیەك پێکهێنانی بەرەی دێموکراتیکی دژی ئیمپریالیستیتان لە قانوونی کاری خۆتاندا وەك پێویستییەك داناوە؟

و: ئێمە پاش شۆڕش پێشنیاری ئەم بەرەیەمان کردو ماوەیەکیش بۆ پێکهێنانی تیّکۆشاین، بەڵام بەداخەوە ئەو ڕێکخراوانە کە دەبوایە وەڵامی موسبەتیان بە دەنگی ئێمە بدایەوە بێدەنگ بوون، ڕێکخراوی موجاهێدینی خەڵك‌و چریکە فیدایی‌یەکانی خەڵکی ئێران لەوانە بوون. پاشان کە ئەو ڕێکخراوانە بوونە ئوپۆزسیۆن بە تەواوی، مەسەلەی بەرە دیسان هاتە ئاراوە. پێش پێکهێنانی شوورا ئێمە لەگەڵ موجاهێدین لە سەر پێکهێنانی بەرە وتووێژمان کردو تەنانەت بە ئاکامیش گەیشتبووین، بەڵام رووداوەکانی دواترو یەکیەتیی نێوان بەڕێز بەنی‌سەدرو موجاهێدین‌و پێکهێنانی شوورا ئێمەیان لەبەردەم کارێکدا راگرت کە کرابوو ("عمل انجام شده") بەم شێوەیە پێشنیاری ئێمە بۆ پێکهێنانی بەرە شتێکی تازە نیە. لە هەلومەرجی توندی ئێستادا زیاتر هەست بە پێویستیی ئاوا کارێك دەکەین. بەم هۆیەوە ئەو هێزانە بە کردەوە دەیانتوانی ببنە ئاڵترناتیڤ، خەتی خۆیان لە دەست داوە، سەڵتەنەت‌خوازەکان هیچکات ئاڵترناتیڤ نەبوون بۆ ئێمە، هەر چەندیش لە سەر مەشرووتەخوازی‌و دێموکراتی هەراو دەنگیان هەبێت‌و ئێران لەگەڵ سوئێدو بریتانیا بەرئاورد بکەن، ئێمە خاوەن ئەزموونی مێژوویی خۆمانین. کە بەو پێیە سەڵتەنەت بریتی‌یە لە: زۆڵم‌و زۆر و بەستراوەیی، هەروەك دەزانی سەڵتەنەت ماوەیەکی زۆر بەستراوە بوو بە رووسیەی تەزاری‌و ئیمپراتۆریی ئینگلستان‌و ئیمپریالیسمی ئامریکاوە. بەڵام ئێمەی کورد هۆیەکی دیکەمان هەیە بۆ دژایەتی لەگەڵ سەڵتەنەتدا ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە سەڵتەنەت یانیّ کۆکردنەوەی دەسەڵات لە تاراندا، کۆکردنەوەی بڕیاردان لە ناوەندا، کە سەر چاوەکەی لە نێوەرۆکی ڕێژیمی پاشایەتی دایە. ئاکامی ئەم کۆکردنەوانە هەمیشە بۆتە هۆی سەرکوتی هەر جۆرە شۆڕشێکی گەلانی زوڵم لێکراوی ئێران. بەلوچەکانیان دەنارده شەڕی دژی کوردەکان، عەرەبەکان بۆ شەڕ

دژی تورکمەن، ئێمە ئەمانهەوێ یەکجارەکی کۆتایی بە کۆکردنەوەی دەسەڵات لە تاراندا بهێنن. دەبێ خەڵکی هەموو ئوستانەکانی ئێران‌و گەلانی ئێران حەقی بڕیاردانیان هەبێ‌و بەس، ئەوەی کە پێویستە دەبێ لە دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی‌دا بێ، وەك پێوەندی‌یەکانی دەرەوەو پارێزگاری لە سەربەخۆیی گشتی‌و تەواویەتی خاکی وڵات، ئیدارەی سیستەمی دراوی‌و بانکی، داڕشتنی بەرنامەی درێژخایەن کە سامانی زۆریان دەوێ، لە پرسیارەکەت دوور ناکەومەوە، دەپرسی پێویستیی دامەزراندنی بەرە بۆ بە پێویست دەزانین؟

بۆ ئەوەی کە ڕێکخراوی موجاهێدینی خەڵکی ئێران، ئاڵترناتیڤی شوورای سووتاند. ئێستا ئێمە ئیتر ئاڵترناتیڤمان نیە. هەر بەو بۆنەیەوە زیاتر لە هەر وەختێکی‌تر هەست دەکەین بە پێویستیی دامەزراندنی بەرە. هەر وەك ئێوە باستان کرد، ڕێژیم لە قەیرانێکی قووڵدا چەقیوە، ئەگەر لەم هەلومەرجە تایبەتی‌یەی مێژوودا، ڕێکخراوو هێزە پێشکەوتنخوازەکان بە خۆیاندا نەیەنەوەو کارێك نەکەن، ئیمپریالیزمی ئامریکاو هێزە کۆنەپەرستە دەستە ڕاستییەکان، دیسان هەوڵ دەدەن ئاڵترناتیڤێك بۆ ڕێژیمی خومەینی بدۆزنەوە. بۆ پێشگیری لە ئاڵترناتیڤێکی ئاوەهاو بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەمان، ئێمە پێشنیاری بەرەمان کرد. ئێمە وتوومانە دوای ڕووخانی ڕێژیم وەزعییەت ٢ شێوە زیاتری نیە، شێوەی یەکەم بریتیە لە سەقامگیر بوونی ڕێژیمێکی دێموکراتیك لەگەڵ پاراستنی پلۆرالیزمی سیاسی‌و ڕێزدانان بۆ مافی گشتی‌و بەشداریی هەمووان، ئەڵبەتە هەر کەس بە گوێرەی بەشی خۆی. بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، نابێ لە لایەن ئەم یا ئەو هێزەوە هەوڵ بدرێ، بە مەبەستی داسەپاندنی زۆرداری‌و تەکڕەوی، ئەبێ ئەوەیش بڵێم کە ئێمە خۆداسەپاندن لە بەرەدا قبووڵ ناکەین، هەر هێزێك هەوڵی ئەوە بدا لە بەرەدا "هژمونی" پێك بێنێ، پێشی پێ دەگرین. بەڵام پێکهێنانی هژمونی لە نێوخۆی وڵاتدا بۆ وەدەستهێنانی پشتیوانیی خەڵك لە ڕێگەی سەرنج ڕاکێشانی، مافی بێ ئەملاو ئەولای هەر هێزێکە، ئێمە وەك حیزبی دێموکرات خاوەن باوەڕێکی پتەوین کە زیاتر لە ٨٠٪ی خەڵکی کوردستان لایەنگری حیزبی ئێمەن‌و لە هەڵبژاردنی ئازاددا دەنگی خۆیان بە ئێمە دەدەن. ئەگەر شێوەی یەکەم جێبەجێ نەبێ، واتە ئەگەر لە ئێراندا دێموکراسی شکست بخوا بەداخەوە ئەو کاتە سەقامگیر بوونی زۆرداری‌و دیکتاتۆری

بە هەر ناوێك لە وڵاتدا بێ، ئاكامی دەبێتە شەڕی ناوخۆیی. ئەوەش ناشارمەوە كە هیچ ڕێكخراوێك لە نێوخۆی ئێراندا نیە كە باشتر لە ئێمە بۆ شەڕی ناوخۆیی ڕانەكێشرێ، بۆ ئەوەی لە ئێراندا شەڕێكی ئەوتۆ كە لە باكووری ئێران زیاتر لە ٢٠٠٠ كیلومتر سنووری هاوبەشی هەیە لەگەڵ شۆرەوی‌و لە باشووری ئەو ناوچەیە كەنداوی فارس هەڵكەوتوە. لە ڕۆژهەڵاتدا ناوچەیەكی ئیستیراتژیك‌و گرینگ بە حیساب دێ. ڕووداوی پڕ لە مەترسی لە دوا دەبێ، ڕوداوی وەها كە هیچ كەس ناتوانێ لایەنەكانی پێش‌بینی بكا تەنانەت لە وانەیە سەربەخۆیی گشتیی وڵات بكەوێتە مەترسی‌یەوە.

پ: ئێوە لە سەر ئەو باوەڕەن كە بە غەیری سەڵتەنەتخوازەكان باقیی ئوپۆزسیۆن دەتوانن لە بەرەدا بەشدار بن، داخوا دەستە ڕاستییەكان كە سەڵتەنەتخواز نین دەتوانن ببنە هاوپەیمانی ئێوە؟

و: سەیركەن، ئامانجەكانی بەرە دیارو روونن، ئێمە چوار ئامانجی گشتیمان پێشنیار كردوە، یەكیان، مەسەلەی سەربەخۆیی ئێرانە، ئێمە خوازیاری ئێرانێكی سەربەخۆو نەبەستراوەین، وا بیر دەكەمەوە بەتایبەت زۆربەی هێزەكان لەو بارەوە لەگەڵ ئێمەبن، بەتایبەت ئەو هێزانەی كە سەڵتەنەتخواز نین‌و دژی ڕێژیمی خومەینین.

دووهەم، ئەوەی كە ئێمە باوەڕمان بە دێموكراسی‌و ئازادییە، خەڵكی ئێران لە شۆڕش‌دا شەست هەزار شەهیدیان داوە، تا بە ئازادی بژین. بەداخەوە وای لێ نەهات، ئێستا كە دەبێ ڕیژیمێك بێتە سەركار كە ڕێز بۆ ئازادی دابنێ، ئازادیی بەیان، بڵاوكراوە، هەڵبژاردن، پۆشش‌و . . . هتد.

سێهەم، دادپەروەریی كۆمەڵایەتیە، ئەم ڕێژیمە دەبێ ڕێزی مافە كۆمەڵایەتی‌یەكانی خەڵكی هەژارو فەقیر كە زۆربەی خەڵكی وڵات پێك دێنن بگرێ، هەروەها دەبێ دابینكردنی ئەوانە لەبەرچاو بگرێ.

مەسەلەی چوارەم، بریتی‌یە لە دابینكردنی مافە نەتەوایەتییەكانی گەلانی زوڵم لێكراوی ئێران، ئێمە لایەنگری شوعاری دێموكراسی بۆ ئێران‌و خودموختاری بۆ كوردستانین. بەڵام لە بەر ئەوەی ئێران لە چەندین نەتەوە پێكهاتووە، ئەگەر بمانەوێ لە لایەن هەموو نەتەوەكانەوە قسان بكەین، دەبێ مەسەلەی كۆماری فێدراتیف بێنینە ئاراوە. لە كۆماری فێدراتیفدا لە لایەك یەكگرتوویی گشتیی وڵات

دەپارێزرێ‌و لە لایەکی دیکەشەوە گەلانی ئێران بە مافە نەتەوایەتی‌یەکانی خۆیان دەگەن. ئێمە ئەم چوار ئامانجەمان پێشنیار کردوون. بەڵام پێ لە سەر وشەکان‌و ناوی بەرە داناگرین هەمووی ئەمانە پێش دامەزراندنی بەرە جێی باس‌و وتووێژن. بەم شێوەیە هەر هێزێکی کۆماریخواز لایەنگری پلۆرالیزم کە دژی رێژیمی خومەینی بێ‌و ئەو ئامانجانەی سەرەوەی قبوولّ بێ، دەتوانێ بێتە نێو بەرەوە.

پ: بەڕای ئێوە چ کەسێك شۆڕشگێڕو دێموکراتەو دژی شۆڕش‌و غەیری دێموکرات چ کەس‌و رێکخراوو حیزبێکن؟ ئەم یەکگرتنی "ئوپۆزسیۆن"ـە کە ئێوە زۆرتان پێ خۆشە بۆ نموونە حیزبی توودەو هێزەکانی دژی خەڵکی‌و دژی گەلیی دیکە دەگرێتەوە؟

و: سەیرکەن، ئێوە باسی شۆڕشگێڕبوون دەکەن، ئێمە ئەوەمان بە پێویستیی هاتنە نێو بەرە دانەناوە. ئێمە وتوومانە کە هەر شێوەیەك لە خەبات تەنانەت شێوەی "منفی"ی خەباتیش لە جێی خۆی‌دا بە قازانج دەزانین. بەم شێوەیە، پێویست ناکا هەر کەس دێتە نێو بەرەوە شۆڕشگێڕ بێ. بۆ نموونە هێندێك لە ژنان بە شێوەیەك دژی حیجاب خەبات دەکەن‌و لە هەوڵی ئەوەدان لە ژێر باری حیجاب خۆیان دەرباز بکەن. ئێمە ئەمە بە شێوەیەك خەبات دەزانین‌و بۆ ئەم کارەش بە پێویستی نازانین حەتمەن ژنان شۆڕشگێڕ بن، یا بیروبۆچوونی شۆڕشگێڕانەیان هەبێ. ئەمە جۆرێك خەباتی "منفی"یە، شێوەیەکی دیکەی خەباتی "منفی" کە لە کوردستان بەڕێوە دەچێ، بەشداری نەکردنی خەڵکە لە نوێژی هەینی‌دا، پێشتر لە کوردستان‌دا مزگەوتەکان چۆڵ نەبوون، بەڵام ئێستا بەتاڵن، بەربڵاوی‌و گرێدانی شێوە جۆراوجۆرەکانی خەبات کە دەبنە هۆی ئەوەی رێژیم خێراتر برووخێ، ئێوە هێندێك لە هێزەکانتان بە دژی‌گەلی ناوبرد. بەڵام ئێمە ناوی هێزێکی تایبەت ناهێنین، بۆ ئەوەی ئێمە بۆخۆمان هێزێکی بەرەین‌و مافی ئەوەمان نیە بە تەنیا لە سەر هێزەکانی دیکە هەڵوێست بگرین. کاتێك بەرە دامەزرا، ئەوکات ئەگەر هێزەکان هەڵوێستی هاوبەشیان گرت، بۆ نموونە رێکخراوی "الف" بە هۆی ئەوەی کە دژی خەڵکەو رێکخراوی "ب" بەهۆی ئەوەی کە بۆ نموونە راستەوخۆ بەستراوەیە، نابێ بەشداری بەرە بن.لەو پێوەندی‌یەدا بەو هۆیەی کە باسمان کرد ئەو کات رای خۆمان دەرنەبڕی‌و هەڵوێستمان نەگرت.

پ: ئێوه باوه‌ڕتان به چ جۆرێکی دێموکراسی هه‌یه؟ به‌ڕای ئێوه دێمه‌کراسی نابێ بوارو لایه‌نی هه‌بێ، ئه‌و جۆره دێموکراسی‌یه که ئێوه پشتی پێ ده‌به‌ستن له قازانجی کام چین له خه‌ڵکی نیشتمانه‌که‌مان دایه؟

و: سه‌یرکه‌ن، "گرگین خانم"، زۆر جار گوێ بیستی ئه‌و پرسیاره بووم، له ئێمه پرسیار ده‌که‌ن که ئێوه باوه‌ڕتان به دێموکراسیی گه‌لی‌یه یا دێموکراسی بورژوائی. ئێمه ده‌ڵێین به‌س دێموکراسی. بۆ؟ له به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر بێت‌و بڵێین دێموکراسیی گه‌لی، چونکه هێندێك هێز هه‌ن که له روانگه‌ی چینایه‌تی‌یه‌وه ورده بورژوان‌و له‌وانه‌یه بورژوایش بن، به‌ڵام بیروباوه‌ڕی دێموکراتانه‌یان هه‌یه‌و لایه‌نگری روخانی رێژیمن، ئه‌وانه حازرن له چوارچێوه‌ی بیروبۆچوونی خۆیاندا بۆ ئه‌م کاره تێبکۆشن. باشه بۆ ئه‌بێ ئه‌وانه له خۆمان دوور بخه‌ینه‌وه‌و نه‌هێڵین بێنه نێو به‌ره‌وه.

پ: به‌ڵام ئه‌مانه ئیدی له‌گه‌ڵ خه‌باتی دژی ئیمپریالیستی ناکه‌ون، مه‌گه‌ر یه‌کێك له ئامانجه‌کانی ئێوه له نێو به‌ره‌دا خه‌باتی دژی ئیمپریالیستی نیه؟

و: ئێمه باسی ئامانجه‌کانمان کرد، ئێوه له بیرتان چۆته‌وه، له ئامانجی یه‌که‌مدا وتمان، ئێمه ئێرانێکمان ده‌وێ سه‌ربه‌خۆ بێ‌و نه‌به‌ستراوه، ئه‌مه بۆ خۆی نێوه‌رۆکی ئامانجی دژی ئیمپریالیستیی ئێمه نیشان ده‌دا.

پ: به‌ڕێز قاسملوو، نزیکه‌ی ۳ ساڵه واته له ۲٥ی خه‌زه‌ڵوه‌ری ساڵی ۱۳٦۳یه‌وه له نێوان حیزبی دێموکرات‌و رێکخراوی کۆمه‌ڵه تێکهه‌ڵچوونی چه‌کدارانه‌و خوێناوی ده‌ستی پێکرد، تا ئه‌و جێگایه که من ئاگادارم دوایین تێکهه‌ڵچوونی ئه‌وانه تا ئه‌مڕۆ له رێکه‌وتی ٥ی پووشپه‌ری ۱۳٦٥دا بو، له‌م تێکهه‌ڵچوونه‌دا به‌داخه‌وه ۱٦ که‌س له هێزه‌کانی ئێوه شه‌هید کراون، به‌ڵام ئاگاداری وه‌زعییه‌تی هێزه‌کانی کۆمه‌ڵه نیم، باشه ئێوه ده‌زانن که داخوازیی هه‌موو خه‌ڵك‌و ئوپۆزسیۆنی پێشکه‌وتوو و شۆڕشگێڕی ئێران‌و داخوازی سه‌رجه‌م گه‌لان‌و خه‌ڵکی ئێران کۆتایی‌هێنان به‌م تێکهه‌ڵچوونانه‌و راگه‌یاندنی ئاگربه‌س نێوان حیزبی دێموکرات‌و کۆمه‌ڵه‌یه. پرسیاری من له ئێوه ئه‌وه‌یه که بۆ هه‌وڵێکی راسته‌قینه ناده‌ن بۆ کۆتایی‌هێنان به‌م شه‌ڕه‌و وه‌ڵامی به‌ڵێ به ئاگربه‌سی بێ‌ئه‌ملاو ئه‌ولای "بدون قید و شرط"ی کۆمه‌ڵه ناده‌نه‌وه؟

و: ئه‌گه‌ر ده‌تهه‌وێ هۆی شه‌ڕی حیزبی دێموکرات‌و کۆمه‌ڵه باش بزانی ده‌بێ له هۆی ئه‌م تێکهه‌ڵچوونانه تێبگه‌ن، هه‌ڵسه‌نگاندنی (پێناسه‌یه‌ك) که کۆمه‌ڵه له

کۆمەڵگای کوردستان دەیکاو ئەو ئامانجانەی کە بۆخۆی دیاریی کردوون، هۆی بنەڕەتیی ئەم تێکهەڵچوونانە پێك دێنن. کۆمەڵە لە روانگەکانی خۆیدا باسێکی بەناوبانگ بە ناوی سێ گۆشە (سێ کوچکە) لە بڵاوکراوەی کومۆنیست بە قەڵەمی بەڕێز عەبدوڵڵا موهتەدی داڕشتوە، لەم بابەتو بۆچوونەیاندا کۆمەڵە ئیدیعا دەکا کە لە کوردستاندا سێ کوچکەیەك هەیە کە لایەکی بورژوازیی ئێرانە کە نوێنەرەکەی کۆماری ئیسلامییەو لایەکەی دیکەشی بورژوازی کوردستانە کە حیزبی دێموکرات نوێنەریەتیو لایی سێهەمیشی پرۆلێتاریایە کە نوێنەرەکەی کۆمەڵەیە. لە بڵاوکراوەیەکی دیکەی کۆمەڵەدا لە وتارێکدا کە لە لایەن یەکێك لە ئەندامانی دەفتەری سیاسییەوە نووسراوە، گوتراوە کە خەتەری بورژوازیی خۆماڵی زیاترە، هەربۆیە ئەگەر پێویست بێ دەبێ لە شەڕ لە دژی رێژیم خۆ ببوێرینو شەڕ لەگەڵ حیزبی دێموکرات بخرێتە پێش. چەند ساڵ لەوە پێش، بەر لەوەی ناوی حیزبی کومۆنیست لە خۆ بنێن، رێبەرانی ئەوکاتی کۆمەڵە چەند تێکهەڵچوونێکیان لەگەڵ ئێمە پێك هێنا، ئێمە هەوڵماندا لە رێگەی ئاشتییەوە کێشەکە چارەسەر بکەینو نەهێڵین پەرە بستێنێ. نزیك بە چوار ساڵ پێش ئێستا بەڕێز عەبدوڵڵا موهتەدی لە نامەیەکدا کە بۆ رێکخراوی کۆمەڵە لە سەردەشت ناردبوویو کەوتە دەست ئێمە، پاش ماوەیەك نامەکەمان پێشانی خۆی دا، نووسیبووی، ئاخرەکەی شەڕ لە نێوان حیزبی دێموکراتو کۆمەڵەدا دەست پێدەکا، کەوابوو تا زوتر بێ، باشترە. ئێمە زۆرمان هەوڵ دا کە رێبەرانی کۆمەڵە تێبگەیەنین کە شەڕ بە زیانی جووڵانەوەی دێموکراتیکی کوردستانو سەرانسەری ئێرانە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك قسەی ئێمەیان قبووڵ نەکرد. کاتێك تێکهەڵچوونی ٢٥ی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٦٤ رووی دا، هاوڕێیانی دەفتەری سیاسیی ئێمە، هەوڵیان دا دیسان مقەڕی رێکخراوی کۆمەڵە بهێننەوە هەورامان، سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵە هیچ کاتێك لەوێ مقەڕو پێگەی نەبووە، هەر چۆنێك بوو ئەندامانی کۆمەڵەیان گەڕاندەوە ناوچەی نەوسوودو هاوکاری گەیشتە ئەو رادەیە کە بۆ پێشگیری لە نفووزی بەکرێگیراوانی خومەینی ناوی شەو لە نێوان هەر دوو لا دانرا. بەڵام هێزەکانی کۆمەڵە بە کەڵکوەرگرتن لەم ناوی شەوە، لە درەنگی شەودا نیگابانەکانی حیزبی ئێمە دەگرن، لە پێشدا دەیانکوژنو پاشان مقەڕەکەمان دەدەنە بەر ئار.پی.جیو هێرشیان کردە سەر مقەڕەکانی ئێمەو بەمجۆرە

جینایەتێکی گەورەیان خوڵقاند. من ئەوکات لە دەرەوەی وڵات بووم. کاتێ گەڕامەوە هەوڵم دا لەگەڵ دا هەموو ئەو کوشتارەی کە کرابوو ڕێگاچارەیەك بۆ کۆتایی ئەو شەڕانە بە لێپرسراوانی کۆمەڵە پێشنیار بکەم، لە فکری ئەوەدا بووم ئەگەر بێت‌و ڕێبەرانی حیزبی کومۆنیست (کۆمەڵە) بە ڕەسمی رابگەیەنن کە ئێمە ئاگامان لەو جینایەتە نەبووە، لەوانەیە بتوانین پێك بێین. بەڵام بەداخەوە دیسان لە بلاوکراوەی "کومۆنیست"دا "ئاوی خاوێنیان بە دەستی ئێمەدا کرد"و بەڕێز عەبدوڵڵا موهتەدی لەو بلاوکراوەیەدا لە سەر ئەو ڕووداوەی نووسی‌و واتە لە سەر ڕوداوێك کە ئێمە بە جینایەتی شەشی ڕێبەندان ناودێرمان کردوە، دەنووسی کە ڕێبەری حیزب دانیشتنی بووەو هەڵوێستی گرتوەو تەنانەت شانازی بەو کردەوەیە دەکا. سەرنجڕاکێشتر ئەوە بوو کە رادەی شەهیدەکانی ئێمەیان زیاتر لەوەی کە لەڕاستی‌دا بوون نیشان دەدا، بەم شێوەیە کۆمەڵە ڕێگەی وتوویژی لە حیزبی دێموکرات گرت، بەڵام لەو کاتەوە کە کۆمەڵە تێگەیشتوە لەگەڵ حیزبی دێموکرات شەڕی پێناکرێ، خوازیاری ئاشتی بێ ئەملاو ئەولا بوو. ئێمە لە ڕەوتی تێکهەڵچوونەکاندا هێندێك بەلگەنامەمان لە کۆمەڵە وەدەست کەوتوە کە ڕاشکاوانە باسی ئەوە دەکەن کە کۆمەڵە دەبێ لەگەڵ حیزبی دێموکرات شەڕ بکاو پاشان ئاشتی بکاو دیسان دوای کۆکردنەوەی هێزەکانی شەڕ دەست پێبکاتەوە، ئەمەیش لە بەر ئەوەی کومەڵە هێزی پێویستی نیەو دەیهەوێ بە شەڕو هەڵاتن هێزەکانی خۆ ڕێك بخات، ئێستا کە هێزەکانی کۆمەڵە لە یەك شوێنی کوردستاندا جێگرن. ئەویش مەنتەقەی سەرشیو لە نێوان سەقزو بانەو مەریوان دایە، ئەمانە لە هەموو شوێنێکی کوردستان لە باکوورو ناوەندو باشوورەوە، وەدەرنراون. بەم بۆنەوە هاواری ئاشتییان بەرز بۆتەوە، بەڵام ئێمە نامانهەوێ لەگەڵ کۆمەڵە ئاشتی‌یەك بکەین کە یەك دوو مانگ بکێشێ‌و دیسان لە ناوچەیەکی دیکەی کوردستان جینایەتێکی دیکەی وەك جینایەتی هەورامان بخوڵقێنن. هەروەها ئێمە لەگەڵ زۆر لە ڕێکخراوەکانی دیکە قسەو باسمان کردوە، هیچ کام لەوان زەمانەتی ئەوە ناکەن کە ئیدی کۆمەڵە جینایەت ناخوڵقێنێ. تەنانەت شێخ عیزەدینی حوسەینی کە پێشتر پشتیوانی لە کۆمەڵە دەکرد، نەتەنیا حازر نەبوو زەمانەتێکی وا بدا، بەڵکوو سیاسەتی ئێستای حیزبی کومۆنیستی کۆمەڵەیش تاوانبار دەکا.

پ: بەڕێز قاسملوو، دەکرێ بفەرموون، ئێستا لەگەڵ ڕێژیمی خومەینی پێوەندیو وتووێژتان هەیە؟ مەبەستم ئەوەیە کە پێوەندیەك هەیە لە نێوان ئێوەو دەسەڵاتی ئێراندا؟

و: لە هەلومەرجی ئێستادا هیچ چەشنە وتووێژێك لە نێوان حیزبی دێموکراتو ڕێژیمی خومەینیدا لە ئارادا نیەو رای ئێمە لە سەر ڕێژیمی خومەینی هەر ئەوەیە کە چەندین جار گوتوومانەو ئێستایش دووپاتی دەکەمەوە. ئەویش ئەوەیە کە لە چوارچێوەی کۆماری ئیسلامیدا هیچ کام لە داخوازە بنەڕەتیەکانی ئێمە واتە دێموکراسیو خودموختاری دەستەبەر نابن. با ئەوەش بڵێم کە حیزبی دێموکرات وەك نوێنەری زۆربەی خەڵکی کوردستان هەر کاتێك بە پێویستی بزانێ، حەقی خۆیەتی کە لە پێناوی گەیشتن بە داخوازەکانی گەلی کورد لەگەڵ ئەم یا ئەو ڕێژمەدا وتووێژ بکا. وەك بنەمایەك ئێمە وتووێژ بە شێوەیەك لە خەبات دەزانین.

پ: لەگەڵ ڕێزو سوپاس لە ئێوە بۆ بەشداریتان لەم وتووێژەدا، دەکرێ وەڵامی دوو پرسیاری دیکەی من بدەنەوە؟

و: بەڵێ فەرموون.

پ: پرسیارەکەم لە بارەی شەڕی ئێرانو عێراقەوەیە. بە بڕوای ئێوە، ئەم شەڕە لە چ هەلومەرجێکدا دەکوژرێتەوە؟

و: ئەم شەڕە بۆ خەڵکی ئێرانو عێراق زۆر بە گران تەواو بووە، نزیکەی یەك میلیون کوژراوو نوقسان لە ئێرانو ٥٠٠ هەزار کەسیش لە عێراقو هەروەها وێرانبوونی بەشێکی زۆر لە شارەکانو دامەزراوە ئابوورییەکانی هەر دوو وڵاتی بەدواوە بوو. ئەمەیە لیستەی بەرامبەری ناتەواوی ئەم شەڕە بێئاکامە، ئەگەر شوێندانانی پڕ زەرەرو زیانی ئەم شەڕە لە باری ڕەوانییەوەو هەروەها لە سەر ورەی لاوەکانو لە ژیانی بنەماڵەکان بەتایبەت ئەو ژنە گەنجانەی کە هاوسەرەکانیان لەدەست داوە لە بەرچاو بگرین، تێدەگەین کە بەداخەوە ئەم شوێندانانە درێژخایەن دەبێو ئەوجار لە گەورەیی ئەو بەڵایە کە شەڕی ناوە دەگەین. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە خومەینی تەرحی ئاوەها شەڕێکی ئامادە دەکرد، ئێستاش ئەوە شەش ساڵ بە سەر ئەو شەڕەدا ڕادەبرێ، بە تەواوی روونە داگرسێنەری شەڕ خومەینییە. ڕاستییەکی دیکەش ئەوەیە کە دەستدرێژی بۆ سەر خاکی وڵاتی ئێمە بە ئاشکرا لە لایەن

عێراقەوە بوو. لەگەڵ ئەوەیش ئێستا کە ئێمە لە سەر ئەو باوەڕەین‌و پێی لە سەر دادەگرین کە ئەگەر عێراق دەستی بە شەڕ نەکردبا، کۆماری ئیسلامی لە پێش‌دا هەنگاوی دەنا. بە هەر جۆرێك بێ ئەمانە راستییەکانی مێژوون، بەڵام ئەوەی زیاتر جێی مەترسی‌یە، راستی‌یەکی دیکەیە، ئەویش ئەوەیە کە درێژەدەری ئەم شەڕە هێندێك لە ئاخوندە دەسەڵاتدارەکانن کە لە سەرەوەی ئەوانە خومەینی‌یە. بۆیە، خەبات بۆ ئاشتی لەڕاستی‌دا جۆرێك خەباتە بۆ رووخاندنی رێژیمی خومەینی، چونکە لە مەسەلەی شەڕدا بە بن‌بەستی تەواو گەیشتووە. درێژەکێشانی شەڕ سەرکەوتنی دەوێ، تا ئێستا ئەو سەرکەوتنە وەدەست نەهاتوە. لە داهاتوویش‌دا ئەگەری سەرکەوتن زۆر لاوازە. راگرتنی شەڕ لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئاخوندییەوە بە مانای رەتکردنەوەی فەلسەفەی بوونی ئیدئۆلۆژیی رێژیمی ویلایەتی فەقیهی‌یە کە شەڕ وەك ئامرازێك دەزانێ بۆ ناردنە دەرەوەو بلاوکردنەوەی شۆڕشی ئیسلامی، بەم شێوەیەو لە هەلومەرجی درێژەکێشانی دەسەڵاتی ئاخوندەکاندا تەنیا بە شێوەیەك ئیمکانی ئاشتی هەیە ئەویش ئەوەیە کە یا رێژیم تووشی شکستێکی ئابڕووبەرانە لە شەڕدا بێ یا خودی خومەینی لە گۆڕەپاندا نەمێنێ. بەداخەوە تا ئەوکاتە شەڕ هەر درێژە دەکێشێ‌و دەیان هەزار کەسی دیکە دەبنە قوربانیی شەڕ، بەڵام باشترین رێگاچارە بۆ راگرتنی شەڕ، رووخاندنی رێژیمی کۆماری ئیسلامی‌یە کە لە لایەك ئاشتی‌و لە لایەکی دیکەوە ئازادی بۆ خەڵکی وڵاتەکەمان بە دیاری دێنێ.

**پ:** رای ئێوە بەرامبەر بە رەشەکوژی (تیرۆریسم) چیە؟

**و:** ئێمە تیرۆریزم بە کردەوەیەك دەزانین کە ژیان‌و ئازادی‌یەکانی خەڵکی بێ‌دیفاع دەخاتە مەترسی‌یەوە، لە وڵاتە رۆژئاوایی‌یەکاندا حەز دەکەن، تیرۆریزم لە چوارچێوەی بارمتەگیری ("گروگان گیری")دا بەرتەسك بکەنەوەو بۆمب دانانەوە لە شارە گەورەکاندا. هەروەها ئێمەش ئەوانە بە کردەوەی تیرۆریستی دەزانین‌و مەحکوومیان دەکەین، ماوەی حەوت ساڵە ئێمە لەگەڵ رێژیمێکی جینایەتکاری وەك رێژیمی خومەینی لە شەڕداین، بەڵام هەموو کاتێك دووریمان کردوە لە خستنە مەترسیی ژیان‌و ئازادیی خەڵکی بێ‌دیفاع. نەك ئەوەی هیچ کاتێك پەنامان نەبردوەتە بەر بارمتەگیری، بەڵکوو کومەکمان کردوە بە ئازادبوونی چەند بارمتە لە وڵاتە ئورووپایی‌یەکاندا بەتایبەت فەرانسە، بەڕای ئێمە بۆمبدانانەوەو بارمتەگیری لە

ماوەیەکی کورتدا دەبێتە هۆی پروپاگەندە بۆ ئەم یا ئـەو گـرووپ کـە ئـەو کارانـە دەکەن، بەڵام لە درێژخایەندا زیان دەدەن لە پێشینەو پرنسیپی جووڵانەوەو لای دەدەن لە رێبازی راستەقینەو لە نێوخۆوە لێکی بڵاو دەکاتـەوە، هـەر بـەم هۆیـەوە حیزبی دێموکرات لە بنەڕەتدا دژی بۆمبدانانەوەو بارمتەگیرییە کە ژیانو ئازادیی کەسانێ کە هیچ لێپرسراوییەکیان نیە بخاتە مەترسییەوە. بەڵام بەڕای ئێمە دەوڵەتی ئەمریکا کە خاکی گرانادای بە زۆر داگیر کردوەو لە لایەکیترەوە یارمـەتیی کونـترا دەکـا بـۆ ئەوەی لە خاکی نیکاراگوادا کردەوەی تیرۆریستیی بکا، ئەوەش تیرۆریست بە حیساب دێ. دەوڵەتی ئافریقای باشوور کە خەباتکارانی دژی رەگەزپەرستی دەداتە بەر گوللە، تیرۆریستە. رێژیمی خومەینی کە خەڵکی گوندەکانی کوردسـتان قـەتڵو عـام دەکـاو بەکردەوەو بەڕەسمی تیرۆریزم دەباتە ئاستی سیاسەتی دەوڵـەت، بـە پلـەی یەکـەم بـە تیرۆریست دەژمێردرێ. لەڕاستیدا وڵاتانی جیهانی سێهەمو بەتایبـەت جووڵانـەوەی رزگاریخوازی بە تیرۆریزم زانین، یەکێك لـە رێگـا تایبەتی‌یـەکانی ئیمپریالیسـتەکانە. ئەگەر فلان گرووپی فەلەستینی کە لە شارەکاندا بۆمب دادەنێتەوە، فڕۆکە دەفڕێنـێ، تیرۆریستە، دەوڵەتی ئیسرائیلیش کە ئوردوگای پەنابەرە فەلەسـتینی‌یەکان بۆمبـاران دەکا دەبێ وەك تیرۆریست بناسرێ. ئەگەر بۆمبدانانەوە لە کشتی ئیسـتانبولدا کـە بـووە هـۆی کوژرانـی ٢٤ کـەس بـە کردەوەیـەکی تیرۆریسـتی دەژمـێردرێو دەبـێ مەحکووم بکرێ، دەبێ دەوڵەتی تورکیەش بە تیرۆریست بزانینو مەحکوومی بکـەین، چوونکە خاکی کوردستانی عێراق بۆمباران دەکاو دەبێتـە هـۆی کوژرانـی زیـاتر لـە ٢٥٠ کەس لە خەڵکی بێدیفاع. لە لایەکی دیکـەوە نابـێ ئـەو راسـتی‌یە لەبـەرچاو نەگرین تا ریشەی تیرۆریزم لە بەین نەچێ، تیرۆریزم خاشەبڕ نابـێ، تـیرۆریزم هۆکـارە نـەك هـۆ، تێگەیشـتن لـە هۆیـەکانی پەرەسـتاندنی تـیرۆریزم مەبەسـت تـیرۆریزمی سیاسی‌یە، وەك بێعەدالەتی، قەیرانی کۆمەڵگاو ستەمی نەتەوایەتی، هـێزو توانـاو کاتێکی زۆری دەوێ. ئەگەر رۆژهەلات بە سەرچاوەی تیرۆریزم دەژمـێردرێ، لـە بـەر ئەوەیـە کـە زیـاتر لـە هـەر ناوچەیـەکی دیکـە، نـاوەندی نـاکۆکیو پێکدانـانی ئیستراتژیکی، سیاسی، ئابووری، ئایینیو نەتەوایەتی‌یە. تا ئەم ناکۆکی‌یانە لە بـەین نەچن، تیرۆریزم ریشەکێش ناکرێ، تـا ئـەو کـات خـەبات دژی تـیرۆریزم لـە ئاسـتی نێونەتەوەییدا نەتەنیا لەگەڵ دەستەو تاقمەکان، بەڵکوو زیاتر لەگەڵ ئەو دەوڵەتانـەی

که هانیان دەدەن دەبێ بکرێ (هیچ گومـــان لـەوەدا نیـە کـە رێژیـمی خومـەینی لـە سەرەوەی ئەو دەوڵەتانە دایە) مەرجی سەرکەوتنی خەباتێکی ئـاوا بەسـتراوەتەوە بـە یەکگرتوویی هەموو گـەلانی تینـوو و ئـەویندارى ئـازادی لـە سەرانسـەری دنیـادا بەتایبەت گەلانی جیهانی سێهەمو جووڵانەوەی رزگاریخوازی رەسەنو دێموکراتەکان.

# وتوویێژی ڕۆژنامەی کوردستان لەگەڵ
# هاوڕێی بەڕێز سکرتێری گشتیی حیزب کاك دوکتور قاسملوو*

**خوێنەرە بەڕێزەکان!**

لەم دواییانەدا هاوڕێی خۆشەویستو تێکۆشەر کاك دوکتور عەبدولڕەحمانی قاسملوو سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە سەفەرێکی پێنج مانگە بۆ دەرەوەی ولاّت گەڕایەوە. "کوردستان" ئەم هەلەی بە دەرفەت زانیو وتوویژێکی لەگەڵ هاوڕێ سکرتێری گشتیدا پێکهێنا کە لە خوارەوە دەخرێتە بەرچاوتان.

کاك دوکتور؛ لە پێشدا بە ناوی دەستەی نووسەرانی بلاّوکراوەی "کوردستان"ەوە بەخێرهاتنەوەت دەکەمو زۆر سوپاست دەکەم کە لەم وتوویێژەدا بەشدار بوویو ئامادەبییت هەبوو کە وەلاّمی پرسیارەکانمان بدەیەوە.

پ: پرسیاری یەکەممان هەموو سەفەرەکەتان دەگرێتەوە. دەکرێ بفەرمووی کە ئامانجی سەفەری ئەم ساڵتان بۆ دەرەوەی ولاّت چ بووەو سەفەرتان بۆ چەند ولاّتی بێگانە کردووە؟

و: منیش بە نۆرەی خۆم سوپاستان دەکەم. من بۆ نۆ ولاّتان سەفەرم کردوە کە یەکێکیان پێرۆ لە ئامریکای لاتین بوو و ئەوانی دیکە ولاّتەکانی ئورووپایی بوون. لەم سەفەرەدا چەند ئەرکم لەسەر شان بوو. ڕاگەیشتن بە ڕێکخراوەکانی حیزبی لە

---

* ڕۆژنامەی "کوردستان" ژمارەی ۱۲۰، خەزەڵوەری ۱۳٦٥

دەرەوەی وڵاتو هەروەها بە کارو تێکۆشانی دەفتەری حیزب لە پاریسو پێوەندی گرتن لەگەڵ ڕێکخراوە ئێرانییەکانو ئەو ڕێکخراوە کوردستانییانە کە نوێنەریان لە دەرەوە هەیەو هەروەها چاوپێکەوتن لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتو ڕێکخراوو شەخسیەتەکانی بێگانە. لەو سەفەرەدا لە کۆنگرەی "ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست"یش بەشدار بووم، دیارە مەبەستیشم ئەوە بوو کە هەم بە وتوویژ لەگەڵ ڕۆژنامەو رادیۆو تەلەویزیۆن، خۆشەویستیی بیروڕای گشتیی جیهانیو ڕێکخراوە دێموکراتیو بەشەردۆستەکان بۆ لای خەباتی حیزبە خۆشەویستەکەمانو جووڵانەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێرانو هەموو گەلانی ئێران دژی ڕێژیمی خومەینی رابکێشم، هەم داوای پشتیوانیی سیاسیو مەعنەوی لە دۆستەکانی خۆمان لە دەرەوە بکەمو هەم لەو ڕێکخراوانە کە بەشەردۆستن داوای ناردنی پزیشکو دەرمانو وەرگرتنی کەم ئەندامو پێشمەرگەی بریندار بکەم.

پ: وەك دەزانین ڕێبەرایەتیی بەشێکی زۆر لە هێزەکانی ئوپۆزسیۆنی ئێران لە دەرەوە دەژین، داخوا لەم سەفەرەدا لەگەڵ ڕێبەرایەتیی ئەو حیزبو ڕێکخراوانە دیدارتان کردوە یان نا و ئەگەر چاوپێکەوتنێك هەبووە، لەگەڵ کام یەك لەو ڕێکخراوانەدا بووەو چ مەسائیلێکی تێدا باس کراوە، پاشان داخوا ئیمکانی پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتووی نیشتمانپەروەرەکانی ئێران لە پێناوی ڕووخاندنی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیدا چۆن دەبینن؟

و: پێوەندی لەگەڵ ڕێکخراوە ئێرانییەکان بۆ پێکهێنانی هاوکاریو هاوپەیمانیو لە پاشان دیارە بۆ پێکهێنانی بەرە بووە. دەتوانم بڵێم کە تەقریبەن لەگەڵ زۆربەی ئەو هێزانە کە دژی خومەینینو شاپەرستیش نین قسە کراوە. هەموو ئەو هێزانە زۆر هیوایان بە حیزبی دێموکراتە. پێیان وایە حیزبی دێموکرات دەبێ بۆ پێکهێنانی هاوکاری لە نێو هێزەکانی ئێرانیدا نەخشێکی گرینگی هەبێو پێشەنگ بێ. لەسەریەك ئەو پێشوازییەی کە لە پێشنیارەکانی حیزبی دێموکرات بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانیو بەرە کراوە لەوە زیاتر بوو کە چاوەڕوان دەکرا. ئێستا پاش تاقیکردنەوەی تاڵی حەوت ساڵی رابردوو، زۆر لە هێزە دێموکراتییەکانو ڕێکخراوەکانو شەخسییەتەکان هاتونە سەر ئەو بڕوایە کە یەکێتیو یەکگرتوویی هەموو هێزە دێموکراتییەکان پێویستە. هەموو ئەوانەی کە من قسەم لەگەڵ کردون چ

ڕێکخراوەکانی چەپی مارکسیستی بن‌و شەخسیەتی ئازادیخواز بن لەو بڕوایەدان کە ئێستا بەتالاٚیی‌یەك لە مەیدانی خەباتی سیاسیی ئێراندا پێکهاتوە. دیارە بۆ دێموکرات‌و ئازادیخوازەکان، هەروەها ئەگەر وەختێك بە بوونی حیزبی دێموکرات‌و چەند ڕێکخراوو شەخسییەتی دیکە لە شوورای میللیی موقاومەتدا، ئەو شوورایە بە بەدیلێکی ڕێژیمی خومەینی دادەنرا، ئێستا ئیمکانی ئەوەی لەدەست داوە ببێتە بەدیلێکی دێموکراتی بۆ دواڕۆژی نیشتمانی ئێمە. کەوابوو هەموو دێموکراتەکان بەگشتی هەست بەوە دەکەن کە ئەو بەتالاٚیی‌یە، کە پێك هاتوە، دەبێ لە لایەن بەرەیەکی دێمۆکراتیی بەرین لە هەموو هێزو ڕێکخراوو شەخسییەتەکانەوە پڕ بکرێتەوە. چونکە هەموو هەست بەوە دەکەن کە هەلومەرجی ئێستای ئێران زۆر ناسکەو ڕێژیمی خومەینی تووشی تەنگو چەڵەمەیەکی یەکجار زۆر هاتوە. پێویستە هەرچی زووتر، بەلاٚم پاش چارەسەرکردنی هەموو گیروگرفتەکان، بەرەی دێموکراتی لە هەموو ئازادیخوازانی ئێران پێك بێ. لەسەر ئامانجەکانی بەرە کە لە پێشنیاری حیزبی دێموکراتدا کە لە ژمارەی ۱۱٤ی ڕۆژنامەی "کوردستان"دا بلاٚو کراوەتەوە، هاتون، هەموو نەزەری موافیقیان هەبوو. واتە ئەو چوار ئامانجە گشتی‌یە بریتین لە پێکهێنانی ئێرانێکی سەربەخۆو بێلایەن‌و غەیرە موتەعەهید، دابینکردنی دێموکراسی‌و ئازادی‌یە دێموکراتی‌یەکان لە ئێراندا، دابینکردنی مافی نەتەوەیی گەلانی زۆرلێکراوی ئێران بە شێوەی خودموختاری یان فدراتیڤو دابینکردنی مافی ئابووری‌و کۆمەلاٚیەتیی زۆربەی خەڵکی ئێران کە زەحمەتکێشانن. لەسەر ئەو چوار ئامانجە، ڕەنگە لە فورمووڵەکردنی هێندێ ڕستەدا ناکۆکی هەبێ، بەلاٚم بەگشتی هەموو ئەو کەسانە کە قسەیان لەگەڵ کراوە موافیق بوون. هەمووش لەو بڕوایەدابوون کە ئامانج تەنیا ڕووخاندنی ڕێژیمی خومەینی نیە. بەڵکوو دەبێ بەدیلێك پێك بێ کە بتوانێ لە پاش ڕووخاندنی ڕێژیم، جێگای بگرێتەوە. بۆیە هەموو ئەو کەسانە کە دژی ڕێژیمی سەڵتەنەتین‌و بە شێوەیەك دژی ڕێژیمی خومەینی خەبات دەکەن‌و ئیمانیان بە هاوکاری‌و پلۆرالیزمی دێموکراتیك هەیە، دەتوانن لەو بەرەیەدا بەشدار بن. هەروەها لەسەر شێوەی پێکهێنانی بەرە زۆر قسە کراوەو لەو مەسەلەیەشدا بەگشتی دەتوانم بڵێم کە تەبایی هەیە. یەکەم ئەوە کە ڕاستە کە پێکهێنانی بەرە زۆر زەرووری‌یە، بەلاٚم نابێ پەلە بکرێ. دەبێ هەموو گیروگرفتەکانی بەرە لە پێشدا

چارەسەر بکرێن، بەرنامەکەی دابنرێ، پێڕەوی نێوخۆی بۆ دابنرێ، ئەندامانی بەرە کۆ ببنەوەو ئەو دوو بەڵگەیە پەسند بکەن. دیارە ئەمەش پرۆسەیەکە کە هەم وەختی دەوێو هەم کارکردن. بۆیە لە لایەکەوە ناکرێ پێکهێنانی بەرە زۆر وەپاش بخرێو لە لایەکی دیکەوە زۆر پێویستە بەپێی ئەو تاقیکردنەوەیە کە لە شووڕای میللیی موقاومەت هەمانە، هەموو ئەو گیروگرفتانە پێش پێکهاتنی بەرە چارەسەر بکرێن‌و داخوازەکانی بە روونی فورموولە بکرێن‌و هیچ گیروگرفتێکی ئەوتۆ نەمێنێ کە هەر لە سەرەتای پێکهاتنی بەرەدا ببێ بە تەنگوچەڵەمەیەك لە کارو تێکۆشانی ئەو بەرە دێموکراتی‌یەدا. گرینگ ئەوەیە کە هەموو لایەنەکان تێبگەن کە بە پاراستنی ئەسڵی پلۆرالیزمی دێموکراتی‌و بە هەوڵنەدان بۆ سەپاندنی هێژمۆنی لەو بەرەیەدا دەبێ موحیتێکی زۆر ساغ‌و سەلیمی هاوکاری لەو بەرەدا پێك بێ. ئەگەر ئەو موحیتە بەڕاستی دێموکراتی بێ‌و هەموو هێزەکان بتوانن پێکەوە هاوکاری بکەن، خۆی نموونەیەکە بۆ هاوکاری‌و پێکەوە ژیان لە دوارۆژی پاش رووخاندنی رێژیمی خومەینی‌دا. بۆ ئەوەی ئەو هێزانە بتوانن پێکەوە لە بەڕێوەبردنی ولاتیش‌دا لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئێرانیش‌دا هاوکاری بکەن بەگشتی دەتوانم بڵێم کە ئەو پێشوازی‌یە لە پێشنیارەکانی حیزبی دێموکرات بۆ پێکهێنانی بەرەی دێموکراتی کرا، لەوە زیاتر بوو کە چاوەڕوان دەکرا. ئێستا لەو بڕوایەدام کە ئەگەر ئەو پێوەندی‌یانە درێژەیان پێ بدرێو لەگەڵ هەموو ئەو هێزو شەخسییەت‌و رێکخراوانەش کە تا ئێستا قسەیان لەگەڵ نەکراوە قسە بکرێ، بەرەی دێموکراتیی دژی ئیمپریالیستی کە پێشنیاری حیزبی ئێمەیە لە دوارۆژێکی نەك زۆر دووردا پێك دێ‌و دەبێتە هیوایەکی زۆر گەورەتر بۆ زۆربەی گەلانی ئێران کە لایەنگری دێموکراسی‌و ئازادین‌و لایەنگری ئەوەن کە ئێرانێکی سەربەخۆ هەبێ‌و گیروگرفتی گەلانی زۆر لێکراوو هەروەها زەحمەتکێشانیشی تێدا چارەسەر بکرێ.

پ: کاك دوکتور ئەگەر دەکرێ بفەرموون مەسەلەی کورد بەگشتی‌و مەسەلەی کوردی ئێران بەتایبەتی لە لای بیروڕای گشتی‌و هێزە پێشکەوتوەکانی دەرەوەی ولات چۆن ناسراوەو هاودەردیی دنیای دەرەوە لەگەڵ خەڵکی کوردستان چۆنە؟

و: دەتوانم بڵێم کە مەسەلەی کورد بەگشتی زۆر لە جاران زیاتر لە ولاتەکانی ئوروپایی باس دەکرێو تەنانەت ئەو باسە گەیشتۆتە ئامریکاش، لەگەڵ هەر

شەخسییەتێکی سیاسی یا بەشەردۆستی بێگانەو هەر نوێنەرێکی ڕێکخراوەکانی دێموکراتی لە حیزبە سۆسیالیستو کومۆنیستو دێموکراتو لیبراڵەکان کە قسەم کردوە، هاودەردیی خۆیان بەتەواوی لەگەڵ خەباتی گەلی کورد دەربڕیوەو داخوازەکانیان بە ڕەواو بەرحەق زانیوە. تەنانەت زۆر جار پێیان سەیرە کە لە ئێراندا حیزبی ئێمە ئەوە حەوت ساڵە ناچارە شەڕێکی چەکدارانە دژی ڕێژیمی خومەینی بەڕێوە ببا بۆ داخوازێکی زۆر ڕەوا وەك خودموختاری بۆ ئەوە کە گەلی کورد کاروباری نێوخۆیی بۆخۆی هەڵسووڕێنێ، بۆ ئەوە کە بە زمانی کوردی بخوێنێ و بۆ ئەوە کە لە زوڵمو زۆری ئەوانەی کە لە لایەن دەوڵەتی مەرکەزییەوە لە کوردستاندا حاکمییەتیان بەدەستەوە گرتوە، ڕزگاری بێ. دیارە ڕێکخراوو شەخسییەتەکان زیاترو ئازادانەتر باسی مەسەلەی کورد دەکەنو پشتیوانیی لێ دەکەن، بەڵام کە دەگاتە دەوڵەتەکان ئەوە کەمتر دەبێ. هۆیەکەشی دیارە ئەو دەوڵەتانە بەگشتی لەبەر وەزعی ژێئۆپۆلیتیکی، یانی وەزعی سیاسیو جوغرافیایی کوردستان لەگەڵ هەر کام لەو دەوڵەتانەی کە کوردیان تێدا دەژی پێوەندیی دۆستانەیان هەیەو لەبەر ئەوە بە ئاشکرا ناوێرنو نایانەوێ پشتیوانیی خۆیان لە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد دەربڕن، بەڵام زۆر کەس لەوانەی کە لە نێو دەوڵەتیشدا نفوزیان هەیەو قسەم لەگەڵ کردون لە نوێنەرانی مەجلیسو لە وەزیرو لە کاربەدەستان خۆیان بە پشتیوانی خەباتی گەلی کورد دەزانن. پێم وایە ئەگەر مەسەلەی کورد زیاتر لە جاران بە بیروڕای گشتیی جیهانی بناسێندرێو بەتایبەتی ڕادیۆو تەلەویزیۆنو ڕۆژنامەکان زیاتر لەسەری بنووسنو بیروڕای گشتیی جیهانی باشتر لە مەسەلەی کورد حاڵی بکرێو بەرەبەرە سەرنجی بۆ پشتیوانی لەو مەسەلەیە رابکێشرێ، ئەو وەختە زۆر لەو دەوڵەتانەش هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد باشتر دەکەنو ڕەنگە ئەو وەختە بوێرن بە ئاشکراش پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد بکەن. بەڵام با ئەو ڕاستییەش بڵێم کە پشتیوانییەکە ئێستا نیسبەت بە کوردی ئێران زیاتر لەبەر چاوە، ئەوە لە لایەك لەبەر ئەوەیە کە ڕێژیمی خومەینی لە دەرەوە بە کۆنەپەرستو دژی گەلی ناسراوە، خەڵکی دەرەوە خەباتی کورد بە ڕەوا دەزانن. لە لایەکی دیکەش کە حیزبی دێموکرات بە حیزبێکی مەسئوول، حیزبێکی شۆڕشگێڕو هەر لەو کاتەدا دێموکرات دەناسن. ئەم مەسەلەیە بۆ ئەوان زۆر گرینگە کە حیزبی دێموکرات

تیرۆریزم رەت دەکاتەوەو "گروگان" ناگرێ، تەیارە نارفێنێ، بە تەنیا لە مەیدانی تێکۆشانی ئوسوولیدا زۆر ئازایانەو بە شێوەیەکی شۆڕشگێڕانە خەبات دەکا. بەلاّم هەر لەو کاتەدا سیاسەتێکی ئینسانیو دێموکراتیش بەڕێوە دەبا. بۆیە دەتوانم بلێم کە ئێستا دەولەتو شەخسییەتو ڕێکخراوو حیزبە سیاسیو بەشەردۆستەکان سەرنجیان زیاتر لە جاران بۆ پشتیوانی کردن لە خەباتی گەلی کورد لە ئێران راکێشراوەو بێگومان ئەگەر خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران ڕێكوپێکتر لە جاران بەرەو پێش بچێو بە دنیای دەرەوەش بناسێندرێ، ئەو پشتیوانییە زیاتریش دەبێو باشتریش خۆی دەنوێنێ.

پ: بیرورای گشتیی جیهانی، رێژیمی کۆماری ئیسلامی چۆن دەناسێو داخوا چ ولاّتانێك لەگەڵ رێژیمی خومەینی دۆستایەتیو هاوکاری دەکەن؟

و: بێگومان کۆماری ئیسلامی لە دەرەوەی ولاّتیش بە رێژیمێکی دژی دێموکراتیو دژی ئینسانیو تیرۆریست ناسراوە. بیرورای گشتیی جیهانی دژی کۆماری ئیسلامیو رێژیمی ئاخوندەکانەو نەك هەر هیچ رێکخراوێکی دێموکراتو ئازادیخوازو پێشکەوتوو، تەنانەت هیچ شەخسییەتێکی پێشکەوتووش پشتیوانیی لێ ناکا. بەڵکوو بە ئاشکرا دژایەتیی خۆیان لەگەڵ رێژیمی خومەینی دەردەبڕن. ئەگەر لە نێو شەخسییەتەکاندا بە دەگمەن کەسێك هەبێ کە پشتیوانی ئەو رێژیمە بێ، لەبەر ئەوە کە رێژیمی خومەینی زۆر ناخۆشەویستەو بیرورای گشتیی جیهانی لێی بێزارە، ناوێرێ بەئاشکرا پشتیوانیی لێ بکا. ئەوەی کە پێوەندیی بە دەوڵەتانەوە هەیە، لە رۆژهەلاّتی نێوەڕاست دوو دەوڵەت، سووریاو لیبی پشتیوانی لە رێژیمی خومەینی دەکەن. دیارە پشتیوانیی ئەوان لە رێژیمی خومەینیش لەبەر ئەوە نیە کە ئەو رێژیمە بە رێژیمێکی باشو رێژیمێکی خۆشەویست دابنێن. بەڵکوو دۆستایەتی ئەوان لەگەڵ رێژیمی خومەینی، زیاتر لەبەر دوژمنایەتییانە لەگەڵ حکوومەتی عێراقو چونکە رێژیمی خومەینی بە دوژمنی حکوومەتی عێراق دادەنێن پشتیوانیی لێ دەکەن. لە ناوچەکانی دیکەی دنیادا هێندێك دەوڵەتی بچووك کە شیعارە توندەکانی خومەینی بە نیشاندەری سیاسەتی ئەو رێژیمە دەزانن، وەکوو شیعاری دژی ئامریکایی، پشتیوانیی لێ دەکەن، و هێندێکیشان کەڵکی ئابووری لە هاوکاریی خۆیان لەگەڵ رێژیمی خومەینی وەردەگرن. مەسەلەن نەوت بە هەرزان دەکڕن، شتومەکی خۆیانی پێ دەفرۆشن. بەلاّم

لە ئوروپا هیچ دەوڵەتێك هەرچەند هاوكاری‌و دۆستایەتیشی لەگەڵ رێژیمی خومەینی هەبێ ناوێرێ باسی ئەو دۆستایەتی‌و هاوكاری‌یە بكا. هێندێ لە دەوڵەتانی ئورووپای رۆژئاوا سیاسەتی خۆیان لەسەر قازانجی ئابووری ولاتەكەیان داناوە، وەك ئالمانی رۆژئاوا، ئینگلستان كە ئەوانە پێوەندیی باشی بازرگانی‌و ئابووری‌یان لەگەڵ رێژیمی خومەینی هەیە. بەلام تەنانەت كاربەدەستانی ئەو دەوڵەتانەش لەبەر بیروڕای گشتیی ولاتی خۆیان ناتوانن‌و ناوێرن بە ئاشكرا دیفاع لە كۆماری ئیسلامی‌و رێژیمی خومەینی بكەن.

**پ:** كاك دوكتور! وەك دەزانین ئێوە لە سەفەری ئەمسالی خۆتاندا لە كۆنگرەی ئەنترناسیۆنالی سۆسیالیستدا بەشدار بوون. ئەگەر بكرێ حەز دەكەین بفەرموون، ئەو كۆنگرەیە كەنگێ‌و لە كوێ پێك هات‌و ئێوە بە چ عینوانێك تێی‌دا بەشدار بوون‌و ئاكامی كاروباری كۆنگرەكە چ بوو؟

**و:** لەسەر دەعوەتی ئەنتێرناسیۆنالی سۆسیالیست كە مەركەزی لە لەندەنە، چووم بۆ كۆنگرەی حەوتەمی ئەو ئەنتێرناسیونالە كە لە شاری "لیما" پێتەختی پێرۆ پێك هاتبوو. ئەو كۆنگرەیە لە مانگی پووشپەڕی ئەمساڵدا گیرا. ئەنتێرناسیۆنالی سۆسیالیست رێكخراوێكە كە ساڵی ١٩٥١ دامەزراوە. بە دەیان حیزبی سۆسیالیست‌و دێموكرات‌و سۆسیال دێموكرات كە لایەنگری سۆسیالیزمن لەو ئەنتێرناسیونالەدا كۆبوونەتەوە. دیارە ئەنتێرناسیۆناڵ سۆسیالیست لە سەرەتاوە كە دامەزراوە ئەنتێرناسیۆنالی حیزبە سۆسیالیست‌و سۆسیال دێموكراتەكانی ئورووپای رۆژئاوا بووە. هەر لەبەر ئەوەش نەیتوانیوە زۆر سەرنج بداتە مەسەلەی ولاتەكانی جیهانی سێهەم كە بۆ سەربەخۆیی‌و ئازادی خەباتیان دەكرد، یان بۆ سەر جوولانەوەی رزگاریخوازیی گەلان كە بە شێوەیەكی شۆڕشگێڕانە دەیانەویست نیشتمانی خۆیان رزگار بكەن. بەرەبەرە ئەو رێكخراوە، واتە ئەنتێرناسیۆناڵ سۆسیالیست لە نێو ولاتەكانی جیهانی سێهەم‌و بەتایبەتی ئامریكای لاتیندا نفووزی كردووەو ئێستا زۆر لە حیزبە سۆسیالیست‌و سۆسیال دێموكراتەكانی ئەو بەشەی دنیا تێی‌دا ئەندامن یا هاوكاری لەگەڵ ئەنتێرناسیۆناڵ سۆسیالیست دەكەن. هەروەها ئێستا بەرەبەرە ئەنتێرناسیۆناڵ سۆسیالیست لەگەڵ ولاتەكانی ئاسیاییش هاوكاری زیاتر بووەو هێندێك لە حیزبەكانی ئەو ولاتانەش لە رۆژهەلاتی نێوەڕاست‌و لە ئاسیای دوور

ئـەندامی ئەنتێرناسـیۆنالْ سۆسیالیسـتن، حکوومـەتیان بەدەسـتەوەیە. واتـە ئەنتێرناسیۆنالْ سۆسیالیست هەرچەند خۆی ناتوانێ وەك هێزێکی تایبـەتی لـە باری نیزامیو ئابووریی‌وە بجوولێتەوە، بەلاّم وەك هێزێکی سیاسیو مەعنەوی نەخشێکی زۆر گرینگی هەیە. سەرۆکی ئەنتێرناسیۆنالّی سۆسیالیست "ویل براند"ە کە وەختێك سـەرۆکی ئالّمـانی رۆژئـاوا بـووەو هـەموو ئـەو حیزبانـەی کـە لـە ئەنتێرناسـیۆنالْ سۆسیالیسـتدا ئـەندامن سـەرۆکەکانیان موعـاونی سـەرۆکی ئەنتێرناسـیۆنالّی سۆسیالیستن. مەسەلەن لە رۆژهەلاّتی نێوەڕاستدا حیزبی سۆسیالیستی پێشکەوتووی لوبنان ئەندامی ئەنتێرناسیۆنالْ سۆسیالیسـتە. هـەر بۆیـەش "ولیـد جنبلاط" لـەو کۆنگرەیەدا بە موعاونی سەرۆکی ئەنتێرناسـیۆنالّی سۆسیالیسـت هـەلّبژێردرا. لـەو کۆنگرەیەدا نزیکەی چوارسەد نوێنەر بەشدار بوون. زۆریـان لـە ئامریکـای لاتینـەوە هاتبوون. بەلاّم تەقریبەن هەموو حیزبە سۆسیالیستەکانی ئورووپای رۆژئاواو هەروەها ئوسترالیاو نیوزیلاندو چەند ولاّتێکی ئاسیایی تێیدا بەشدار بوون. هەروەها نوێنەرانی رێکخـراوە رزگـاریخوازو شۆڕشـگێڕەکانی وەك رێکخـراوی رزگـاریخوازی فەلەسـتین، ئەریترە، پۆلیساریۆ، ئیلسالوادۆر، شیلی، پاراگوا، نیکـاراگواو سـواپۆ لـە ئـەفریقای جنووبی لەم کۆنگرەیەدا بەشدار بوون. بۆ یەکەم جار بوو کـە نوێنـەری رێکخراوێکـی کوردستانی وەك میوان لە کۆنگرەی ئەنتێرناسیۆنالْ سۆسیالیستدا بەشدار بـوو. لـەو کۆنگرەیەدا ئەوانەی ئەندام بوون حەقی دەنگدانیـان هـەبوو. ئەوانـەی هاوکـار بـوون جارێ لە کۆنگرەکـانی ئەنتێرناسـیۆنالّدا بەشـداربوونو هـەروەها میوانـەکان حـەقی دەنگدانیان نەبوو بەلاّم دەیانتوانی لە کۆبوونەوەی گشتیی کۆنگرەدا قسە بکەن. بەوە کە هێندێك لە رێکخراوەکانی جیهانی سێهەمو بەتایبەتی ئەمریکای لاتـین چوونەتـە نێو ئەنتێرناسیۆنالّی سێهەم، ئەنتێرناسـیۆنالْ لـەو وەزعـە کـە تـەنیا رێکخراوێکـی ئورووپایی بوو هاتۆتە دەرو بەرەو ئەوە دەڕوا کە دێموکراتیکترو پانو بـەرینتر بـێو تەنانەت لایەنی شۆڕشگێڕیشی هەبێ. لەو بارەوە ناکرێ ئەنتێرناسیۆنالْ سۆسیالیستی ئێستا لەگەلْ ئەنتێرناسیۆنالّی پێش شەڕی جیهانیی دووهەم بەراوەرد بکەین کـە لـەو کاتـەدا ئەنتێرناسـیۆنالْ رێکخراوێکـی ولاّتـانی ئورووپـای رۆژئـاوا بـوو، لـە هیـچ خـەباتێکی شۆڕشـگێڕانە یـان چەکدارانـە پشـتیوانیی نـەدەکرد. لـە کـاتێکدا لـە ئەنتێرناسیۆنالْ سۆسیالیستدا ساندنیستەکانی نیکاراگوا زۆر جار وەك میوان بەشدار

بوون‌و قسەی خۆیان کردوەو ئەنتێرناسیۆنالیش پشتیوانیی لیٚ کردون. ئەمجارەش لە کۆنگرەی حەوتدا بەشدار بوون. هەروەها فەلەستینی‌یەکان‌و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران‌و زۆر رێکخراوی شۆڕشگێڕی ئامریکای لاتین‌و ئەفریقای جنووبی‌و ئەفریقا بەگشتی لەو کونگرەیەدا بەشدار بوون. بەلاّم راستی ئەوەیە کە جاریٚ لە ئەنتێرناسیۆنالٚ سۆسیالیستدا زمانی زۆربەی ئەوانە کە لە لایەن ئورووپای رۆژئاواوە قسە دەکەن لەگەلٚ زمانی ئەوانە کە لە جیهانی سێهەمەوە قسە دەکەن فەرقی هەیە. مەسەلەن ئەگەر قسەکانی "ویلی براند" لەگەلٚ قسەکانی سەرۆك کۆماری پێرۆ "ئالین گارسیا" کە زۆر دژی ئیمپریالیستیو شۆڕشگێڕانە بوون بەراورد بکەین ئەو جیاوازییە بەرچاو دەکەویٚ. بەڕاستی قسەکانی "ئالین گارسیا" تا رادەیەکی زۆر راست ئەو بیرو باوەڕەیان دەردەبڕی کە ئێمەش وەك حیزبی دێموکرات لە ئێراندا هەمانەو لەسەر زۆر مەسەلەی گرینگی خەباتی دژی ئیمپریالیستیو هەروەها خەبات بۆ دێموکراسی، بۆ رزگاریی گەلان بیروڕای وەك بیروڕای ئێمەیە. تەنانەت زۆر ئیستلاحیش کە لە قسەکانی "ویلی براند"دا بەکار نەدەهات وەك مەسەلەن هێرش کردن بۆ سەر سەرمایەداری یا بۆ سەر ئیمپریالیسم لە قسەکانی "ئالین گارسیا"دا کە لە لایەن حیزبی سۆسیالیستی پێرۆوە بە سەرۆك کۆمار هەلبژێردراوە، ئەنتێرناسیۆنالٚ سۆسیالیتیش گیانی دژی ئیمپریالیستی بەرچاو بوو کافی‌یە سەیری بەلگەکانی پەسندکراوی کۆنگرەی حەوتەم وەك مەسەلەی قەرزی ولاّتانی ئامریکای لاتین یا لە نێو بردنی مەترسیی چەکی ئەتۆمی بکەین. دەمەویست لێرەدا ئیشارە بە دوو بەلگەی دیکەی ئەو کۆنگرەیە بکەم. یەکەمینیان قسەکانی "میشێل رۆکار" یەکێك لە بەڕێوەبەرانی بەرچاوی حیزبی سۆسیالیستی فەرانسە بوو کە زیاتر لەسەر سۆسیالیزمی دێموکراتیك قسەی کرد. هەر چەند خۆی ئورووپایی‌یە، بەلاّم لە چەند بارەوە قسەکانی لەگەلٚ ئەو بۆچوونەی کە ئێمە بۆ سوسیالیزمی دێموکراتیك هەمانە یەکتر دەگرنەوە. دووهەم سفارش‌نامەیەك بوو کە لە لایەن کۆنگرەی حەوتەمی ئەنتێرناسیۆنالی سۆسیالیستەوە دەرچوو، بە ناوی سفارشنامەی لیما، دیارە ئەوە بەلگەی دوایی نیە، ئەو بەلگەیە دەبیٚ شتی لیٚ زیاد بکریٚو بەتەواوی پەسند بکریٚ، بەلاّم سفارشنامەی لیما زۆر مەسەلەی ئەساسیی سەردەمی ئێمەی هێناوەتە گۆڕیٚو بۆچوونێکی شۆڕشگێڕانەو دژی ئیمپریالیستیو دێموکراتی‌یەو پێشنیاری

چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی کردوە کە بەتایبەتی دیفاع لــە ئـازادیو ئازادیـیە دێموکراتیـیەکان، دیفاع لە حەقی گەلانی زۆرلێکراو، دیفاع لە مافی ژنانو هــەروەها روونکردنەوەی هێندێك باری زۆر گرینگی سۆسیالیزمی دێموکراتیکە. دیارە قــازانجی چوونی خۆم وەك نوێنەری حیزبی دێموکرات بۆ کۆنگرەی حەوتــەمی ئەنتێرناسـیۆناڵی سۆسیالیســت مــن لــە دوو شــتدا دەبینـم، یەکـەم ئەوەیـــە کـــە لەگـــەڵ خـــودی ئەنتێرناسیۆناڵی سۆسیالیست لە نزیکەوە ئاشنا بووم. لە دوورەوە ئینســـان تــەنیا لــە چاپەمەنیو لە بەڵگەکانییەوە تەماشای ئەو ڕێکخراوە دەکاو لەگەڵ ئەو شێوەیە کـە لە کۆنگرەکەیدا بە چاوی خۆی دەبینێو لەگــەڵ زۆر کــەس لــە ئــەندامانی پێوەنـدی دەگرێ، فــەرقی هەیــەو ئــەو پێوەندییانــەش کــە لەگــەڵ زۆر لــە نوێنــەرانی حیزبـە سۆسیالیستەکانو دێموکراتەکان گیراوە بێگومان بــۆ دوارۆژی حــیزبی ئێمــە قــازانجی هەیە. دووهەم ئەوەیە کە لەگەڵ وڵاتانی ئامریکای لاتیندا ئاشناییم پەیدا کرد کە پێم وایە دنیایەکی دیکەیەو ئێمە هەتا ئێستا ئەو دنیایەمان نەناســیوەو کەڵکیشــمان لێ وەرنەگرتوە. پێم وایە کە دەبێ حیزبی دێموکرات لەو دەرەتانەی کـــە بــۆی پێکهــاتوە کەڵك وەربگرێو بەرەبـــەرە پێوەندیــی خــۆی لەگــەڵ زۆر لــە ڕێکخــراوو شەخســیەتە دێموکراتیو سۆسیالیستەکانی ئامریکای لاتین دامەزرێنێ. چونکە وڵاتانی ئامریکای لاتین کە ٣٠٠ میلیۆن زیـــاترن، نەخشــێکی زۆر گرینگیـــان لــە مــەیدانی سیاســەتی جیهانیدا هەیە، بەتایبەتی لەو کاتەوە کە زۆربەیان بەرەو دێموکراتیبوون رۆیشـــتون. لەواقیعدا ئێستا تەنیا دوو وڵاتــی وەك پاراگوئــەو شـیلی مــاون کــە دیکتاتۆرییـان بەتەواوی تێدا دامەزرابێ ئەوانەی دیکە زیاتر بەرەو دێموکراسی رۆیشتونو خودی ئەو پرۆسەی دێموکراتییەش بۆ ئێمە جێگای سەرنجو فێربوونو دەرس وەرگرتنە. ئــەوەش کە ئێمە وەك ڕێکخراوێکی کوردستانی لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بووین خۆی نیشــانەی ئەوەیــە کــە حــیزبی ئێمــە حــیزبێکی بــەرپرسو حــیزبێکی دێموکــراتو لایــەنگری سۆسالیزمەو بە حیزبێکی ئەوتۆ دەناسن کە لـــە دوارۆژدا لــە سیاســەتی رۆژهــەلاتی نێوەڕاستدا تەئسیری دەبێ. بەڵام ئێمە ئەندامی ئەنتێرناســیۆناڵ سۆسیالیســت نـینو داوای ئەندامەتیشمان نەکردوەو دیارە لەگەڵ هەموو بڕیارەکــانی یــا سیاسەتەکەشـی موافیق نین. بەداخـــەوە کۆنگـرەی حەوتــەمی ئەنتێرناســیۆناڵی سۆسیالیسـت لەبـەر هێندێ رووداوی نالەبار کە پێك هات کە بریتی بوو لە ڕاپەڕینی زیندانییەکانی ســێ

بەندیخانەو هەروەها دانانی بۆمب لە پێش ئەو هۆتێلە کە کۆنگرەی تێدا دەگیرا، نەیتوانی کارەکانی خۆی بە تەواوی بەجێ بگەیەنیٚو رۆژێك زووتر تەواو بوو. هەر لەبەر ئەو مەسەلەیە رۆژهەلاٚتی نێوەڕاستیش باس نەکرا. منیش وەك نوێنەری حیزبی دێموکرات نەمتوانی لەو کۆنگرەیەدا قسە بکەم چونکە میوانیش بوومو دیارە ئەوەڵ جاریش بوو بۆ ئەو کۆنگرەیە دەعوەت کرابووین لەو بارەوە ئیسرارێکی زۆرم نەکرد. کۆنگرەی ئەنتێرناسیۆناڵ سۆسیالیست دوو ساڵ جارێك دەگیرێ.

کۆنگرەی داهاتوو لە شاری ستۆکهۆلم لە سوئید دەبێ. ئێمە هیواداریین ئەو جارە بە ئامادەیی‌یەکی زیاترو باشتر بتوانین لەو کۆنگرەیەدا کە دەبێتە کۆنگرەی هەشتەم بەشدار بینو دەنگی خۆمان زۆر بەرزتر بە سۆسیالیستەکانی جیهان بگەیەنین.

پ: ببوورە دەمەوێ پرسیارێك بکەم کە رەنگە زۆر لەگەڵ پرسیارەکانی دیکە هاوپلە نەبێ. ئێوە زۆر وتووێژی چاپەمەنیٚو رادیۆو تەلەویزیۆنیتان هەبوو. لە یەکێك لەو وتووێژانەدا فەرمووتان دەترسم بەیانی‌یەك کە لە خەو هەستام خەبەرم پێ بدەن کە پێشمەرگەکان بەرەو تاران پێشڕەوی‌یان کردوە. داخوا ئەمە تەنیا بۆ تەشویقی عەمەلیاتی ئەمساڵی پێشمەرگەو لە رووی خۆشبینی‌یەوە بوو، یان دەلایلێکی دیکەشی هەبوو؟

و: هەروەها کە دەزانن من عادەتم نیە کە بۆ رووخاندنی رێژیم یان رووداوی داهاتووی ئەوتۆ وەخت دیاری بکەم، تاریخ دیاری بکەم. ئەو قسەیە کە لە پرسیارەکەدا هاتوە هی من نیە. بە پێچەوانە من لە وتووێژ لەگەڵ هەواڵنووسی رۆژنامەی تایمزی لەندەندا گوتم کە لە حاڵی حازردا لەو باوەڕەدا نیم کە رۆژێك لە خەو هەستینو خەبەرمان پێ بدەن کە پێشمەرگە گەیشتوونە تاران. دیارە ئەوەش وەك گاڵتە گوتم نەك لە کاتی وتووێژدا. ئەوە لایەك، بەلاٚم ئەگەر هاوڕێیانی خۆشەویست لە بیریان بێ وەختێك لە ساڵی ١٣٥٨دا تازە شەڕی چەکدارانەی ئێمە دژی رێژیمی خومەینی دەستی پێکردبوو، کە لێیان پرسیم چەند لە دەرەوەو لە شاخی دەمێنینەوە وەلاٚمم ئەوە بوو کە ٢٥ ساڵ. ئەو وەختە هێندێ لە هاوڕێیانمان پێیان وابوو ئەو قسەیەی من تەنیا گاڵتەیە، بەلاٚم ئێستا کە ٧ ساڵی رابردووە، لەو بڕوایەدا نیم کە ١٨ ساڵمان مابێ. دەتوانم بە مەسئوولییەتەوە بڵێم کە زیاتر لە جاران خۆشبینم. خۆشبینی‌یەکەشم لە دووبارەوەیە. لە لایەك وەزعو هەلومەرجی ولاٚت ئەو

خۆشبینی‌یەی لە مندا پێك هێناوە. وەزعی رێژیم زۆر لە جاران خراپترە. چ لە باری نیزامی، چ لە باری ئابووری، چ لە باری سیاسیو کۆمەلایەتی‌یەوەو خەڵك زۆر زیاتر لە جاران لەو رێژیمە ناڕازین. هەرچەند ناتوانن بەتەواوی ئەو ناڕەزایەتی‌یە دەربڕن. لایەکی دیکەش خۆشبینم بەو کارو کردەوەیە کە حیزبی دێموکراتو بەڕێوەبەریی حیزبی دێموکرات، ئەندامانو کادرو پێشمەرگەکانی ئێمە لە تێکۆشانی خۆیاندا نیشانی دەدەن. عەمەلیاتی ئەم ساڵی پێشمەرگەکان زۆر سەرکەوتوو بوو. بۆ من تەنیا لە باری کەمییەتەوە گرینگ نیە بەڵکوو زیاتر لە باری کەیفییەتەوە گرینگە کە عەمەلیاتی بەهارو هاوینی پێشمەرگەی دەخەمە بەرچاو لەو بارەوە زۆر سەرنجم رادەکێشێ کە پێشمەرگە زۆر بە رێكوپێکی عەمەلیاتیان کردوە. بە دانانی بەرنامەی باشو تەواوو ئامادەیی‌یەکی تەواو عەمەلیاتیان کردووەو کەیفیەتی عەمەلیاتەکە زۆر باش بووە. نیشانەشی ئەوەیە کە زۆر جار شەهیدمان هەر نەبووە یان شەهیدمان زۆر کەم بووە. لە کاتێکدا چەکدارانی رێژیم کوشتەو بریندار یان یەکجار زۆر بووەو زۆر تەسلیم بوون. ئەوە ئەگەر نیشانەی رێكوپێك بوونو باشتر بوونی وەزعی پێشمەرگەیە، لایەکی دیکەشی نیشانەی شپرزەبوونی وەزعی رێژیمە. بەتایبەتی لە باری رۆحی‌یەوە. ئەوە کە جاران چەکدارانی رێژیم تا ئاخر فیشەك شەڕیان دەکرد، بەلام ئێستا زووتر تەسلیم دەبن، یان پایەگاکان زۆرتر لە جاران دەگیرێن، نیشانەی ئەوەیە کە رۆحیەی چەکدارانی رێژیم کە نوختەی هەرە بەقووەتی رێژیم بووە، زۆر هاتۆتە خوارێ. لە واقیعدا وەیان نەماوەو من ئەوە بەسەرتای پرۆسەیەکی تازە دەبینم کە ئەویش تەواوبوونی حاڵەتی تەعەروزیو هێرشکردنی رێژیمو دەست پێکردنی حاڵەتی تەعەروزیو هێرشی هێزی پێشمەرگەیە. ئەوە بەو مانایە نیە کە رێژیم هیچ هێزێکی نەماوە، نە، بەلام ئەوە بەو مانایەیە کە رێژیم رۆژبەرۆژ بەرەو کزتر بوون دەڕواو ئیمکانی ئەوە هەیە کە پێشمەرگە لەو ماوەدا زۆر زەربەی توندترو باشتر بوەشێنێ. هەروەها لەبەر دوو هۆی دیکەش من بە دوارۆژی خەباتەکەمان خۆشبینم:

یەکێکیان ئەوە کە لە بەشەکانی دیکەی ئێرانیشدا بەرەبەرە خەباتو حەتتا خەباتی چەکدارانە پەرە دەستێنێ وەك بەلووچستانو هێزەکانی دێموکراتو شۆڕشگێڕی ئێران هەست بە مەسئوولییەت دەکەنو خەریکن یەك بگرنەوە.

یەکیش ئەوە کە لە باری نێونەتەوەییشەوە هەروا کە لە پێشدا گوتم، ڕێژیمی خومەینی بە ڕێژیمێکی زۆر زۆردارو بە ڕێژیمێکی دژی ئینسانی ناسراوەو پێموایە ئێستا ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاّت هەردوولا بەرەبەرە هاتوونە سەر ئەو باوەڕە کە ئەو ڕێژیمە بۆ هەموو بەشەرییەت خەتەرەو مەترسیی هەیە. بۆیە لە مەیدانی نێونەتەوەییشدا پشتیوانی نەماوە. هەموو ئەوانە منی لە جاران خۆشبینتر کردوە. بەلاّم خۆشبینێکی واقیعبین نە خۆشبینێکی خەیالّی. بۆیە پێموایە کە ڕووخاندنی ڕێژیمی خومەینی ئێستاش هەر بەستراوەتەوە بەوە کە هێزەکانی ئوپۆزسیۆن چەند ڕێکوپێکترو موتەشەکیلترو یەکگرتووتر لە جاران پێکەوە بۆ ئەم مەبەستە تێ بکۆشن.

پ: دەنگوباسی شەڕی قارەمانانەی پێشمەرگەکانی کوردستان چۆن دەگاتە دنیای دەرەوەو چ دەنگدانەوەیەکی هەیە؟ ئەم پرسیارەمان زیاتر لەبەر ئەوەیە کە خۆتان دەزانن لە بەهارو هاوینی ئەمسالّدا عەمەلیاتی پێشمەرگە لە باری چەندیو چۆنی‌یەوە زۆر پەرەی ئەستاندبوو.

و: بەڕاستی عەمەلیاتی پێشمەرگە لە بەهارو هاوینی ئەمسالّدا لەوە زۆر پانو بەرینتر بوو کە ئێمە چاوەڕوان بووین. هەر بۆیەش زۆر باشتر لە جاران لە دەرەوەش دەنگی دایەوە. لە زۆر ڕۆژنامەی بەناوبانگی دنیا بۆ وێنە ئۆتریش، سوئید، ئینگلستان، فەرانسە، ئالمان، پێرۆ، وێنێزۆئێلا، هەروەها ڕادیۆو تەلەویزیۆنی ئینگلستانو فەرانسەو ئامریکا خەبەری شەڕی سەرکەوتووانەی پێشمەرگەکان بلاّو کرایەوە. منیش خۆم کە لە دەرەوە بووم لە هەموو وتووێژەکاندا هەولّم دەدا کە هەرچی زیاتر باسی سەرکەوتوویی عەمەلیاتی پێشمەرگە لە بەهارو هاوینی ئەمسالّدا بکەم. عەمەلیاتی ئەمسالّی پێشمەرگە جارێکی دیکە دوو ڕاستیی نیشان دا. یەکەم ئەوە کە کاربەدەستانی ڕێژیم درۆ دەکەن کە دەلّێن لە ئێرانو هەروەها کوردستانیش هیچ موقاوەمەتێك نەماوە. عەمەلیاتی ئەمسالّی پێشمەرگە جارێکی دیکە هەموو کاربەدەستانی ڕێژیمو ڕۆژنامەکانو ڕادیۆو تەلەویزیۆنی ڕێژیمی وەدرۆخستەوە. دووهەم ئەوە کە تەنیا کوردستانە کە زەربەی چاك لە ڕێژیم دەوەشێنێو لە کوردستانیشدا تەنیا پێشمەرگەی حیزبی دێموکراتە کە ئازایانەو قارەمانانە خەبات دەکا. کەوابوو بەحەق دەبێ بلّێین کە حیزبی دێموکراتو پێشمەرگەکانی لە سەنگەری هەرە پێشو هەرە قایمی خەبات دانو هێزی هەرە

چالاکی دژی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامین. ئەو راستی‌یە لە زۆر جێگا گوترا، بۆ نموونە تەلەویزیۆنی ئینگلستان کە دەڵێن بەینی بیست تا سی میلیۆن کەس بە شەو تەماشای دەکا لە وەختێکی زۆر باشدا وتووێژی منی بڵاو کردەوە. لەو وتووێژەدا ئەو کەسەی کە وتووێژەکەی پێشکەش دەکرد باسی ئەوەی کرد کە ئێستا بەرهەڵستو موقاومەت لە داخڵی ئێراندا لە کوردستانەو لە کوردستانیشدا حیزبی دێموکراتە کە ئەو جووڵانەوە بەرێوە دەبا. بێگومان بەردەوام بوون لە خەبات دژی ڕێژیمداو هەروەها تێکۆشانی هاورێیانی ئێمە لە دەرەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە لەمەودوا زیاتریش باسی عەمەلیاتی پێشمەرگەو خەباتی هەموو خەڵکی کوردستان دژی ڕێژیمی خومەینی بکرێ.

پ: چ پەیامێکتان بۆ خەڵکی کوردستانو چ ڕێنوێنی‌یەکتان بۆ کادرو ئەندامانو پێشمەرگەکانی حیزب هەیە؟

و: من بەڕاستی زۆر خۆشحاڵم کە جارێکی دیکە لە نێو خەڵکی خۆمانو ئەندامانی حیزبو پێشمەرگەدام. وڵاتی دیکە زۆر خۆشن، زۆر جێگای خۆشیش لەو دنیایەدا هەیە. بەڵام بۆ من هیچیان بەقەد نیشتمانی خۆمان خۆش نینو هەموو جارێك کە دەگەڕێمەوە، هەست بە خۆشحاڵی‌یەکی یەکجار زۆر دەکەمو کە دەگاتە ڕۆژەکانی ئاخری سەفەرەکەم کەمێکیش بەپەلەم کە هەرچی زووتر بگەڕێمەوە نێو هاوڕێیانو پێشمەرگەکانو گەلی خۆمان. پەیامم بۆ خەڵکی کوردستانو سەرانسەری ئێران ئەوەیە کە هەرچی دەتوانن یەکگرتوو و یەکپارچە بنو بە هەر شێوەیەك کە دەتوانن دژی ڕێژیمی خومەینی خەبات بکەن. چونکە بەڕاستی هەروەها کە گوتم ڕێژیم زۆر لە جاران کزترەو ئەو هەیبەتەی جارانی نەماوەو ئەگەر هێزێکی بەتوانا بێتە مەیدان دەتوانێ ئەو ڕێژیمە بڕووخێنێ. کەوابوو داوام ئەوەیە هەموو ئیمکانو هێزو تێکۆشانی خۆمان بۆ ڕووخاندنی ڕێژیمی خومەینی بەکار بێنین. هەروەها داوام لە خەڵکی شارو گوندەکانی کوردستان ئەوەیە هەر وەك جاران یارمەتیی ئەندامانی حیزبو پێشمەرگەکانی حیزب بدەن، بیانپارێزن. چونکە دەزانن دێموکرات بۆ ئازادیو بەختیاریی ئەوان خەبات دەکا. ئەو زەحمەتو تێکۆشانەو ئەو سەختیو کوێرەوەریو دەربەدەری‌یە بۆ خاتری ڕزگاریی هەموو خەڵکی کوردستانو تەنانەت سەرانسەری ئێرانە. پەیامم بۆ کادرو پێشمەرگەو ئەندامانی حیزب ئەوەیە کە

ئینزیبات‌و دیسیپلینی خۆیان زیاتر بکەن. ڕێنوێنی‌یەکانی حیزبی بەچاکی بەڕێوە بەرن. ئێستا زۆر لە جاران ڕێکوپێکترن کە بەڕاستی جێگای خۆشحاڵی‌و شانازی‌یە. بەلاّم هیوادارم لە باری چۆنیەتی‌یەوە زیاتر ڕێکوپێك بن. ئەوەیان لەبیر بێ کە زەربە وەشاندن لە دوژمن باشە، بەلاّم دەبێ خۆیان لە هێرشی بێ‌سوودو پڕزیان بپارێزن. پایەگای دوژمن گرتن بە هەر نرخێك باش نیە. پایەگا گرتن‌و بەگشتی زەربە لە دوژمن دان زۆر باشە، بە شەرتێك بە نرخێکی هەرزان جێبەجێ بێ. ئەوەیان لەبیر بێ کە ژیانی پێشمەرگە، کادرو ئەندامانی حیزب لە هەموو شتێك بۆ ئێمە نرخی زیاترەو گەورەترین سەرمایەی حیزبیشە. نابێ دوژمن پێشمەرگەیەکی ئێمە غافڵگیر بکا، بەڵکوو دەبێ دوژمن غافڵگیر بێ. نابێ لەبیر بکەین کە پشتیوانی هەرە سەرەکیی ئێمە کۆمەلاّنی خەڵکی کوردستانن. پێشمەرگە دەبێ هەموو کاتێك لەگەڵ خەڵك برایانەو دۆستانە بجوولێتەوە. چونکە خۆی ڕۆڵەو خۆشەویستی ئەو خەڵکەیەو تا خەڵکی کوردستانمان پشتیوان بێ هیچ هێزێك ناتوانێ تێکمان بشکێنێ. لەو سەفەرەدا بۆم دەرکەوت کە حیزبی ئێمە چەندە ئێعتباری هەیەو چۆن وەك حیزبێکی سیاسیی مەسئوول ناوبانگی دەرکردوە،و ئەو ئیعتبارەش ڕۆژبەڕۆژ دەچێتە سەرێ. بەڕاستی شانازیم بەوە دەکرد کە ئەندامی حیزبی دێموکراتم. پێم وایە ئەوە نەتیجەی سیاسەتی دروستی حیزبەکەمان، نەتیجەی ناساندنی ژیان‌و خەباتی خەڵکی کوردستان لە دەرەوەیە، بەلاّم هەروەها ئاکامی فیداکاری‌و قارەمانەتیی کادرو ئەندام‌و پێشمەرگەکانی حیزبە. هیوام ئەوەیە کە هەموومان لەو ڕێگایەدا بەردەوام بین. چونکە پێم وایە ئەوە ڕێگای سەرکەوتنمانە. ئەوە ڕێگایەکە دێموکراسی بۆ ئێران‌و خودموختاری بۆ کوردستان دابین دەکا.

سوپاستان دەکەم.

# بەشێك لە وتووێژەکانی راگەیەنە گشتی‌یەکانی رۆژئاوا لەگەڵ هاوڕێ سکرتێری گشتی، کاك دوکتور قاسملوو*

سەفەری ئەو دوایی‌یانەی هاوڕێی تێکۆشەر دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بۆ وڵاتە ئوروپایی‌یەکان‌و ئەمریکای لاتین لە هەموو بارێکەوە پڕ لە تێکۆشان‌و هەڵسووڕان‌و لە ئاکامدا پڕ بەرهەم بوو. یەکێك لە لایەنەکانی تێکۆشانی هاوڕێ سکرتێری گشتی، وتووێژی چاپەمەنی لەگەڵ راگەیەنەرە گشتی‌یەکان بوو. لە ماوەی چەند مانگ مانەوەی دوکتور قاسملوو لە دەرەوەی وڵاتدا ژمارەیەکی زۆر لە گوزارشگەرەکانی رادیۆ، تەلەفزیۆن‌و چاپەمەنی‌یەکانی دەرەوە وەك تەلەفزیۆنی "بی.بی.سی"، سرویسی جیهانیی بی.بی.سی بە زمانی ئینگلیزی، بەشی فارسیی رادیۆی بی.بی.سی، تەلەویزیۆنی سوئید، رۆژنامەکانی تایمزی لەندەن، لیبراسیۆنی فەرانسە، "ئرباتیرتسایتۆنگ"ی ئۆتریش‌و زۆر لە رۆژنامەکانی سوئیدو وڵاتی ئەمریکایی پێرۆ لەگەڵ ئەو چاوپێکەوتنیان بوو و وتووێژی چاپەمەنی‌یان رێك خست. لێرەدا هەڵبژاردەیەك لەو وتووێژانە بۆ ئاگاداریی خوێنەرانی بەرێزی کوردستان چاپ دەکەین.

گوزارشگەری بی.بی.سی وتووێژی خۆی بەم شێوەیە لەگەڵ دوکتور قاسملوو دەست پێ دەکاو دوایی پێ دێنێ:

---

* رۆژنامەی "کوردستان" ژمارەی ١٢٠، خەزەڵوەری ١٣٦٥

**بی.بی.سی:** ئەو هەواڵەی ئەمرۆ لە ئاشکرا بڵاو بۆوە سەبارەت بەوە کە هێزی هەوایی تورکیە حەشارگەی کوردە راپەڕیوەکانی لە نێو خاکی عێراقدا بۆمباران کردوە، نیشانەیەکی دیکەیە لە هاوکاریی دەوڵەتان لە سەرکوتکردنی جووڵانەوەی کوردەکاندا، خەڵکێك کە لە کێوپایە دەژینو زمانو فەرهەنگی تایبەتیی خۆیانیان هەیەو لە ناوچە سنوورییەکانی تورکیە، ئێران، عێراقو هەروەها یەکێتیی سۆڤیەتو سووریە نیشتەجێن، کوردەکان لە مافی پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆیان بێبەش مانەوە، بەڵام لە نێو ئەو وڵاتانەدا کە تێیاندا دەژین بە شێوەیەکی شێلگیرانە بۆ وەدەست هێنانی خودموختاری خەباتیان کردوە. بەڵام هیچ کام لەوان بە رادەی کوردەکانی ئێران لەو ڕێگایەدا تێنەکۆشاون. ئەوان لە کوێستانە سەختو نەستەمەکانی خۆیاندا کە لە بەشی شیمالی رۆژئاوای ئێران هەڵکەوتوون، لە بەرامبەر شاو لە پێش ئەویشدا بەرامبەر بە بابی ئەو واتە رەزاشاو دواییش بە دژی ئایەتوڵڵا خومەینی شەڕیان کردوە. رێبەری کوردەکانی ئێران عەبدولرەحمان قاسملوو بەسەفەر هاتوتە لەندەنو ئێستا لێرەیە. سەرەتا سەبارەت بە دوژمنی ئێران لە شەڕی کەنداو (دەوڵەتی سەدام حوسەین لە بەغدا) پرسیارم کرد.

**دوکتور قاسملوو:** ئێمە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق هێندێك هاوکاریمان هەیە، چونکە ئێمە هەردووکمان بە دژی دوژمنێکی هاوبەش شەڕ دەکەین. بەڵام خەباتی ئێمەو شەڕی ئێمە دژی خومەینی جیاوازی هەیە. ئێمە لە نێو ئێراندا شەڕ دەکەین، ئەرتەشی عێراق لە سنوور شەڕ دەکا. ئەرتەشی عێراق شەڕێکی مودێڕنو جبهەیی دەباتە پێش، ئێمە بە شێوەی پارتیزانی شەڕ دەکەین. بێجگە لەوەش ئەرتەشی عێراق بۆ گەیشتن بە ئاشتی شەڕ دەکاو ئێمە لە پێناوی ئامانجی سیاسیی خۆماندا کە دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستانە شەڕ دەکەین.

**بی.بی.سی:** بەڵام ئێوە کە لە لایەن عێراقییەکانەوە پشتیوانیتان لێ دەکرێ، ئایا بە کوردە هاورەگەزەکانی خۆتان کە لە کوێستانەکانی عێراقدا شەڕ دەکەنو دوژمنی ئێوە، ئێران، پشتیوانییان لێ دەکاو بە دژی هاوپەیمانی ئێوە سەدام حوسەین خەبات دەکەن، زیان ناگەیەنن.

**دوکتور قاسملوو:** ئێمە لەگەڵ رێکخراوە سیاسییەکان، رێکخراوە سیاسییە کوردەکان لە عێراقدا پێوەندیی زۆر چاکمان هەیەو هیچ هەنگاوێك بە دژی ئەوان

هەڵناهێنینـەوە. پێموایـە وەزعـی ژێئۆپۆلیتیکـی ئێـمە زۆر دژوارە. کـە وابـوو زۆر سروشتی‌یە کە ئەوانیش لەگەڵ دەوڵەتی ئێران پێوەندی‌یان هەیەو ئەگـەر لەگـەڵماندا بەشەڕ نەیەن، قەیدی ناکا.

**بی.بی.سی:** وا دیارە پشتیوانانی ئێوە دژی یەکترن؟

**دوکتور قاسملوو:** سێ ساڵ لەمەوپێش، ئەوان (کوردەکـانی عـێراق) وتووێژێکیـان دەست پێ کردو ئێمە لە بەینی یەکیەتیی نیشتمانیو دەوڵەتی عـێراقدا لـەو بـارەوە نەخشی نێوبژیوانمان هەبوو، ئەگەر جارێکی دیکەش وتووێژ بکەن ئێمە بـۆ هاوکـاری ئامادەین، بەڵام ئەگەر لەگەڵ یەکتر شەڕ بکـەن، ئـەوە ئیـدی پێوەندیـی بەخۆیانـەوە هەیە.

**بی.بی.سی:** ماوەیەکە دەوڵەتی ئێران پەیتا پەیتا وادەی هێرشێکی چارەنووس‌ساز لە شەڕی کەنداودا دەدا. ئایا وێ دەچێ هێرشێکی ئەوتۆ بکرێ،و **داخـوا شـوێنەواری** لەسەر حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران چ دەبێ؟

**دوکتور قاسملوو:** وێ دەچێ. هەروەك دەزانین، **سیاسەتی ئێران لەسەر** درێژەی شـەڕ دەگەڕێ. بەڵام لەبەر ئەوە کە ناتوانێ هەموو رۆژو **حەوتوو و مانگێك** بە شـێوەیەکی بەربڵاو و هەموو لایەنە درێژەی پێ بدا، بە ناچار ساڵێ دوو یـا سـێ هێرشـی گـەورە دەکا. پێموایە ئەمساڵیش بەتـەمان هێرشـێکی بـەربڵاو بکـەن، رەنگـە لـە مـانگی سپتامبردا. چونکە لەسەر یەك مانگی سپتامبر (بـۆ ئـەو کـارە) مـانگێکی باشـە، چونکوو لەو مانگەدا هەوا نە وەك هاوینە گەرمو **نە** وەك زستانە سارد. بەڵام من لە سەرکەوتنی ئەوان دڵنیا نیم. بە بڕوای مـن لـە نێـوان ئـێرانو عـێراقدا پارسـەنگی هێزەکان وەك یەکە.

**بی.بی.سی:** ئایا هێرشێکی ئەوتۆ لەگەڵ وەزعی کوردەکان لـە دوو لای سـنووردا جۆر دێتەوە؟

**دوکتور قاسملوو:** هەر وەك دەزانن، هەرێمی کوردستان لە هـەر دوو لای سـنووردا وێران بووە، شارەکان، بەتایبەت شارە سنووری‌یەکان لە لایەن هێزی هـەوایی عـێراقو هێزی هەوایی ئێرانەوە بۆمباران کراون. ئەوەش هەر دەبێ. چونکـە ئـەو شـارانە لـە نزیك سنوور هەڵکەوتون لەبەر ئەوە بۆمباران کردنیان نەك هـەر بـۆ هـێزی هـەوایی، بەڵکوو بۆ تۆپخانەش، زۆر هاسانە. بەڵام ئێمە پێمان وایە رەنگە ئێوە پێتان سەیر بێ

(ئەگەر بلێین) کە ئێمە لایەنگری ئاشتین. ئێمە وەك حیزبێکی دێموکرات، بڕوامان وایە کە شەڕی نێوان ئێران‌و عێراق بێ‌مانایە، شەڕێکی شێتانەیە. ئاشتی رەنگە ببێتە هۆی ئەوە کە ژمارەیەکی زۆرتر سەربازو پاسدار بۆ کوردستان بەرێ بکرێن. بەڵام لە باری سیاسییەوە ئاشتی بە واتای رەتکردنەوەی بەتەواوی بوون‌و مانی رێژیمی خومەینی دەبێ‌و دەبێتە هۆی پێکهاتنی ئاڵوگۆڕێکی رادیکاڵ لە ئێراندا.

**بی.بی.سی:** ئامانجی ئێوە لە هاتن بۆ لەندەن چ بووە؟ ئایا ئێوە تەنیا دەتانەوێ سەرنجی بیروڕای گشتی بۆ لای مەسەلەی کورد رابکێشن، یا لە هەوڵی پەیداکردنی یارمەتی زۆرتر لە رۆژئاوادان.

**دوکتور قاسملو:** هیچ کامیان، من لە هەوڵی پەیداکردنی شتێکی زۆرتردا نیم، چونکە دەوڵەتێك نیە ئامادە بێ پشتیوانی لە مەسەلەی کورد بکا. ئێمە کەمێك یارمەتیی مەعنەوی‌و سیاسیی هێندێك لە رێکخراوەکان، شەخسیەتەکان، نوێنەرانی مەجلیس‌و هێندێك رێکخراوی بەشەردۆستمان پێ دەگا. بەڵام بە هۆی بارودۆخێکی ژیئوپۆلیتیکی‌یەوە کە هەمانە، هیچ کەس پێی خۆش نیە بەو شێوەیە کە بۆ وێنە لە بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی فەلەستین، ئێریترە، پۆلیساریۆو رێکخراوەکانی دیکە پشتیوانی دەکرێ، یارمەتیمان بکا. لەگەڵ ئەوەش ئێمە دەمانەوێ بیروڕای گشتی لە ویستی خۆمان ئاگادار بکەین، بلێین کە بۆ مەسەلەیەك شەڕ دەکەین کە زۆر رەواو عادلانەیە، زۆر سەرەتاییە، بەڵام رەوایە. دەمانەوێ لە مەدرەسەکانی کوردستاندا زمانی کوردی دەرس بدرێ، دەمانەوێ بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆیی کوردستان لە دەست خۆماندا بێ‌و دەمانەوێ دێموکراسیمان هەبێ لەبەر ئەوە بڕوام وایە کە دەبێ پشتیوانیمان لێ بکرێ.

* * *

لە وەڵامی هەواڵنوسی رۆژنامەی فەرانسەویی لیبراسیۆندا کە سەبارەت بە تیرۆرو تیرۆریزم پرسیاری لێ دەکا، کاك دوکتور قاسملوو بەم جۆرە نەزەر دەردەبڕێ: تیرۆریزم تەنیا تەقاندنەوەی بۆمب لە پێتەختی وڵاتە رۆژئاواییەکان نیە، کوشتاری گوندنشینەکانیش بەهۆی رێژیمی خومەینییەوە تیرۆریزمە. لە رۆژئاوادا بەگشتی بۆمب دانانەوە بە تیرۆریزم ناو دەبەن، بەڵام جۆرەکانی تیرۆریزم ناخەنە بەرچاو. بێجگە لەوەش تیرۆریزم تەنیا کاری تاقم یان دەستەیەك نیە. هێندێك وڵاتیش

دەستیان لە تیرۆریزم‌دا هەیە. ئێران تەنیا ولاٚتێکە کە بە رەسمی تیرۆریزمی گەیاندۆتە سەتحی سیاسەتی ولاٚت. ئەوە مەوزوعێکە کە من وەبیرهێنانەوەی بە پێویست دەزانم. نوکتەیەکی دیکە ئەوەیە کە تیرۆریزم‌و بزووتنەوە رزگاریخوازی‌یە نەتەوەی‌یەکان دوو مەسەلەی جیاوازن. شەڕی چەکدارانە یان پارتیزانی بۆ رزگاری نەتەوەیەك پەنابردن بۆ تیرۆریزمی پێویست نیە. بە پێچەوانە من پێم وایە بزووتنەوە بەهێزەکان، ئەو بزووتنەوانەی بە رێگای دێموکراتی‌دا دەرۆن‌و رێنوێنی دەکرێن‌و لایەنگری‌و پشتیوانیی خەلکیان لەگەلە، پێویستی‌یەکیان بە پەنابردن بۆ تیرۆریزم نیە. لە بارەی خۆماندا دەبێ بلێم لەگەل ئەوەی خومەینی چەندین جار دژی ئێمە لە شێوەکانی تیرۆریستی کەلکی وەرگرتووە، ئێمە هیچ کاتێك ئەوەمان تەئیید نەکردوەو بە پێرەوی کردن لە ئوسوول، بارمتە گرتنمان مەحکووم کردوە. لە سالی ۱۹۷۹دا ئێمە تەنیا حیزبێکی ئێرانی بووین کە بارمتەگرتنمان لە سەفارەتی ئەمریکادا مەحکووم کرد دواتریش هەمیشە تەیارە رفاندن‌و بۆمب دانانەوەمان مەحکووم کردوە. تیرۆریزم سیاسەتی رەسمیی کۆماری ئیسلامی‌یە کە بەرپرسانی رێژیم چەند سال لەمەو پێش بە ئاشکرا رایانگەیاند. ئێستا چونکە لە نێوخۆی ئێراندا لە هەر لایەکەوە هاواری رەخنەو ئیعتیراز بەرز بۆتەوە، رێژیم بێ‌ئەوەی بە رەسمی قسە لە تیرۆریزم بکا، بە کاری دێنێ. بەلاٚم فەلسەفەی کۆماری ئیسلامی ئەوەیەو هەمیشەش ئەوە بووە کە شۆڕشی ئیسلامی بە هەر شکل‌و شێوەیەك کە ئیمکانی هەبێ- با لە رێگای تیرۆریزمیشەوە بێ- بۆ دەرەوە بنێرێ. ئەوەمان لەبیر بێ کە ئێران بە "دکترین"ی "ولایت فقیه" ئیدارە دەکرێ بەپێی ئەو "دکترین"ە ئێستا خومەینی نوێنەری ئیمامی غایب لەسەر عەرزەو بەو ناوەوە مافی ئەوەی هەیە کە بۆ گەیشتن بە ئامانج هەموو کارێك بکا. ئەو "آیت الله"یانەی ئەمڕۆ دەسەلاٚتیان لە ئێراندا بەدەستەوەیە دەزانن کە لە ولاٚتی رۆژئاوادا دەتوانێ هەلوێست‌و تەنانەت سیاسەتی دەولەتەکانیش بگۆڕێ بە وردی هەر بەو هۆیەشەوەیە کە ئەوان تیرۆریزمیان هەلبژاردوە. من بۆ خۆم پێم وایە، ئەوەی کە لە لوبنان‌و چەند ولاٚتی دیکەی مۆسولماندا روو دەدا، راستەوخۆ لە تارانەوە رێنوێنی دەکرێ. ئەوەی لە فەرانسەش هاتۆتە پێش لە تاراندا رێنوێنی دەکرێ.

دوکتور قاسملوو پاشان لە وەڵامی نوێنەری لیبراسیۆندا سەبارەت بە عادی کردنەوەی پێوەندییەکانی ئێران‌و فەرانسە، بڕوای خۆی بەم شێوەیە دەردەبڕێ: پێوەندی بە منەوە نیە کە لە جیاتی ئەوان بڕیار بدەم. من تەنیا لە بارەی ئەوەدا کە پێوەندییەکانی ئێمە لەگەڵ ڕێژیمی خومەینی- ڕێژیمێك کە ماوەی ٧ ساڵە شەڕی لەگەڵ دەکەین- نەزەر دەردەبڕم. ئێمە لە سەرەتاوە هەوڵمان دا لە هێندێك بارەوە لەگەڵیان گەینە یەك. ئەزموونێك کە لەو هەوڵدانانە وەدەست ئێمە کەوت، ئەوە بوو کە نابێ متمانەیان پێ بکەین. بە بڕوای من دەوڵەتی فەرانسەش دەبێ ئەو مەوزووعە تێ بگا کە ڕێژیمی خومەینی لە شێوەو ڕەوشی ئەوتۆ کەڵك وەردەگرێ کە ئەو شێوەو ڕەوشانە لە پێوەندیی نێوان وڵاتاندا، ئاسایی نین. ئێران، بەرواڵەت، قانوون‌و ڕێوشوێن‌و ستانداردە نێونەتەوەییەکانی قبووڵ کردوە. هەر وەك دەزانن ئێران ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە، بەڵام لە سەریەك ئەو ڕێکخراوە ڕەت دەکاتەوە. لە فەلسەفەی شۆڕشی ئیسلامیدا، تەنیا ئەو ڕێوشوێن‌و یاسایانە قبووڵن کە لە خزمەتی گەیشتن بە ئامانجدا بن. هەرگیز نابێ بە قسەی نوێنەرانی ڕێژیمی خومەینی باوەڕ بکەن. لە بەرامبەر ئەواندا دەبێ بزانن لەگەڵ کێ قسە دەکەن. تەنانەت یاریدەری وەزیری کاروباری دەرەوەی ڕێژیم- کە دێتە پاریس هەتا سەبارەت بە بارمتەکان‌و عادی کردنەوەی پێوەندییەکان وتوویژ بکا- هیچ دەسەڵاتێکی نیە. دەسەڵات لە دەست خومەینی‌و ڕەفسەنجانیدایە. ئێمە چەندین جار لەگەڵ نوێنەران‌و نێردراوانی خومەینی وتوویژمان کردو ڕێك کەوتین. کاتێك گەڕانەوە تاران ڕێژیم حاشای لە قسەکانی وان کرد. ئێستا ئەوان عەینی ئەو کارە لەگەڵ دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان دەکەن.

***

لە چاوپێکەوتن لەگەڵ ژمارەیەك لە ڕۆژنامەنووسە سوئیدیەکاندا هاوڕێ دوکتور قاسملوو وەزعی کوردستان‌و جەرەیانی خەباتی چەکدارانەی خەڵکی کوردستان بەو چەشنە شی دەکاتەوە:

ئێمە لە شەڕی دژی خومەینیدا ئامادەین لەگەڵ هەموو تاقم‌و ڕێکخراوەکان هاوکاری بکەین. بێجگە لە لایەنگرانی سەڵتەنەت کە دەیانەوێ بە پێکهێنانی دەوڵەتێکی مەرکەزی زۆر بەهێز جارێکی دیکەش دەسەڵات بەدەستەوە بگرن‌و ئەو

کارەش بەپێچەوانەی مەبەستی کوردانە. لە دوو ساڵی رابردوودا پێشمەرگە کوردەکان ناچار بوون تاکتیکی شەڕی خۆیان بگۆڕن‌و بەشێوەی بڵاو شەڕی چریکی بکەن. ئەم تاکتیکە نوێیە مەسەلەی شەڕی بۆ پێشمەرگەکان هاسان‌تر کردووەو لە ئاکامدا زیانی کوردەکان زۆر لە زیانی هێزەکانی خومەینی کەمترە.

کوردەکان نزیکەی ٢٠٪ی کوردستانی ئێرانیان بە وردی لە ژێر چاوەدێری‌دایە، هەروەها رێژیمی خومەینیش تەنیا بەسەر ٢٠٪ی خاکی کوردستان‌دا دەسەلات‌و چاوەدێری تەواوی هەیەو ٦٠٪ی دیکە رۆژانە لە نێوان کوردەکان، عێراقی‌یەکان‌و رێژیمی خومەینی‌دا دەست بە دەست دەکا. بەگشتی دەبێ بڵێین کە رێژیمی خومەینی ئێستا زۆر لاواز بووە. شەڕ لەگەڵ عێراق بۆ حکوومەتی تاران، وەك کۆڵانێکی بن بەست وایە کە رێگای گەڕانەوەی نەبێ. خومەینی بۆ سەلماندنی هێزی خۆی پێویستی بە سەرکەوتنێکی گەورە هەیە. بەڵام بۆ هەموو کەس ئاشکرایە کە شتێکی وا هەرگیز روو نادا. لەگەڵ ئەوە کە رێژیم بۆخۆشی لەو مەوقعییەتە بەتەواوی ئاگادارە، بەڵام ناتوانێ قسەیەك لە ئاشتی بێنێتە گۆڕێ، چونکە ئاشتی کردن لەگەڵ عێراق‌و "صدام حسين" هەموو فەرزی‌یە ئیدئولۆژیکەکانی کۆماری ئیسلامی سەبارەت بە بەرەو پێش بردنی مەسەلە ئیسلامی‌یەکانی تێك دەڕووخێنێ.

# پەیامی رادیۆیی هاوڕێ سکرتێری گشتی کاك دوکتور قاسملوو*

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

**گوێگرانی بەڕێز !**

لە لایەن کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە رۆژی مێژوویی ٢ی رێبەندانتان پیرۆزبایی لێ دەکەم‌و ئارەزووم بۆ ئێوە خۆشی‌و سلامەتی‌و بۆ نیشتمانە خۆشەویستەکەمان ئازادی‌و ئاشتی‌یە. دووی رێبەندان لە مێژووی گەلی کورد لە نێو هەموو رۆژە بەرێزەکانی کۆمەڵی کوردەواری‌دا جێگایەکی تایبەتی هەیە. لەم رۆژەدا ئەستێرەی گەشی کۆماری کوردستان لە مەهاباد شەوی دەیجووری کوردستانی رووناك کردەوەو ئێستاش هەر نیشتکی رێ نیشاندەری خەباتی رزگاریخوازانەی نەتەوەی کوردە، گرنگیی حکوومەتێك لە مێژوودا بە کورتی‌و درێژیی تەمەنی ئەو حکوومەتە نەبەستراوە، زۆر پاشایەتی‌و گەلێك "دەسەڵات" بە دەیانساڵیان خایاندوە، کەچی شوێنەواریشان لە تاریخدا دیار نیە. بەڵام کۆماری کوردستان لە مەهاباد کە رۆژی دووی رێبەندان لە دایك بوو و تەنیا یازدە مانگ دەوامی کرد، لاپەرەیەکی پڕ لە شانازی لە مێژووی گەلێکە کە چەندین سەدەیە بۆ رزگاریی خۆی هەوڵ دەدا. چونکە کارو کردەوەی ئەم کۆمارە وەدی‌هێنانی ئامانج‌و ئاواتی چەندین پشت لە خەباتگێڕانی شۆڕشگێڕی کوردستان بوو، چونکە ئەم کۆمارە لەو یازدە مانگەدا کە لە مێژووی مرۆڤایەتی‌دا ماوەیەکی یەکجار کورتە، هێندێ کاری گرینگی مێژوویی وەك پێكهێنانی یەکەم دەوڵەتی نەتەوەیی لە سەردەمی نوێ‌دا،

* ئەم پەیامە لە رۆژنامەی "کوردستان" ژمارە ١٢٣، لە رێبەندانی ١٣٦٥دا بلاو کراوەتەوە.

ڕەسمی کردنی زمانی کوردی، دانانی هێزی پێشمەرگە، بڵاوکردنەوەی بیروڕای دێموکراتی، ڕێگا خۆش کردن بۆ بەشداری ژنان لە ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیدا جێبەجێ کرد، کە لە زۆر جێگا چەندین ساڵ وەختی ویستوە. بۆیە دووی ڕێبەندان لە لای هەموو کوردێکی دێموکراتو نیشتمانپەروەر خۆشەویستەو هەموو ساڵێ خەڵکی کوردستان ئەم ڕۆژە پیرۆزە دەکەنە جێژن. دووی ڕێبەندانی ئەمساڵمان جێژنێکی دیکەشی لەگەڵە، ئەویش کردنەوەی ئێستگەی تازەی ڕادیۆی دەنگی کوردستانە کە جێژنەکەمان خۆشترو دڵمان شادتر دەکا. دەنگی کوردستان ڕادیۆی خۆشەویستی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان پەیامهێنەری خەبەری خۆشی چیا بەرزەکانو پێشمەرگە نەبەزەکانە، زیاتر لە شەش ساڵ لەمەوبەر، لە ئێرانی کشو ماتو بێ دەنگدا کە دێوەزمەی سەرەڕۆیی ڕەشی سەدەکانی نێونجی بە سەر وڵاتەکەماندا زاڵ ببوو، ئازادی پێشێل کرابوو و قسەی ئازاد، سزای زیندانو ئەشکەنجەو ئیعدام بوو، دەنگی کوردستان، دەنگی حیزبی پێشڕەوی کۆمەڵانی خەڵك، دەنگی پێشمەرگە قارەمانەکان بەرز بووەوەو پەیامی ئازادیی لە سەرانسەری ئێراندا بڵاو کردەوە. لەم شەش ساڵەدا ڕێژیمی خومەینی چەندین جار جێگای ڕادیۆی دەنگی کوردستانی بۆمباران کرد، بەردەوام پارازیتی لە سەردانا، هەرچەند دەنگی کوردستان زۆر جار جێگای خۆی گۆڕی، تەنانەت ڕۆژێکیش بێ دەنگ نەبوو و گوێگرانی وەفاداری خۆی ناهومێد نەکرد. بەڵام با ئەو ڕاستییەش بڵێین کە لەبەر هۆی تەکنیکیو کز بوونی دەزگای ڕادیۆو لەبەر پارازیتی دوژمن دەنگی کوردستان بە هاسانی لە هەموو ئێرانو کوردستان نەدەبیسترا. ماوەیەك بوو بەڕێوەبەریی حیزب هەوڵی دەدا دەزگایەکی بەهێزترو مودێرنتر بۆ دەنگی کوردستان دابین بکا. ئەم کارە لە بەر سێ مەبەست گرینگ بوو. یەکەم بێ گومان پاش چەندین ساڵ تاقی کردنەوە سیاسەتی حیزبی دێموکراتو خەباتی کوردستانی شۆڕگێر بۆ گەلانی ئێران ناسراوە، بەڵام لەبەر تەبلیغاتی فریودەرانەو درۆزنانەی ڕێژیمی ئاخوندی پێویستە هەموو ڕۆژێ هەم ئەم ڕێژیمە زیاتر ریسوا بکرێو هەم بارودۆخی ڕاستی کوردستان بە هەموو بەشەکانی ئێران ڕابگەیێندرێ، دووهەم لە هەلومەرجی ناسکی ئێستای وڵاتەکەماندا کە ئالتێرناتیوێکی دێموکراتی ڕاستەقینە بەرچاو ناکەوێ، دەنگی کوردستان دەتوانێ ڕۆڵێکی بەرچاوی لە کۆکردنەوەی هەموو ئەو هێزو ڕێکخراوو شەخسییەتانەدا هەبێ

کە دژی رێژیمی خومەینی خەبات دەکەن‌و هەر لەو کاتەشدا دژی گەڕانەوەی پاشایەتی‌و هەر شێوە دیکتاتۆری‌یەکی دیکەن. بێگومان هەرچی پەیام بۆ دێموکرات‌و ئازادیخوازان دوورتر بڕوا تەئسیری باشترە، بە تایبەتی ئەگەر دەنگی ئەو پەیامە لە سەنگەری دێموکراسی ئێران، لە کوردستانەوە بەرز بێتەوە. سێهەم تاقی کردنەوەی جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان بۆ گەلانی زۆرلێکراوی ئێران وەك بەلووچ، تورکمەن، ئازەربایجانی‌و عەرەب گرنگە. مەبەست ئەوە نیە کە ئەم گەلانە کوردستان بەتەواوی بکەن بە نموونە، ئەوە هەر ناگونجێ چونکە هەلومەرجی هەر بەشێکی ئێران بێجگە لە بارودۆخی، باری تایبەتی خۆشی هەیە، مەبەست ئەوەیە کە گەلانی زۆرلێکراوی ئێران لە تاقیکردنەوە بنچینەیی‌کانی گەلی کورد کە بە کەڵکن دەرس وەربگرن‌و بە کاریان بێنن، مەبەست ئەوەیە کە لە نێو کوردو بەلووچ‌و ئازەربایجانی‌و عەرەب‌و تورکمەندا یەکیەتی‌و هەماهەنگی بەرامبەر بە حکوومەتی کۆنەپەرستی مەرکەزی پێك بێ. بۆیە گەیشتنی دەنگی کوردستانی ئێران بە گوێی گەلانی زۆرلێکراوی سەرانسەری ئێران ئەهمیەتێکی تایبەتیی هەیە.

**گوێگرانی بەرێز!**

ڕێگام بدەن سوپاسی هەموو ئەو هاوڕێ‌یانە بکەم کە دڵسۆزانە تێکۆشاون بۆ ئەوە دەزگای تازەی رادیۆ دەنگی کوردستان دابمەزرێنن‌و بۆ جێژنی دووی رێبەندان ئامادەی بکەن. هەروەها سوپاس بۆ کارگێڕانی دەنگی کوردستان کە چەندین ساڵە بێ‌وچان بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامەکانی ئەم رادیۆیە تێ‌دەکۆشن‌و سوپاسیش بۆ گوێ‌گران کە لەم چەند ساڵەدا بە ناردنی پێشنیارو رێ‌نوێنی‌و رەخنە هاوکاریی دەنگی کوردستانیان کردوە، هیواداریین ئێستا کە دەنگی رادیۆی کوردستان دوورتر دەڕوا، بەرنامەکانیشی رێك‌وپێك‌ترو پڕنێوەرۆکتر بن، پێویستە لەمەودوا سەرنجێکی تایبەتی بدرێتە بەرنامەی فارسی کە گوێ‌گرانی زۆر لە جاران زیاتر دەبێ. هەروەها پێویستە دەنگی کوردستان بۆ دانانی بەرنامە بە زمانی گەلانی زۆرلێکراوی دیکەی ئێران تێ‌بکۆشی.

**گوێگرانی خۆشەویست!**

جێژنی دووی رێبەندانی ئەمساڵ لەکاتێکدا دەگرین کە رێژیمی خومەینی رۆژ نیە هەزاران گەنجی نیشتمانەکەمان لە مەیدانی شەڕێکی بێ‌سوودی بێ‌مانا بەکوشتن نەدا، سیاسەتی دژی گەلی‌و شەڕخوازانەی خومەینی، ئێرانی تووشی وێرانی‌و

کوێرەوەریی‌و بێسەروسامانی‌یەکی بێوێنە کردووە. هەلومەرجێکی ناسك‌و هەر لەوکاتەش‌دا پڕ لە ڕووداوی پێشبینی نەکراو پێك هاتووە، بوحرانی گشتیی ڕێژیم کە کۆماری ئیسلامی تووشی بنبەستی نیزامی، ئابووری‌و سیاسی‌و کۆمەلایەتی کردووە، ڕێگا بۆ ڕووخاندنی خۆش دەکا. ئێستا ئاسۆی ڕزگاری نیشتمانەکەمان لە هەموو کاتێك ڕوونترە بۆیە لەم هەلومەرجە ناسکەدا دەبێ زۆر وریا بین، خۆمان بۆ هەموو ڕووداوێك ئامادە بکەین.

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

**گوێگرانی بەڕێز!**

جارێکی دیکە بە بۆنەی دووی ڕێبەندان پیرۆزبایی‌تان لێ دەکەم‌و هیوام سەرکەوتنی هێزەکانی دێموکراتی وڵاتەکەمان بە سەر کۆنەپەرستی‌و دیکتاتۆری دایە‌و ئارەزووم ئەوەیە وڵاتەکەمان هەرچی زووتر ڕووی ئازادی‌و ئاشتی ببینێ‌و لە کوێرەوەری‌و زۆرداری‌و ژیانی تاڵ ڕزگاریی بێ.

هەر شادو سەرکەوتووبن.

## وتوویژی رۆژنامەی "کوردستان" لەگەڵ هاوڕێ سکرتێری گشتیی حیزب کاك دوکتور قاسملوو *

خوێنەرە بەڕێزەکان! لەم دوایی‌یانـەدا هـاوڕێی تێکۆشـەر دوکتـور عـەبدولڕەحمان قاسملوو پاش سـەفەرێکی چـەند مانگـە بـۆ دەرەوەی وڵات گەڕاوەتـەوە کوردسـتان. دەسـتەی نووسـەرانی بڵاوکـراوەی "کوردسـتان" بـە دەرفـەتی زانـی ئـەم وتوویـژە چاپەمەنی‌یە لەگەڵ هاوڕێی سکرتێری گشتی‌دا رێك بخا.

پ: کاك دوکتور پێش هەموو شتێك لە لایەن دەستەی نووسەران‌و هەموو کـادری هەڵسووڕێنەری بڵاوکراوەی کوردستانەوە بەخێرهاتنەوەت دەکەم‌و سوپاست دەکەم کـە قەبووڵت کرد ئەم وتوویژەمان لەگەڵ بکەی.

**دوکتور قاسملوو:** منیش سوپاستان دەکەم.

پ: کاك دوکتور دەکرێ بفەرموون ئامانجی بنەڕەتی لـە سـەفەری ئەمسـاڵتان بـۆ دەرەوەی وڵات چ بوو و سەفەرتان بۆ چەند وڵاتی بێگانە کرد؟

**دوکتور قاسملوو:** هەروەها کە دەزانـن ئێمـە پێوەندی‌یـەکی بـاش‌و رێکوپێکمـان لەگەڵ حیزبی سوسیالیستی فەرانسەدا هەیە. ئەمساڵ کۆنگرەی حیزبی سوسیالیستی فەرانسە لە مانگی ئاوریل‌دا گیراو لەسەر بڕیاری بەڕێوەبەریی حیزب من بۆ بەشـداری لەم کۆنگرەیەدا چووم بۆ فەرانسە بـۆ شـاری لیـل. بەشـداری لـە کۆنگـرەی حـیزبی سوسیالیستدا لە دوو بارەوە بۆ ئێمە جێگای سەرنج بوو. لە لایەکەوە ئەو حیزبە کـە

---

* رۆژنامەی "کوردستان" ژمارەی ١٢٩، گەلاوێژی ١٣٦٦

زۆر وێدەچێ جارێکی دیکە لە فەرانسە بێتەوە سەرکار، شێوەی خەباتو شێوەی کاری سیاسیو هەروەها شێوەی بەڕێوەبردنی کۆنگرەی بۆ ئێمە زۆر جێگای سەرنجو جێگای شت فێربوونیش بوو. لە لایەکی دیکەشەوە لەو کۆنگرەیەدا نزیکەی ٩٠ هەیئەتی نمایەندەگی لە وڵاتەکانی جیاواز بەشدار بوونو ئەوە دەرفەتێکی زۆر باش بوو بۆ ئێمە کە لەگەڵ زۆر لەو نوێنەرانە دانیشین قسە بکەینو مەسەلەی کورد، خەباتی خەڵکی کوردستانی ئێرانو هەروەها خەباتی هەموو گەلانی ئێرانو وەزعی ئێرانیان پێ رابگەیەنین. بەتایبەتی ئیمکانی ئەوە هەبوو کە لە نووسراوەکانی خۆمان کە بە ئینگلیسیو فەرانسەییو ئیسپانیایی ئامادەمان کردبوون، بڵاو بکەینەوە. پێم خۆشە ئەوەش بڵێم کە لەم کۆنگرەیەدا حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، تەنیا رێکخراوی سیاسیی ئێرانی بوو کە دەعوەت کرابوو. پێشتر هێندێ لە رێکخراوەکانی دیکەش دەهاتن بۆ کۆنگرەی حیزبی سۆسیالیست. بەڵام ئەمجارە تەنیا ئێمە بووین، کە لەو کۆنگرەیەدا بەشداریمان کرد. ئەو فرسەتەشەمان هەبوو کە لەگەڵ زۆر لە سەرۆکەکانی خودی حیزبی سۆسیالیستی فەرانسەدا پێوەندی بگرینو بە دوورو درێژی لەسەر گیروگرفتەکانی هاوبەشی خۆمان قسە بکەین. لە پاشان دیارە من ئەرکی ئەوەم بۆ دانرا بوو کە لەگەڵ رێکخراوەکانی ئێران، ئۆپۆزسیۆنی دێموکراتیك پێوەندی بگرم، بۆ ئەوەی وەزعێکی وا ئامادە بکەین کە بەڵکوو زەمینەی هاوکاری پێك بێو ئەگەر لەو هاوکاری‌یەدا زۆرتر سەرکەوتوو بین، زەمینەی پێکهێنانی جبهەیەکی بەرینی دێموکراتی پێك بێ. لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا کە لە فەرانسە بووم لەگەڵ زۆر لە رێکخراوەکانو شەخسییەتەکانی ئێران پێوەندیم گرت. لەسەر یەك دەتوانم بڵێم کە هەنگاوێك لەو بارەوە چووینە پێش، زەمینە لە جاران ئامادەترە، بەڵام لە ئێرانی خۆماندا سوننەتی جبهەو هاوکاری زۆر کەمە، دەبێ زەحمەتێکی زیاتری بۆ بکێشرێو من هیوادارم کە حیزبی ئێمە کە ئەو ئیبتکارەی بەدەستەوە گرتوە هەتا سەر لەسەری بڕوا. هیواداریشم کە سەرکەوێ. دیارە هێندێ پێوەندیشمان لەگەڵ شەخسییەتو رێکخراوەکانی سیاسی لە خودی فەرانسە گرتو ئیمکانیش پێك هات کە لەگەڵ هێندێ رۆژنامەنووس وتوویژ بکەین. پاشان بۆ یەکەم جار سەفەری ئیسپانیامان بۆ هاتە پێش، لەو سەفەرەدا کە هەشت رۆژی خایاند بۆ من دەرکەوت کە ئیسپانیا وڵاتێکە کە هەم رێکخراوە سیاسی‌یەکانیو هەم خەڵکەکەی ئامادەیی‌یەکی تەواویان

هەیە بۆ ئەوە پشتیوانیی سیاسی لە خەباتی گەلی کورد بکەن‌و بەتایبەتی ئیسپانیا لە بارێکی دیکەشەوە بۆ ئێمە گرنگە چوونکە لە واقیعدا دەرگای قارەیەکی تەواو وەك ئەمریکای لاتینە کە زیاتر لە سێ سەد میلیۆن کەس دەگرێتەوەو ئەگەر بتوانین لە ئیسپانیا باش خەبات‌و ژیانی خۆمان بناسێنین ئەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە بتوانین دەنگی خۆمان بە ئەمریکای لاتینیش رابگەیەنین.

**پ:** ببورە لەو بارەوە پرسیارێکم هەیە کە دەفەرمووی ئیسپانیا دەرگای قارەیەکی وەك ئەمریکای لاتینە مەبەستت هەر ئەوەیە کە زمانەکەیان لەگەڵ زمانی وڵاتانی ئەمریکای لاتین یەکە، یان شتێکی دیکەش هەیە؟

**دوکتور قاسملوو:** بەڵێ نەك هەر مەبەستم ئەوەیە کە زمانەکەیان یەکە، بێجگە لە برێزیل، کە زمانی پورتوغالی‌یان هەیەو ئەوانی دیکە هەموویان بە زمانی ئیسپانیایی قسە دەکەن، بەڵکوو بێجگە لەوە تەواوی رێکخراوەکانی سیاسیی ئەمریکای لاتین لە واقیعدا زۆر لە رووناکبیرانی زۆر بەناوبانگیان یان لە ئیسپانیا دەژین یا هاتووچۆی ئیسپانیا دەکەن. لەواقیعدا ئیسپانیا مەرکەزێکی فەرهەنگی سیاسی‌یە بۆ هەموو ئەمریکای لاتین‌و جێگای ئیستفادەیە بۆ ئێمە.

**پ:** زۆر سوپاس. کاك دوکتور! بیروڕای گشتیی خەڵکی ئورووپا سەبارەت بە مەسەلەی کورد چۆنە؟ خەڵکی دەرەوە تا چ رادەیەك لەو مەسەلەیە حاڵین؟

**دوکتور قاسملوو:** پێم‌وایە بەشی دووهەمی پرسیارەکە پێوەندی‌یەکی راستەوخۆی هەیە لەگەڵ بەشی یەکەمی‌دا. بە تەجرەبە دەرکەوتووە کە هەرچی زیاتر لە مەسەلەی کورد بزانن، ئەوەندەش زیاتر پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد دەکەن. وڵاتی وەکوو فەرانسە کە ئێمە زیاتر لەوێ کارمان بۆ کراوە، ئامادەیی زۆر زیاتری هەیە بۆ ئەوەی هەم لە مەسەلەی کورد باشتر حاڵی بن، هەم پشتیوانیمان لێ بکەن. بەڵێ وڵاتی ئیسپانیاش کە بۆ یەکەم جار بوو سەفەرمان بۆ کرد، بۆم دەرکەوت کە نەك هەر رێکخراوە سیاسی‌یەکان، رێکخراوە پێشکەوتوەکان، یا رۆژنامەنووسەکان کە بەڕاستی بە شێوەیەکی پان‌و بەرین وتووێژەکانی منیان لە گەورەترین رۆژنامەکان، لە رادیۆو لە تەلەویزیۆن بڵاو کردەوە، بەڵکوو حکوومەتی ئیسپانیاو حیزبی سۆسیالیست کە بۆخۆی لە واقیعدا حاکمە ئەوانیش بۆچوونێکی زۆر باشیان هەیەو ئێمە دەتوانین لەو پشتیوانی‌یە لە دوارۆژدا ئیستفادە بکەین. بە کورتی دەتوانم بڵێم کە رۆژبەڕۆژ

مەسەلەی کورد باشتر لە دەرەوە دەناسرێو ئەوەندە کە باشتر دەناسرێ، ئەوەندەش زیاتر سەرنجو پشتیوانیی گەلانی ئورووپا بۆ لای جوولانەوەی کورد رادەکێشرێ.

پ: زۆر سوپاس. هەر لەو پێوەندی‌یەدا پرسیارێکی دیکەمان بۆ هاتە پێش، لەو وەختەدا کە ئێوە لە دەرەوەی وڵات بوون، هەواڵدەری‌یەکانی بێگانە خەبەرێکیان بڵاو کردەوە کە گۆیا ئەفرادی پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیە کە بە پ.ک.ک. دەناسرێ هێرشیان کردۆتە سەر دێ‌یەکی کوردستانی تورکیەو چەند کەسێکیان لە خەڵکی ئەو دێ‌یەو تەنانەت لە ژنو منداڵی ئەو دێیە کوشتوە، جگە لەوەش خەبەر بڵاو بۆوە کە لە ئورووپایش چەند کەسێکیان تیرۆر کردوە. وەك ئێوە ئاگادار بن ئەو خەبەرانە تا چ رادەیەك راست بوونو پاشانیش نەزەرتان لەسەر ئەو جۆرە عەمەلیاتە چەکدارانەیە چیە؟

**دوکتور قاسملوو:** ئەو وەختە من لە ئیسپانیا بووم ئەو خەبەرە بڵاو بۆوە کە لە دێ‌یەکی نیزیکی شاری ماردین، ئەندامانی پ.ک.ك سیو یەك نەفەریان کوشتوە کە بەشێکیان ژنو منداڵ بوون. دیارە ئێمە چوونکە ئەو کارە ٢٤ سەعات پاش بڕیاری پارلەمانی ئورووپا پێك هاتبوو، کە پارلەمانی ئورووپا لە بڕیارەکەیدا دەیگوت، ئەوەی لەساڵی ١٩١٥دا دەوڵەتی عوسمانی زیددی خەڵکی ئەرمەنی کردوویەتی ژینۆسایدەو هەروەها ئەوەشی گوتبوو کە مەسەلەی کورد لە تورکیەدا هەیە، وامان هاتە بەرچاو کە ئەوە دەوڵەتی تورکیە سازی کردووە بۆ ئەوەی ئەسەری سیاسیی ئەو بڕیارە گرنگە لە لایەن پارلەمانی ئورووپاوە درابوو، لەبەین بەرێ. بەتایبەتی ئەگەر ئەوە بخەینە بەرچاو کە تورکیە بە هەموو هەوڵیەوە خەریکە بچێتە نێو بازاڕی موشتەرەکی ئورووپاو زۆر لە رێکخراوەکان، بەتایبەت حیزبە سۆسیالیستو کومۆنیستەکان لەو بڕوایەدان کە هەتا تورکیە مەسەلەی میللییەتەکان حەل نەکاو هەتا دێموکراسی لە تورکیە دانەمەزرێ، نابێ تورکیە وەربگیرێ. بەڵام بەداخەوە لە پاشان نوێنەرانی خودی پ.ک.ك لە شاری برۆکسێل پێتەختی بلژیکدا وتوویژی چاپەمەنی‌یان کردو رایانگەیاند کە بەڵێ ئەوە کاری ئەوان بووەو داخی خۆشیان لەوە دەربڕی کە ئیدی شەڕێکی وا دەبێ گوللەی وێڵ وە منداڵیش دەکەوێو لەواقیعدا ئیعترافیان کرد کە کاری ئەوانە. بەداخەوە هەر لەو وەختەدا کە من لە فەرانسە بووم، سەرۆکی کرێکارانی کوردی تورکیەشیان کوشتو پێشتریش یەکێکی دیکەیان لە

ئەڵمان کوشتبوو کە ئەندامی پارتی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیە بوو و وەختی خۆی ئەو برادەرەمان کە بەناوی عەلی ناسرابوو، وەك پێشمەرگەی پارتی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیە لە کوردستانیش دژی ڕێژیمی خومەینی شەڕی کردبوو. دیارە ئێمە هەموو ئەمانەمان پێ ناخۆش بوو، بەتایبەتی بۆ ئێمە موهیم بوو کە لە دەرەوە تەسویرێکی دروستی جووڵانەوەی کورد بە خەڵکی ئورووپا بدەین‌و تێیانْ بگەیەنین کە کورد تیرۆریست نین. مەسەلەن حیزبی دێموکرات نەك هەر قەت تیرۆری نەکردوە، قەت گرەوگانی نەگرتوە، تەیارەی نەڕفاندوە بەڵکوو بە پێچەوانەوە زۆر جاریش یارمەتیی داوە بە ئازادیی گرەوگانەکان‌و حیزبێکی دێموکراتەو ئیحتیرامی بۆ دێموکراسی هەیەو زۆر هەوڵ درا کە تەنسیری کارەکانی پ.ك.ك لەبەین بچێت. بەڵام بەداخەوە حکوومەتی تورکیە گەورەترین ئیستفادە لەو ودزعە دەکا، بە شێوەیەك کە مەسەلەن هەر ئێوارەی ڕۆژی دووهەمی ئەو ڕووداوە کە لە ماردین ڕووی دابوو و ئەو سی‌ویەك کەسەی تێدا کوژرا بوون، عەکسەکانیان‌و حەتتا فیلمی تەلەویزیۆنی‌یان لە سەرتاسەری ئورووپای ڕۆژئاوادا بڵاو کردەوە. ئەوە کە جێگای داخە، پاش ئەو وەختە دوو جاری دیکەش ئەو مەسەلەیە تیکرار بۆتەوەو ژن‌و منداڵ لە دێیەکانی تورکیە بەرکەوتون. دیارە ئێمە لەگەڵ ئەوە کە پێمان وایە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی تورکیە خەباتێکی بەرحەقە، لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە خەباتی هەموو ڕێکخراوەکانی کوردستانی تورکیە تەنانەت "پ.ك.ك"ش دژی ڕێژیمی تورکیە تەئیید دەکەین، ناتوانین لەگەڵ ئەو جۆرە میتۆدانە موافق بین‌و بە هیچ جۆرێك پێم‌وانیە کە تیرۆریسم خزمەتی جووڵانەوەی کورد بەگشتی بکا. بە نەزەری من دەبێ تەجرەبەی فەلەستینی‌یەکانمان لەبیر بێ کە لە سەرەتاوە زۆر کاری ئەوتۆیان کرد کە ئێستاش کە ئێستایە نەیانتوانیوە ئەسەری مەنفیی ئەو کارانە لەبەین بەرن.

**پ:** کاك دوکتور ببوورە، هەر لەو پێوەندی‌یەدا، بەڕاستی ئەوان بۆخۆیان مەسئوولیەتی کوشتنی سەرۆکی کرێکارانی کوردی تورکیەو کاك "عەلی"شیان بە عۆدە گرت؟

**دوکتور قاسملوو:** بەڵێ دیارە ئەوەیان بەعۆدە گرت، بەڵام دەبێ بگوترێ کە لە جێگایەکی دیکە کە شەڕ سازبوو لە بەینی لایەنگرانی ئەوان‌و پارتی سۆسیالیستدا یەکێك لەوان کوژرا بوو. جا ئەوە وەکوو ئەوەی کە تۆڵەی خۆیان کردبێتەوە، کە ئەوە

دیارە تەئسیرێکی یەکجار زۆر خراپی هەیە لەسەر بیری خەڵکی ئورووپا بەتایبەتی ئێمە حەقی ئەوەشمان هەیە کە لەو بارەوە قسە بکەین، حەقی ئەوەشمان هەیەو مەسئوولیەتیشمان دێتە سەر، چوونکە لەوێ ئینسانی عادی، بڵێین ئی کۆڵان، نازانێ پ.ک.ك چیەو حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران چیە، رەنگە زۆر بۆی وا بێتە گۆڕێ کە ئەوە کوردن ئەو کارەیان کردوە. جا ئێمە دەبێ زۆر هەوڵ بدەین هەتا ئەو ئەسەرە مەنفی‌یە لەبەین بەرین. بۆیە پێمان وایە کە مەسئوولیەتێکی سیاسیشمان لەسەر شانە کە هەموو وەختێك لە هەر جێگایەك بڵێین کە ئەوە جووڵانەوەی کورد نیە کە ئەو کارانە دەکا،و من هەوڵم دا ئەو کارە بکەم بەتایبەتی وتوویژێکی تایبەتیم کرد لەگەڵ لیبراسیۆنی پاریس کە رۆژنامەیەکی چەپی‌و بەناوبانگی فەرانسەیەو لێرەدا بە کردەوەکانی پ.ك.ك چوومەوە. هیوادارم ئەو رۆژنامەیەش بگاتە دەستی ئێوەو لە "کوردستان"یش‌دا بڵاو بێتەوە.

**پ:** سوپاس کاك دوکتور. هەر لەو ماوەیەدا کە ئێوە لە فەرانسە بوون، پێوەندیی نێوان فەرانسەو کۆماری ئیسلامیی ئێران تووشی ئاڵۆزی‌یەکی زۆر هات‌و وەك دەزانین ئەنجامەکەی بوو بە هۆی پچڕانی پێوەندیی نێوان ئێران‌و فەرانسە. دەکرێ جەنابت کە لە نێزیکەوە ئاگاداری رووداوەکان بووی مەسەلەکەمان زیاتر بۆ روون بکەیەوە. پاشان نەزەری خۆتان لەسەر دوارۆژی پێوەندی‌یەکانی ئێران‌و فەرانسە بفەرموون.

**دوکتور قاسملوو:** لە پێش‌دا ئەوە بڵێم کە پارەکە من لە فەرانسە بووم. زۆر بە سەراحەت بە نوێنەرانی رێکخراوە سیاسی‌یەکان‌و تەنانەت دەوڵەتی فەرانسەشم راگەیاند کە ئێمە وتوویژمان وەختی خۆی زۆر کردوە، شەش مانگی تەواو لەگەڵ ئایەتوڵڵاکان دانیشتووین. وتوویژ لەگەڵ ئەوانە زەحمەتە، بەتایبەتی کە ئەوانە تەرەفێکی باش نین، درۆ زۆر دەکەن، قسەکانیان هەموو فڕوفێڵەو بەپێی ئەو ئەسڵە کە بۆ خۆیان هەیانە، "تقیە"، دەتوانن هەموو درۆیەك بکەن‌و دەوڵەتی فەرانسە نابێ ئەوانە وا چاو لێ بکا کە وەك دەوڵەتی دیکە کە قسەیەك دەکەن ئیعتباری هەیەو لەسەری رادەوەستن. بەڵام بەداخەوە دەوڵەتی فەرانسە بەپێی وەزعی داخلیی خۆی‌و بە هۆی ئەوە کە هێندێك گرەوگانی هەبوون، وتوویژەکەی درێژە پێ دا، تەنانەت ٣٣٠ میلیۆن دۆلاریشی لەو پوولەی کە لە لای فەرانسەیە دا بە رێژیمی جمهووریی ئیسلامی. بەڵام رێژیمی جمهووریی ئیسلامی هەروەها کە من پێش‌بینیم کردبوو، یا

ئەوانە جمهووریی ئیسلامی دەناسن، پێش‌بینی‌یان کردبوو، وەعدەکانی خۆی بەجێ نەهێنا، فەرانسە بەتایبەتی داوای دەکرد کە گرەوگانەکان، ئەوانەی کە لە لوبنانن بەر بدرێن. دەوڵەتی جمهووریی ئیسلامی شەرتی تازەی هێنایە گۆڕی وەك ئەوە کە دەوڵەتی فەرانسە نابێ سیلاح بدا بە عێراق یا هەر نەبێ ئەگەر سیلاح بە عێراق دەدا دەبێ سیلاحیش بدا بە جمهووریی ئیسلامی. دەوڵەتی فەرانسە ئەوەی قبووڵ نەکرد. لەو وەزعەدا دەرکەوت کە یەکێك لەوانە کە بەناوی موتەرەجیم لە سەفارەتی فەرانسە کار دەکا، سەرۆکی شەبەکەی ئەو تیرۆریستانە بووە کە پارەکە پاییز لە شاری پاریس زۆر تیرۆری گەورەیان کرد. دیارە هەر ناوی موتەرەجیمە. هێندێ رۆژنامەنیگار کە لە نێزیکەوە دەیناسن دەیانگوت وەختێك بە فەرانسەیی پێی دەڵێین بۆ ئەوەی تەرجومەی بکا بۆ مەسئوولینی سەفارەت، بۆخۆی جواب دەداتەوە. مانای ئەوەیە کە سەلاحییەتی هەیەو لە واقیعدا شەخسی یەکەم نەبێ شەخسی دووەمی سەفارەتە. ئەو کابرایە کە ناوی وەحیدی گورجی‌یە، چونکە مەسوونییەتی دیپلۆماسیی نیە، دادگای فەرانسە داوای کرد کە دەبێ بێ بۆ بازجوویی، بەڵام ئەو خۆی شاردەوە لە پاشان دەرکەوت کە لەواقیعدا لە سەفارەتەو دەوڵەتی جمهووریی ئیسلامی بۆ ئەوەی گاڵتە بە دەوڵەتی فەرانسە بکا، رۆژێك هات ئەو کابرایەی بە ناوی موتەرەجیم لە وتوویژێکی چاپەمەنی‌دا بەشدار کرد کە لە سەفارەت کراو نوێنەرانی تەلەویزیۆنو رۆژنامەکان لەوێ ئامادە بوونو ئەوە لە واقیعدا تەحقیر کردنی دەوڵەتی فەرانسە بوو کە یەکێك کە عەدالەتی فەرانسە لێی دەگەڕێ ئەوە لە سەفارەتەو حازریش نیە بچێ خۆی تەسلیمی عەدالەت بکا. لە نەتیجەدا لەبەر ئەفکاری عموومیی فەرانسەو لەبەر ئەوە کە دەرکەوت نەرمی‌و پاشەکشە لەگەڵ ئێران فایدەی نیە هەردووکیان یانێ هەم شیراكو هەم میتەران موافق بوون کەدەبێ زۆر قایم بەرامبەر بە ئێران رابوەستن. لەبەر ئەوە کە گوتیان بێ ئەملاو ئەولا وەحیدی گورجی خۆی تەسلیمی عەدالەت بکاو ئەوە هەم شیراك گوتی، هەم میتەران گوتی، لە نەتیجەدا گەیشتە ئەو جێگایە کە پێوەندیی دیپلۆماسیی بەینی فەرانسەو ئێران قەتع بوو و دەوڵەتی فەرانسە تێ‌گەیشت کە لەگەڵ دەوڵەتی جمهووریی ئیسلامی هیچ رێگای دیکە نیە. بە نەزەری من ئەوە کە ئەو پێوەندی‌یە لە دوارۆژدا چۆن دەچێتە پێش، بە زۆر عامیل بەستراوەتەوە. بەڵام من پێم وایە دەوڵەتی جمهووریی ئیسلامی ئەگەر لە بەرامبەری‌دا

قایم رابوەستی پاشەکشە دەکا. هەروەها کە چەند رۆژ لەوە پێش دەیانگوت کە دیپلۆماتەکانی دەوڵەتی فەرانسە لە تاران هەموو جاسووسنو دەیانەویست وەزعێکی وا پێك بێنن وەك سەفارەتی ئەمریکایان گرتبوو لە ساڵی ١٣٥٨دا ئەوەی تیکرار بکەنەوە، بەڵام لە موقابیل قایم راوەستانی دەوڵەتی فەرانسەدا دەوڵەتی جمهووریی ئیسلامی پاشەکشەی کرد. نەتیجەکەی دیارە بەتەواوی مەعلووم نیە. چونکە بەستراوەتەوە بە زۆر شتی دیکەوە کە پێکەوە دەچنە پێشێ وەك مەسەلەی وەزعی خەلیج، ئەو وەزعەی کە ئێستا لە خەلیجدا پێکهاتووەو مەسەلەی بڕیاری شووورای ئەمنییەت. بە نەزەری من لە لایەکەوە دەوڵەتی جمهووریی ئیسلامی مەجبوورە پاشەکشە بکا، بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە لە بیرمان نەچێ کە هەروەخت لە داخلی خۆیدا تووشی وەزعێکی زۆر ناخۆش بوو، دەوڵەتی جمهووریی ئیسلامی لەوە دەگەڕێ کە لە خاریجدا بوحرانێك ساز بکا بۆ ئەوەی هەموو تەوەجووهەکەی رابکێشی بۆ لای خاریج.

**پ:** زۆر سوپاس کاك دوکتور، ئیجازە بدەنە من ئاخر پرسیارمان لە بارەی رۆژنامەکەمانەوە بێ، نەزەرتان لەسەر بڵاوکراوەی "کوردستان" چیەو بەتایبەتی چ رێنوێنییەکتان هەیە بۆ ئەوەی رۆژنامەکە زیاتر بەرەو پێش بچێو زیاتر بتوانێ سەرنجی خوێنەرانی رابکێشێ.

**دوکتور قاسملوو:** چونکە بۆخۆم یەکێك لە ئەندامانی هەیئەتی نووسەرانی "کوردستان"م پێم خۆش نیە زۆر تەعریفی "کوردستان" بکەم. بەڵام پێموایە نێوەڕۆکی رۆژنامەی "کوردستان" لەسەر یەك زۆر باشە، نێوەڕۆکی چۆتە سەرێ، یانی سەتحی باشەو ئەو شتانەی کە لە رۆژنامەی کوردستاندا بڵاو دەبنەوە سەتحێکی باشیان هەیەو لە باری سیاسییەوە زۆر رێکوپێکەو هیوادارم کە رۆژنامەکەمان هەر وا بچێتە پێش، بەتایبەتی ئەوەش هەیە کە زۆر شتی جۆراوجۆری تێدایە. ئینسان کە دەیخوێنێتەوە جالبە بۆی کە هەم شتی لێ فێر دەبێو هەم ئەخبارو ئیتلاعاتی تازەی تێدایە. بەڵام پێم خۆش بوو ئیشارە بە دوو شتیش بکەم، یەکێکیان ئەوە کە وەك دەزانین ئێمە رێکخراوێکی ئێرانین کە لە داخلی ئێراندا هەم نفووزمان لە نێو خەڵكدا زۆرەو هەم رێکخراوەکانمان لە داخلی ئێراندا مەوجوودن. جا بە نەزەری من زیاتر دەبێ هەوڵ بدەین لەسەر گیروگرفتەکانی داخلی ئێرانو داخلی کوردستان شت

بنووسینو وەزعی داخلی ئێران ئەوەندە کە پێویستەو ئەوەندە کە مومکینە مونعەکیس بکەین لە رۆژنامەکەماندا. مەسەلەی دووهەم کە پێم خۆش بوو ئیشارەی پێ بکەم ئەوەیە کە دیارە "کوردستان" مانگانەیەو کە مانگانەش بوو ناکرێ بە رۆژنامەیەکەی خەبەری، بەلاّم لەگەلّ ئەوە پێم وایە مەسایلی موشەخەس، ئێوە ئەگەر زیاتر مەترەح بکەن، چ لە باری "بین‌المللی"یەوە چ لە باری داخلی‌یەوە زۆر باشەو بەتایبەتی دەمەوێ ئیشارە بەوە بکەم کە هەرچی بتوانین مەقالەکانمان کورتتر بێ‌و زیاتر شت بنووسین، ئەوە قازانجی زیاترە یا مەسەلەن ئەگەر بتوانین ستوونی تازە بکەینەوە وەکوو مەسەلەن ئەو ستوونەی کە کراوەتەوە بەناوی "مەسەلەی کورد لە راگەیەنە گشتی‌یەکاندا"، وا دەردەکەوێ کە خوێنەران زۆریان پێ خۆشە. بە کورتی دەمەوێ بلێم کە رۆژنامەی کوردستان لە واقیعدا دوو ئەرك یانی ئەرکێکی دوو لایی لەسەرە، لە لایەکەوە وەزعی واقیعیی ئێرانو کوردستانی ئێران مونعەکیس بکا. چونکە لە دەرەوە زۆر کەس هەیە پێی خۆشە بزانێ لە ئێرانو کوردستان چ باسە، لە لایەکی دیکەشەوە وەزعی "بین‌المللی"و دەرەوە بۆ خوێنەرانی خۆی لە کوردستانو لە ئێران مونعەکیس بکا. چونکە ئەوانیش پێیان خۆشە بزانن کە لە دەرەوە نیسبەت بە مەسەلەی کورد بەگشتی یان مەسائیلی ئێران خەلّك چ هەلّوێستێکیان هەیە.

**پ:** کاك دوکتور لە هەموو تەوزیحەکانت بەتایبەت لە رێنوێنی‌یەکانت سوپاس دەکەم، ئارەزووم ئەوەیە هەمیشە ساغو سلاّمەتو سەرکەوتوو بی.

**دوکتور قاسملوو:** سوپاستان دەکەم.

# بەشێك لە وتووێژە چاپەمەنی‌یەكانی
# هاوڕێ دوكتور عەبدولڕەحمان قاسملوو لە ئیسپانیا*

لە ماوەی كورتی مانەوەی كاك دوكتور لەم وڵاتەدا زۆر ڕۆژنامەی پڕ تیراژی ئیسپانیایی وتووێژیان لەگەڵ كرد كە بێگومان بڵاوبوونەوەی ئەو وتووێژانە شوێنەواری بەرچاوی لە ناساندنی بزووتنەوەی كوردو هەڵوێستی حیزبی دێموكراتی كوردستانی ئێران لەسەر مەسەلە گرنگەكانی ئێران و كوردستاندا دەبێ. ئێمە وەرگێڕدراوی بەشێك لەم وتووێژانە بۆ ئاگاداریی خوێنەرە بەڕێزەكانی كوردستان بڵاو دەكەینەوە:

بەشێك لە وتاری "ئیل پائیس"، ڕۆژی ١٩٨٧/٦/٢٤، وتووێژ لەگەڵ كاك دوكتور بەم جۆریە: حیزبی دێموكراتی كوردستانی ئێران لە ئەنتێرناسیۆناڵی سۆسیالیستدا وەك تەماشاكەر (چاوەدێر) بەشدارە، بەڵام ئێستاش بەتەواوی نەناسراوە. سابیقەی ٤٢ ساڵ خەباتی هەیە. ح.د.ك.ئ. چونكە لە پشتیوانیو یارمەتیی حكوومەتان بێبەشە تا ئێستا نەیتوانیوە مەسەلەی كورد بەرێتە نێو ڕێكخراوە نێونەتەوەیی‌یە گەورەكان. سەرەڕای ئەوەش كاری دیپلۆماتیك قازانجی هەبووە. قاسملوو دەڵێ: "پێوەندیی باشمان لەگەڵ حیزبی سۆسیالیستی فەرانسە بوو بە هۆی ئەوە كە دوای هاتنە سەر كاریان ڕێگەمان بدەن دەفتەرێك بكەینەوەو لە باری ئینسانی‌یەوە یارمەتیمان پێ كەن. حكوومەتی موحافیزەكار ئەو هاوكاری‌یەی پاراست. بۆ وێنە موعالەجەكردنی ئەو بریندارانەی برینەكانیان قورسن. چونكە ئێمە كەلوپەلی

---

* ڕۆژنامەی "كوردستان" ژمارەی ١٢٠، خەرمانانی ١٣٦٦

پێویستمان بۆ موعالەجەکردنیان نیە. دیارە هێندێك لەو چەشنە یارمەتی‌یانەمان لە سوئیدو ئوتریش وەدەست کەوتوە دەمانەوێ لە ئیسپانیاش بەو ئامانجە بگەین." پێشمەرگەی بەساڵدا چووی رێبەری کوردەکان بە گەرمی‌یەوە رادەگەیەنێ: "تا ئێستا پێویستی‌مان بە یارمەتیی ماددیو چەك نیە تەنیا یارمەتیی مەعنەویو سیاسیمان دەوێ. بۆ ئەوە بتوانین بە زمانی خۆمان قسە بکەینو لە ئازادی‌دا بژین." قاسملوو بە تەئکیدەوە ئەوە روون دەکاتەوە کە ح.د.ك.ئـ حیزبێکی مودێرنە کە بە هۆی شەخسێکەوە رێبەرایەتی ناکرێو هەر دوو ساڵ جارێ کۆنگرە دەگرێ. کۆنگرە ئورگانێکە کە لەودا ئەندامی کومیتەی ناوەندی لە رێگای دەنگدان بە شێوەی نهێنی هەڵدەبژێردرێن.

***

رۆژنامەی "دیاریو دیسی سیەس" لە ژمارەی رۆژی ١٩٨٧/٦/٢٥ی خۆیدا دەنووسێ: ئەم رۆژانە، عەبدولڕەحمان قاسملوو سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، بۆ ناساندنی خەباتی گەلەکەی بەبیروڕای گشتی هاتۆتە مادرید. ح.د.ك.ئـ. وەك هەموو رێکخراوە کوردی‌یەکانی دیکە لەبەر مەوقعییەتی ستراتیژیکی کوردستان، ئەو شوێنەی گەورە هێزەکان قازانجیان تێی‌دا هەیە لە لایەن هیچ حکوومەتێکەوە یارمەتی نادرێ. ئەو پێشمەرگانەی دوکتور قاسملوو رێبەرایەتی‌یان دەکا نیزیك بە دە ساڵە لە رێگای وەدی‌هێنانی دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ گەلەکەیاندا لەگەڵ رێژیمی تاران بەربەرەکانێ دەکەن. قاسملوو لە سەر ئەو مەبەستە پێ دادەگرێ کە هەم کاروباری نێوخۆی حیزبەکەیو هەم کاروباری ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی حیزب بەپێی ئوسوولی دێموکراتیك بەڕێوە دەچن. هەروەها دەڵێ: "ئێمە وەك حیزبێکی دێموکرات رەشەکوژی رەت دەکەینەوە. چونکە حیزبێك کە لە لایەن گەلەوە پشتیوانی لیٚ بکرێ، هیچ پێویستی‌یەکی بە پەنابردن بۆ ئەو چەشنە کارانە نیە، ئێمە تیرۆریزم لە هەر شوێنێك مەحکووم دەکەین. بەڵام خەباتی چەکدارانە لە دژی رێژیمی تیرۆریستو کۆنەپەرستی تاران رەت ناکەینەوە. لە رێژیمێکی دیکتاتۆری‌دا کە دەرەتانی هیچ شێوەیەکی دیکەی خەبات لە گۆڕێدا نیە، تەنیا چەك بۆ خەبات لە پێناوی دێموکراسی‌دا دەمێنێتەوە."

سکرتێری گشتیی ح.د.ک.ئـ. دەڵێ: "ئەوە هێرش‌و دەستدرێژیی ڕێژیمە کە ئێمەی ناچار بە پەلامارو هێرش کردوە. بەڵام هێرش‌و پەلاماری شۆڕشگێڕانە نابێ لە هێندێك سنوور تێپەڕ بن. دەبێ هێرش بکرێتە سەر پێگە نیزامی‌و ستراتێژیکی‌یەکان‌و هێزە چەکدارەکانی ڕێژیم، بەڵام هەنگاو هەڵێنانەوە دژی خەڵکی بێ‌دیفاع دەبێ بەرگریی لیٚ بکرێ". قاسملوو تا ئەو جێگایە مەحکووم کردنی تیرۆریزم بەرین دەکاتەوە کە ئەو ڕێکخراوە کوردانەش دەگرێتەوە کە ستراتیژی خۆیان لەسەر بناخەی ئەم کردەوانە دامەزراندوە. ئەو چەشنە ڕێکخراوانە بەوە تاوانبار دەکا کە ئامانجیان لەگەڵ ئامانجی بزووتنەوەی کورد یەك نیەو هێرشی ئەم دواییانەی شەڕکەرە کوردەکان لە جنووبی ڕۆژئاوای تورکیە کە ئاکامەکەی بە کوشتچوونی ٣٠ کەس لە خەڵکی بێ‌تاوان بوو بە نموونە دێنێتەوە: "کاتێك دەستەیەکی وەك پ.ك.ك ئەو چەشنە کارە تیرۆریستی‌یانە دژ بە خەڵکی کوردستان دەکا لە ئاکامدا بیانوویەکی باش بۆ بەکار هێنانیان دژی خۆیان دەداتە دەست حکوومەتی تورکیە."

***

ڕۆژنامەی "ئێگێن" (وڵاتی باسك)، ١٩٨٧/٦/٢٧ بەشێك لە وتوویژی هەواڵنووسی خۆی لەگەڵ کاك دوکتور بەو شێوەیە بڵاو کردۆتەوە:

قاسملوو بەتەئکیدەوە دەڵێ: "ئێمە بۆ دێموکراسی بۆ ئێران‌و خودموختاری بۆ کوردستان خەبات دەکەین، داواکانمان حەقن. شەڕکەرین بەڵام هەر چەشنە کردەوەیەکی تیرۆریستی ڕەت دەکەینەوە. ئەگەر ڕێژیمی دێموکراتیك لە وڵاتێکدا هەبێ ئەوە زۆرایەتی بڕیار دەداو کەمایەتی پەیڕەوی دەکا. بەڵام لەوەدا کە پێوەندی بە مەسەلەی میللی‌یەوە هەیە جێی خۆیەتی کەمایەتی نەتەوەیی بڕیار بداو مافی دیاریکردنی چارەنووسی هەبێ". قاسملوو دەڵێ: "ڕۆژئاوا بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەو شەڕی شۆڕشگێڕانەی لەگەڵ تیرۆریزم لیٚ تێك چووەو هێندێك لە ڕاگەیەنەرە گشتی‌یەکان دەکەونە نێو داوێك کە تیرۆریزم دروستی کردوە. بەدبەختیی ئێمە ئەوەیە کە کوردین‌و میللەتێکین کە کەس باسمان ناکا، ئەگەرچی زیاتر لە ٤٠،٠٠٠ کەس خەڵکی بێ‌دیفاعمان لیٚ کوژراوەو هەزاران لاومان ئیعدام کراون، بەدەیان گوندمان وێران کراون‌و دانیشتووەکانیان لە نێو چوون‌و زیندانەکان پڕن لە زیندانیی سیاسی کە ئەشکەنجەی گیانی‌و رووحی دەدرێن. ئەوانە بڵاو ناکرێنەوە هەروەها ئەوەش بڵاو

ناکرێتەوە کە لە کۆماری ئیسلامی‌دا کچە جەحێڵەکان بۆ ئەوەی بە کچێنی نەمرنو نەچنە بەهەشت پێش ئێعدام کران، دەستدرێژی بە نامووسیان دەکرێو ئەفرادی مەحکووم بە مەرگ بە زیندوویی خوێنی لەشیان بەتاڵ دەکرێ، چونکە رێژیم پێویستی بە خوێن بۆ بریندارەکانی شەڕ هەیە". قاسملوو ئیددیعا دەکا کە حیزبەکەی خاوەنی ئیدئۆلۆژی‌یەکی دیاری‌کراو نیە. بەڵکوو بەگشتی حیزبێکی لائیکەو لە رێبەرایەتی‌یەکەی‌دا ئەفرادی مەزهەبیو مارکسیست هەن. سەرەڕای ئەوە پێکهێنانی سیستمێکی سۆسیالیستی لەگەڵ دێموکراسیو پلۆرالیسم وەك ئامانج دیاری کراوە.

***

رۆژنامەی "یا" لە ژمارەی رۆژی ١٩٨٧/٦/٢٩ی خۆی‌دا وتوویژی نوێنەری خۆی لەگەڵ کاك دوکتور چاپ کردوە. بەشێك لە وتوویژەکە بەم جۆرەیە:

**هەواڵنووسی "یا":** ح.د.ك.ئـ. لە شۆڕشی ئیسلامیی ئێراندا بەشدار بوو و دژی شا خەباتی کرد. ئایا ئەو کاتە هیچ بیرتان لەوە دەکردەوە کە دیکتاتۆرێك دەڕواو دیکتاتۆرێکی دیکە جێی دەگرێتەوە؟

**دوکتور قاسملوو:** نامەوێ بڵێم ئەوەمان دەزانی بەڵام ئێمە هەوەڵ حیزب بووین کە دژایەتیمان لەگەڵ کۆماری ئیسلامی کردو هەر لە هەوەڵەوە لە بەرامبەر خومەینی‌دا راوەستاین. ئەمن خومەینیم لە فەرانسە چاو پێکەوت، زۆریش خوشبین نەبووم دەمزانی کۆنەپەرستو زاڵمە. بەڵام قەت پێم وانەبوو تا ئەو رادەیە زاڵمو خوێنڕێژ بێ.

**هەواڵنووسی "یا":** کاتێك خومەینی لە نێو بچێ، شۆڕش چی بەسەر دێ؟

**دوکتور قاسملوو:** رێژیمی کۆماری ئیسلامی بە خومەینی‌یەوە بەستراوەتەوە. رێبەرو شەخسیەتێکی دیکە نیە کە بتوانێ شوێنی بگرێتەوە. خومەینی سێ تایبەتی هەن: رێبەری شۆڕشە، ئایەتوڵڵایەکی گەورەیە، سیاسەتمەدارێکی کۆنەکارو بەتەجرەبەیە. ئێستا لە ئێراندا کەسێکی ئەوتۆ نیە کە تەنانەت دوو تایبەتمەندی لەو سێ تایبەتمەندییانەی تێدا بێ. پێم وایە مردنی خومەینی بە مانای لە نێوچوونی فەوریی رێژیمی ئیسلامی نیە، بەڵام بەڵێ رێگای رووخانی کۆماری ئیسلامی خۆش دەکا.

**هەواڵنووسی "یا":** ئایا هیچ چەشنە پێوەندی‌یەکتان لەگەڵ موجاهیدینی خەڵق، رێکخراوێك کە ئەویش بەرامبەر بە رێژیمی تاران دژایەتی دەکا، هەیە؟

**دوکتور قاسملوو:** بۆ ماوەی ٤ ساڵ ح.د.ك.ئـــ. بەشێك لـە شـوورای نیشـتمانیی بەرگریی بوو کە موجاهیدین پێکی هێنابوو. بەڵام دوو ساڵ لەمەوپێش لەو شـــوورایە هاتینە دەر، کاتێك بووینە ئـەندامی شـوورا، پێمـان وابـوو ئیدەکـانی موجـاهیدین جیاوازی‌یان لەگەڵ ئیدئۆلۆژیی کۆماری ئیسلامی‌دا هەیـەو موجـاهیدین بڕوایـان بـە دێموکراسی‌و پلۆرالیزم هەیە. چوار ساڵ هاوکاریی نیزیك لەگەڵیان، پێچەوانـەی ئـەو شتانەی نیشان داین، رەجەوی رێبەرەکەیان خۆی بـە خومەینی‌یـەکی دیکـە دەزانـیێو رادەگەیەنێ کە ئەو تەنیا لە بەرابەر خودادا بەرپرسی کردەوەکانیەتی. ئێمە ئەوانەمان پێ قبووڵ نەدەکرا، هــەر بۆیـە شـوورامان بـەجێ هێشـت. ئێسـتاش هیـچ چەشـنە پێوەندی‌یەکمان لەگەڵیان نیە.

**هەواڵنووسی "یا":** پێت وایە پێشنیاری ئاگربەس کـە بـە هـۆی پێنـج ئـەندامی دایمیی شوورای هێمنایەتیی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە پێشکەش کـراوە، بتوانـێ ببێتـە رێگەیەك بۆ بردنی ئاشتی بۆ خەلیج؟

**دوکتور قاسملوو:** زۆرم متمانە بـە ویسـتو ئـیرادەی ئـەندامانی دایمیـی شـوورای هێمنایەتیی رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتوەکان نیە، نموونە دێنمەوە، چەند ساڵە سەرۆك کۆمار رێگان داوای لە وڵاتەکانی ئورووپا کردوە چەك نەدەن بە ئێران، بەڵام بۆ خـۆی ئەو کارەی کردو هەڵلای ئێران گێت ساز بـوو. بێجگـە لـەوە حکوومـەتی تـارانیش رایگەیاندوە کە ئاگربەس قبووڵ ناکا. بە هەرحاڵ پێم وایە ئەگەر شوورای هێمنایـەتی لە سەر ئەو مەسەلەیە سوور بێ‌و پێ دابگرێ، مومکینە بتوانێ زەمینەی تەواوبوونی شەڕ پێك بێنێ.

# وتووێژی گۆڤاری "٢٦ی سەرماوەز" لەگەڵ هاوڕێ سکرتێری گشتیی حیزب، دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو*

**خوێنەرە بەڕێزەکان!** بە بۆنەی ڕۆژی پێشمەرگە "٢٦ی سەرماوەز"، وتووێژێکمان لەگەڵ هاوڕێی تێکۆشەر سکرتێری گشتیی حیزب، کاك دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو پێکهێناوە، کە دەقی ئەو وتووێژە لە خوارەوە دەخوێننەوە.

**پ:** هاوڕێی بەڕێز کاك دوکتور قاسملوو وێڕای سوپاس لە بەشداریتان لەم وتووێژەدا لەگەڵ بەڕێوەبەرانی "٢٦ی سەرماوەز"، پرسیاری یەکەمان بەم چەشنە دەست پێ دەکەین: دیاریکردنی ڕۆژی پێشمەرگەی کوردستان یەکەم جار ساڵی ١٣٦٣ لە لایەن حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە ڕاگەیاندرا. تکایە بفەرموون ئەو کارە بە چ مەبەستێك بوو؟

**و:** حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بۆیە ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەزی بە ڕۆژی پێشمەرگە دانا، کە ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٤ یەکەم جووڵانەوەی چەکدارانەی خەڵکی کوردستان لە مەهاباد بە بەڕێوەبەریی حیزبی دێموکراتی کوردستان پێکهات و نەتیجەی ئەوە بوو کە توانی بە حاکمییەتی دەوڵەتی مەرکەزیی کۆنەپەرست لە کوردستان کۆتایی بێنێ. بەمجۆرە ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەز لە مێژووی گەلەکەماندا ڕۆژێکی پیرۆزە. بۆ وەبیرهێنانەوەی ئەو ڕۆژەو نیشاندانی ئەو ڕاستییە کە درێژەدان بە ڕێبازی جووڵانەوەی ١٣٢٤و ١٣٢٥ تا کۆتاییهێنان بە حاکمییەتی

---

* گۆڤاری "٢٦ی سەرماوەز"، ژمارە ١١

کۆنەپەرستی ئێستاش هەر ئەرکی سەرشانمانە، بۆ ڕێزدانان بۆ خەباتی قارەمانانەی ئێستای پێشمەرگە کە پتر لە ٨ ساڵە کۆڵنەدەرانە بەرامبەر بە ڕێژیمی سەدەکانی نێوبجیی کۆماری ئیسلامی بەربەرەکانێ دەکاو هەروەها بۆ ئەوە کە هەموو ساڵێ بە سەر خەباتی ساڵی ڕابردوومان‌دا چاو بخشێنین. بۆ ئەوەی بتوانین کەموکووڕی‌یەکانی لابەرین، بۆ ئەوەی بتوانین گیروگرفتەکانی چارەسەر بکەین لە تاقیکردنەوەی ساڵی ڕابردوو بۆ ساڵی داهاتوو و ساڵەکانی داهاتوو کەڵك وەرگرین. بۆ هەموو ئەوانە بەڕێوەبەریی حیزبی ئێمە، بڕیاری دا ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەز بە ڕۆژی پێشمەرگە ڕابگەیەنێ‌و هەموو ساڵێ ئەو ڕۆژە جێژن بگرێ.

**پ:** بە بڕوای ئێوە پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ٢٦ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٦٣ڕا تا ئێستا بەگشتی چ ئاڵوگۆڕێکیان لە باری چەندی‌و چۆنی‌یەوە بەسەردا هاتوە؟

**و:** لە سێ ساڵی ڕابردوودا بەگشتی باشتربوونی چۆنیەتیی تێکۆشانی هێزی پێشمەرگە زۆر بەرچاوە. دەتوانم بڵێم لە باری سیاسی‌و نیزامی‌یەوە پێشمەرگەی ئێمە ئێستا باشتر بۆ خەبات ئامادە دەکرێن‌و لێرەش‌دا دەبێ بڵێم کە فێرگەی سیاسی - نیزامی نەخشێکی باشی هەیە. بەڵام دیارە ئەوە لە مەیدانی خەبات‌دایە کە پێشمەرگە تاقیکردنەوە وەدەست دێنێ‌و ئابدیدە دەبێ‌و دەبێتە پێشمەرگەیەکی ئەوتۆ کە حیزبی ئێمە ئاواتیەتی هەبێ. پێشمەرگەی ئێستامان لە باری دیسیپلین‌و ئینزباتیشەوە جیاوازی لەگەڵ پێشمەرگەی چەند ساڵ لەوە پێش زۆرە، ئێستا پێشمەرگە دەزانێ کە هەرچی دیسیپلین‌و ئینزباتی زیاتر بێ‌و هەرچی ئوسوولی ئەو دیسیپلینە باشتر بەکار بێنێ ئەوەندە لە کارو تێکۆشان‌و بەتایبەتی لە عەمەلیاتی نیزامی‌دا سەرکەوتووە. لە باری چەك‌و تەقەمەنی‌و جلوبەرگەوە پێشمەرگەی ئێستای حیزبەکەمان پۆشتەو تەیارە. تەنانەت بەخۆشی‌یەوە دەتوانم بڵێم کە لە زۆر لە چەکدارانی ڕێژیمی خومەینی تەیارترەو خۆشحاڵم کە لێی زیاد بکەم کە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا بەتایبەتی پێشمەرگەکانمان هەرگیز تووشی کەمبوودی تەقەمەنی نەبوون. چەکیشیان ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر بووەو ئێستا چەکی زۆر بەکاریان پێ‌یە. هەروەها پێشمەرگەکانمان تاقیکردنەوەی نیزامی‌یان زیاتر بووەو بەتایبەتی هێندێ فەرماندەی زۆر باشمان بۆ پەیدا بوون کە دەتوانن تەرحی زۆر باش دابڕێژن‌و ئوسوولی شەڕی

پارتیزانی بەڕێوەبەرن. زۆربەی ئەو عەمەلیاتانەی کە لە ساڵی رابردوودا بووە سەرکەوتوو بووە. شەهیدمان یا نیە یا نیسبەت بە ساڵانی رابردوو زۆر کەمترەو ئەوە هەموو نیشانەی ئەوەیە کە پێشمەرگە ئوسوولی شەڕ باشتر فێر بووەو لەوەش زیاتر نەك هەر فێر بووە بەڵکوو بەکردەوە لە عەمەلیاتی نیزامی‌دا ئەوەی کە فێری بووە بەکاری دێنێ. بەکورتی پێشمەرگە گەیشتۆتە رادەیەکی بەرزتر لە تێکۆشانی خۆی‌دا لە عەمەلیاتی نیزامیی خۆی‌داو ئێستا ئیمکانی ئەوە پێکهاتوە کە پاش ئەوە کە چۆنیەتیی (کاری) پێشمەرگەمان زۆر چۆتە سەرێ، فکر لەوە بکەینەوە کە ژمارەی پێشمەرگەش بەپێی پێداویستیی هەلومەرج زیاد بکەین.

**پ:** ژنانی کوردستان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ بەشداریی چالاکانەیان لە شۆڕشی ئێمەدا بووە بەڵام ئەمساڵ ژمارەیەکی بەرچاو لە کچەکان هاتوونەتە ریزی پێشمەرگەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. تکایە رێنوێنیو پێشنیاری خۆتان بۆ بەشداریی زیاتری خوشکەکان بفەرموون.

**و:** بەڕاستی بەشداری تا ئێستای ژنان لە شۆڕشی کوردستاندا جێگای شانازی‌یە. بەڵام ئێمە نابێ بەوەندە رازی بین. زۆر جار گوتوومانەو ئێستاش دووپاتی دەکەمەوە هەرچی ژنان لە بزووتنەوەی کوردستاندا زیاترو چالاکتر بەشدار بن ئەوەندە بزووتنەوەی کوردستان سەرکەوتووترە. جێگای خۆشحاڵی‌یە کە کچانی کوردستان ئێستا زیاتر لە جاران دێن بۆ نێو خەباتی چەکدارانە. هیوام ئەوەیە کە زۆر باش وەریان بگرن. هەموو هەلومەرجێك بۆ ژنانو پەروەردەکردنیان بۆ خەبات پێك بێننو لەگەڵ ئەم خوشکانە کە بە ئاواتو هیوایەکی زۆرەوە هاتوون بۆ نێو شۆڕش بەشێوەیەك بجووڵێنەوە کە هەست بکەن بەتەواوی مافی وەك یەکیان لەگەڵ کوڕاندا هەیە. هەرچەشنە بۆچوونێکی کۆنەپەرستانە یا دژایەتی لەگەڵ بەشداریی ژنان لە هەموو لایەنەکانی خەباتی ئێستاماندا مەحکوومەو نابێ رێگا بدرێ وەزعێکی ئەوتۆ بێتە پێش کە خوشکەکانمان لە هاتن بۆ نێو جەرگەی خەبات پەشیمان ببنەوە.

**پ:** گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لەو ماوەدا بە هەموو شێوەیەك نیشانی داوە کە پاڵپشتی راستەقینەی پێشمەرگەیەو لە راستی‌دا ئێستا گەیشتوونەتە پلەیەك لە تێکۆشان کە رێژیم سەرەڕای هەموو زەبرو زەنگێك نەیتوانیوە ریزی خەڵك لە

پێشمەرگە جیا بکاتەوە. بۆ یەکگرتوویی زیاتری خەڵکو پێشمەرگە ئەرکی هەردوو لا لە چیدا دەبینی؟

و: سەرمایەی هەرە گەورەی حیزبی ئێمە پشتیوانیی گەلی کوردە، پێشمەرگەش لە گەل جیا نیەو جیاش ناکرێتەوە. پێشمەرگە ڕۆڵەی خەڵکەو لە شەرەفو ئازادیی خەڵك دیفاع دەکا. رازی تێکنەشکانو سەرکەوتوویی ئێمە هەر لەوەدایە کە خەڵك پێشمەرگە بە هی خۆی دەزانێ لە باوەشی دەگرێو دەیپارێزێ. بۆیە بە لای منەوە پێشمەرگەو خەڵك دوو لا نینو ناکرێ باسی یەکگرتوویی پێشمەرگەو خەڵك بکەین، بەڵام پێم خۆشە پێشمەرگە خۆشەویستەکان ئەوەندەیان لەبیر بێ کە چونکە تفەنگیان لە سەر شانە، نابێ خۆیان لە خەڵك بەزیاتر بزانن. راستە پێشمەرگە باسکی بەهێزی گەلە بەڵام هێزی پێشمەرگە بۆ خزمەت بە گەل پێکهاتووە. هەرچی دەکا دەبێ لەپێناو خزمەت بە گەلدا بێ بۆیە پێشمەرگە دەبێ ئاکارو کردەوەی لەگەڵ خەڵك جوان بێ. هەموو کاتێك خۆی بە پارێزەری نامووسو ئازادیی خەڵك بزانێ بۆ بیروراو سوننەتەکانی خەڵك رێز دانێو هیچ کارێکی ئەوتۆ نابێ لە پێشمەرگە روو بدا کە ببێتە هۆی نارەزامەندیی کۆمەڵانی خەڵك. حیزبی دێموکرات حیزبی گەلی کوردە، پێشمەرگەی حیزبیش دەبێ هەر پێشمەرگەی گەل بێ.

پ: یەکێك لە پیلانە دژی گەلییەکانی رێژیم بۆ بەچۆکدا هێنانی پێشمەرگەی کوردستان بە لای ئێمەوە کوردستانی کردنی شەڕە، بەم چەشنە کە ئێستا رێژیم ژمارەیەکی بەرچاو لە لاوانی کوردستان بەناوی سەرباز لەو پایەگایانە دادەنێ کە بۆ سەرکوتی گەلەکەمان لە کوردستان بەرپای کردونو ئێمە پێیان دەڵێین جاش - سەرباز. ئێوە چ رێگایەك پێشنیار دەکەن بۆ ئەوەی رێژیم لەو پیلانەشیدا وەك پیلانەکانی دیکە شکست بخوا بە ئامانجی خۆی واتە "کورد بە کورد بەکوشت دان" نەگا؟

و: ئەوەندەی بزانم دەزگای راگەیاندنی حیزب، رادیۆو چاپەمەنی لەسەر ئەم مەسەلەیە واتە هەوڵی رێژیم بۆ کوردستانیکردنی شەڕ زۆریان شت بڵاو کردۆتەوە کە زۆر رێنوێنیی بەنرخیان تێدایە. من هەر ئەوەندە دەڵێم کە سیاسەتی حیزبی ئێمە بەرانبەر بە دیاردەی جاش - سەرباز دەبێ دوو لایەنی هەبێ. لە لایەکەوە هەوڵ بدەین لاوی کورد رابکێشین بۆ پێشمەرگایەتی ئەگەر هەر بۆی نەکرا لە کوردستان سەربازی

نەکاو ئەگەر ناچار بوو لە کوردستان سەربازی بکا نەك هەر نابێ شەڕ لەگەڵ پێشمەرگە بکا بەڵکوو دەبێ پێوەندی لەگەڵ هێزی پێشمەرگە بگرێو هاوکاریی لەگەڵ بکا. دیارە بۆ ئەم مەبەستە دەبێ لە نێو لاوانی کوردستاندا کارێکی بەربڵاو بۆ روونکردنەوە بکرێ. بەڵام ئەگەر لاوێك بەپێچەوانەی تێکۆشانی ئێمە هیچ کام لەو کارانەی نەکردو بەڕاستی ئامادە بوو خزمەت بە رێژیم بکا، ئەو کاتە لایەکی دیکەی سیاسەتی حیزب هەبێ، کەسوکاری لاوەکان خۆشیان دەتوانن لەم بارەوە نەخشێکی کاریگەریان هەبێو کوڕەکانیان ئامۆژگاری بکەن کە خزمەت بە گەلی کورد بکەن نە بە کۆماری ئیسلامی کە دوژمنی گەلی کوردە. پێم خۆشە ئەوەش بڵێم کە سیاسەتی کوردستانیکردنی شەڕ سەرنەکەوتوەو سەریش ناکەوێ. هەروەها ئەوانەی بە دڵخوازی خۆیان ببوون بە جاش هیچیان پێنەکرا سیاسەتی هاندانی لاوەکانی کوردستانیش بۆ "جاش ـ سەرباز"ی هەر تووشی شکست دەبێ.

پ: ئایا بە بۆنەی ٢٦ی سەرماوەزی ئەم ساڵ، رۆژی پێشمەرگە، پەیامێکتان بۆ پێشمەرگە قارەمانەکان هەیە؟

و: بە بۆنەی ٢٦ی سەرماوەزی ئەمساڵ پەیامم بۆ پێشمەرگە خۆشەویستەکان ئەوەیە نیشتمانی ئێمە لە هەلومەرجێکی ناسکدا دەژیو دەکرێ لە دواڕۆژدا چاوەڕوانی رووداوو گۆڕانی گرینگ بین. بۆ ئەو وەزعە تازەیە دەبێ پێشمەرگەکانمان خۆیان لە باری فیکریو جسمیەوە ئامادە بکەن. رادەی زانینی سیاسیان بەرنە سەرێو باش لە سیاسەتی حیزبەکەمان حاڵی بن. شێوەی بەکارهێنانی هەموو چەشنە چەکێکی سووكو قورس کە لە هەلومەرجی ئێستادا بەکاری دێنین بە باشی فێر بن. تاکتیکی دوژمن بناسنو بە وردی گەڵاڵە دژی تاکتیکی دوژمن دابنێن. دیسیپلینی خۆیان کە زۆر باش بووە زیاتر لەوەش پتەو بکەن. ئەوەش زۆر گرینگە کە لە ریزی هێزی پێشمەرگەدا نابێ تەنانەت یەك پێشمەرگەی نەخوێندەواریش بمێنێ. پێشمەرگەی ئێمە نەك هەر بە بیرو باوەڕ، ئازایەتیو لەخۆبردووییو دیسیپلینی نیزامی دەبێ لە دوژمن لە پێشتر بێ، بەڵکوو دەبێ لە باری زانینو ئاگاهیو خوێندەواریشەوە کە عاملێکی زۆر گرینگە، لە سەرەوەی چەکداری دوژمن بێ. سیاسەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران سیاسەتێکی روونو دروستو شۆڕشگێڕانەیە. خەڵکی کوردستان هەروەها کە پێشمەرگە نەبەزەکانمان خۆیان زۆر

باش دەزانن پشتیوانی سیاسەتی حیزبەکەمانن. عەمەلیاتی نیزامیی ئەمساڵ نیشانی دا کە پێشمەرگە لە باری چۆنیەتی‌یەوە وەزعی زۆر لە ساڵەکانی رابردوو باشترە ئەم سێ عامیلە پێکەوە واتە سیاسەتی دروستی حیزبەکەمان، پشتیوانیی خەڵك لە سیاسەتی حیزبو قارەمانەتیی پێشمەرگەو چۆنیەتی کاری پێشمەرگە پێکەوە شەرتی سەرەکیی سەرکەوتنی شۆڕشی کوردستانن. من بە هیوای سەرکەوتنی خەباتە خوێناویو دوورو درێژەکەمان بۆ وەدیهێنانی دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان، لە رۆژی ٢٦ی سەرماوەزدا پیرۆزبایی لە هەموو پێشمەرگە خۆشەویستەکان دەکەم. داوام سلامەتیو خۆشیو سەربەرزی‌یانە. دڵنیام کە پێشمەرگە قارەمانەکانمان رێگای پڕ لە شانازیی شەهیدە نەمرەکانمان بەر نادەنو تا سەر بۆ ئامانجی پیرۆزی ئازادیو ژیانی بەختیارانە خەباتی خۆیان درێژە پێ دەدەن.

هەروەها لە گۆڤاری "٢٦ی سەرماوەز" سوپاس دەکەم کە رێگای دام لەگەڵ پێشمەرگە قارەمانەکانمان قسە بکەمو پەیامیان بۆ بنێرم.

# وتوویێژی گۆڤاری عەرەبی "الدستور" لەگەڵ سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران*

پاییزی ١٣٦٧ کاتێك دوکتور قاسملوو لە ئورووپا بوو، گۆڤاری "الدستور" وتوویێژێکی لەگەڵ پێکهێناو لە ژمارەی ٥٥٥ی (١٧ی ئۆکتوبری ١٩٨٨) خۆیدا بلاوی کردەوە.

**"الدستور":** پاش پیلانی ئەم دوایییەی هێندێك عونسوری گومان لێکراو لە دژی حیزب‌و رێبەرایەتی‌یەکەی بەمەبەستی پێکهێنانی "انشعاب" لە ریزەکانی حیزب‌و کادرەکانی‌دا وەزعی حیزب لە ناوچەی کوردستاندا چۆنە؟

**دوکتور قاسملوو:** وەزعی حیزب لە ساڵی رابردووەوە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتوە. زیاتر لە هەموو کاتێکی رابردوو یەکپارچەیەو لە دەوری رێبەرایەتی‌یەکەی کۆ بۆتەوە. لە بارەی خەباتی حیزب‌و پێشمەرگەکانیشەوە، دەبێ بڵێم ئەو خەباتە هەر بەردەوامەو هەرچەند شەڕ لە نێوان ئێران‌و عێراقدا راوەستاوەو رێژیم هێزی زیاتری ناردۆتە ناوچە کوردنشینەکان، حیزبی ئێمەو پێشمەرگەکانی حیزب عەمەلیاتی نیزامی دژی پاسدارانی رێژیم لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا درێژە پێ دەدەن‌و تا ئێستاش "ابتکار عمل" لە دەست هێزەکانی ئێمە دایە. گومان لەوەشدا نیە کە ورەی هێزەکانی رێژیم دوای ئەو شکستانەی لە دوارۆژەکانی شەڕدا تووشیان بوو، زۆر لە خواریێیە. ئێمە لە بارەی داهاتووی بەرەبەرەکانی‌یەوە بەدبین نین‌و زۆریی هێزەکانی

---

* گۆڤاری "لاوان" ژمارەی ٣٠

ڕێژیمیش نامانترسێنێ. گرنگ ئەوەیە کە ڕێژیم بە قۆناغێکی دژوارتردا تێدەپەڕێو ئێرانییەکان موخالەفەتی خۆیان لەگەڵ ڕێژیم ناشارنەوە. لە کوردستان بە دروشمی بەناوبانگی خۆی: "دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان" بۆتە ڕەمزی خەباتی خەڵکی کوردستان دژی کۆماری ئیسلامی. لە حاڵی حازردا ئێمەش مادام گەلەکەمان پشتیوانیمان لێدەکاو لە هەموو گوندو شارەکان باوەش بۆ پێشمەرگەکانمان دەکاتەوە هەرچەندیش فشارمان زیاتر لەسەر بێ هەر بەهێز دەبین.

"الدستور": ئاشکرایە کە هەتا وەختێك تاران دان بە هیچ مافێکی ڕەوای خەڵکی ئێراندا نەنێ، خودموختاریی کوردانیش نایەتە دی. بەڵام ئێمە هەر بۆ نموونە وا دادەنێین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕێژیم رادەگەیەنێ کە موافقە خودموختاری بدرێ بە کوردەکان. ئایا لەو حاڵەدا ئەرکی ئێوە تەواو دەبێ؟ بە جۆرێکی دیکە بڵێین ئایا حیزبی دێموکرات خەباتی خۆی بە خەباتێکی ناوچەیی لەپێناوی وەدیهێنانی خودموختاری بۆ کورداندا دەزانێ، یان حیزبێکی سەرانسەرییەو بۆ ڕزگاریی نیشتمانی گەورە لەژێر دەسەڵاتی تاقمی فەرمانڕەوا خەبات دەکا؟ ئایا قاسملوو خۆی بە سەرکردەیەکی نیشتمانی بۆ هەموو ئێران دەزانێ یان خۆی هەر بە ڕێبەرێکی کورد دەزانێو خەباتەکەی پاش وەدیهێنانی خودموختاری بۆ ناوچەکەی خۆی رادەوەستێ؟

**دوکتور قاسملوو:** وەك دەزانن دروشمی سەرەکیی ئێمە دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستانە. پێشخستنی دێموکراسی لەسەر خودموختاری لە دروشمەکەماندا دەلایلی خۆی هەیە. ئێمە وەك ڕێکخراوێکی دێموکراتو پێشکەوتوو کە باوەڕی بە حاکمییەتی خەڵكو پلۆرالیزمی سیاسی هەیە، خەبات دەکەین بۆ دامەزرانی ڕێژیمێکی دێموکراتیك لە ئێراندا، کە لەو حاڵەدا بەشی دووهەمی دروشمەکەمان، واتە خودموختاریش دێتە دی. هەڵەیە ئەگەر کەسێك پێی وابێ دەکرێ خودموختاری لە کوردستاندا بێتە دی بێ ئەوەی لە بەشەکانی دیکەی ئێراندا حکوومەتێکی نیشتمانیو دێموکرات دامەزرابێ. بەجۆرێکی دیکە بڵێین؛ پێویستە دامەزرانی حکوومەتێکی نیشتمانیو دێموکرات لە ئێراندا کە ڕێز بۆ حاکمییەتی خەڵكو حقوقی زەحمەتکێشانو جووتیارانو چینە بێبەشەکان دابنێو بۆ وەدیهێنانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی تێبکۆشێ، پێویستە دامەزرانی ڕێژیمێکی لەو بابەتەو دابینبوونی خودموختاری بۆ کوردستان بە دوو شت دابنێین کە لێکتر جوێ ناکرێنەوە.

بۆیە ئێمە وەك حیزبێكی دێموكرات كە باوەڕی بە نیشتمانپەروەریی خۆی هەیەو شانازی بە ئێرانیبوونی خۆیەوە دەكا، شەڕ دەكەین بۆ جێگیركردنی حاكمییەتی خەڵكو دامەزرانی ڕێژیمێكی نیشتمانیو دێموكرات كە خەڵكی ئێران بە كوردو فارسو بەلووچو نەتەوەكانی دیكەوە دەیانەوێ.

**"الدستور"**: ڕەنگە ئەتۆ تەنیا ڕێبەری ئۆپۆزیسیۆنی ئێران بی كە پێی لەسەر خاكی نیشتمانەكەیەتی. لە كاتێكدا ئەوانی دیكە بێجگە لە بازرگانو هاوڕێیەكانی خەباتەكەیان دژی ڕێژیم لە دەرەوەڕا بەڕێوە دەبەن. ئێوە لە ئێران هەنو رادیۆو ناوچەی ئازادكراوتان هەیە. كەوابێ حیزبی ئێوە بۆچی ئەو ئیمتیازانەی هەیەتی ناكا بە بناخەو مێحوەرێك بۆ یەكخستنی ریزەكانی ئۆپۆزیسیۆن بەمەبەستی بەرپابوونی شۆڕشێكی گەلیو سەرتاسەری دژی ڕێژیم لە ناوچە ئازادكراوەكانەوە؟

**دوكتور قاسملوو:** پێویستە بەو پەڕی تەوازوعەوە بڵێم ئێمە گەیشتووینە ئەو باوەڕە كە حیزبی ئێمە ناتوانێ لە داهاتوودا ببێ بە ئاڵتێرناتیڤی ڕێژیمی خومەینی. بۆیە لە ساڵەكانی رابردوودا هەوڵمان داوە بۆ پێكهێنانی پێوەندییەكی دۆستانە لەگەڵ هەموو حیزبو ڕێكخراوو شەخسیەتە نیشتمانیو پێشكەوتنخوازەكان لەپێناوی دامەزرانی دێموكراسیدا. زۆر بەداخەوە بەهۆی تەعەسوبی هێندێك لە هێزەكانی ئۆپۆزیسیۆن، تێكۆشانی ئێمەو هێندێك لە هاوڕێیانمان لە حیزبو ڕێكخراوە نیشتمانیو پێشكەوتووەكان لە ساڵەكانی رابردوودا بەتەواوی سەركەوتوو نەبوو. بەڵام هێشتا ئێمە لە وەدیهاتنی ئامانجی سەرەكیمان واتە پێكهێنانی هاوپەیمانەتیی نیشتمانیو پێشكەوتنخواز كە باوەڕی بە حاكمییەتی گەلو دێموكراسی هەبێ، ناهومێد نەبووین. پێویستە هەموومان دان بەوەدا بنێین كە هیچ كامێكمان بەتەنیا ناتوانێ وەك ئالترناتیڤی ڕێژیمی فەرمانڕەوا خۆی داسەپێنێ. پێویستە هێزە نیشتمانیو دێموكراتەكانو شەخسییەتە پێشكەوتنخوازە كۆمارخوازەكان لە سەر یەك مێحوەر لە دەوری یەكتر كۆ بنەوە، ئەویش هێنانە سەركاری ڕێژیمێكی نیشتمانیو دێموكراتییە لە ئێراندا. ئەوانەش كە خەیاڵ دەكەن دەتوانن بەتەنیا دەسەڵات بەدەستەوە بگرنو ڕێژیمێكی دیكتاتۆری بێننە جێگای دیكتاتۆریی فەرمانڕەوا، پێویستە لەبیرمان بێ كە گۆڕینی ڕێژیمی خومەینی بە ڕێژیمێكی دیكتاتۆریی دیكە، ئێران تووشی شەڕێكی نێوخۆیی دەكا كە هیچ كام لە ئێمە ناتوانین سەرەنجامی پێشبینی بكەین. چونكە

ئێران بەو وەزعە جوغرافیاییو کۆمەڵایەتی‌یەوە کە هەیەتی دەبێتە مەیدانێك بۆ کێشەو مل بە ملەی نەتەوایەتیو ئەرکی هەموومانە کە هەوڵ بدەین کارەساتێکی وەها روو نەدا.

**"الدستور"**: دەنگۆیەك هەیە کە رێژیمی تاران دەیەوێ هێزەکانی لە کوردستان کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی هێزەکانی ئێوە خاشەبڕ بکا. ئێستا پاش راوەستانی شەڕ لەگەڵ عێراق، ئێوە دەتوانن بەرامبەر بە پەلاماری رێژیی خۆ ڕابگرنو ئایا حیزبی دێموکرات نیازی ئەوەی هەیە داوا لە ئێرانی‌یەکان بکا کە بۆ رووبەڕووبوون لەگەڵ قۆناخی داهاتوو بێنە نێو ریزەکانی پێشمەرگەوە؟

**دوکتور قاسملوو**: وەك ئێمە بزانین ڕێژیم ئێستا خەریکە هێزەکانی کۆ دەکاتەوە بۆ لێدانی کوردەکان. بەڵام پاش قبووڵ کردنی بڕیارنامەی شوورای ئەمنییەتو رووخانی ورەی هێزەکانی ڕێژیمو لە کاتێکدا ئێرانی‌یەکان چاوەڕوانی کۆتایی هاتنی شەڕو ماڵوێرانین، زەحمەتە ڕێژیم بتوانێ شەڕێکی تازە بەسەر هێزەکانی‌دا بسەپێنێ. بە باوەڕی ئێمە هێزەکانی ناتوانن وەك جاران عەمەلیاتی نیزامیی خۆیان دژی ئێمە درێژە پێ بدەن. لەگەڵ ئەوەش‌دا ئێمە ئامادەیی شەڕکردنمان بۆ بەرەوڕوو بوونەوە لەگەڵ قۆناخی داهاتوو بەرەو ژوور بردوەو چاوەڕوانیشمان لە هەمووی ئەو ئێرانی‌یانە کە خەباتی ئێمە بە خەباتێکی رەوا دەزانن ئەوەیە کە پشتیوانیی خۆیان لەو برا کوردانەیان کە لە پێناوی حاکمییەتو ئازادیی ئەواندا خەبات دەکەن، درێژە پێ بدەن.

**"الدستور"**: ئاشکرایە کە رێژیمی خومەینی بە کۆتایی هاتنی شەڕ رازی نەبوو. ئەتۆ وەك رووناکبیرێکی تێکۆشەر کە بەوردی ئاگات لە شەڕەکە هەبووە، رەنگە زیاترت ئاگاداری لەسەر نەخشی هێزە ئیستعماری‌یەکانو ئیسرائیل لە درێژەدانی شەڕدا هەبێ. گومانیش لەوەدا نیە کە راوەستانی شەڕ لە ئاکامی نارەزایەتیی خەڵكو رێبەرایەتی‌یە وشیارەکانیانەوە موونافاتی هەیە لەگەڵ رێبازی رێژیمو ئەو نەخشە گومان لێکراوانەی لە لایەن ئەو هێزانەوە کە قازانجیان لە شەڕدا هەیە پێی سپێراون. روونتر بڵێین ئەو ڕێژیمە کە ئێستاش باسی ئازادکرنی قودس لە رێگای کەربەلاوە دەکا، ئەمڕۆ کە قسە لە ئاشتی دەکا، قسەکانی جێی گومانن، یان با بڵێین دەیەوێ وەخت بەدەست بێنێ. چاوەڕوان دەکەی هەتا خومەینی لە ئێراندا حاکمە

ئاشتی وەدی بێ‌و ئایا ئەو هەیئەتەی لە وتووێژی ئاشتی‌دا نوێنەرایەتیی ئێران دەکا، بۆی هەیە بەناوی خەڵکی ئێرانەوە قسە بکا؟

**دوکتور قاسملوو:** ڕێژیمی خومەینی ئاشتیی ناوێ. ئەمەش ئێستا بۆ هەموو کەس دەرکەوتوە. هێشتا قسەی خومەینیمان لەبیر نەچۆتەوە کە شەڕی بە نێعمەتێکی خودایی دادەناو هەرکەس قسەی لە ئاشتی کردبایە لە نەزەر خومەینی‌یەوە خائین بە ئیسلام‌و ئێران بوو. موافەقەتی ڕێژیم لەسەر کۆتایی هاتنی شەڕ، کە بە سەری‌دا سەپا، لە حوکمی نەفیی فەلسەفەی کۆماری ئیسلامی‌دایە کە داوای سادرکردنی شۆڕش دەکاو ڕێگا دەدا هەموو ئیمکاناتی وڵات لە ڕێگای وەدیهێنانی خەونەکانی وەلیی فەقیهدا خەرج بکرێ. ئەم فەلسەفەیەش ناتەبایی لەگەڵ ئاشتی هەیەو ئێمە زۆر تاقیکردنەوەی تاڵمان لەگەڵ ڕێژیمی ویلایەتی فەقیهدا هەیە. یەك لەوان تاقیکردنەوەمانە لە سەرەتای شۆڕش‌دا کە ڕێژیم ناچار بوو لە بەرامبەر بزووتنەوەکەماندا هێندێك پاشەکشە بکاو ئیمتیاز بداو ئاشتیشمان لەگەڵ بکا. بەڵام پاش شەش مانگان لە بەڵێنەکەی خۆی پاشگەز بۆوەو شەڕێکی دڕندانەی دژی ئێمە دەست پێ‌کردەوە کە تا ئێستاش بەردەوامە. خومەینی بۆ پاراستنی ڕێژیمەکەی موافقەتی لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕ کردوەو هەر وەخت پێی وا بێ ڕێژیمەکەی لە مەترسی‌دا نیە لە هەڵوێستی ئێستای پاشگەز دەبێتەوەو سەر لە نوێ شەڕەکە هەڵدایسێنێتەوە. لە بارەی ئەو هەیئەتەوە کە لە وتووێژەکانی ژینێودا بەشدار دەبێ، پێویستە بڵێم ئەو هەیئەتەش لەگەڵ ڕێژیم فەرقی نیە، هەر وەك ڕێژیم بۆ ئەوە نابێ حکوومەت بەسەر ئێراندا بکا، ئەو هەیئەتەش کە نوێنەرایەتیی دەکا، سەلاحییەتی ئەوەی نیە بە ناوی خەڵکی ئێرانەوە قسە بکا.

**"الدستور":** نەزەرتان سەبارەت بە پێوەندیی نێوان تاران‌و تێلاڤیڤ چیەو ئایا ئێوە پێوەندیتان لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریدەری فەلەستین وەك بزووتنەوەیەکی پێشکەوتنخوازو تێکۆشەر هەیە؟

**دوکتور قاسملوو:** ئەمن یەکەم کەس بووم کە لە سەرەتای شەڕدا لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەگەری‌دا لە پاریس، باسی پێوەندیی ڕێژیمی خومەینی لەگەڵ ئیسرائیلم کرد. هەرچەند ئەو دەم کەس باوەڕی بە قسەکەم نەدەکرد، بەڵام ئاڵوگۆڕەکانی شەڕو ڕیسوابوونی پێوەندیی نهێنی لە نێوان ئێران‌و ئیسرائیل‌دا بەتایبەتی دوای مەسەلەی

"ئێران گەیت" دروستیی قسەکەمی سابیت کرد. لە بارەی پێوەندیمان لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریدەری فەلەستیندا، دەڵێم چەندین ساڵە ئێمە پێوەندیمان هەیەو پێوەندییەکی خەباتکارانەمان لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە وەك تەنیا نوێنەری قانوونیی گەلی فەلەستین بەهێزە. ڕێبەری شۆڕشی فەلەستین زۆر جار پشتیوانیی خۆی لە خەباتی کوردەکانی ئێران دەربڕیوەو لە دوادیدارماندا، ئەوبوو عەممار هاودەردیی خۆی لەگەڵ ئێمەو پشتیوانیی خۆی لە خەباتی کوردی ئێران لە پێناوی دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستاندا دەربڕی.

# چەند بەشێك لە وتووێژی "راه ارانی" لەگەڵ هاوڕێ دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو*

هاوڕێی تێکۆشەر دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە سەفەری رابردووی خۆیدا بۆ ئورووپا، وتووێژێکی لەگەڵ بڵاوکراوەی "راه ارانی" ئۆرگانی مەرکەزیی حیزبی دێموکراتیکی خەڵکی ئێراندا کردبوو. ئەم وتووێژە لە ژمارە شەشی "راه ارانی"دا بڵاو کراوەتەوە.

**"راه ارانی":** حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران زۆر بەجێ دروشمی دێموکراسی بۆ ئێران‌و خودموختاری بۆ کوردستانی هێناوەتە گۆڕێ کە وەپێش بوون‌و پێویستیی جێگیربوونی دێموکراسی‌و رێژیمی دێموکراتیك لە ئێراندایە. داخوا لە جێیدا ئێوە وەدەستهێنانی خودموختاری لە کوردستاندا بێ ئاڵوگۆڕی دێموکراتیك لە ئێراندا بە شتێکی مومکین دەزانن؟

**دوکتور قاسملوو:** ئێمە دێموکراسی لە پێش خودموختاریدا دەبینین ئەویش بە دوو هۆی بنەڕەتی:

یەکەم ئەوە کە حیزبێکی بەتەواوی دێموکراتین‌و بە دێموکراسی لە نێوخۆی حیزب‌و پلۆرالیزم لە دەرەوەی حیزب واتە لە نێوخۆی وڵاتدا بڕوایەکی قووڵمان هەیەو هەر بۆیە زۆر پێ لە سەر دێموکراسی دادەگرین. دوای شۆڕش ئەگەر نەڵێم یەکەم رێکخراو، دەتوانم بڵێم یەکێك لەو رێکخراوانە بووین کە مەسەلەی

---

* رۆژنامەی "کوردستان" ژمارەی ١٤٥، بەفرانباری ١٣٦٧

دێموکراسی‌یان وەك مەسەلەی ئەسڵی (عمده) هێنایە گۆڕێ. ئەو کاتە کە بەشێك لە ڕێکخراوەکان بەو ناوە کە ڕێژیمی خومەینی دژی ئیمپریالیستە، ببوونە کلکەی ڕێژیم، ئێمە مەسەلەی دێموکراسیمان هێنایە گۆڕێو گوتمان هیچ ڕێژیمێکی بەڕاستی دژی ئیمپریالیست ناتوانێ بەم جۆرە لە هەموو جێیەکی وڵات دێموکراسی پێشێل بکاو خەڵکی کوردستان قەڵاچۆ بکا. بە کردەوەش روون بۆوە کە ئێمە لەسەر حەق بووین، جگە لەمە هۆیەکی دیکەشمان هەیە بۆ ئەوەی دێموکراسی لە پلەی یەکەمدا دابنێینو بیخەینە پێش خودموختاری. من قامکم بۆ ئەوە راداشت ئەگەر بێتو لە کوردستاندا خودموختاریمان هەبێت بۆ پاراستنی خودموختاری دوو ڕێگامان زیاتر نیە، یا چەکداربوونو بە کلاشینکۆف پاراستنی خودموختاری یا دابینکردنی هەلومەرجێك کە لە درێژخایەندا خودموختاریی ئێمە دەستەبەر بکا. ئێمە جگە لە دێموکراسی سەرانسەری ئێرانو سەقامگیربوونی دێموکراسی‌یەکی راستەقینە لە ئێراندا هیچ دەستەبەرێکی دیکە بۆ خودموختاری نابینین. هەر بۆیە لەسەر دێموکراسی لە نێوخۆی ئێراندا زۆر پێ دادەگرین.

**"راه ارانی":** پرسیاری من ئەوە بوو کە ئایا لەجێدا بەر لە پێکهاتنی ئاڵوگۆڕی دێموکراتیك لە ئێراندا پێتان وایە گەیشتن بە خودموختاری ئیمکانی هەیە؟

**دوکتور قاسملوو:** پێوەندی دێموکراسی لەگەڵ خودموختاری پێوەندیی بەش ("جزء")و گشت ("کل")ـە. نامهەوێ بچمە نێو باسی فەلسەفی، بەڵام لەباری فەلسەفی‌یەوە راستە کە "کل" ئەساسیو چارەنووس‌سازە، بەڵام "جزء"یش شوێنەواری خۆی هەیە. لە راستی‌دا "کل" لە "اجزاء" پێك هاتوە یانی ئەگەر وا دابنێین رۆژێك ئێمە ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیمان ناچار بە قبووڵکردنی خودموختاری کوردستان کرد. بە بڕوای ئێمە ئەوە سەرکەوتنێکە بۆ دێموکراسی، چوونکە لەو حاڵەدا لە نێو بەشێك لە ئێراندا دێموکراسی جێگیر بووە. بەڵام هەروا کە لە وەڵامی پێشوودا گوتم ئەو وەزعە، یانی کۆماری ئیسلامی لە لایەك، خودموختاری لە لایەکی دیکەوە، ئەویش خودموختاری‌یەك کە حیزبی ئێمە وەك حیزبێکی لائیك (غەیری مەزهەبی) دەیهەوێ، بۆ ماوەیەکی زۆر ناتوانن لە تەنیشت یەك بژین. من وا بیر دەکەمەوە ئەگەر ئێمە ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی تووشی پاشەکشە بکەینو بۆ ساتێك وای دابنێین کە خودموختاری ئێمەی قبووڵ کردو ئەوکات ئەوە بۆخۆی

هاندەرێکە بۆ هەموو گەلانی ئێران‌و بۆ خەڵکی ئێران کە خەباتی خۆیان بۆ وەدیهاتنی دێموکراسی لە سەرانسەری ئێراندا توندو تیژتر بکەن. پاشان کوردستان ئەوکات لە هەلومەرجێکی باشتردا بۆ هەموو ئازادیخوازانی ئێران دەبێتە سەنگەر، بەو پێیە من ئەوە بە شتێکی غەیرە مومکین نازانم، بەڵام بەڕاستی لە درێژخایەندا بیرکردنەوە لەوە کە ئێمە خودموختاریمان هەبێ، بێئەوەی لە ئێراندا دێموکراسی هەبێ، بۆ ئێمە مومکین نیە.

**"راه ارانی"**: ئەم هۆیانە کە حیزبی دێموکراتیان هێنایە سەر ئەو بڕوایە تا داخوازی خودموختاری لە چوارچێوەی ئێرانێکی سەربەخۆو ئازادو یەکگرتوودا بێنێتە گۆڕێ چن؟ داخوا ئەمە دروشمێکی تاکتیکی یا داخوازێکی ئیستراتیژیکی ئێوەیە؟ بۆچی ویستی خودموختاری بە باشترین ڕێگاچارەی مەسەلەی نەتەوایەتی لە ئێراندا دەزانن؟

**دوکتور قاسملوو**: من لە بەشی دووهەمی پرسیاری ئێوەڕا دەست پێ‌دەکەم. میللەتێکی زۆرلێکراوی وەك گەلی کورد مەسەلەی بنەڕەتیی چیە؟ بەداخەوە لە ئێراندا تەنانەت بەشێك لە دۆستەکانیشمان سەرنجی تەواو بەو مەسەلەیە نادەن. هێندێك وا بیر دەکەنەوە کە چونکە کوردستان لە باری ئابووریەوە دواکەوتوویە دەبێ باری ئابووریی کوردستان باش بکرێ. هێندێکی دیکە پێیان وایە چونکە قوتابخانە لە کوردستان کەمە دەبێ گرینگی زیاتر بە ئامووزش لە کوردستاندا بدرێ. هەڵبەت هەمووی ئەم کارانە پێویستن بەڵام چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی لە هیچ لەم هەنگاوانە کورتتر نیە. تەنیا ئەندامانی گەلێکی زۆر لێکراون کە هەست بەو ستەمە دەکەن‌و هەر بۆیەش دەتوانن تێبگەن لاچوونی ستەم چیە؟ ئەویش ئەوە کە خەڵك دەبێ هەست بەوە بکەن کە لە نیشتمانی خۆیاندا بێگانەو هاوولاتیی دەرەجە دوو نین‌و لەو ناوچەیەی تێی‌دا دەژین بەسەر چارەنووسی خۆیاندا زاڵن.

ئەم هەستە لە هەموو شتێك گرینگترەو من لێرەوە دەست پێ دەکەم. بە بڕوای من مافی دیاریکردنی چارەنووس مافێکی سەلماو بێ ئەملاو ئەولای هەر گەلێکە. ئێمەش لایەنگری مافی دیاریکردنی چارەنووسی خەڵکی کوردستانی ئێران بەدەست خودی ئەو گەلەین‌و لە پێناویدا خەبات دەکەین. دیارە ئەمە نێوەڕۆکی داخوازەکەی ئێمەیە. مافی دیاریکردنی چارەنووس نێوەڕۆك (محتوا)یەو دەتوانێ چەندین شێوەی

هەبێ. یەکێك لــەم شێوانە خودموختاری‌یـە، یـەکێکیان فیدرالـیزم‌و یەکێکیشـیان سـەربەخۆیی تـەواوە. ئێمـە وەك حـیزبێکی بـەرپرس‌و واقعبـین بـە لەبـەرچاوگرتنی هەلومەرجی سیاسی‌و جۆغرافیایی وڵات‌و ناوچە، بەو ئاکامە گەیشتوین کە باشـترین رێگـا بـۆ ئێمـە وەدەسـتهێنانی خودموختاری‌یـــە لـــە ئـــێرانێکی دێمۆکراتیـــك‌و کوردستانێکی خودموختاردا، هەم ئەو هەستەی خەڵك کـە باسـم کـردو هـەم مـافی دیاریکردنی چارەنووس، یـانی هـەردوو لا وەدی دێـن. جگـە لەمـەش لـە روانگـەی گشتی‌یەوە، پێکهاتنی وڵاتی بچووك بچووك لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا بە هیچ جۆر لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنولوژی‌و ئابووری لە سەرانســەری جیـهاندا یـەك ناگرێتـەوە. بەپێچەوانە لە زۆر لە وڵاتاندا، ئێستا من تەنیا لە بارەی "بـازار مشـترك اروپـا"وە قسە ناکەم بەڵکوو وڵاتەکانی ئەمریکای لاتین‌و وڵاتە عەرەبی‌یـەکانیش هـەوڵ دەدەن کە واحیدی گەورەتر پێك بێنن. نەزەری ئێمە ئەوەیە بۆ خەڵکی کوردسـتان ئـەوە زۆر گرینگ نیە کە نوێنەرێکی لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هەبێ‌و ئـاڵاو پوڵـی تایبەت بە خۆی هەبێ، ئەم قۆناغە لە راستی‌دا لە روانگـەی مێـژووەوە ئیـدی کـۆن بووە. بۆ ئێمە ئەوە گرینگە خەڵکەکەمان هەست بەوە بکەن کـە چارەنووسـی خۆیـان بەدەستەوەیە. لە نێو خۆی وڵاتێکی وەك ئێرانیشدا واحیدێکـی گـەورە کـە دەتوانـێ هاوکـاریی هـەموو گـەلانی ئـێران بـــۆ لای خـــۆی رابکێشـــێ، وەختێـــك مافـــە نەتەوایەتی‌یەکانیان دابین بکرێ، پێشکەوتنی ئـابووری‌و کۆمەڵایـەتیی کوردسـتانیش خێراتر دەبێ. سەدان ساڵە کە خەڵکی کوردستان لەگەڵ گەلانی دیکەی ئێران پێکـەوە دەژین. ئێمە خۆمان بە ئێرانی دەزانین‌و بەو کەسانە کە جاروبار لێرەو لەوێ ئێمـە بـە جیاوازیخواز (تجزیه طلب) دادەنێن دەڵێین: بە هیچ جۆر ئەو حەقە بە کەس نادەین کـە خۆی لە ئێمە بە ئێرانی‌تر بزانـێ. بـەڵام لـە سـەر دروشـمی دێموکراسـی بـۆ ئـێران‌و خودموختاری بـۆ کوردسـتان، ئەگـەر بڕواننـە بەرنامـەی حـیزب، ئـەوە دروشمێکـە ئیستراتیژیکی‌و تاکتیکی نیە، ئێمە ئەگەر بمانویستبا لـە ئـێران جیـا ببینـەوە هیـچ ترسێکمان نەبوو. نەتەوەی زۆر بچووك هەن کـە داوای سـەربەخۆیی‌یان کـردو پێشـی گەیشتن. ئەو خەڵکەی پۆلیساریۆ نوێنەریانە سـەد هـەزار کەسـن‌و سەربەخۆیی‌شـیان دەوێ، بەڵام ئێمە داوای ســەربەخۆیی ناکـەین. هـەروەها پێـم خۆشـە ئـەوەش بڵێـم هێندێك دەڵێن خودموختاری قۆناغێکە لە داهاتوودا بۆ سەربەخۆیی. با لەو بـارەوە

بلێم ئێمە بەرپرسی بەرەکانی داهاتوو نین هەروا کە بەرەکانی رابردوو بەرپرسی ویستەکانی ئێستای ئێمە نەبوون. ئێمە ئێستا لەگەڵ سیاسەت‌و واقیعییەت رووبەڕووین، سەردەمی ئێمە واتە نەسڵی ئێمە نەسڵی خودموختاری‌و دێموکراسی‌یە. ئەمن پێم وایە لەبەر هێندێ هۆی ئابووری‌و پێشکەوتنی تێکنۆلۆژی، جیهان زیاتر بەرەو "ئینتگراسیۆنی ئابووری" یانی پێکهێنانی واحیدی گەورەتری ئابووری دەڕوا. پێشبینی دەکرێ لە ساڵی ١٩٩٢دا زۆربەی وڵاتانی ئورووپای رۆژئاوا، ببن بە واحیدێکی ئابووریی تەواو. بەمجۆرە لە وەها وەزعێکدا بە بڕوای من هەوڵدان بۆ پێکهێنانی وڵاتانی مینیاتۆری (وڵاتانی چووکە چووکە) دروست نیە. لەگەڵ هەمووی ئەمانەش دەمهەوێ بلێم کە گەلی کورد لە بارەی مافی دیاریکردنی چارەنووسەوە جیاوازی‌یەکی لەگەڵ گەلانی دیکە هەیەو ئەویش ئەمەیە کە کوردەکان لە عێراق، تورکیەو سووریەشدا دەژین‌و دابەشێکی دەستکرد بەسەر خەڵکی کوردستاندا سەپاوە. رۆژێك کە ئەو مەسەلەیە بێتە گۆڕێ وەك مافی یەکگرتنەوەی کوردستان خۆی دەنوێنێ.

حەزم نەدەکرد ئیشارە بەو شتە بکەم (چوونکە لە واقیع دوورە) من لە کتێبێکدا کە بیست‌و پێنج ساڵ لەمەوبەر بڵاوبۆتەوە لەو بارەوە نووسیومە کە لە داهاتوودا بۆ رۆژهەڵاتی نێوەڕاست فیدراسیۆنێك پێش‌بینی دەکەم. لەو فیدراسیۆنەدا لەوانەیە یەکێك لە کۆمارە فێدراتیوەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستیش کوردستان بێ. بەڵام ئەوەی کە پێوەندی بە کوردەکانی ئێرانەوە هەیە، دەتوانم بلێم لە کوردستانی ئێراندا نە حیزبی دێموکراتی کوردستان‌و نە هیچ تاقمێکی سیاسیی دیکە جگە لە خودموختاری داخوازێکی دیکەیان نیە. کاتێك ئێمە دوای شۆڕش مەسەلەی خودموختاریمان هێنایە گۆڕێ هێندێك لە تاقمە سیاسی‌یەکان ئەم دروشمەیان بە دروشمێکی بورژوایی دادەناو رەدیان دەکردەوە. بۆ وێنە کۆمەڵە لە بەر ئەوەی ئەم دروشمە لە نێو خەڵکدا جێی خۆی کردەوەو پشتیوانییان لیٚ کرد بە ناچار لە بەرنامەی خۆیدا خودموختاری گونجاند. با ئەوەش بلێم هێندێك کەس لە ئێراندا لە خۆڕا لە خودموختاری دەترسن. نازانم هۆی ئەو ترسە چیە؟ لە زۆر وڵاتدا خودموختاری دابین کراوەو هیچ جوێبوونەوەیەکیش رووی نەداوە. بۆ وێنە دەوڵەتی ئیسپانیا خودموختاری داوە بە کاتالان. ئەمەمان خوێندۆتەوە وەریشمان گێڕاوە. باشە قانوونێکی ئەوتۆمان وەك

بنچینەی خودموختاری قبووڵە. داخوا ئێوە ئێستا بیستووتانە کاتالان کە پێتەختەکەی "بارسلون"ە ویستبێتی لە ئیسپانیا جیا بێتەوە. بە هیچ جۆر مەسەلەی جیابوونەوە لەگۆڕێدا نیە. ئەدی بۆ لە ئێراندا ئەم مەسەلەیە بەم شێوەیە لەگۆڕێدایە؟ دروشمی دێموکراسی بۆ ئێران‌و خودموختاری بۆ کوردستان دروشمی ئەسڵیی ئێمەیە. واتە دروشمی ئیستراتیژیکیمانەو هەر بەو جۆرەش لە بەرنامەی ئێمەدا هاتوە. بە هیچ جۆر تاکتیك نیە. ئێمە نە دەمانهەوێ خەڵك فریو بدەین‌و نە خۆمان‌و ئەگەر بەڕاستی دروشمی ئێمە شتێکی غەیری ئەوە بوایە رامان دەگەیاند.

**"راه ارانی":** وا وێدەچێ کە کۆنگرەی هەشتەمی حیزبی ئێوە لەگەڵ کۆنگرەی دامەزرێنەران (مؤسسان)ی حیزبی دێموکراتیکی خەڵکی ئێران هاوکات بووبێ. لەو بەشە راپۆرتی کومیتەی ناوەندی‌دا کە باسی حیزب‌و رێکخراوە سیاسی‌یەکانی ئێران دەکا، ئیشارەیەك بە حیزبی ئێمە نەکرا، ئێستا کە بەڵگەو بڕیارنامەکانی کۆنگرەی دامەزرێنەران لە بەردەستتان دایە، تکایە بۆمەی روون بکەوە کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هەڵوێستی بەرامبەر بە حیزبی ئێمە چیە؟

**دوکتور قاسملوو:** بە راشکاوی دەبێ بڵێم کە ئێمە هێشتا تێکۆشانی رێکخراوی ئێوەمان بە وردی هەڵ نەسەنگاندوە هۆیەکەشی ئەوەیە کە وەختێکی وامان بۆ ئەو کارە نەبووە، ئێوە کۆنگرەکەتان پێك هێناوە بەڵام خۆ ئێمە لە ئورووپا ناژین تا دەست بەجێ بەڵگەکانی ئێوەمان بەدەست بگات بەو حاڵەش مەسەلەیەکی گشتی لە چاپەمەنیی ئێوەو بەڵگەکانی کۆنگرەکەتاندا وەبەرچاو دەکەوێ، ئەویش بریتی‌یە لە گرتنە پێشی سیاسەتێکی دێموکراتیك وا تێ‌گەیشتووین کە لەڕاستی‌دا ئەو سوسیالیزمەی ئێوە بۆ ئێرانتان دەوێ لە دێمۆ کراسی جیای ناکەنەوە چوونکە ئامانجی دوارۆژی حیزبی ئێمەش سۆسیالیزمی دێموکراتیکە بۆیە ئێوە بە رێکخراوێکی نزیك بە حیزبی دێموکرات دەبینین‌و هیوادارم لە رێبازێکدا کە گرتووتانەتە بەر شێلگیرو سەرکەوتوو بن‌و ئەوەی کە دەگەڕێتەوە سەر هەڵسەنگاندنی دروست‌و هەڵوێستی رەسمیی حیزبی ئێمە بەرامبەر بە حیزبەکەتان، پێم وایە لە داهاتوویەکی نزیکدا رادەگەیەندرێ‌و هەر ئەوە کە من ئێستا لێرە دانیشتووم‌و وتوویژتان لەگەڵ دەکەم بە رێکەوت نیە.

**"راه ارانی"**: چ پەیامێکت بۆ خوێنەرانی ئێمەو هێزەکانی چەپی ئێران هەیە؟ چاوەڕوانیی ئێوە لە هێزەکانی پێشکەوتوو و چەپی وڵات چیە؟

**دوکتور قاسملوو:** کاتێك کە دەڵێم دێموکراسی سەرەکی‌تر لە هەر شتێکە، یەکێك لە مەسەلە بنەڕەتی‌یەکانی دێموکراسی مەسەلەی چەپی ئێرانە. بێ‌چەپێکی سەربەخۆو بەهێز کە بەئازادی بیر بکاتەوە سەقامگیرکردنی دێموکراسی لە ئێراندا ئیمکانی نیە. بەم جۆرە ئێمە دیسانیش وەك حیزبێکی دێموکرات هەم لەبەر خاتری دێموکراسی‌و هەم سەبارەت بە خودموختاری زۆرمان پێ خۆشە کە چەپ، چەپێکی سەربەخۆو داهێنەرو بەهێز لە ئێراندا پێك بێ، بەداخەوە ئێستا شتێکی ئاوامان نیە. پرش‌و بڵاوی بەسەر هێزەکانی چەپدا زۆر زاڵە. ئێمە لەو بڕوایەداین ئەگەر دێموکراسی بۆ خودموختاری دەستەبەرێکە بوونی چەپێکی سەربەخۆ، داهێنەرو بەهێزی ئەوتۆش کە بە ئازادی بیر بکاتەوە لە ئێراندا بەڕاستی دەستەبەری ئەو دێموکراسیەیەو هەر بۆیە ئێمە لەمێژە بەو ئاکامە گەیشتووین کە دەتوانین ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی بێ‌هێز بکەین.

دەتوانین ئەو ڕێژیمە ناچار بە پاشەکشەش بکەین‌و تەنانەت دەتوانین لە باشترین حاڵەتدا هەلومەرجێکی وا پێك بێنین کە ڕێژیم بەرەو رووخان بچێ. بەڵام ئێمە لە هیچ هەلومەرجێکدا بەتەنیایی ناتوانین ببین بە ئاڵتێرناتیڤ، ئێمە بە هیچ جۆرێك بە تاقی تەنیا پێمان ناکرێ ببین بە جێنشینی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی‌و چونکە بڕوایەکی قووڵمان بە پلۆرالیزم هەیە، لەم رووەوە هەموو هەوڵی خۆمان دەدەین تا لە بەشەکانی دیکەی ئێراندا هاوپەیمان پەیدا بکەین‌و بۆیەش هەر وەك ئێوە ئاگادارن هەوڵ‌و تێکۆشانێکی زۆرمان بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی بەرین لە هێزە دێمکراتیکەکان‌و شەخسیەتەکان، لە خۆمان نیشان داوەو هەرواش درێژەیان پێ دەدەین. ئەوە کە تا ئێستا بەرە پێك نەهاتوە نابێتە هۆی دڵساردیی ئێمە لەو هەوڵ‌و تێکۆشانە. چوونکە ئێمە دەزانین پرش‌و بڵاوەو ناکۆکی زۆر هەیە، دوگم زۆرەو لە بەشێکی زۆری ڕێکخراوەکاندا کاتێکی زۆر پێویستە تا دوگمەکان لە نێو بچن‌و زەمینە بۆ بەرە ئامادە ببێ. من لەو بڕوایەدام ڕەوتی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە من بۆ داهاتووی ئێران پێش‌بینیم کرد، بە قبووڵکرانی ئاگربەس، دەستی پێکردوەو بە ڕۆیشتنی خومەینی خێراتر دەبێ. لە فەزاییێکی ئازادتردا ئیمکاناتێکی زیادتر بۆ

پێکهێنانی بەرەیـەیەکی لـەو بابەتـە پێـك دێ. هەڵبـەت دیسـان دەگەڕێمـەوە سـەر پرسیارەکەی ئێوەو دووپاتی دەکەمەوە کە بەرەیەکی ئەوتۆ بە بـێ چـەپێکی بـەهێز، داهێنەرو سەربەخۆو ئازادبیر رابەری پێویستو تەواوی نابێ.

## فەسڵی دووهەم:

# بەشێك لەو وتووێژو وتارانەی دوكتور قاسملوو كە لە رادیۆ "دەنگی كوردستان"ـەوە بلاّو كراونەتەوە

- پلینۆم
- جبهەی بانە ـ سەردەشت
- سەفەری ئورووپا
- سەنگەری پێشمەرگە
- گەڕانەوە لە ئورووپا

# وتووێژی رادیۆیی لەگەڵ کاك دوکتور قاسملوو بە بۆنەی کۆتایی هاتنی پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی*

گوێگرانی خۆشەویستی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران، هەروەك دەزانن پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، لە چەند رۆژی رابردوودا پێکهات، بەم بۆنەوە لە هەڤاڵ دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، داوامان کردوە کە سەبارەت بەم پلینۆمەو هەروەها لە بارەی مەسەلەکانی کوردستانو تێکڕای بارودۆخی ئێران وتووێژێکیان لەگەڵدا بکەین، ئێستا کاك دوکتور لە ستۆدیۆی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێراندایەو داوایان لێ دەکەین کە وەڵامی چەند پرسیاری ئێمە بدەنەوە.

پ: کاك دوکتور سڵاوتان دەکەینو لە پێشدا سپاست دەکەین کە جارێکی دیکە داخوازیی ئێمەتان قبووڵ کردو هاتنە ستۆدیۆ چکۆلەکەی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران.

و: زۆر سپاستان دەکەم.

پ: کاك دوکتور! پلینۆمی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە چەند رۆژی رابردوودا بەڕێوە چوو، تکایە بفەرموون ئەو مەسەلانە کە ئەم پلینۆمە پێی راگەیشتوە چ بوون؟

---

* ئەم وتووێژە لە رێکەوتی ۱۳۵۹/۸/۲۳دا ئەنجام دراوە.

- پەیام بەبۆنەی هێرشی رێژیم
- وتووێژ لەگەڵ رادیۆی "دەنگی کوردستانی ئێران"
- پەیام بە بۆنەی مانگی هێرش
- پەیام لە سەر تەواو بوونی دوو مانگی دیفاعو هێرش
- وتووێژ لەگەڵ رادیۆی "دەنگی کوردستانی ئێران"
- پەیام بەبۆنەی ٢٥ی گەلاوێژ
- بەرەو جیهانی گەورەی ئابووری
- شکستی ریسواییهێنەری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی
- وتووێژی ئاشتی لە نێوان ئێرانو عێراق
- سەفەری دەرەوە
- سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی
- رێژیمی خومەینیو رێکخراوە نێونەتەوەییەکان

و: له پێشدا سلاو له هەموو گوێگرانی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران دەکەمو هیوام ئەوەیه که هەموو کەیفخۆشو سلامەتو باش بن، کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران سێ مانگ جارێ کۆ دەبێتەوە. ئەم جارەش پاش سێ مانگان کۆبووەوەو له پێشدا وەزعی سیاسیی گشتیی ئێرانو کوردستانی تەحلیل کرد له پاشان دیاره هێندێ بڕیاری دا بۆ دوارۆژ، هەم له باری تەشکیلاتیو کاروباری پێشمەرگەوە. لەسەر مەسەلەی وەزعی ئێران پلینۆم هاته سەر ئەو بڕوایه که ئەو تەحلیلەی که له سێ مانگی ڕابردوودا له پلینۆمی پێشتر کرابوو، وەکوو تەحلیلێکی دروست ئێستاش هەر بیخاته بەرچاوو هاته سەر ئەو بڕوایه که وەزعی ئابوویو سیاسیو تەنانەت ئێستا پاش شەڕ لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا نیزامیی ئێرانیش رۆژبەڕۆژ خراپتر دەبێو له باری سیاسیو ئابووری‌یەوە ولاتەکەمان کەوتۆته تەنگانەیەکی نەدیتراو، له باری سیاسی‌یەوە به تاقی تەنیا ماوەتەوە هیچ دەوڵەتێکی دەرەوە پشتیوانیی لێ ناکا، له باری نیزامیشەوە دیاره له زۆر جبهەدا شکاوە هەرچەند دەوڵەتی ئێرانو کاربەدەستانی جمهووریی ئیسلامی دەیانەوێ به هەموو هێزیانەوە شکانی خۆیان به دانی شوعارو به درۆو شاردنەوەو له باری ئابووریشەوە میللەتەکەمان به چاوی خۆی دەبینێ که چ رۆژگارێکی رەشیان بۆ ئەو میللەته پێك هێناوە که موهیمترین وەسایلی ژیان، ئێستا به هاسانی دەست ناکەوێ. به کورتی دەردەکەوێ که ولاتەکەمان بەداخەوە رۆژبەڕۆژ بەرەو فاجیعەیەکی گەورە دەڕوا، ئەوانەی که کاربەدەستن ئیحساسی مەسئوولییەت ناکەنو هەروەها له پلینۆمدا گوترا بەڕاستیی وەزعێکی وا پێکهاتوە که ئەو کاربەدەستانە قابیلیەتی هەڵسووڕاندنی کاروباری ولاتیان نیەو ئەگەر هەروا بڕۆن، هیچ گومانی تێدا نیه که گەلانی ئێران تووشی کارەساتێکی زۆر ناخۆشو نالەبار دەبن.

پ: زۆر سپاس. کاك دوکتور له وەزعی ئێستادا، هەڵوێستی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، سەبارەت به دەوڵەتی مەرکەزی چیه؟

و: سیاسەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان بەرانبەر به دەوڵەتی مەرکەزی له واقیعدا هەڵوێستی دەوڵەتی مەرکەزی بەرانبەر به جوولانەوەی گەلی کورد دیاریی دەکا. ئەگەر دەوڵەتی مەرکەزی ئاماده بوو داخوازەکانی ئێمه جێبەجێ بکا، ئەگەر ئاماده بوو دەس له شەڕو لەو دوایانەدا له خەڵك کوشتن هەڵگرێ، ئەو وەختە دیاره

ئێمەش ئامادەین بۆ وتووێژ، ئامادەین بۆ ئەوە کە شەڕ بوەستێنین. بەڵام ئەگەر دەوڵەتی مەرکەزی هەروەها کە هەتا ئێستا نیشانی داوەو سیاسەتی شەڕخوازانەی خۆی ئیدامە بدا، ئەوانەی کە بەناوی پاسدارو موجاهید هاتوونەتە کوردستانێ، بەو جۆرە کە لەو ڕۆژانەدا دەستیان پێ کردوە، خەڵکی بێگوناهی ئێمە بکوژن لە شارەکانو لە گوندەکانی کوردستاندا، دیارە دیفاعی ئێمە ڕۆژبەڕۆژ توندتر دەبێو بە هەموو هێزمانەوە لە هەموو بستێکی خاکی کوردستان لە ناموسو شەرەفی میللەتەکەمان، لە ئازادیی خۆمان، لە دەسکەوتەکانی شۆڕشی ئێران دیفاع دەکەین.

**پ:** بیروڕاتان لەسەر ڕێکەوتنی ئێرانو ئەمریکا واتە "شەیتانی گەورە" سەبارەت بە بارمتەکان چیە؟

**و:** وەڵڵا ئەوە باشە دەفەرمووی شەیتانی گەورە، بەڵام ماوەیەکە کاربەدەستانی ئێران باسی شەیتانی گەورە ناکەن. ئێمە پێشتریش رامانگەیاند کە خەبات دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکا دەبێ خەباتێکی شێلگیرو هەموو لایەنە بێ، خەبات بۆ خاشەبڕکردنی نفووزی سیاسیو ئیقتسادیو نیزامیو فەرهەنگیی ئیمپریالیزم بەگشتیو بەتایبەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکایی نە بە شوعاردان، نە بەگرتنی چەند بارمتەو چەند دیپلۆماتی ئەمریکایی. ئەوە ڕێگای خەباتی دژی ئیمپریالیستی نیە، ئێستاش دەردەکەوێ کە ئەو سەحنەسازییە خەریکە خەلاس دەبێ. شەیتانی گەورە تەقریبەن ئێستا کەس باسی ناکا. بۆ هەموو کەس دەرکەوتوە کە چەندین مانگە لە بنەوە دەوڵەتی جمهوریی ئیسلامی کە بە ئیددعا دژی ئیمپریالیستییە، وتووێژ دەکا لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئەمریکا بۆ ئەوە گرەوگانەکان بەر بدا، هەتا بتوانێ یارمەتیی ئابووریو نیزامی لە ئیمپریالیزمی ئەمریکا وەربگرێو ئێستا دەرکەوتوە کە ڕێککەوتوون، بەڵام چوونکە ئەو ڕێککەوتنە لەسەر دوو دڵیی کاربەدەستانی یا هێندێ لە کاربەدەستانی جمهووریی ئیسلامی برێك پاش کەوت. لە نەتیجەدا وای لێ هات کە پێش ئینتخاباتی ئەمریکا جێبەجێ نەبوو و ئێستا کار بەدەستانی کۆماری ئیسلامی زۆر بەپەلەن کە ڕێك کەون لەگەڵ ئەمریکا بۆ وەرگرتنی کۆمەكو بەپێچەوانە، کاربەدەستانی ئەمریکا پەلەیان نیە چوونکە دەزانن کە ڕۆژبەڕۆژ هەلوێستی ئێران، مەوزعی ئێران زەعیفتر دەبێو لە نەتیجەدا ئێران مەجبوور دەبێ هەموو شەرتەکانی ئیمپریالیزمی ئەمریکا قبووڵ بکاو هەتا ئێستاش لەواقیعدا هەر

بەرەو ئەوە دەڕۆن. کـەوابوو جـارێکی دیکـە دروسـتبوونی سیاسـەتی حـیزبی ئێمـە دەرکەوت کە دەمانگوت ئەوە کە ئەو رێژیمە بە ناوی دژی ئیمپریالیزم میللەتی کـورد دەکوتێ، راست ناکا، دژی ئیمپریالیزم ناتوانێ میللەتێکی زۆرلێکـراو بکوتـێ. دژی ئیمپریالیزم ناتوانـێ دێموکراسـی لەبـەین بـەرێ، دژی ئیمپریـالیزم ناتوانـێ حـەقی زەحمەتکێشان نەدا. ئێستا دەردەکەوێ کە ئەو رێژیمـە لەبنـەوە لەگـەڵ ئیمپریـالیزمدا رێك کەوتوە، فەقەت وەختی دەوێ بۆ ئەوە کە بیروڕای گشتیی ئێران بۆ ئەوە ئامـادە بکا کە ئەو رێککەوتنە بەتەواوی ئاشکرا بێت.

پ: بەڵێ زۆر سپاس. کاك دوکتور ئاگادارن کە نێزیك بە یەك مانگ لەوەو پێـش نێوان پێشمەرگەکانی حیزب لە لایەکەوەو پاسداران‌و ئەرتـەش لـە لایـەکی دیکـەوە، تێکهەڵچوونێك لە شاری ورمێ رووی دا، هەر بەو بۆنەشـەوە رەسـانەکانی گرووهیـی کۆماری ئیسلامی پڕوپاگەندەیـەکی پـان‌و بـەرینیان بـە دژی حـیزب دەس پـێ‌کرد، بیروڕای ئێوە لەو بارەوە چیە؟

و: دیارە نابێ سەرمان لەوە سوور بمێنێ کە ئەوانـەی کاربەدەسـتن لـە ورمـێ کـە بەراستی دەبـێ بڵێـم عەیبـە بـۆ خـەڵکی پێشـکەوتوو و رەوشـەنفکری ورمـێ کـە مەلایەکی نـەزان‌و نـەخوێندەوار حاکمییـەتی ئـەو شـارە بەدەسـتەوە بگـرێ. ئێمـە تەعەجوب ناکەین کە ئەوانە دەستیان کردوە بە پڕوپاگـەندە دژی حـیزبی دێموکراتـی کوردستان‌و گەلی کورد. چوونکە زەربەیەکی زۆر توندیان وێ کەوت‌و تێگەیشـتن کـە ئەگـەر حـیزبی ئێمـەو میللـەتی کـورد بیـەوێ، دەتوانـێ زۆر تونـدو زۆر بـاش بەربەرەکانێیان بکا لەبەر ئەوە بوو کە دەستیان پێ‌کرد بە درۆو دەلەسە بە ناوی ئـەوە کە گۆیا پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئـێران لـە ورمـێ خـەڵکیان کوشتوەو گۆیا حەملەیان کردۆتە سەر ماڵەکان لە حاڵێکدا هەموو خەڵکی ورمێ زۆر باش دەزانن کە پێشمەرگەکانی حیزب چ رەفتارێکی ئینسانی‌و باشیان هەبووەو بـاش دەزانن کە چۆن خودی پاسداران‌و ئەرتەش بە خومپارەو تۆپ لە ماڵی خەڵکیان داوەو ماڵ‌و منداڵیان کوشتوەو قەدەغەشیان کردوە کە هیچ کەس باسی ئەوە نەکا کە ئـەوە پاسدار بوون کە ئەو کارەیان کردوەو داوایان لێ‌کردون کە زیاتر پێشمەرگەکانی ئێمـە تاوانبار بکەن. دەمەوێ ئەوەندە بڵێـم کـە ئەوانـەی کـە لـە ورمـێ زۆر ترسـاون لـە ئوستاندارەوە بگرە هەتا مەلا نەزانەکەیان دەبێ بزانـن کـە ئـەو زەربەیـە کـە وێیـان

کەوت ئاخر زەربە نەبوو و دەبێ خۆیان ئامادە بکەن کە لە دواڕۆژدا زەربەی زۆر توندتر لەوەیان وێ کەوێ، چوونکە میللەتی ئێمە ئەو ئەرکە موهیمەی بە عوهدەی گرتوە کە بنکەی فەسادی گەورە کە لە ورمێ ساز بووە ئەوبنکە فەسادە لەبەین بەرێو کارێکی وا بکا کە میللەتی کوردو برایانی خۆشەویستی ئازەربایجانیو ئاسووریو ئەرمەنی کە لەو شارەدا دەژین هەموو پێکەوە بتوانن بە دۆستایەتیو بە خۆشی بژینو رزگار بکرێن لەو کۆنەپەرستی‌یە رەشە کە بەتەواوی لەو شارە رووناکبیرو پێشکەوتووەدا زاڵ بووە.

پ: بەڵێ سەبارەت بەو جنایەتە دڵتەزێنانە کە لە لادێیەکانی دەوروبەری مەهاباد وەك ئیندرقاشو یوسفکەندو سۆفیان روویان دا لێکدانەوەی ئێوە چۆنە؟

و: ئەگەر لە بیرتان بێ پار ئەو دەمانە جینایەتێکی زۆر گەورەیان لە گوندی قاڕنێ کردو زۆر ژنو منداڵو ئینسانی بێدیفاعیان کوشت بەناوی ئەوانەی کە پێیان دەڵێن موجاهێد یا موجاهێدنما بە ناوی ئیسلام ئەو کارەیان کرد. ئەوساڵیش ئەو کارە تیکرار دەکەنەوە لە گوندەکانی ئیندرقاشو یوسفکەند کە لە دەوروبەری مەهابادنو لە دێی سۆفیان لە نێزیکی شنۆیەو چەند دێی دیکەش لە سەرۆکانی، دیسانەکە ئەو پەلامارەیان دەست پێ کردوە لە لایەکەوە ئەوە نیشانەی زەعفی دەوڵەتی مەرکەزی‌یە، نیشانەی زەعفی دوژمنانی گەلی کوردە کە ناتوانن بەرەنگاری پێشمەرگە بن، ناتوانن لە بەرانبەری پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستاندا رابوەستن جا هجووم دەکەنە سەر خەڵکی بێگوناح، لە لایەکی دیکەشەوە دڕندەیی، بێشەرمیی ئەو کەسانە دەنوێنێ کە خۆیان بە موسڵمان ناو دەبەنو بەو شێوە حەیوانی‌یە خەڵکی موسڵمان لەبەین دەبەنو بەڕاستیش ئەوەی ئەوان کردوویانە جینایەتێکی زۆر گەورەیە، بە دەیان ئینسانی بێگوناح کوژراون، بە شێوەیەکی زۆر فەجیع کوژراونو ئێمە وەك حیزبی دێموکراتی کوردستان بڕیارمان داوە کە هەموو ئەو جینایەتانە لە مەیدانی "بین‌المللی"دا بخەینە بەرچاوی رێکخراوەکانی نێونەتەوەیی، رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانو خاچی سووری جیهانیو داوایان لێ بکەین کە نوێنەر بنێرن بۆ دیتنی جینایەتەکانی ئەو موسڵمان نمایانە. لە لایەکی دیکەشەوە بە نێوی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانو هەموو خەباتکارانی رێگای ئازادیی میللەتەکەمان داوا لە هەموو برایانی زەحمەتکێشی جووتیاری خۆمان لە هەموو گوندەکانی

کوردستان دەکەم خۆیان بۆ دیفاع بەتەواوی ئامادە بکەن، فریوی ئەو کەسانە نەخۆن کە دەڵێن پاسدارو موجاهید، دێن‌و برایەتیمان لەگەڵ دەکەن، ئێستا دەرکەوتوە بۆ برادەرانی ئێمە بۆ برایانی جووتیارو هەموو خوشك‌و برایانی دانیشتوانی دێهاتی کوردستان کە ئەوانە دوژمن‌و دڕندەن. لە هەموو دێیەکی کوردستان دەبێ سەنگەربەندی بکرێ، دەبێ هەموو خۆیان ئامادە بکەن‌و بە هەموو هێزیانەوە دیفاع لە گیان‌و ماڵ‌و ناموس‌و ئازادیی خۆیان بکەن. پێشمەرگەکانی ئێمەش، پێشمەرگە قارەمانەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستان، لە هەموو جێگا وەزیفەیانە یارمەتیی دانیشتوانی دێهاتی کوردستان بدەن‌و وەزعێکی وا پێك بێنن کە لەمەودوا تەنانەت یەك نەفەریش لە پاسدارانی بەکرێگیراوو موجاهێدنمایان نەتوانن لە شارەکان یا لە پادگانەکان بێنە دەرێ.

پ: کاك دوکتور بەم حاڵ‌و وەزعەی کە ئێستا هەموو کەسێك بە چاو دەبینێ، ئێوە داهاتووی وڵاتەکەمان (ئێران) چۆن دەبینن؟

و: بەداخەوە وەزعی سیاسی‌و ئابووری‌و نیزامیی وڵاتەکەمان زۆر خراپە، ئێمە نایشارینەوە کە زۆر لەو مەسەلەیە، لەو وەزعە ناڕازین‌و پێمان وایە کە مەسئوولییەتی ئەساسی دەکەوێتە سەر شانی کاربەدەستانی جمهووریی ئیسلامی کە نازانن وڵات بەڕێوە بەرن، کە وەزعێکی وایان پێك هێناوە. چەندین مانگ باسی ئەوەیان دەکرد کە خەریکن شۆڕشی ئێران بۆ وڵاتەکانی دراوسێ سادر بکەن‌و بەتایبەتی بۆ عێراق. هەزاران جنێویان بە کاربەدەستانی عێراق دەدا، وەزعێکی وایان پێك هێنا کە عێراقیان تەحریك کردو عێراق تەجاوزی کرد بە خاکی ئێران‌و خاکی ئێرانیان داگیر کرد. کە دیارە ئێمە وەك ئێرانی دژی ئەو تەجاوزەو دژی ئەو داگیرکردنەین. بەڵام واقعییەتەکە بڵێین کە کاربەدەستانی ئێران لە سازکردنی ئەو شەڕەدا بۆخۆیان دەستێکی باڵایان هەبوو. ئێستا لەو حاڵەدا ئێمە دیارە وەزعی دوارۆژی میللەتەکەمان وەك ئینسانێکی شۆڕشگێڕ زۆر باش دەبینین، خۆشبینین چوونکە پێمان وایە ناتەبایی‌و تەزادەکانی ناو دەزگای حاکم خەریکە وەزعێکی وا پێك دێنێ کە ئەو دەزگایە تەزعیف بکاو لە بەینی بەرێ‌و بەڵکوو میللەتی ئێران بەگشتی‌و گەلانی ئێران بەگشتی‌و هەروەها گەلی کورد بتوانن قودرەتێکی ئاوا بێننە سەرکار کە داخوازەکانیان جێبەجێ بکا. ئێمە خۆشبینین چوونکە ئیمانمان بە خەباتی

میللەتەکەمان هەیەو ئیمانمان بەوە هەیە کە گەلانی دیکەی ئێرانیش وەك گەلی کورد هەرچی زووتر واقعییەتەکە تێ دەگەن‌و تێدەگەن کە دیفاع لەو رێژیمە دیفاع لە حاکمییەتی هیندێ ئاخونده، دیفاع لە نیشتمان‌و دیفاع لە ئازادیی ئێران‌و دیفاع لە ئیستقلالی ئێران نیە. لەبەر ئەوە هەرچەند ولاتەکەمان لە وەزعێکی ئابووری‌و سیاسی‌و نیزامیی زۆر خراپدایە، هیوامان ئەوەیە کە هەموو ئەو وەزعە بە خۆشی تەواو بێ‌و ئێمە خۆشبینین کە میللەتەکەمان پێکەوە لەگەڵ گەلانی ئێران هەر سەر دەکەوێ.

پ: ئێمەش هیوامان هەر ئەوەیە. کاك دوکتور قاسملوو ئێوە چ پەیامێکتان هەیە بۆ گوێگرانی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران؟

و: یەکێك لەو مەسائیلەی کە لە پلینۆمی ئێمەدا باس کراو پێم خۆش بوو عەرزتان بکەم ئەوە بوو کە لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا کە بەسەر پلینۆمی رابردوودا تێپەڕیوە، دوو مەسەلەمان هاتە بەرچاو، یەکێکیان ئەوەیە کە یەکێتی فیکری‌و سیاسی‌و تەشکیلاتی لە ناو حیزبی ئێمەداو بەتایبەتی پتەوبوونی یەکێتیی حیزبی دێموکراتی کوردستان لەگەڵ میللەتی کورد، لەگەڵ گەلی کورد زۆر زۆر زیاتر بووەو ئێستا ئیدی لە سەراسەری کوردستان تەنیا هێزێکی ئەساسی کە ئالاهەڵگری خەباتی میللەتی کوردە، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە، کە ئازایانە لە هەموو شەرایەتێك‌دا لە تەنگانەو لە رۆژی رەشیش‌دا لەگەڵ میللەتی خۆیەتی. دووهەم ئەوە کە ئەو وەختە کە پێش سێ مانگان گرووهێك پەیدا بوو بە نێوی گرووهی ٧ نەفەری کە دەیهەویست لە داخڵەوە زەربە لە حیزبی دێموکرات بدا، زەربە لە خەباتی میللەتی ئێمە بدا، ئێستا ئەو گرووهە وجوودی لە کوردستاندا نەماوە، بە تەواوی جووڵانەوەی میللەتی کورد ئەو گرووهەی تەرد کردوەو لە نەتیجەدا یەکیەتیی فکری‌و سیاسی‌و حەتتا تەشکیلاتی حیزبەکەمان زۆر زۆر زیاتر بووە. مەسەلەی دیکە لەو سێ مانگەدا گۆڕینی هەڵوێستی سازمانی چریکە فیدایی‌یەکانە. پاش پلینۆمی سێ مانگ لەوەو پێش، ئێمە بەیانیەیەکی موشتەرەکمان دا، پێکەوە لەو بەیاننامەیەدا هەڵوێستی خۆمان بەرانبەر بە دەوڵەتی مەرکەزی‌و بەرانبەر زۆر گیروگرفتی گرینگی کوردستان دەربڕی‌و پێمان وابوو کە دەتوانین لە دوارۆژیش‌دا لەگەڵ برا چریکەکان هاوکاری بکەین، ئێمە هەر لە سەنگەری خۆماندا ماوینەوە ئێمە هەر دیفاع لە

حەقی میللەتی کورد دەکەین، بەڵام زۆرمان پێ ناخۆشە کە ئەوان سەنگەری دیفاع لە حەقی میللەتی کوردیان بەجێ هێشتو چوونە سەنگەری دوژمنـی میللـەتی کـوردو وەزعێکی وایان پێك هێنا کە نەتوانن تەنانـەت لـە کوردسـتان بمێننـەوە. ئێمـە لـە حاڵێکدا ئەو کردەوە ناشیرینە بە زەرەری خودی "سازمان چریکهای فدائی خلق"و بـە زەرەری گەلانی ئێرانو گەلی کورد دەزانین، داوا لە هەموو جەوانانی دڵسـۆزی چریـك دەکەین کە ئەوان دەتوانن لە کوردستان بمێننەوە کە میللەتی کورد باوەشی بۆ هەموو خەباتگێڕێکی دڵسۆز ئاواڵەیەو حیزبی دێموکراتی کوردستانیش هەروەها حـازرە ئـەو برایانە زۆر بە خۆشی وەربگریو لە سـەنگەری میللـەتی کـورددا پێکـەوە لەگـەڵیان هاوکاری بکا. جا پەیامی من بۆ گەلانی ئێرانو بۆ سازمانەکانی دیکـە ئەوەیـە کـە رۆژبەڕۆژ وەختەکە ناسکترو حەساستر دەبێ کە ڕێژیم زەعیف بوو ئیمکانی ئـەوە کـە بڕووخـێ زۆرە، بـەڵام بەداخـەوە هـێزی دێموکـراتو هـێزی چـەپ، هـەتا ئێسـتا نەیانتوانیوە پێکەوە بگەنە نەتیجەیەك بۆ ئەوە بتوانن لە پاش ئەو ڕێژیمـە، ڕێژیمێکـی ئازادیخواز، ڕێژیمێکی دێموکراتیكو میللی بێننـە سـەرکارو ترسـی ئـەوەم هەیـە کـە ئەگەر زوو دەسبەکار نەبین ئیمپریالیزمی ئەمریکا دیسـان مۆرەیـەکی دیکـەمان بـۆ دابنێ لە جێگای ئەو ڕێژیمە، کە نەتوانین بەهاسانی لایبـەرین بۆیـە داوا لـە هـەموو سازمانەکانی بەڕاستی دێموکراتیو میللیو بەڕاستی دژی ئیمپریالیستی دەکـەم کـە هەرچی زووتر دەس بەکار بنو کارێکی وا بکەن کە خەباتی گەلانی ئـێران بـەخۆڕایی نەچێ. ئەو شۆڕشە گەورەیە کە بەرپامان کردووەو بە هەزارانو دەیان هەزار شەهیدمان داوە، خوێنی ئەو شەهیدانە بەخۆڕایی نەچێو بتوانین داخوازەکانی گـەلانی ئـێران لـە دوارۆژدا بە چاکیو بە هاوکاریی هەمووومان بەجێ بگەیەنین. زۆر سپاستان دەکەم.

کاك دوکتور قاسملوو ئێمەش زۆر سپاسی ئێوە دەکەین.

# وتوویژ لەگەڵ کاك دوكتور قاسملوو لە بارەی جبهەی شەڕی بانە - سەردەشت*

گوێگرانی خۆشەویست لە هەواڵەکانی دوێنێدا، رامانگەیان کە هەڤاڵ دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە جبهەکانی شەڕ دیتنیان کردو لەگەڵ پێشمەرگە قارەمانانەکاندا وتوویژیان کردوە، هەروەها پێمان ڕاگەیاندن کە سبەینێ واتە ئەوڕۆ وتوویژێکمان لەبارەی چلۆنایەتیی جبهەکانی شەڕو رۆحیەی پێشمەرگەو وەزعی ئێستای شەڕ لەگەڵتاندا دەدوێین، ئێستا کاك دوکتور تەشریفی هێناوە ئێزگە تا لە نزیکەوە لەگەڵ ئێوە خۆشەویستان بدوێ‌و وەزعی شەڕمان بۆ باس بکا.

پ: کاك دوکتور بەخێر هاتی.

و: زۆر سپاس.

پ: کاك دوکتور بێگومان ئێستا گوێگرەکان چاوەڕوانن تا ئێوەی بەڕێز لە باری وەزعی شەڕ لەگەڵیان بدوێن، چوونکە بەڕاستی خەڵکی کوردستان چاویان تێبڕیوەو رۆژبەڕۆژ چاوەنوارن بزانن چی لێ بەسەر دێتەوە. دەکرێ بفەرموون مەبەستی ئێوە لە سەردانی جبهە چ بوو؟

و: گوێگرانی بەڕێز سڵاوێکی گەرمتان پێشکەش دەکەم. هەروەها کە دەزانن نێزیکەی دە رۆژ لەوەو پێش ستوونێکی ئەرتەشی لەگەڵ جاش‌و پاسداران لە بانەوە

---

* پاییزی ١٣٥٩

وەڕێ کەوتبوون بۆ سەردەشتو پێشمەرگە قارەمانەکانی ئێمە پێشیان پێ گرتبوونو ستوونەکە لە مەحاسرەدا بوو. مەبەستی ئێمە لە چوون بۆ جبهە ئەوە بوو کە بزانین وەزعی پێشمەرگەکانمان چۆنە، خەڵك چۆن یارمەتییان دەدەنو ئوسوولەن وەزعی نیزامیی جبهەش چۆنە کە ئەگەر کەموکووڕییەك هەیە لە وەزعیاندا بتوانین رەفعی بکەینو لە پاشان مەبەستمان ئەوە بوو کە لە تەرەف هەموو حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانو گەلی کوردەوە جارێکی دیکە پشتیوانیی خۆمان بە پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان رابگەیەنینو پێیان بڵێین کە هەموو خەڵك بە دڵەوە لە خەباتی ئەوان لەو جبهەیەدا پشتیوانی دەکەن.

پ: تکایە بفەرموون جبهەی شەڕتان چۆن دی؟

و: دیارە جبهەی شەڕ جبهەی شەڕە. ئێمە شەودرەنگ گەیشتینە لای پێشمەرگەکان لەواقیعدا ئەو شەڕەی کە حکوومەتی مەرکەزی دەیکا، شەڕێکی نابەرابەرە، بە هەموو هێزیانەوە بە فانتۆمو بە هلیکۆپتێر، بە رۆژ بە فانتۆم بە شەو بە تۆپو خومپارە نەك پێشمەرگەکان بەڵکوو دێهاتی کوردستانو دەوروبەری جبهەکە دەکوتن. وادیارە بە پێشمەرگەکان ناوێرن، جا تۆڵەی خۆیان لە خەڵکی بێدیفاع دەکەنەوە، ئەوەی کە ئێمە دیتمان خەڵك لەگەڵ ئەوەی کە زەربەی زۆری لی کەوتوە، زۆر دێ هەتا ئێستا سووتاوە. بەڵام مقاومەت دەکاو رۆژبەڕۆژ زیاتر تێدەگا کە حکوومەتی مەرکەزی چەند زۆردارو غەددارەو چۆن هەموو قسەکانو هەوڵەکانی خۆی وەدرۆ دەخاتەوەو میللەتی ئێمە لەواقیعدا دەیهەوێ لە بەین بەرێ، ئەوەی کە ئێمە حاڵی بووین ئەوەیە کە ئەو شەڕەی حکوومەتی مەرکەزی دەیکا شەڕە بۆ لەبەین بردنی میللەتی کورد، شەڕێکە کە بەڕاستی مەبەستی ئەوەیە بۆ هەمیشە خەباتی میللەتەکەمان سەرکوت بکا. بەڵام ئەوەی کە ئێمە لە جبهە دیتمان ئەوەی دەنواند کە پێشمەرگەکان لە جێگای خۆیانن. خەڵك پشتیوانییان لێ دەکا، نانیان بۆ دەبا، شتومەکیان بۆ دەباو لەگەڵ هەموو ئەو زەرەرە کە لە خەڵکی کەوتوە، لەگەڵ هەموو ئەو خانووانە کە سووتاون پێم وایە کە مقاومەتێکی قارەمانانە لە لای خەڵكو پێشمەرگەکانەوە دەکرێ.

پ: بەڵێ ئێمەش بەوە زۆر خۆشحاڵین. کاك دوکتور تکایە بفەرموون لەو جبهانە چ شتێك زیاتر لە هەمووان بەرچاو بوو؟

و: پێم وایە دوو شت لە هەموو شتێك زیاتر بەرچاو بوو. یەکیان ئەوە کە لەواقیعدا حکوومەتی مەرکەزی شەڕ لەگەڵ پێشمەرگە ناکا، پێشمەرگە لە سەنگەردایە، بەڵام دەچێ و ئەوە بێپەروا بێ لە نەزەرگرتنی هیچ چەشنە شەرتێکی ئینسانی لە دێهاتی دەدا. خانووی دێهاتی‌یەکان وێران دەکا، ماڵ و منداڵیان دەکووژێ، ئەو دێیەی کە ئێمە لێی بووین و هەر ئەوێ شەوێ چەندین جار فانتۆم هاتە سەری، نوورئەفکنی هەڵکردو لێی دا. هەر لەو دێیەدا ١٢ کەس هەتا ئەو وەختە بریندار بوون و چەند ماڵ سووتابوو و دێیەکانی دیکە بەتایبەتی بەعزێکیان بەتەواوی سووتابوون و لەبەین چووبوون. ئەوە یەك شتە کە زۆر بەرچاوە یەعنی حکوومەتی مەرکەزی بەوە دەیهەوێ رووحیەی خەڵکی تەزعیف بکاو پێشمەرگە مەجبوور بکا لەبەر ئەوە کە خەڵك رۆحیەی تەزعیف دەبێ یا لەبەر ئەوە ماڵی دەسووتێ پێشمەرگە بکشێتەوە. دیارە ئەوە خەیاڵی خاوە پێشمەرگە کە تفەنگی هەڵگرتوەو شەڕ دەکا، دەزانێ بۆچی شەڕ دەکاو هیچ هجوومێکی ئەوتۆ کە میللەتی کورد ماڵوێران دەکا، خانووەکانی دەسووتێنێ، ماڵ و منداڵی دەکوژرێ نابێتە هۆی ئەوەی کە پێشمەرگە سەنگەری خەبات بەجێ بێڵێ. شتێکی دیکە کە زۆر بەرچاو بوو لەگەڵ هەموو ئەو زەحمەتە رۆحیەیەکی یەکجار زۆر بەرزی خەڵك و پێشمەرگەکان بوو. هەرچەند هەر لەو رێگایەدا تووشی دوو شەهید بووم، تووشی ٤ برینداری دیکە بووین، بەڵام ژنێکمان دیت کە نانی دەکرد ساعەت سێی بەیانی بوو کە لێم پرسی بۆچی ئێستا وا زوو دەستت پێ کردوە بۆ نان کردن؟ دەیگوت ئەمن رۆژان دوو سەعات درەنگتر هەڵدەستم بەڵام ئەورۆ زوو دوو سەعات زووتر هەستاوم چوونکە دەمهەوێ زووتر نانەکە بگاتە پێشمەرگەکان پێم وایە ئەوە رۆحیەیەکی زۆر بەرزی هەموو میللەتی کوردەو ئەوەیە سەنبولی سەرکەوتنی ئێمە تا ئێستا.

پ: زۆر سپاس. دیارە چوونی ئێوە بۆ جبهەی شەڕی پێشمەرگە قارەمانەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، دیتنی پێشمەرگەکان لە نزیکەوە لەگەڵیان دواون، هەروەها وەزعی ستوونەکانی دوژمن کە بۆخۆتان دەزانن زۆر شپرزەیە دەبێتە هۆی ئەوە کە لێتان داوا بکەین ئەگەر پەیامێکتان هەیە بۆ پێشمەرگەکان بۆ ئەو ستوونە ئەرتەشی‌یە، بۆ خەڵکی کوردستان، بۆ هەموو گەلانی ئێران بفەرموون تکایە.

و: هەر بەڕاستیش ئەمن پەیامم هەیە بۆ ئەو چوار دەستەیە کە ئێوە باستان کرد، لە پێشدا بۆ گەلانی ئێران ئەو شەڕە، شەڕێکی براکوژییە، شەڕێکی نابەرابەرە. ئەوانەی کە سەربازانی ئێرانی هەتا پاسدارانی ئێران مەخسووسەن پاسدارانی ئوستانەکانی دیکە دەنێرن بۆ کوردستانو هەتا ئەوانەی کە ئەو کوردانە کە فریویان خواردوە کە ئێمە پێیان دەڵێین جاش، ئەوانیش دەنێرن بۆ کوردستان دەبێ بزانن کە هەتا ئێستا چەندین جار ئێمتیحانیان کردوە، دەبێ ئەوە بزانن بەو شێوەیە بە سەر میللەتی کورددا ناتوانن زاڵ بنو تەنها نەتیجەی ئەو کارانە دەبێتە هۆی کوشتارێکی زۆری ئەو کەسانە کە لە بەشەکانی دیکەی ئێرانەوە هاتوون بۆ کوردستان بۆیە ئێمە جارێکی دیکە داوا لە گەلانی ئێران دەکەینو جارێکی دیکە پێیان دەڵێین کە خەبات لە کوردستاندا تەنیا بۆ وەرگرتنی مافی خودموختاری کوردستانی ئێران نییە، ئەوە خەباتە بۆ ئازادیو دێموکراسی لە سەرانسەری ئێراندا خەباتێکە بۆ دیفاع لە ئینسانییەتو لە شەرەفو ناموسی هەموو ئینسانێکی ئازادیخواز، بۆیە وەزیفەیانە یارمەتیمان بدەن، وەزیفەیانە دەنگی ئیعترازی خۆیان هەڵێننو هەرچی زیاتر موخالیفەتی خۆیان، دوژمنایەتی خۆیان لەگەڵ ئەو شەڕە براکوژییە نیشان بدەن. پەیامم هەیە بۆ گەلی کورد کە پشتیوانیی خۆی ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بکا بە پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان لەواقیعدا ئەگەر ئەو پشتیوانییە هەبێ کە هەیە ئەگەر ئەو پشتیوانییە بەردەوام بێ من پێم وایە کە هیچ پێشمەرگەیەکی نەبەزی کوردستان، سەنگەری خەباتو سەنگەری شەڕ بەجێ ناهێڵێ. هەروەها پەیامم هەیە بۆ پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان، تەواوی چاوی میللەتەکەمان نەك لە کوردستان بەڵکوو لە سەرانسەری ئێران لە ئێوەیە، نابێ ڕێگا بدەن ئەو ستوونە بگاتە سەردەشت. چوونکە دوژمن زۆر هاواری کردوە زۆر تەبلیغاتی درۆی کردوە کە گۆیا ستوونەکە بە قاتعانە دەچێتە پێش. ئێوە بۆخۆتان دەزانن کە ڕۆحیەی ستوونەکە چەند زەعیفە، ئێوە بۆخۆتان دەزانن کە چەند کەسیان لێ کوژراوە لێرەدا ئەو شەڕە بۆ ڕزگاریی میللەتی کورد، بۆ ئازادیی ئێرانو بۆ دیفاع لە شەرەفو ناموسی هەموو ئینسانێکی ئازادیخوازە لە سەرانسەری ئێراندا، جا لەبەر ئەوە دەبێ قایم لە سەنگەرەکانی خۆتاندا بنو دڵنیا بن کە هەموو میللەتی کورد لەگەڵ ئێوەیەو ئەفکاری عوومومی ئێرانو بیروڕای گشتیی جیهانی ئەوانیش هەر پشتیوانی لە ئێوە

دەکەن چوونکە ئێوە بۆ حەق موباریزە دەکەن. پەیامیشم هەیە بۆ ئەرتەشی‌یەکان دەبێ جارێکی دیکە تێبگەن کە ئەو شەڕە هیچ قازانجی بۆ ئەرتەش نیە، هیچ قازانجی بۆ وڵاتی ئێمە نیە، شەڕێکە بێهەدەف، شەڕێکە تەنها نەتیجەی بەکوشتدانی هەزاران جەوانی ئێرانی‌یە کە دەتوانن لە سازەندگی‌دا بەشدار بن‌و وڵاتەکەمان ئاوەدان بکەن. بەڵام ئێستا لە هیچ‌و خۆڕایی لە شەڕێکی براکوژی‌دا لەبەین دەچن. ئەوە ئێمە نین کە حەملەمان کردۆتە سەر ئەرتەش، ئەوە ئەرتەشە لەگەڵ جاشەکانی کوردستان کە فریویان خواردوە، ئەوە ئەوانەن هاتوون هجوومیان هێناوەتە وڵاتی ئێمە، ئێمە دیفاع لە خۆمان دەکەین‌و ئەوە حەقی مەشرووعی ئێمەیە، بۆیە ئێمە داوا لە ئەرتەشی‌یەکان دەکەین لەگەڵ میللەتی کورد بەشەڕ نەیەن، داوا لە پاسداران‌و تەنانەت جاشەکان کە فریویان خواردوە دەکەین ئەو رێگا خراپە، رێگای براکوژی، رێگای دوژمنایەتی لەگەڵ داخوازەکانی میللەتی کورد بەردەن‌و بچنە ریزی میللەتی کوردو بچنە سەنگەری میللەتی کورد پێکەوە لەگەڵ میللەتی کورد دژی ئەو کەسانە شەڕ بکەن کە ئەو شەڕەیان هەڵایساندوەو دەیانهەوێ بەخۆڕایی بەکوشتنیان بدەن.

پ: زۆر سپاس کاک دوکتور قاسملوو ئێمەش داوا دەکەین‌و ئارەزوو دەکەین کە پێشمەرگە قارەمانەکانمان بەڕاستی لە جبهەکانی شەڕدا هەر وەکوو تا ئێستا راوەستاون، قایم راوەستن. پەیامی ئێوەیان گوێ دابێ‌و عەمەلی پێ بکەن، داوا دەکەین کە گەلانی ئێران کە پەیامی ئێوە دەبیستن هیواداریـن زۆرتر لە هەمیشە یارمەتیی میللەتی کوردو یارمەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بدەن‌و هیواداریـن کە میللەتی کورد هەروەها کە تا ئێستا مەردانەو قارەمانانە لە ڕووی دڵسۆزی‌یەوە پێشمەرگەکانیان یارمەتی کردوە، پشتیوانیی لێ کردوە هەروەها درێژەی پێ بدەن‌و دیسانەوە هیواداریـن کە ئەو ئەرتەشی‌یانە کە جەنابتان پەیامتان بۆ ناردن، حەتمەن گوێیان لە پەیامی ئێوە بووبێ‌و بە قسەی ئێوە بکەن بە قسەی میللەتی کورد بکەن، چوونکە قسەی ئێوە قسەی میللەتی کوردە، قسەی حیزبی دێموکراتی کوردستانە، ئارەزوو دەکەین بە قسەی ئێوە بکەن‌و هەرچی زووتر وریا بنەوەو بێنە ریزی پێشمەرگە قارەمانەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستان‌و میللەتی کوردەوە.

و: زۆر سپاس.

# وتووێژی رادیۆ دەنگی کوردستان لەگەڵ کاك دوکتور قاسملوو، سەبارەت بە سەفەری بۆ ئورووپا*

پ: گوێگرانی بەڕێز هەروەك ئاگادارن هەواڵی تێکۆشەر دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ماوەیەك بۆ دەرەوەی ئێران سەفەری کردبوو تا لە دەرەوەی ئێران سیاسەتی ڕێژیم لە دژی گەلی کورد بە بیروڕای گشتیی جیهان رابگەیەنیٚ‌و زۆر بە وردی بارودۆخی کوردستان‌و هەروەها ئەو جینایەتانەی کە دەرحەقی ئێمە ئەنجام دەدرێن روون کاتەوە. هەڤاڵی تێکۆشەرمان چەند رۆژێکە لە سەفەر گەڕاوەتەوەو لە پەیامی نەورۆزیدا بڕیاری دا کە لە بارەی ئەو سەفەرەدا لە دەرفەتێك لەگەڵتان بدوێ. ئێستا بەختیارانە ئەو دەرفەتە هاتۆتە پێش‌و کاك دوکتور تەشریفی هاتۆتە ئێزگەی "دەنگی کوردستان" تا لە نێزیکەوە لە بارەی سەفەرەکەی‌و ئاکامەکانی لەگەڵتان بدوێ. کاك دوکتور بەخێر بێن. پێشەکی لە لایەن خۆم‌و بەڕێوەبەرانی "دەنگی کوردستانی ئێران"ـەوە بەخێرهاتنت دەکەم، هیوادارم بە دەستێکی پڕ گەڕابیتەوە کوردستان.

و: زۆر سپاس. هاونیشتمانانی بەڕێز، خەڵکی بەشەرەفی کوردستان، سڵاوتان لیٚ دەکەم.

پ: زۆر سپاستان دەکەم کاك دوکتور. تکایە بفەرموون مەبەستت لەم موسافرەتە چ بوو؟

---

* ٨ی خاکەلیٚوەی ١٣٦٠

و: دیارە هەروەها کە دەزانن ماوەی سێ مانگان لە ئورووپا بووم‌و مەبەست لەو موسافیرەتە ئەوە بوو کە سیاسەتی جوولانەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران‌و هەروەها سیاسەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بۆ بیروڕای گشتیی ئورووپاو جیهانی ڕوون بکرێتەوە، چوونکە هەروەها کە دەزانن دەوڵەتی کۆنەپەرستی تاران‌و ئەو کەسانە کە پشتیوانیی لێ‌دەکەن لە دەرەوە زۆر درۆو دەلەسەیان لەسەر سیاسەتی ئێمە بلاو کردۆتەوەو ویستوویانە وا بنوێنن کە جوولانەوەی گەلی کورد جوولانەوەیەکی ئەسیل نیە، جوولانەوەیەکە لە دەرەوەڕا هان دراوەو ئەوە گەلی کورد نیە کە خەبات دەکا بۆ خودموختاری لە کوردستانی ئێران‌و بۆ دێموکراسی لە ئێراندا، بەڵکوو هێندێ گرووهی چکۆلەن کە چەکیان هەڵگرتوەو خۆیان بەسەر ئەو میللەتەدا تەحمیل کردوە، من لە زۆر جێگا کە ئیمکانی وتووێژی مەتبووعاتیم هەبوو لە رادیۆو لە تەلەویزیۆن کە لە سەریەك دەتوانم شایەد بڵێم لە ٥٠ وتوویژ زیاتر بوو لە ولاتەکانی ئورووپادا، هەولم دا ئەوە روون بکەمەوە کە خەباتی ئێمە لە پێش هەمووان‌دا خەباتە دژی ئیمپریالیزمی ئامریکا، بۆ لە ریشە دەرهێنانی نفووزی ئیمپریالیزمی ئامریکا لە ئێراندا، لە پاشان خەباتە بۆ دێموکراسی لە ئێراندا، خەباتە بۆ دیفاع لە حەقی زەحمەتکێشان لە سەرانسەری ئێران‌داو هەروەها خەباتە بۆ وەرگرتنی مافی نەتەوایەتیی میللەتەکانی زۆرلێکراوی ئێران بە شێوەی خودموختاری‌و ئەوەندە دەتوانم بڵێم کە هەموو هێزە پێشکەوتووەکان لە ئورووپاو هەموو ئەو کەسانە کە من توانیم قسەیان لەگەڵ بکەم بیرو باوەڕێکی باشیان لەسەر جوولانەوەی ئێمە هەبوو.

پ: زۆر سپاس، دەکرێ بفەرموون لەو سەفەرەدا سەردانی چەند ولاتتان کرد؟

و: لەو سەفەرەدا لەسەریەك لە ٦ ولاتی سەرمایەداری‌و ٢ ولاتی سۆسیالیستی دیدەنم کردو دیارە مومکینە وا بێتە بەرچاو کە سێ مانگ وەختێکی زۆرە بۆ وەی ئینسان بتوانێ لە زۆر ولاتان دیدەن بکا بەلام بەڕاستی لەو ماوەیەدا لەوە زیاتر نەدەکراو هیوام ئەوەیە کە برایانی دیکەی ئی بەڕێوەبەریی حیزب کە دەبێ لە داوڕۆژدا بچن بۆ ئورووپا ئەو کارە کە کراوە لەوێ پشتی بگرن‌و بەشێوەیەکی رێکوپێك‌و نەپچڕاو خەباتی خۆمان‌و ژیانی خۆمان‌و سیاسەتی خۆمان بۆ ولاتەکانی دەرەوە روون بکەینەوە.

پ: زۆر سپاست دەکەین، وا دیارە لەم سەفەرەدا لەگەڵ شەخسیەتەکانو هێزە سیاسی‌یەکانی ئورووپاش دیتنت کردوە، دەکرێ بفەرمووی لەگەڵ چ هێزێكو شەخسییەتێك مولاقاتت کرد؟

و: دیارە دەگەڵ زۆر شەخسییەتم مولاقات کردوە. ئەگەر بمهەوێ لێرە هەموویان ببژێرم وەختێکی زۆر دەگرێ، بەلاّم بەگشتی ئەوەی کە لەو ولاّتانەدا ئێمە پێوەندیمان لەگەڵ گرتن بریتی بوون لە حیزبە سۆسیالیستەکان، حیزبە کومۆنیستەکان، لە سەندیکا کرێکاری‌یەکان، لە رێکخراوە پێشکەوتوو و شەخسییەتە پێشکەوتووەکانو جاروباریش لەگەڵ سەرۆکی دەولّەتانو نوێنەری رەسمیی دەولّەتان. وەك دەزانن لە ئۆتریش لەگەڵ سەرۆك کرایکی کە پشتیوانیی خۆی لە خەباتی گەلی کورد دەربڕیو لە نۆروێژ لەگەڵ نوێنەرانی رەسمیی دەولّەتی نۆروێژو هەروەها لە زۆر جێگای دیکەش لەگەڵ شەخسییەتی زۆر بەرچاو مەسەلەن لە فەرانسە لەگەڵ "سیمۆن وەی" کە سەرۆکی پارلەمانی ئورووپایە کە ئەویش پشتیوانیی خۆی لە خەباتی گەلی کورد دەربڕی. دەمەویست ئەوەی بلّێم کە لە هەموو ئەو پێوەندییانەدا ئەوەی بەڕاستی جێگای شانازی‌یە هەموو ئەو کەسانەو هەموو ئەو هێزانە کە لەگەڵیان تەرەف بووین، رێزێکی یەکجار زۆر دادەنێن بۆ خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێرانداو بەپێچەوانەی ئەو درۆو دەلەسەیە کە جارجارە لە ئێراندا بلاّو دەبێتەوەو دەگاتە دەرەوەش هەموو هێزە پێشکەوتووەکان بەگشتی پشتیوانی خەباتی ئێمەنو نەك هەر ئەوە، دەتوانم بلّێم کە هەموو ئەو هێزانە حیزبی ئێمە، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە بەڕێوەبەرو رێکخەری خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران دەزاننو ئەوە چ لە ولاّتە سۆسیالیستی‌یەکاندا بووبێو چ لە ولاّتە سەرمایەداری‌یەکانو زۆر جار تووشی ئەوە بووین کە حەتتا زیاتر لەوە کە ئینسان بۆخۆی ئیحساس دەکا رێزو ئیحترام بۆ خەباتی گەلی کورد، بۆ خەباتی پێشمەرگە قارەمانەکانمان بۆ پشتیوانیی بەنرخی میللەتی کورد لە خەباتی خۆیو هەروەها بۆ بەڕێوەبەریی حیزبی ئێمە دادەنێنو دەتوانم بلّێم کە ئێستا ئیتر هەم جوولاّنەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێرانداو هەم حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران وەك حیزبێکی پێشڕەو کە بەڕێوەبەری ئەو جوولاّنەوەیە لە سەرانسەری ئورووپادا تەنانەت لە سەرانسەری دنیاشدا ناسراوە.

پ: کاك دوکتور کاتێك لە ئورووپا بووی هەڵپەرەستانی سیاسیو ئەوانەی لە بنەڕەتدا لەگەڵ مافی گەلی کورد دوژمنایەتیيان هەیە، شایەعەیان بڵاو کردەوە کە بەڵێ دوکتور قاسملوو لە دەرەوە لەگەڵ ئەوانەی کە سەڵتەنەتخوازن دیتنی کردوە. بەتایبەت ئەو هەڵپەرەستانە شایەعەیان کردبوو لەگەڵ بەختیار دیتنت کردوە. ئایا لەگەڵ بەختیار مولاقاتت کردوە یا خێر؟ تکایە بۆ گوێگرانی روون کەوە.

و: دیارە پێم سەیرە کە ئێمە وەك حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە بە درێژایی مێژووی خۆمان دژی رێژیمی شا خەباتمان کردوە، ئێستا بێین بۆخۆمان پاکانە بکەین کە لەگەڵ لایەنگرانی شا پەیوەندیمان نیە. پێم وایە ئەوە شتێکی زۆر ئاشکرایەو من لە زۆر وتوویژی خۆمدا بە سەراحەت رامگەیاندوە کە هەرگیز حازر نابین لەگەڵ ئەوانەی کە لایەنگری رێژیمی شا بوونو ئێستاش بە خەیاڵی خۆیان سەڵتەنەتتەڵەبنو شاپەرستن پێوەندیمان هەبێ. نەك هەر ئەوە ئێمە بە هەموو هێزمانەوە دژی ئەو شاپەرستانەو سەڵتەنەتپەرستانە رادەوەستینو جارێکی دیکە رێگا نادەینەوە ئەوانە لە ئێراندا بێنە سەرکار. بەڵام لە سەر هێزەکانی دیکەی ئێرانی کە تەماسم لەگەڵ گرتوون یا ئەوان ویستوویانە پێوەندی بە ئێمەوە بگرن، دەبێ بڵێم ئێمە حیزبێکی موستەقیلین بە حەقی موسەلەمی خۆمان دەزانین لەگەڵ هەرکەس کە پێمان خۆش بێ، پێوەندی بگرینو حیزبێکی سەربەخۆ ئەو مافەی هەیەو هیچ کەسیش حەقی نیە ئەو مافەی لێ بستێنێتەوە، ئەوەندەی کە پێوەندیی بە بەختیارەوە هەیە بەختیار هەم ئەو وەختە کە لەسەر کار بوو لە ئێرانداو هەم ئێستاش نیشانی دا کە سیاسەتمەدارێك نیە کە رێگای لەگەڵ رێگای خەباتی میللەتی ئێمەو حیزبی ئێمە رێك کەوێ. ئێستاش بەختیار پێی وایە کە دەکرێ ئێران بکرێتەوە وڵاتێکی پاشایەتی، بەڵام دێموکراتیك، هەر وا بزانە گەلانی ئێران لەبیریان چووەتەوە کە حەمەڕەزاشاش ئەو وەختە کە هاتە سەرکار باسی دێموکراسی دەکردو لە پاشان چ دیکتاتۆرییەکی دامەزراند. پاشان بەختیار حەتتا کە باسی حەقی میللەتی کورد دەکا، ئێستاش هەر وا بزانە کوێخایەکە لە مەرکەزی ئێران دانیشتوەو حەق دابەش دەکاو خۆی بە حەقدار دەزانێ، ئێمە بەوە تاوانبار دەکا کە بەڵێ حەقمان دەداتێ بەڵام نابێ تەجزیەتەڵەب بین. ئوسوولەن ئەوەش دەبێ بڵێم کە لە هەموو جێگایەك رامانگەیاند کە هیچ ئێرانییەکی دیکە حەقی نیە بە ئێمە بڵێ تەجزیەتەڵەب، ئێمە

ئێرانین‌و ئێرانی‌تر لە خەڵکی دیکە نەبین کەمتر لەوانیش ئێرانی نین. لەبەر ئەوە ڕێگـا نادەین لەمەودوا یەکێك لە مەرکەزەوە هاوار بکا کە بەڵێ خـۆی بکـا بـە سـاحیب‌و حاکمی ئەو ئێرانەو ئێمە بە تەجزەتەڵەب دابنێ. لەبەر ئەو هۆیانەو لەبـەر ئـەوە کـە ئوسوولەن شاپووری بەختیار لە رابردووی ئەو دوو سـاڵەی خـۆی‌دا نیشـانی داوە ئـەو کەسە نیە کە جێگای بڕوای گەلانی ئێران بێ، هەروەها گەلی کـورد بـێ، مـن هیـچ پێوەندی‌یەکم لەگەڵی نەگرتوەو حیزبی ئێمەش حیزبی دێموکراتـی کوردسـتانی ئـێران پێوەندی لەگەڵ بەختیار بە قازانجی خـەباتی ئێمـەو خـەباتی گـەلانی ئـێران نـازانێ. کەوابوو ئەوەش درۆ بـوو. هـەروەها کـە بیسـتووتانە زۆر لـە وتووێژەکـانی منیـش تەحریف کراون. مەسەلەن ئەو وتووێژەی کە لەگەڵ ڕۆژنامـەی "لۆمۆند"م کردبـوو یـا ئەو وتووێژەی کە لەگەڵ رادیۆ "بی.بـی.سی" م کردبـوو لـە ئـێرانیش بڵاوبۆتـەوە، ئەوانەیان تەحریف کردوەو زۆرم پـێ خـۆش بـوو کـە دیتـم کـە دۆسـتانی سـازمانی موجاهیدینی خەڵك عەینی موساحیبەی منیان لەگەڵ رادیـۆ "بـی.بی.سـی" بـڵاو کردۆتەوەو نیشانیان داوە کە ڕۆژنامـــەی "کیـهان" چـۆن وەقیحانـە موسـاحیبەکەی تەحریف کردوەو تەزویری تێ‌دا کردوە. لەبەر ئەوە سیاسەتی ئێمە روونە، ئێمە ئەگـەر نـەزەرێکمان هـەبێ هـەروەها کـە لـە ئـێران‌و لـە کوردسـتاندا نیشـانمان داوە بـــە سەراحەتەوە دەیڵێین‌و لە کەسیش باکمـان نیـە. بۆیـە ئێمـە سیاسـەتی خۆمـان بـەو شێوەیە کە حیزبی ئێمە دیاری کردوە بەڕێوەی دەبەین. ئێمە لەگەڵ هـەموو هـێزێکی پێشکەوتوو لە ئێراندا، لەگەل هەموو هێزێکی بەڕاستی ئازادیخواز پێوەندیمان هەیـەو ئەو پێوەندی‌یە لە دوارۆژیش‌دا بەقوەت دەکەین‌و هیوادارین کە ئەو پێوەندی‌یە بگاتـە نەتیجەی زۆر باش بۆ ئێمە. بەپێچەوانەی ئەوەی کە ئەوان دەیڵێـن ئێمـە لەگـەڵ زۆر ڕێکخراوی دیکە پێوەندیمان هەبووە کە من پێم خۆشە لێرەدا باسـی دووانیـان بکـەم. یەکێکیان پێوەندی‌یەکی زۆر باشمان هەبوو لەو ماوەیەداو دانیشـتنێکی زۆر درێژمـان هەبوو لەگەڵ سەرۆکەکانی سازمانی ئازادیبەخشی فەلەستین‌و دەتوانم بڵێم کە لەسـەر تەواوی مەسائیلی موهیم نەزەرمان وەك یەکە، دووهەم دانیشتنمان هـەبوو هـەروەها کە دەزانن لەگەڵ نوێنەرانی سازمانی موجاهیدینی خەڵك کە لەوێش‌دا لەسەر تەواوی مەسائیلی ئەساسی کە پێوەندیان بە ئێرانەوە هەیە نـەزەرمان وەك یەکـەو هیواشمـان ئەوەیە کە ئەو هاوکاری‌یە لە دوارۆژدا رۆژبەرۆژ زیاتر بێ. ئەوانەی کـە هەلپەرسـتن‌و

ئوپۆرتونیستن‌و دەیانەوێ میللەتی ئێمە هەڵخڵەتێنن ئەوان ناوێرن باسی دۆستایەتیی ئێمە لەگەڵ سازمانی ئازادیبەخشی فەلەستیندا بکەن، جا لەبەر ئەوە دەچن درۆو دەلەسە ساز دەکەن‌و ئێمە بەوە تاوانبار دەکەن بەوە کە لەگەڵ فلان کەس پێوەندیمان گرتوە یا مەسەلەن یەکێکی وەکوو بەختیار یا ئەفرادی وەك ئەو مولاقاتمان کردوە.

پ: زۆر سپاس. کاك دوکتور تکایە بفەرموون لە دەرەوەی ئێران هێزە سیاسی‌و شەخسیەتە سیاسی‌یەکان‌و بەگشتی خەڵکی ئورووپا چۆن دەڕواننە موباریزەو خەباتی گەلی کوردو حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران؟

و: ئەمن پێم وایە ئیدی جوابی ئەو سوئالەم داوەتەوە. واقیعییەت ئەوەیە کە من بۆخۆشم زۆرجار پێم سەیر بوو کە نەك هێزە سیاسی‌یەکان نەك رۆژنامەنووسەکان بەڵکوو خەڵکی عادی‌و مەعمولی چۆن لە خەباتی ئێمە ئاگادارن‌و چۆن حەتتا حیزبی ئێمە بە ناو دەناسن. دیارە زۆر شت بڵاو بۆتەوە لە دەرەوە. هەر لەو ماوەیەدا چەندین وتووێژی تەلەویزیۆنی پێکهات کە مەسەلەن یەکێکیان لە فەرانسە لە سەعاتی ۸ی ئێوارەی رۆژی شەممۆ بڵاو بووەو ئەوە وەختێکە هەر نەبێ ۱۵ میلیۆن کەس لە فەرانسە تەماشای تەلەویزیۆن دەکەن. دیارە ئەوە هەمووی تەئسیری هەیە بۆ وەی کە خەڵك لە خەباتی ئێمە ئاگادار بکرێن، بەڵام دیسانەکە ئێستا کە بۆخۆمان لە کوردستانی ئێران لەسەر ئەو مەسەلەیە قسە دەکەین دەمەویست پێتان رابگەیەنم کە دەبێ زیاتر لەوە خەباتی ئێمە لە دەرەوە مونعەکیس بێ چوونکە ئەو خەباتە کە لێرە بەڕاستی میللەتی کورد، پێشمەرگە قارەمانەکانمان بەڕێوەی دەبن شایستەی ئەوەیە کە زیاتر لەوەو باشتر لەوە کە ئێستا ناسراوە بناسێندرێ.

پ: کاك دوکتور پرسیارێکی دیکە دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە کە لە هێزەکانی ئێرانی کامەیان لایەنگری جووڵانەوەی گەلی کوردن‌و کامەیان دژی خەباتی گەلی کورد تەبلیغات دەکەن تکایە بفەرموون؟

و: لە واقیعدا سێ گرووه لە هێزەکانی ئێرانی دژی سیاسەتی حیزبی ئێمە راوەستاون. لەپێشدا دیارە لایەنگرانی حیزبی جمهووریی ئیسلامی، ئەوانەی کە پێیان دەڵێن حیزبوڵلاهی، ئەوانە لە هەموو ئەو جێگایانە کە ئەفرادیان هەیە زۆریش نین بەڵام هەیانە چوونکە پووڵو پارەیەکی زۆریش خەرج دەکەن بۆ تەبلیغاتی خۆیان ئەوانە دژی ئێمە تەبلیغات دەکەن. شتێکی تەبیعی‌یە بۆ ئەوەش بۆ دەرەوە نێردراون

کە تەبلیغات دژی ئێمەو هێزە پێشکەوتووەکانی ئێرانی بکەن. تـەبلیغاتی ئـەوان لـە ئورووپـا تەئسـیری یـەکجار کەمـە چوونکـە ڕێژیمـی ئێسـتای ئـێران بـە ڕێژیمێکـی کۆنەپەرستو پاشکەوتوو و ڕێژیمێکی قروونی وسـتایی ناسـراوە لـە دەرەوەو ئێمـەش کۆمەکمان کرد زیاتر بەو شێوەیە بناسرێ. دەستەی دووهەم بریتین لەو جەوانانەی کـە ماوەیەك لەوەی پێش بەناوی چریك، چریکی فیدایی لە کوردسـتاندا بـوون ئـەوانیش ژمارەیان زۆر کەم بۆتەوە، ڕۆژبەڕۆژیش لە ڕەهبەریی خۆیان کە بەناوی ئەکسـەرییەت ناسراوە زیاتر جودا دەبنەوە بەڵام هێنـدێ، جـارێ هـەر هـەنو سەرگەردانیشـن، لـە لایەکەوە دیفاع لە گەلی کورد دەکەن بە قسە لە لایەکی دیکەشەوە هجـووم دەکەنـە سەر سیاسەتی حیزبی ئێمەو دیفاع لە ڕێژیمی کۆنەپەرست دەکەن کە گوایە ڕێژیمێکـی دژی ئیمپریالیستی‌یە. بێجگە لەوە دیارە لەو جێگایانە کە حـیزبی تـوودە، تـوودەی ئێران نفووزی هەیە، ئـەفرادی هەیـە ئـەوانیش تـەبلیغاتێکی نـاڕەوا، تـەبلیغاتێکی بەڕاستی بێشەرمانە دەکەن لە دژی حیزبی ئێمە. بەڵام بەخۆشـی‌یەوە دەتـوانم بڵێمو بەمەسئوولییەتەوە ئەو قسەیە دەکەم کە نەك هـەر حیزبـە پێشـکەوتوەکان بەگشـتی حیزبە سۆسیالیستەکان بەڵکوو حیزبە کومۆنیستەکانیش کە جاران حـیزبی توودەیـان بە حیزبی برا دادەنا ئێستاش پێوەندی‌یان لەگەڵی‌دا هەیە، هیچیان سیاسەتی ئـەوڕۆی حیزبی توودەیان لە ئێراندا قبووڵ نیەو ئەوەی کە دەڵێم تـەنیا مـەربووت بـە حیزبـە کومۆنیسـتەکانی وڵاتـەکانی سـەرمایەداری نیـە، بـەڵکوو مەربووتـە بـە حیزبـە کومۆنیستەکانی وڵاتەکانی سۆسیالیستیش. نموونەیەکتان بۆ بێنم، هەروەها کە ڕادیۆ کوردستان وەختی خۆی بڵاوی کردەوە لە پاییزی ڕابردوودا، ڕۆژنامەی "ئۆمانیتە" کە ئۆرگانی کومیتەی مەرکەزیی حیزبی کومۆنیستی فەرانسەیە جێژنێکی گەورەی سـاز کردبوو، ئەو جێژنە هەموو ساڵێ ساز دەبێو چەندین میلیـۆن نەفـەر تێـی‌دا بەشـدار دەبن، داوایان لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئـێرانیش کردبـوو کـە لـەو جەژنـەدا بەشدار بێ کە حیزبی ئێمە، ئامادە بوو لەو جەژنەدا بەشدار بـێ لـە شـاری پـاریس. نوێنەری حـیزبی تـوودە ڕایگـەیاند کـە ئەگـەر حـیزبی دێموکراتـی کوردسـتان لـە جەژنەکەدا بەشدار بێ ئەوان حازر نین بەشدار بنو دیارە حیزبی کومۆنیستی فەرانسـە بە شێوەیەکی زۆر ئوسوولی جوابی دانەوە کە کەیفی خۆیانە، بـەڵام ئـەوان نـاتواننو ناشیانەوێ پێشگیری لە بەشداربوونی حیزبی دێموکراتـی کوردسـتانی ئـێران بکـەن،

نەتیجە وای لیْهات کە بۆ یەکەم جار پاش ساڵهای ساڵ حیزبی توودە لەو جێژنەدا بەشدار نەبوو و تەنیا حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بەشدار بوو کە بەشداریشی یەکجار زۆر سەرکەوتوانە بوو. وەختێك ئەو باسەمان دەکرد لەگەڵ نوێنەری کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کومۆنیستی فەرانسە کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو پێی گوتم، گوتی دەمەوێ ئەوەشتان پێ بڵێم کە ئەوە یەکەم جارە لە تاریخی حیزبی کومۆنیستی فەرانسەدا کە بۆ خاتری حیزبێکی دێموکرات واز لە بەشداریی حیزبێکی برا، یانی حیزبی توودە دێنیێو من لێم پرسی کە بۆچی ئەوەتان کرد؟ برادەری حیزبی کومۆنیسی فەرانسە جوابی دامەوە کە ئێمە سیاسەتی ئێوە بە راست دەزانین لە ئێراندا، نەك سیاسەتی حیزبی توودەی ئێران. کەوابوو ئێستا ئێمە بەپێچەوانەی هەموو ئەو درۆو دەلەسەو تەبلیغاتە بۆمان دەرکەوتوە کە حیزبی توودە نەیتوانیوە نە لە ژوورەوەی ئێرانو نە لە دەرەوە چووکترین تەئسیرێك بکاتە سەر حیزبە کومۆنیستەکانی وڵاتەکانی سۆسیالیستیش، لەسەر یەك سیاسەتی حیزبی توودەی ئێران لە شەرایەتی ئێستادا بە سیاسەتێکی ئوپۆرتونیستی دادەنێنو ئەوە شتێکە لە بەینی حیزبە کومۆنیستەکانی وڵاتانی رۆژئاوایشدا ناسراوە.

پ: کاك دوکتور زۆرتان سپاس دەکەم، دەکرێ بفەرموون ئەو موسافرەتە تا چ رادەیەك سەرکەوتوو بوو؟

و: دیارە ئەوە حەق نیە کە من ئەو قسەیە بکەم، بەڵام وەختێك گوزاریشی موسافیرەتەکەم دایە دەفتەری سیاسی، برادەرانی دەفتەری سیاسی بەگشتی لەو بڕوایەدا بوون کە ئەو موسافیرەتە زۆر سەرکەوتوو بووەو منیش پێم وایە کە موسافیرەتەکە لەسەر یەك توانیویەتی ئەو ئەرکەی کە دەبوا بەجێی بگەیەنێو دەتوانم ئەوەی بڵێم کە ئەوە نە لەبەر ئەوەیە کە من توانیومە ئەو کارە بکەم واقیع ئەوەیە کە خەباتی میللەتی کورد، یەکگرتوویی میللەتی کورد، خەباتی قارەمانانەی پێشمەرگەکان بۆتە هۆی ئەوە کە نوێنەری ئەوان ـ کە خەڵك لە دەرەوە منیان بە نوێنەری ئەوان دادەنا ـ زۆر بە رێزو ئیحترامەوە وەربگیرێ بۆ ئەوە کە من توانیم لە تەلەویزیۆن، لە رادیو لەگەڵ رۆژنامەنووسەکان قسە بکەمو قسەکانی من زۆر بە پانو بەرینی بڵاو بێتەوە لەبەر ئەوەیە کە هەموو ئەو خەڵکە لە دەرەوەو بیروڕای گشتی لە ئۆرووپا و حەتتا جێگای دیکە چونکە زۆر موساحیبەشم کرد. مەسەلەن بۆ ئامریکای

لاتین زۆر موساحێبەم کرد. حەتتا بۆ ولاتەکانی عەرەبی زۆر موساحێبەم کرد بۆ خودی ئامریکا، ئەوانە هەموو ئەوەی دەگەیەنێ کە خەباتی میللەتی ئێمە گەیشتۆتە مەرحەلەیەکی زۆر سەرکەوتوو. ئەگەر ئەو خەباتە بەو شێوەیە ئیدامەی هەبێ لەوەدا گومانم نیە کە لە دوارۆژێکی نزیکدا بیروڕای گشتیی جیهانیو هەموو هێزە پێشکەوتووەکانو تەنانەت هێندێ لە دەوڵەتەکان بە جیددی بە شێوەیەکی هەموو لایەنە پشتیوانی لە خەباتی ئێمە دەکەن. دەمەویست لە ئاخری قسەکانمدا سلاوی هەموو ئەو هێزە پێشکەوتووانە کە داوایان لێ کردووم بە گەلی خەباتکەری کورد، بە پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان بگەیەنمو دڵنیایان بکەم دەبێ بزانن کە بە تەنیا نین، کە پشتوانیان هەیە کە خەباتیان لە دەرەوە دەنگی داوەتەوەو میلیۆنها کەس لە ولاتەکانی ئۆرووپاو ئامریکادا لە خەباتی ئەوان ئاگادارن. ئەوە بۆ خۆی هەستێکی باشە کە ئێمە بزانین کە لە خەباتی خۆماندا بە تەنیا نینو راستە کە پشتیوانی ئەسڵیی خەباتەکەمان بۆ خۆمانینو میللەتی خۆمانە بەلام دۆستیشمان زۆرنو ئەو دۆستانە ئامادەشن بە قەد ئیمکانی خۆیان یارمەتیمان بدەنو پشتیوانیمان لێ بکەن. ئەوە خۆی عامیلێکی باشە بۆ سەرکەوتنی ئێمە لە دوارۆژدا.

**پ:** زۆر سپاس، هیوادارم گەلی کورد لە ژێر رێبەرایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانو سیاسەتی دروستو ئوسووڵیی ئەم حیزبەدا سەرکەوێو بە ئامانجی بەرزو لە مێژینەی خۆی کە دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستانە بگا. سەرکەوتوو بن.

**و:** سپاستان دەکەم.

# وتوویژ لەگەڵ کاک دوکتور "عبدالرحمن قاسملو" لە سەنگەری پێشمەرگەکانی ناوچەی مەهابادداٍ*

پ: لە لایەن هێزی پێشەواوە خوشحاڵیی خۆمان دەردەبڕین کە هاتون بۆ سەنگەری پێشمەرگەو وەزعییەتی پێشمەرگە دەبینن. پێمان خۆش بوو ئێستا کە لە نزیکترین نوختەکانی شاری مەهابادەوە دەڕواننە جێیەکانی دوژمنەوەو وەزعییەتی دیفاعیی پێشمەرگەکان دەبینن، پێمان خۆشە بزانین رۆحیەی پێشمەرگەکانت چۆن دیوەو وەزعییەتی ئێستا بە نەزەری خۆتان فەرموون.

و: دیارە زۆر خۆشحاڵم کە توانیومە جارێکی دیکە لە نێو سەنگەری پێشمەرگەکاندا بم‌و بەڕاستی جێگای شانازی‌یە کە رۆحیەی پێشمەرگەکانمان زۆر بەرزە، هەموویان زۆر لە سەرەخۆو باشن، خۆشڕوو ئامادەن بۆ دیفاع، ئاوا کە تەماشای پایەگاکانی دوژمن دەکەم، شتێکم دێتە بەرچاو ئەویش ئەوەیە کە بەڕاستی دوژمن زۆر دەترسێ، رۆحییەی نەماوە، بەڵام ئەگەر ئینسان فکر بکاتەوە ئەو هەموو پایەگایەی لەو هەموو جێگایە داناوە تەنیا بۆ ئەوەیە کە دەزانن هەموو میللەتی کورد زدیانە، هەموو میللەتی کورد دژیان خەبات دەکاو لەبەر ئەوە بتوانن خۆیان لە میللەتەکەیان بپارێزن ئەو پایەگایانەیان لەوێ داناون. پێم وایە کە ئێمە کە بۆخۆمان دامان ناوە خەباتێکی دوورو درێژ بکەین، ئەمەش مەرحەلەیەکە لە خەباتەکەمان‌و دەتوانم بە مەسئوولییەتەوە بڵێم هەتا ئێستا ئەو خەباتەمان سەرکەوتوە ئەو

---

* ساڵی ١٣٦٠

مەرحەلەیەشمان سەرکەوتوەو لەگەڵ هەموو هاتو هووی دوژمن دڵنیام کە پێشمەرگەکان لە نیشتمانی خۆشەویستمان، لە گەلی زۆرلیکراومان لە دوارۆژیشدا ئازایانە دیفاع دەکەن.

پ: زۆر سوپاس! کاك دوکتور زۆرجار دەبیسین کە دەزگا تەبلیغاتی‌یەکانی رێژیم دەڵێن کە پێشمەرگە بەرەبەرە سەنگەرەکان چۆڵ دەکاو دەکشێتەوە، ئێستا پێتان وایە لەگەڵ شاری مەهاباد چەندمان فاسیلە هەبێ؟

و: وەڵ ڵاهی لێرەدا تەنانەت نێو شاری مەهاباد دیارە، ئەوە پێشمەرگەکان پێیان خۆشە هەرچی زووتر بگەرێنەوە شاری منیش پێم خۆشە، زۆر بە دووریشی نابینم کە جارێکی دیکە لە چوارچرای شاری مەهابادا پێکەوە لەگەڵ خەڵکی قارەمانی مەهاباد لە میتینگێکی پانو بەریندا بەشدار بم چونکە قەولیشم پێ داون دەبێ ئەو قەولە هەر بە جێ بگەیەنم، بەڵام ئەوەی کە دوژمن ئیددیعا دەکا کە فلان جێگای گرتوەو یا فلان رێگای گرتوە من پێم وایە کە خەڵکی کوردستان بە چاوی خۆیان دەبینن کە درۆ دەکاو تەنانەت هەتا ئەگەر رێگایەکیشی گرتبێ کە مەجبوور بووە بە دەیان پایەگا لەو رێگایەدا دابنێ ئەویش زیاتر بۆ وەی کە بۆ خۆی زیاتر هاتوچۆی پێ بکرێ لەوە زیاتر بەو کوردستانەدا هیچی پێ نەکراوە ئەوەی کە من دەبینم لەو چەند رۆژەدا کە لە کوردستاندا دەگەرێم تەواوی کوردستانەکە بێجگە لە هێندێ رێگا لە شارەکان، بە دەس پێشمەرگەوەیە، بە دەس خودی خەڵکیەوەیە، ئەمن هیوادارمو دڵنیاشم کە پێشمەرگەو خەڵکی کوردستان رێگا نادەن جارێکی دیکە پاسدارو ئەرتەشی بەسەریاندا زاڵ بێ.

پ: زۆر سوپاس کاك دوکتور

و: ئەمنیش سوپاستان دەکەمو سڵاو لە هەموو پێشمەرگەکانی هێزی پێشەوا دەکەمو سڵاو لە خەڵکی قارەمانی مەهاباد دەکەم. لێرەرا گوێیان لە دەنگی من نیە بەڵام هیوادارم کە بە واسیتەی رادیۆ دەنگی کوردستانەوە گوێیان لە دەنگی من بێت.

پ: کاك دوکتور وێرای سوپاس هیوادارین وەك ئەوەڵ جار نەبووە ئاخر جاریش نەبێ کە بێن لە نزیکەوە سەنگەری پێشمەرگە ببینن، زۆر سوپاستان دەکەم.

و: ئەمنیش سوپاس دەکەم، هەر وەختێك پێشمەرگە پێم بڵێ ئێستا جاری واشە پێشم نەڵێن هەر دێمەوەو زۆریشم پێ خۆشە.

# وتوویژی رادیۆیی لەگەڵ کاك دوکتور قاسملوو لەدوای گەڕانەوەی لە ئورووپا*

هەر وەك دەزانن هاوڕێی تێکۆشەر دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە زستانی رابردوودا سەفەری دەرەوەی وڵاتی کردو مەبەست لەم سەفەرە، گەیاندنی دەنگی حەقخوازانەی گەلی قارەمانی کورد بە بیروڕای گشتیی جیهانیو هەروەها بەشداری لە کۆبوونەوەکانی شوورای نیشتمانیی بەرگریدا بوو کە نەتیجەکەی سەنەدە گرینگەکانی شوورا بوون کە لە دەنگی کوردستانی ئێرانەوە بڵاو کرانەوە. سەفەری سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە چەند بارەوە جێگای سەرنج بوو و دەسکەوتی زۆر بەنرخی بووەو ئێستا کە هاوڕێی تێکۆشەرمان لە سەفەری خۆی گەڕاوەتەوە نێو پێشمەرگە حەماسەخولقێنەرەکانو گەلی قارەمانی کورد، ئاگاداری لە ئاکامی سەفەرەکەی بۆ هەموو هاونیشتمانان گرنگو جێگای سەرنجە. دەنگی کوردستانی ئێران بانگهێشتی دوکتور قاسملووی کردوە کە لە وتوویژێکی رادیۆییدا بەشداری بکا. کاك دوکتوریش ئەم بانگهێشتەی قبووڵ کردوەو ئێستا لە ئیستۆدیۆی دەنگی کوردستانی ئێراندایە کە ئێمە لە لایەن خۆمانو هەموو خەڵکی کوردستانەوە بەخێرهاتنی دەکەین.

**پ:** کاك دوکتور سڵاو بەخێرهاتنتان لێ دەکەینو ماندوو نەبن.

---

* ٢٣ی بانەمەڕی ١٣٦١

و: زۆر سوپاس. لە پێشدا سلاوێکی گەرم دەنێرم بۆ هەموو خەڵکی کوردستان، بۆ هەموو گەلانی ئێران‌و بەڕاستی خۆم زۆر بە بەختیار دەزانم کە لە نێو میللەتی خۆم دام. لە دنیای ئەورۆدا جێگای خۆش هەیە، بەلام بۆ من لە هەموو جێگایەك خۆشتر ئەوەیە کە لە کوردستانی ئێران، لە نێو گەلی کورد لە نێو پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستاندا بم.

پ: زۆر سوپاس ئێمەش هەروا بیر دەکەینەوەو هاتنی ئێوە بۆ ناومان، بۆ خەلکی کوردستان، بۆ پێشمەرگە قارەمانەکان جێگای خۆشحاڵی‌یە. تکایە بفەرموون مەبەستتان لە سەفەر بۆ دەرەوەی ولاّت چ بوو؟

و: لەسەر بڕیاری کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، من بۆ ئورووپا سەفەرم کردو لەم سەفەرەدا سێ مەبەستی ئەساسیم هەبوون، لە پێش هەمووانڤدا پێویست بوو کە لە کۆبوونەوەکانی شوورای نیشتمانیی بەرگری‌دا بەشدار بم. بۆخۆتان دەزانن کە شوورا پێکهاتبوو و حیزبی ئێمە ببوو بە ئەندامی شوورا، بەلاّم پێویست بوو لەگەلّ ئەندامانی دیکەی شوورا لەسەر دیاریکردنی تاکتیکی داهاتووی شوورا قسە بکەین. دەتوانم بلّێم کە پاش دوو مانگ‌و نیو کۆبوونەوە شوورا توانی بە سەرکەوتوویی کارەکانی خۆی بەڕێوەبەرێ‌و کاری شوورا، تێکۆشانی ئەندامانی شوورا ئاکامێکی زۆر موسبەتی هەبوو، لە پێشدا ڕێگام بدەن کە لە لایەن مەسئوولی شووراوە برامان کاك مەسعوودی رەجەوەی سلاوێکی گەرمتان پێشکەش بکەم چونکە داوای کردبوو کە سلاوی مسئوولی شوورا لە ڕێگای رادیۆ دەنگی کوردستانەوە بە هەموو گەلانی ئێران رابگەیەنم. لە شوورادا ئێمە سێ سەنەدی ئەساسیمان پەسند کرد، یەکەم پێویست بوو ئەرکی شوورا دیاری بکرێ. بگوترێ کە شوورا بۆچی پێك هاتوەو ئەرکی ئەساسی چیە. لە سەنەدی یەکەمدا ئاوا هاتوە، گوتراوە کە شوورا بۆ رووخاندنی ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی پێکهاتوەو مەبەستی ئەوەیە کە ڕێژیمێکی دێموکراتی بە شکلّی جمهووریی دێموکراتیکی ئیسلامی بینێتە سەرکار. دووهەم ئەوە بوو کە لە ئەرکەکانی شوورادا دیاری بکرێ کە شوورا تا کەنگێ هەیەو کەی دەسەلاّتی خۆی تەحویلی نوێنەرانی هەلّبژێردراوی گەلانی ئێران دەدا. ئەوە دیاری کراوە کە پاش رووخاندنی ڕێژیمی خومەینی ٦ مانگ شوورا کاروباری ولاّت بەڕێوە بەرێ‌و لە واقیعدا هەم دەولّەتی کاتی لە ژێر چاوەدێریی

شوورادا کارەکانی خۆی بکاو هەم شوورا حەقی قانووندانانی هەبێ تا دەگاتە ئەو وەختەی کە مەجلیسی موئەسیسان لە هەڵبژاردنێکی راستەوخۆدا، لە هەڵبژاردنێکی ئازاددا پێك بێ کە مەجلیسی موئەسیسان پێكهات، شوورا تەواوی دەسەڵاتی خۆی تەسلیمی مەجلیسی موئەسیسان دەکاو ئەوە مەجلیسی موئەسیسانە کە دەوڵەتی داهاتوو دیاری دەکا، مەجلیسی موئەسیسانە کە قانوونی ئەساسی دادەنێو مەجلیسی موئەسیسانە کە مەجلیسی قانوونگوزارە تا ئەو وەختە کە مەجلیسی شوورای میللی هەڵبژێرێو هەروەها مەجلیسی موئەسیسانە کە لەواقیعدا ماهییەتی وەك تیپی رێژیمی جمهووریی داهاتوو دیاری دەکا، دیارە تەئکید دەکەم، رێژیمی جمهووری داهاتوو نە هەر رێژیمێکی.

پ: راستە، مەعزەرەت، مەبەستتان لەوە چیە؟

و: رێژیمی جمهووری، مەبەستمان ئەوەیە کە نە هەر رێژیمێکی، نە ئەوە کە مەسەلەن هێندێ لەو کەسانە کە لە دەرەوەی وڵاتن دەڵێن مەجلیسی موئەسیسان پێك دێو ماهییەتی رێژیم دیاری دەکا کە ئەگەر گۆیا مەجلیسی موئەسیسان پێی خۆش بوو دەتوانێ جارێکی دیکە سەڵتەنەت لە ئێراندا زیندوو بکاتەوە. بۆ ئێمە بۆ ئەندامانی شوورا کە خەبات دەکەن بۆ رووخاندنی رێژیمی خومەینی، سەڵتەنەت جوزئی تاریخی ئێرانەو جارێکی دیکە هەروەها کە ئێمەش لە حیزبی خۆماندا بارها تیکرارمان کردۆتەوە، رێگا نادەین بە هیچ شێوەیەك سەڵتەنەت لە وڵاتی ئێمەدا زیندوو بێتەوە. دووهەم ئەرکی شوورا ئەوە بوو کە بەرنامەیەکی فەوری بۆ ئەو ٦ مانگە دابنێ یانی دەوڵەتی مووەقەت پاش ئەوەی کە رێژیمی خومەینی دەڕووخێ، دێتە سەرکار. لەو ٦ مانگەدا دەبێ چ بکا، دیارە کە دەڵێین ٦ مانگ لەوێڕا دەردەکەوێ کە ناتوانێ دەوڵەت زۆر کاری ئەساسی جێبەجێ بکا. بەڵام چونکە شوورا ئیمانێکی قووڵی بە دێموکراسی هەیە لەو بڕوایەدایە کە پاش پێکهاتنی مەجلیسی موئەسیسان پاش دامەزرانی دەوڵەتێك کە مەجلیسی موئەسیسان دیاریی دەکا، ئەو وەختەیە کە مەسائیلی ئەساسیی ئێران لە باری سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریيەوە دەبێ حەل بکرێ. بەڵام دەوڵەتی مووەقەت هێندێ شتی زۆر موهیم دەتوانێ جێبەجێ بکا کە لە بەرنامەی فەوریی دەوڵەتی مووەقەتدا هاتوە، یەکیان دوایی پێهێنان، کۆتایی پێهێنان بە شەڕی بەینی ئێرانو عێراقە لە سەر دامەزراندنی ئاشتییەکی

عادلانە، لەگەڵ پارێزگاری لە تەمامییەتی ئەرزیی ئێرانو هەروەها تێکۆشان بۆ لەنێوبردنی هەموو ئەو خراپییەی کە شەڕ بە باری هێناوە، دووهەم دیارە ئەوەی کە بۆ ئێمە ئەساسی‌یە لە کوردستاندا لە دوایی‌پێ‌هێنان، کۆتایی پێ‌هێنان بە شەڕی دژی گەلیی ڕێژیمی خومەینی‌یەو ئیعلانی خودموختاری‌یە لە تەرەفی شووراوەو هەروەها لەبەین بردنی ئاسەواری ئەو شەڕەیە لە کوردستاندا، لە پاشان دیارە لە بەرنامەکەدا تەئمینی ئازادی‌یە دێموکراتی‌یەکان لە هەموو بارێکەوەو تەئکید لەسەر ئەوەی کە ئازادیی ژنان دەبێ تەئمین بکرێ لە هەموو بارێکەوە حەتتا لە باری پووششەوە. لەبەین بردنی هەرچی زووتری ئاساری فەوریی ئەو وەزعە خراپە ئیقتسادی‌یە کە پێکهاتوەو ئێستا لە ئێرانی خۆماندا بە کۆپۆنیزم مەشهوورەو هەروەها چەند مەبەستی گرینگی دیکە کە لەو بەرنامەیەدا هاتوە. ئێمە ئەو بەرنامەیە بە بەرنامەیەکی زۆر سەرکەوتوو دەزانینو پێمان وایە کە لەو ٦ مانگەدا هیچ دەوڵەتێك ناتوانێ لەوە زیاتر کار ئەنجام بدا. بەڵام لە عەینی وەختیش‌دا پێم خۆشە ئەوەی بڵێم کە تەواوی ١٠ بەندی بەرنامەکە بە تەواوی لەگەڵ بەرنامەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ڕێك دەکەوێ. سێهەم سەنەدی شوورا کە پەسند کراوە بریتی‌یە لە ئەساسنامەی شوورا کە شوورا چۆن دەبێ کار بکا هەرکەس حەقیو ئەرکی چیە لە شووراداو، ئەوەش دیاری کراوە، دیارە لێرەدا هاتوە کە شوورا بە بەشداریی زۆرینەی ئەندامانی خۆی بڕیار دەدا بەڵام هیچ بڕیارێك نادرێ بێ ئەوە کە هەموو ڕێکخراوەکانی عوزوی شوورا موافیقەتی لە سەر بکەن. پێمان وایە کە ئەوە باشترین ڕێگا بووەو دێموکراتیکترین شێوەیە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شوورا بەرەو پێش. چونکە ئەگەر هەر میعیارێکی دیکەمان دانابا، وەك ئەوە کە هەر سازمانێك، هەر ڕێکخراوێك یا هەر شەخسییەتێك چەند پشتیوانی هەیە چەند هەواداری هەیە، پێمان وایە نەدەگەیشتینە نەتیجەیەکی زۆر موسبەتو دەقیق، لەبەر ئەوە پاش دانانی بەرنامەی شووراو پاش ئەوەی کە وەزایفی، ئەرکی خودی شوورامان دیاری کرد هاتینە سەر ئەو باوەڕە کە دیارە ئەو شوورایە، لەو شوورایەدا هەموو ئەندامان وەك یەك نەزەریان هەبێ، وەك یەك حەقیان هەبێ تا ئەو وەختەی کە دەگەینە مەجلیسی موئەسیسانو خەڵك، گەلانی ئێران بە دەنگی خۆیان دیاری دەکەن کە چ سازمانێك یا

چ شەخسییەتێك چەند حەقی هەیە لە بەر دەسی موئەسیساندا، نەزەری هەبێ یا دەنگی هەبێ.

پ: زۆر سوپاس کاك دوکتور. لێرەدا پرسیارێك هەیە. مەجلیسی موئەسیسان کە دێتە سەرکار بۆ خۆی دەتوانێ ماهییەتی جمهووری دیاری بکا، یانی بلێ کە جمهووری‌یە؟

و: بەڵێ دیارە، لەوێدا گوتراوە کە ماهییەتی جمهووری دیاری دەکا، مانای ئەوەیە کە مەجلیسی موئەسیسان هەر چۆنێکی پێ خۆش بێ دەتوانێ بلێ کە جمهووری داهاتووی ئێران مەسەلەن ببێ هەر بە جمهووریی ئێران، یا ببێ بە جمهووریی دێموکراتیك یا ببێ بە جمهووریی دێموکراتیکی ئیسلامی، یا ببێ بە جمهووریی میللی، بەپێی ئەوە کە مەجلیسی موئەسیسان چۆن تەشخیس بدا دیارە ماهییەتی جمهووری بەو شێوەیە دیاری دەکرێ. بەڵام ئەوەی کە لە ئێستاوە دیاری کراوە ئەوەیە کە دەبێ حەتمەن جمهووری بێ ناتوانێ شتی‌تر بێ.

پ: مەبەستی دیکەتان لە سەفەر بۆ دەرەوە؟

و: دیارە من لە مەسەلەی شوورادا جارێ پێم خۆش بوو کە ئەوەش بلێم کە لە داخلی شوورادا هێزی ئەساسی بریتین لە: سازمانی موجاهیدینی خەڵك‌و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران‌و، بەڕاستی هەم برادەرانی موجاهیدو هەم هەموو ئەندامانی دیکەی شوورا رێزێکی زۆریان بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دادەنا، رێزێکی زۆریان بۆ بیرو باوەڕی نوێنەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دادەناو بەڕاستی نیشانیان دەدا کە بۆ خەباتی گەلی ئێمە لە کوردستانی ئێراندا بۆ خەباتی قارەمانانەی پێشمەرگەکانمان ئەرزشێکی یەکجار زۆر قائیلن، بەڵام لە باری مەبەستەکانی دیکە کە بریتی بوون لەوە کە هێندێ پێوەندی لەگەڵ رێکخراوەکانی سیاسی، حیزبە پێشڕەوەکانی ئورووپایی‌و هەروەها لەگەڵ هێندێك لە شەخسییەتەکانی ئورووپایی‌و ئێرانی بگرێ‌و وەزعی کوردستان، کوردستانی ئێران‌و وەزعی گشتیی ئێران بۆیان روون کەینەوە. چونکو بۆمان دەرکەوتبوو لە سەفەری پێشووش‌دا ئاوا بەرچاو دەکەوت کە زۆر پێویستە کە دەنگوباسی درۆی رێژیمی ئێران، چونکە هەروەها کە بۆخۆتان دەزانن، ئێستا درۆ لە ئێراندا تا رادەی سیاسەتی رەسمیی دەوڵەت چۆتە سەرێ پێویست بوو کە ئەو دەنگوباسە درۆیە بەڕاستی

واقیعییەتەکەی بگوترێ بە شەخسییەتە سیاسـیـیەکانو ڕێکخراوەکـان. لـەو بـارەوە هێندێ دیارە وتووێژی چاپەمەنیش کرا، وتووێــژی رادیۆیـیـو تەلـەویزیۆنی کـرا کـە بەتایبەتی لە فەرانسە، لە ئینگلستان، لە هۆلەند ئەو وتووێژانە بلاو بوونەوە، دەتوانم بلێم کـە لـەو بارەیـەوە ئـەو کـارەی کـە کـرا نەتیجـەی زۆر باشـی هـەبوو زۆر لـە ڕۆژنامەکانی بەناوبانگی ئورووپا وەك "تایمزی لەندەن" و وەك "لومونـدی فەرانسـە" کە ئامادە بوون مەقالەیەکی تـەواوی ئێمـە بەتـەواوی چـاپ بکـاو چاپیشی کـردو هەروەها ڕۆژنامەکانی دیکە، تەلەویزیۆنی فەرانســەو رادیـۆی بـی.بـی.سـی ئەوانـە هەموو ئیمکانیان دا تا رادەیەکی زۆر ئێمە بتوانین بیروبـاوەڕی خۆمـان، بیروبـاوەڕی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە دەرەوە بلاو بکەینەوەو پێم وایە تا رادەیەکیش دەنگی بلاوکردنەوە گەیشتۆتە کوردستانی ئێرانو ئـێرانیش. ئـەرکی سێهەم، یـانی مەبەستی سێهەمی سەفەری من بۆ دەرەوە ئەوە بـوو کـە لەگـەڵ برادەرانـی حـیزبی خۆمان لەگەڵ ڕێکخراوی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئـێران لـە ئورووپـا پێوەنـدی بگرین لە نیزیکەوەو کاروباریـان ببینـینو بەتایبـەتی وەزعێکـی وا پێـك بێنـین کـە لەمەودوا ئەو دەفتەرە کە بە ڕەسمی لە تەرەف دەوڵەتی فەرانســەوە دراوە بـە حـیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئـێران، یـانی دەوڵـەتی فەرانسـە ڕێگـای داوە ئێمـەش وەك سازمانی ئازادیبەخشی فەلەستین لە شاری پاریس دەفتەری ڕەسمیمان هەبێ، کارێکی وا بکەین کە ئەو دەفتەرە هەرچی زووتر دەست بەکار بێو بتوانێ ئەرکی خۆی باشـتر بەجێ بگەیەنێ، دەنگی ئێمە باشتر بگەیەنێتە گەلانی ئورووپاو گەلانی جیهانو باشتر بتوانێ واقیعییەتی وەزعی ولاتەکەمان لە دەرەوە بلاو بکاتەوەو هـەروەها دیـارە لـە نەتیجەدا خۆشەویستیو هەواداریی گەلانی ئورووپاو هەموو گـەلانی جیـهان بـۆ لای خەباتی میللەتی کورد رابکێشێ.

پ: زۆر سپاس. دیسانەکە لەسەر شوورا، دروشمی ئەساسیی شـوورای نیشـتمانیی بەرگری، ئێستا چیەو چۆن دەیەوێ ئەم دروشمە دابەزێنێ؟

و: دیارە دروشمـی ئەساسـیی شـوورای نیشـتمانیی بـەرگری، ڕووخـاندنی ڕێژیمـی خومەینییەو بۆیە ئێستا بە ڕەسمی پەسند کراوە لەمەودوا ئەندامانی شوورا شوعاری بمرێ خومەینی، شوعاری بڕووخێ ڕێژیمی دژی گەلیو کۆنەپەرستی خومـەینی بـەکار بێننو لە هەموو ئێراندا ئەو شوعارانە بلاو بکەنەوەو نیشان بدەن بـە گـەلانی ئـێران

کە ڕێژیمی خومەینیو خودی خومەینی بە دوژمنی ئەساسیو دوژمنی گەورەی پێشکەوتنی گەلانی ئێران دەزانن‌و هەروەها ئەوەش باس کراوە کە بۆ ڕووخاندنی ڕێژیمێکی کۆنەپەرستو دیکتاتۆرو قروونوستایی وەك ڕێژیمی خومەینی پێویستە کە گەلانی ئێران بە شێوەیەکی توندوتیژ خەبات بکەن لەبەر ئەوە گوتراوە کە میحوەری ئەساسی یا شێوەی ئەساسیی خەباتی گەلانی ئێران دژی ڕێژیمی خومەینی دەبێ خەباتی چەکداری بێ کە ئێستا بەتایبەتی لە لایەن دوو ڕێکخراوی ئەندامی شووراوە ڕێکخراوی ئەساسی وەك موجاهیدینی خەلق‌و حیزبی دێموکرات کە ئەو شێوە خەباتە بەڕێوە دەچێ. بەلاَم ئەوەش گوتراوە کە خەباتی چەکداری لە نێو شاراندا دەبێ لەگەلْ خەباتی چەکداری لە دەرەوەی شار لە بەینیاندا تەلفیق هەبێ بۆ ئەوە کە نەتیجەکەی باشتر بێ هەروەها ئەوەش گوتراوە کە لە بەینی خەباتی چەکداری بەگشتی‌و خەباتی غەیری چەکداری لە خەباتی هەرە بلێین مەنفی‌یەوە بگرە وەك مەسەلەن نەچوون بۆ نوێژی جەماعەت تا دەگاتە ئیعتسابی گشتی، مانگرتنی گشتی، هەموو ئەوانە دەبێ پێکەوە تەلفیقیان هەبێ بۆ ئەوەی کە هەرچی زووتر هەلومەرجی ڕووخاندنی ڕێژیمی خومەینی تەواو بێ‌و لە نەتیجەی زەربەی دوایی‌دا، ئەو ڕێژیمە بڕووخێ.

پ: کاك دوکتور ئێستا ئەرکی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، وەك ئەندامی شووڕای نیشتمانیی بەرگری بەرانبەر بە گەلانی ئێران‌و بەتایبەت گەلی قارەمانی کورد لەم هەلومەرجە ناسك‌و مێژوویی‌یەدا چیە؟

و: حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران حیزبێکی سیاسیی مەسئوولە، وەختێك کە داخلْی شوورا بوو، دەیزانی کە ئەو هەنگاوە هەنگاوێکی گرینگە، چوونی حیزبی دێموکراتی کوردستان بۆ نێو شوورا، مانای ئەوە بوو کە لە تاریخی میللەتەکەماندا بەڕاستی گۆڕانێك پێك‌هاتوە، ئەویش ئەوەیە کە بۆ یەکەمجار خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا گرێ دراوە لەگەلْ خەباتی هەموو گەلانی ئێران‌و ئەوە پێم وایە، نوقتەیەکی گۆڕانە لە تاریخی میللەتەکەمانداو تاریخ دلْنیام کە ئەرزشێکی زۆری بۆ دادەنێ. هەروەها چوونی حیزبی ئێمە بۆ نێو شوورا ئەوەشی لەگەلْ بوو کە هەموو هێزو ڕێکخراوەکانی دێموکراتی ئێران ئەو واقیعییەتە قبوولْ بکەن کە خەباتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، خەباتی گەلی کورد بە بەڕێوەبەریی حیزبی دێموکراتی

کوردستانی ئێران خەباتێکی ڕەوایە. ئەو خودموختارییە کە ئێمە داوای دەکەین حەقی موسەلەمی ئێمەیەو بۆیە ئەویش بۆ یەکەمجار دیسان لە تاریخدا زۆر ڕێکخراوو شەخسییەت ئەسنادی تازەی هی شوورایان ئیمزا کردوە کە یەکێك لە بەندەکانی بەرنامەی دەوڵەتی مووەقەت هەروەها کە باسمان کرد پاش سەرکەوتنی شوورا دەسبەجێ ڕاگەیاندنی (ئیعلانی) خودموختارییە. حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەو کاتەدا دەزانێ کە مەسئوولییەتێکی گەورەی کەوتۆتە سەرشان. هەتا ئێستا حیزبی ئێمە دەرکی ئەو واقیعییەتەی کردوە کە کوردستان تەنیا بۆ خودموختاری شەڕ ناکا، تەنیا بۆ خودموختاری خەبات ناکا، بەڵکوو بۆ دێموکراسی لە ئێراندا خەبات دەکا. بەڵام ئێستا ئەو واقیعییەتە لە لایەن زۆر ڕێکخراوی ئێرانییەوە کە لە شووراداو حەتا هێندێکی دیکە کە لە شوورادا نین- و ئێمە هیواداریین لە دوارۆژدا ئەوانیش ببنە ئەندامی شوورا- قبووڵ کراوە کە کوردستان سەنگەری ئازادیی ئێرانە، ئەوە دیارە هەم شانازییە بۆ ئێمە، بەڵام هەم مەسئوولییەتێکی گەورەشە ئەوەش کە ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی بە هەموو هێزیەوە هێرشی هێناوەتە سەر کوردستان هەر لەبەر ئەوەیە کە تێگەیشتوە کە کوردستان بەڕاستی لە دیاریکردنی وەزعی سیاسیی داهاتووی ئێراندا نەخشێکی یەکجار زۆر گرینگی هەیە.

پ: زۆر سپاس، کاك دوکتور تکایە بفەرموون لە ئورووپا لەگەڵ کام ڕێکخراوو شەخسییەت دانیشتنو وتوویژتان کرد.

و: دیارە لە ئورووپا لەگەڵ زۆر لە ڕێکخراوەکانو شەخسییەتەکان چاوپێکەوتنمان هەبوو، بەڵام لە هەمووان زۆرتر لەگەڵ حیزبە سۆسیالیستو کومۆنیستەکانی ئورووپا بەتایبەتی فەرانسەو ئینگلستان مولاقاتم هەبوو. من کە گەیشتمە فەرانسە ڕاست لەو وەختەدا بوو کە کۆنگرەی ٢٤ی حیزبی کومۆنیستی فەرانسە پێکهاتبوو و لەسەر دەعوەتی کومیتەی ناوەندیی حیزبی کومۆنیستی فەرانسە، لە تەرەف حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوومو ئەوە فورسەتێك بوو کە نەك هەر لەگەڵ وەك کۆنگرەو جەرەیانی کۆنگرە ئاشنابم بەڵکوو لەگەڵ زۆر لە هەیئەتە نوێنەرەکانی حیزبەکانی دیکەی سۆسیالیستو کومۆنیست کە لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوون وتوویژ بکەمو بەڕاستی لەو فورسەتە ئیستفادەمان کردو توانیمان لەگەڵ زۆر لەو ڕێکخراوانە پێکەوە دانیشینو ئاڵوگۆڕی بیرو باوەڕ بکەین.

لەوانە دەتوانم حیزبە کومۆنیستەکانی بەتایبەتی هی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست ناو بەرم لەپاشان حیزبە کومۆنیستەکانی ئوروپایی، حیزبی سۆسیالیستی یۆنانو چەند حیزبی کومۆنیستی ولاتەکانی سۆسیالیستی کە لە هەموو ئەو وتووێژانەدا بۆمان دەرکەوت کە بەگشتی ئەو حیزبە سۆسیالیستو کومۆنیستانە، ڕێژیمی خومەینی بە ڕێژیمێکی کۆنەپەرست دادەنێن، لە خەباتی گەلانی ئێرانو بەتایبەتی لە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران پشتیوانی دەکەنو ئێمە هیوامان دەربڕی کە لە داوڕۆژدا ئەو پشتیوانی‌یە زیاتریش ببێ.

بێجگە لەوە لەگەڵ هێندێ شەخسییەتیش کە ئیمکان هەبوو مولاقات بکەین قسەمان کرد، لەوانە دەتوانم دەعوەتی کومیسۆنی خارجیی پارلەمانی هولەند ناو بەرم کە بەرەسمی دەعوەتیان کردم بۆ هولەندو لەوێ لەگەڵ نوێنەرانی پارلەمانی هولەند لەسەر وەزعی کوردستانی ئێرانو لەسەر وەزعی ئێران قسەم کردو ئاگادارم کردن لەو وەزعە کە لە کوردستانی ئێرانو ئێراندا هەیەو داواشم لێکردن کە بەپێی ئیمکانی خۆیان پشتیوانیی سیاسی لە خەباتی گەلانی ئێران بکەن. هەروەها ئەو وەختە کە لە لەندەن بووم لە پارلەمانی ئینگلستان لەگەڵ نوێنەرانی جەناحی چەپی حیزبی کرێکاری ئینگلستان وتووێژم هەبوو و بەڕاستیش زۆر بەدڵەوە دژی ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی بوونو ئامادەیی خۆیان دەربڕی کە پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێرانداو تەنانەت لە شوورای میللیی موقاومەت لە شوورای نیشتمانیی بەرگری بکەن. دیارە چوونکە ئەرکی ئەساسیی من ئەو جارە بەشدار بوون لە کارەکانی شووراداا بوو، زیاتر لەگەڵ شەخسییەتەکانی ئێرانیش کە هێندێکیان ئێستاش لە دەرەوەی شووران یان لەگەڵ ڕێکخراوەکانی ئێرانی کە جارێ نەهاتوونەتە نێو شوورا، لەگەڵ ئەوانیش وتووێژم هەبوو و دەتوانم بڵێم کە ئەو وتووێژانە ڕەنگە لە داهاتوودا یارمەتیی ئەوە بدەن کە ئەو شەخسییەتو ڕێکخراوانە نیسبەت بە شوورای نیشتمانیی بەرگری مەوزعی باشتریان هەبێتو شوورا بەرینترو باشتر بێ لە پێشوو ئەوەش دەمەوێت بڵێم کە ئێمە هەمووومان حەتا ئەوانەیش کە لە شووراداا نەبوون ئەو شەخسییەتە میللیو دێموکراتانە لەو بڕوایەداین کە شوورای نیشتمانیی بەرگری تەنیا بەدیلی ئێستایەو تەنیا ئالتّرناتیڤە. هیچ یەك لە هێزەکانی دیکە چ ئەوانەی کە خۆیان بە سەڵتەنەتخواز دەزاننو لە ئێراندا هیچ نفووزیان نەماوەو چ ئەوانە کە

دەیانەوێ بە جۆرێك ڕێژیمی جمهووریی ئیسلامی ڕوتووش بکەنو زاهیرێکی وای بۆ دروست بکەن کە بە خەیاڵی ئەوان عامەپەسند بێ. ئەوانە هیچیان ناتوانن ببن بە ئاڵترناتیڤێکی واقیعیو بەدیلێکی واقیعی بۆ دوارۆژی گەلانی ئێران. تەنیا ئاڵترناتیڤی دێموکراتیك بە نەزەری ئێمە، بە نەزەری زۆربەی گەلانی ئێران هەر شوورای نیشتمانیی بەرگرییە.

پ: زۆر سپاس. لەسەر خەباتی گەلی کورد پرسیارێکم هەیە. کاك دوکتور ئێوە لە وتوویژ لەگەڵ ڕۆژنامەی "تایمز"دا گوتووتانە کە خەباتی گەلی کورد دژی ڕێژیمی خومەینی بەر لە دەس پێکردنی شەڕی نێوان ئێرانو عێراق دەستی پێ کردوەو ئەم خەباتە پاش دواییهاتنی شەڕی دوو وڵاتیش تا وەدیهاتنی داخوازە ڕەواکانی گەلەکەمان درێژەی دەبێ. تکایە لەم بارەوە هێندێك زیاتر تەوزیح بدەن؟

و: لەو وەختەوە کە شەڕێ ئێرانو عێراق دەستی پێکردوە، ڕێژیمی کۆنەپەرستی ئێران هەوڵی داوە وا نیشان بدا کە خەباتی گەلی کورد دژی ڕێژیمی خومەینی پێوەندیی هەیە بە شەڕی ئێرانو عێراقەوە. ئێمە هەر ئەو وەختە نەزەری خۆمان ڕاگەیاند کە ئەگەر داخوازەکانی گەلی کورد قبووڵ بکرێنو خودموختاری بدرێ بە کوردستانی ئێران، دیارە پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ئامادەن لە موقابلی هەموو تەجاوزێکدا لە تەمامیەتی ئەرزیی ئێران دیفاع بکەن. بەداخەوە هیچ جوابێکمان وەرنەگرت لە ڕێژیمی خومەینی کە هیچ، بەڵکوو هێرش بۆ سەر کوردستانی ئێران، هێرشی نیزامی زیاتر بوو. پارەکە ئەو مەسلەیە زیاتر بڵاو بۆوە کە گۆیا خەباتی گەلی کورد لە نەتیجەی تەبلیغاتی درۆی ڕێژیمدا لە ژێر تەئسیری شەڕی ئێران وعێراق دایە، ئەوساڵ بەختیارانە دەتوانم بڵێم کە کەس بڕوا بەو درۆو دەلەسەیە ناکا، دەزانن کە خەباتی گەلی کورد خەباتێکی ئەسیلە، پێش شەڕی ئێرانو عێراق دەستی پێکردوە. ئەو خەباتە چەکدارییەو من دڵنیام کە ڕۆژێك ئەو شەڕە تەواو دەبێ بەڵام خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران تا وەرگرتنی خودموختاری هەر درێژەی هەیەو مەبەستیشم لە وتوویژ لەگەڵ ڕۆژنامەی "تایمز" ئەوە بوو کە ئەوەی ڕابگەیەنم کە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران، خەباتێکی سەربەخۆیە، ئەسیلە، ڕەسەنەو بۆ داخوازیی ئەساسیی میللەتەکەمان، تەئیمن کردنی دێموکراسی

بۆ ئێران‌و دابینکردنی خودموختاری بۆ کوردستان دەستی پێ‌کردوەو هەتا گەیشتن بەو ئامانجە هەر درێژەی دەبێ.

**پ:** زۆر سپاس کاك دوکتور، تکایە بفەرموون بیروڕای گشتیی جیهانی سەبارەت بە ڕێژیمی دژی گەلیی خومەینی‌و سەبارەت بە خەباتی قارەمانانەی خەڵکی ئێران بەتایبەتی هێزە شۆڕشگێڕەکان دژی ئەم ڕێژیمەو هەروەها سەبارەت بە بەربەرەکانێی دلێرانەی خەڵکی کوردستان‌و حیزبی پێشڕەوی ئەو گەلە، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران چیە؟

**و:** هەڵوێستی بیروڕای گشتیی جیهانی بەرانبەر بە ڕێژیمی خومەینی زۆر روونە ئەو ڕێژیمە بە ڕێژیمێکی کۆنەپەرست، پاشکەوتوو و قروون وستایی دەناسن، بەختیارانە ڕێژیم بۆخۆی ئەوەندە کردەوەی ناشیرینی لە دەرەوەو لە ژوورەوە هەبووە کە پێویستیەکی زۆر بە پڕوپاگەندەو تەبلیغاتی ئێمە نەبووە، ئەو هەموو ئیعدامە، ئیعدامی کچی ٩ ساڵەو منداڵی ١٢ ساڵە کە لە دەرەوە بەتەواوی دەنگوباسەکەی بڵاو بۆتەوە یا هەر نموونەی ئەخیر هاندانی ١٥٠ یا ٢٠٠ نەفەر چەقۆکێشی حیزبوڵلاهی بۆ ئەوە حەملە بکەنە سەر "خوابگاە"ی دانیشجوانی ئێرانی لە شاری مانیس لە ئاڵمان. ئەوانە هەموو لە بێ‌ئابڕووکردنی ڕێژیمی خومەینی‌دا تەئسیرێکی زۆر باشیان هەبووەو بەڕاستی ئەو ڕێژیمە کەس بە ڕێژیمێکی حەتا مەسئوولیشی ناناسێ‌و لەبەر ئەوەیە کە هەر ئێرانی‌یەك کە بیهەوێ سەفەر بکا بۆ وڵاتەکانی ئوورووپایی دەبێ لە پێش‌دا ئیسبات بکا کە دژی ڕێژیمی خومەینی‌یە تا ڕێگای بدەنێ، ویزای بدەنێ. هەروەها زۆر تەبیعی‌یە کە گەلانی ئوورووپا، بیروڕای گشتیی ئوورووپاو حەتا جیهان بەگشتی پشتیوانی لە خەباتی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی ئێران دژی ڕێژیمی خومەینی دەکاو دەتوانم بڵێم کە لە ماوەی سەفەری خۆم‌دا تووشی تەنانەت یەك شەخسییەت، تەنانەت یەك ڕێکخراویش نەبووم کە نەزەری بەرانبەر بە ڕێژیمی خومەینی باش بێت، هەموویان ئەو ڕێژمەیان مەحکووم دەکردو هەموویان لەو بڕوایەدا بوون کە ئەو ڕێژیمە ڕۆژێك هەر دەبێ بڕووخێ‌و ئاخرەکەی گەلانی ئێران لە ژێر چەپۆکی ڕێژیمێکی ئەوتۆ دیکتاتۆر بێنە دەر، بەڕاستی هەڵوێستی بیروڕای گشتیی ئوورووپا نیسبەت بە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران‌داو نیسبەت بە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، جێگای شانازی‌یە. دەتوانم بڵێم کە لە هەموو جێگا

شانازیم بەوە دەکرد کە نوێنەری حیزبێکم کە هەموو ڕێکخراوەکانی پێشکەوتوو بە حیزبێکی مەسئوولی سیاسیی دەناسن، بە حیزبێکی پێشڕەوی دەناسن و ئامادەیی خۆیان دەردەبڕن بۆ وەی کە پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد و لە حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران بکەن و لە حیزبە کومۆنیستەکانی وڵاتەکانی سۆسیالیستی‌یەوە بگرە تا دەگاتە نوێنەرانی جەناحی چەپی حیزبی کاریگەری ئینگلستان، هەموویان بێ ئیستیسنا ئیحترامێکی زۆریان بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستان دادەناو پێم وایە کە ئەوە نەتیجەو ئاکامی خەباتی قارەمانانەی گەلی کورد بەگشتی، پێشمەرگەکانمان بەتایبەتی لە ژێر ڕەهبەریی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێراندایەو هیوادارم کە ئەو خەباتە بەردەوام بێ و باشتر بچێتە پێشێ. نەتیجەی ئەو خەباتەش لە سیاسەتی جیهانی‌دا ڕۆژبەڕۆژ زیاتر خۆی دەنوێنێ و دڵنیام کە لە دوارۆژدا ئیحترامێکی زیاتر، ڕێزێکی زیاتر بۆ حیزبی ئێمەو خەباتی گەلی ئێمە دادەنێن و حەتتا لەوەیش زیاتر دەتوانم بڵێم کە پشتیوانی‌یەکە ئێستا زیاتر پشتیوانیی سیاسی‌یە لە دوارۆژدا دەتوانێ ببێتە پشتیوانی‌یەکی زۆر بەهێز لە هەموو بارێکەوە. هەر ئێستا زۆر ڕێکخراو ئامادەن دەرمانمان بۆ بنێرن، پزیشکمان بۆ بنێرن، شتمان بۆ چاپ بکەن و هیوادارم لە دوارۆژدا ئەو پشتیوانی‌یەش لەوە دوورتر بڕواو لە هەموو بارێکەوە هێزە پێشکەوتووەکانی جیهان پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا بکەن.

پ: زۆر سپاس کاك دوکتور ئەگەر پەیامێکتان بۆ گەلانی ئێران بەتایبەتی بۆ گەلی کورد و پێشمەرگە نەبەزەکانی کوردستان تەنانەت ئەگەر پەیامێکتان بۆ ئەرتەشی و پاسدارەکانیش هەیە، تکایە لە دەنگی کوردستانی ئێرانەوە کە دڵنیا بن بێجگە لە دۆست تەنانەت دوژمنانیش گوێی بۆ دەگرن بنێرن.

و: پەیامی من بۆ گەلانی ئێران ئەوەیە کە دەبێ لەو ڕاستی‌یە هەموو کەس تێ بگا کە ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی ڕێژیمێکی دژی ئازادی، ڕێژیمێکی دژی گەلی، تەنانەت ڕێژیمێکی دژی ئینسانیەو ئەوەی ئیسبات کردوە. خەبات کردن دژی ڕێژیمی خومەینی بریتی‌یە لە دیفاع لە ئازادی، بەڵام بریتی‌یە لە دیفاع لە ئینسانیش. بەڕاستی وجوودی ڕێژیمی خومەینی نەنگە بۆ گەلانی ئێران، نەنگە بۆ تاریخی ئێران و هەموو گەلانی ئێران. هەموو هێزە پێشڕەوەکانی گەلانی ئێران هەموو ئەو ئینسانانە

کە خۆیان بە ئازادیخواز بە دێموکرات دادەنێن دەبێ یەك بگرن بۆ ئەوە هەرچی زووتر ئەو ڕێژیمە بڕووخێو شوێنەواری نەمێنێو ئەو نەنگە لە تاریخی ئێران لابچێ. بۆیە زۆر بە دڵەوە داوایان لێ دەکەم بە هەموو هێزیانەوە پشتیوانی لە شووراى نیشتمانیی بەرگری بکەن، پشتیوانی لە بەرنامەی ئەو شوورایە بکەنو خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەوە کە لە دوارۆژدا زەربەیەکی نیهایی لەو ڕێژیمە کۆنەپەرستە بدەینو بە یەکجاری گەلانی ئێران لە دەست ئەو دیکتاتۆرییە ڕەشە رزگار بکەین. پەیامی من بۆ گەلی خەباتگێڕی کورد ئەوەیە کە هەروەك رابردوو دیسانەکە ئالآی خەباتی خۆی بۆ رزگاریی ئێران لە ژێر نەنگی ئیستبدادی ڕەشی قروونی وستایی بەرز رابگرێ، لەو خەباتەدا دڵنیا بێ کە گەلانی ئێران پشتیوانیی لێ دەکەن ئەو شانازییە کە نەسیبی بووە کە کوردستان بۆتە سەنگەری ئازادیی ئێران ئەو شانازییە وەك مەسئوولییەتێکی تاریخی وەئەستۆی خۆی بگرێو ئەو واقیعییەتە بخاتە بەرچاو کە خەبات بۆ خودموختاری لە کوردستان، بۆ دێموکراسی لە ئێران، هەر لەو کاتەدا خەباتە بۆ پێشکەوتنی بەشەرییەتو بۆ ئازادیی هەر نەبێ ٣٦ میلیۆن ئینسان لە ژێر چنگالی یەکێك لە ڕەشترین دیکتاتۆرییەکانی تاریخی بەشەری. پەیامم بۆ پێشمەرگەکانی کوردستانی ئێرانو بەتایبەتی بۆ پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستان ئەوەیە کە قارەمانانە، مەسئوولانە هەر وەك رابردوو لە سەنگەری خۆیاندا قایم رابوەستن ئەو ڕێژیمە کە هەراو هوریایەکی زۆری ساز کردوە ڕێژیمێکی هیچو پووچە، ڕێژیمێکی بەتاڵە، ڕێژیمێکە کە دوارۆژی نیەو دەبێ بڕووخێو با ئەو شانازییە بۆ پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بمێنێتەوە کە لە رووخاندنی ئەو ڕێژیمەدا دەستێکی بالآیان هەبووەو با ئەو شانازییە بۆ گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا بمێنێتەوە کە پێشڕەوی گەلانی زۆرلێکراوی ئێران بووە بۆ لە نێوبردنی ڕێژمێك کە هەروەها کە گوتم نەنگی تاریخی ئێرانە. هەر لەبەر ئەوە داوا لە هەموو ئەرتەشییەکانی نیشتمانپەروەر تەنانەت لەو پاسدارانە کە رۆژێك ڕەنگە چووبن بووبن بە پاسدار کە پێیان وابوو دیفاع لە گەلانی ئێران، لە شۆڕش، لە حەقانییەتی زەحمەتکێشان دەکەن لە هەموویان داوا دەکەم کە ئیحساسی مەسئوولییەت بکەن. شەڕکردن دژی گەلی کورد شەڕکردن دژی هەموو گەلانی ئێرانە، شەڕکردن لەواقیعدا دژی ئیستقلالو ئازادیی ئێرانە، ئەگەر بەڕاستی

ئیستقلالو ئازادیی ئێرانیان خۆش دەوێ ئەگەر بەڕاستی دەیانەوێ دوارۆژی ئازادیی ئێران تەئمین بکەن، پێکەوە لەگەڵ پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، پێکەوە لەگەڵ هەموو گەلی کورد، چەکی خۆیان دژی رێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی ئاراستە بکەنو پێکەوە کارێکی وابکەن کە نەك هەر نەبنە هۆی ئەوە کە خوێنی میللەتی کورد بڕێژن، بەڵکوو ببنە هۆی ئەوە کە هەرچی زووتر ئەو رێژیمە بڕووخێو هەموو گەلانی ئێران برایانە لە ژێر سێبەری ئازادیدا پێکەوە بۆ دروستکردنی ئێرانێکی ئازادو ئاباد هاوکاری بکەن.

پ: کاك دوکتور زۆر سپاستان دەکەین کە دەعوەتی ئێمەتان قبووڵ کردو وەلامی پرسیارەکانتان داوە. هیواداریـن لە داهاتوویەکی نێزیکدا سەرکەوتنی شووورای نیشتمانیی بەرگریو رووخانی رێژیمی دژیگەلیی خومەینی، دێموکراسی لە ئێران دامەزرێو خودموختاریی کوردستان دابین بکرێ، رێگا بدەن سڵاو بنێرین بۆ خەباتگێڕانی گیانبازی ئێرانو پێشمەرگە قارەمانەکانو دروشمی شووورای نیشتمانیی بەرگری دووپات بکەینەوە کە "بمرێ خومەینی"، "بڕووخێ رێژیمی دژی گەلیو کۆنەپەرستی خومەینی".

# پەیامی سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران
# بە بۆنەی
# هێرشی دڕندانەی ڕێژیمی خومەینی بۆ سەر خەڵکی کوردستان*

هاونیشتمانانی خۆشەویست!
گەلانی بەشەرەفی ئێران!
خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان!

سڵاوێکی گەرمتان پێشکەش دەکەم.

هەمووتان دەزانن کە ڕێژیمی کۆنەپەرستو دژی گەلیی خومەینی ڕێژیمێکی شەڕفرۆشو خوێنمژە. بەڕاستی تاقیکردنەوەی ئەم چەند ساڵە نیشانی داوە کە خومەینیو ڕێژیمەکەی بێشەڕو بێ وڵات وێرانکردنو بێ کوشتاری خەڵکی بێدیفاع ناژین. ئێستاش ئەوە چەند ڕۆژە ڕێژیمی ئاخووندی هێرشێکی پانو بەرینی تازەی دژی کۆمەلانی زەحمەتکێشی خەڵکی کوردستان دەست پێ کردوە. ڕێژیمی خومەینی کە لە هەموو جەبهەکانی دەرەوەو نێو وڵاتدا تووشی شکست بووە پێویستی بە سەرکەوتن هەیە، پێی وایە بە بەسیج کردنی چەند هەزار کەس دەتوانێ ئەو سەرکەوتنە لە کوردستاندا وەدەست بێنێ. هەر بۆیە دەستی داوەتە پانو بەرینترینو دڕندانەترین هێرشی خۆی. ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان بە تۆپو هێلیکۆپتێرو تەیارە

---

* ئەم پەیامە لە ڕۆژنامەی "کوردستان" ژمارەی ٨٦، لە خەرمانانی ١٣٦١دا بلاّو کراوەتەوە.

دەکوتێ، گوندەکان وێران دەکا، خانووی زەحمەتکێشان دەڕووخێنێو لە سەر هەموو ئەم کردەوە دژی ئینسانی‌یانە ناوی ئیسلام دادەنێ.

هێرشی ئێستای ڕێژیمی خومەینی دوا پەلەقاژەیەتی بۆ جێگیرکردنی خۆی لە کوردستاندا. بەلاّم هەلومەرج لە هیچ بارێکەوە بۆ ڕێژیم لەبار نیە. لە بەر شەڕی کوردستانو شەڕی عێراق ڕێژیم لەباری نیزامی‌یەوە زۆر کزتر بووە. ئەگەر جاران ئەرتەشی‌یەکان ڕۆحیەیان نەبوو، ئێستا پاسدارو بەسیجیش ڕۆحیەی نەماوە.

ڕێژیم تەنانەت لە باری تەقەمەنی قورسیشەوە لە تەنگانە کەوتوە. لە هەمووان گرینگتر زۆربەیزۆری دانیشتوانی ئێران دژی ئەو ڕێژیمەو دژی هێرشەکەی بۆ سەر کوردستانن.

ئێمە دلّنیاین کە ئەم هێرشە وەك هەموو پەلامارەکانی پێشوو تێك دەشکێو دوژمن بە سەرشۆڕی پاشەکشە دەکا. بەلاّم بۆ ئەم مەبەستە پێویستە کۆمەلاّنی میلیۆنیی خەلّکی کوردستان ڕاپەڕنو بە دڵو بەگیان دیفاع لە ئازادیو مەوجوودییەتی خۆیان بکەن. ڕێژیمی خومەینی درۆ دەکا ئەگەر وەها دەنوێنێ کە گۆیا لەگەلّ حیزبی دێموکراتی کوردستان شەڕ دەکا، شەڕی خومەینی لەگەلّ هەموو خەلّکی کوردستانە. خومەینی ڕقی لە کوردستانە. چونکە موسلّمانو ویلایەتی فەقیهی خومەینی کە ئیستبدادو سەرەڕۆیی سەدەکانی نێوەنجی زیندوو دەکاتەوە، قبوولّ نیە. خومەینی ڕقی لە خەلّکی کوردستانە چونکە کوردنو لە ڕۆژەکانی پاش سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێرانەوە بوون بە دڕکی چاوی خومەینی. خومەینی ڕقی لە خەلّکی کوردستانە چونکە ئازادیو دێموکراسیان دەوێ، خومەینیش لە ئازادی هەراسانە. چونکە دابینبوونی ئازادی لە ئێراندا مانای ڕووخانی ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی‌یە. خومەینی ڕقی لە خەلّکی کوردستانە چونکە خودموختاریی دەوێ. جێبەجێ بوونی خودموختاری یانێ پووچەلّبوونی ئیستبدادی ویلایەتی فەقیهیو تێكڕووخانی بناخەکانی ڕێژیمی خومەینی. بۆیە خومەینی دەیهەوێ گەلی کورد لەنێو بەرێ هەر بۆیەش شەڕی خەلّکی کوردستانو ڕێژیمی خومەینی شەڕی مانو نەمانە.

بەرامبەر بە هێرشی دڕندانەی ڕێژیمی خومەینی تەنیا یەك ڕێگا هەیە، ئەویش ڕاوەستانو بەربەرەکانێ کردنو هێرش بردنە. بۆیە دەفتەری سیاسی بڕیاری دا کە لە

ڕۆژی ٢٠ی مانگی خەرمانانی ١٣٦١ەوە تا ٢٠ی مانگی ڕەزبەری ١٣٦١ مانگی دیفاع لە ئازادیو مەوجوودییەتی گەلی کورد ئیعلان بکا.

هەروەها دەفتەری سیاسی بڕیاری دا فەرماندەریی گشتیی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دابمەزرێنێ کە سەرپەرستیی بەڕێوەبردنی کاروباری دیفاع لە کوردستان بە عۆدە بگرێ. ئێمە ئیمانمان هەیە ئەگەر لەم هەلومەرجە ناسکەدا خەڵکی کوردستان وەك جاران لە مەیدانی خەباتدا ئامادە بنو دیفاع لە بوونو ژیانو دواڕۆژی خۆیان بکەن، ئەگەر حیزبەکەمان وەك ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕ ئەرکی ڕێکخستنو بەڕێوەبردنی جوولانەوە بە چاکی جێبەجێ بکاو ئەگەر پێشمەرگە قارەمانەکان ئازایانە لە سەنگەری شەرەفدا دیفاع لە بەشی ئازادکراوی نیشتمان بکەن، بێگومان ئەم جارەش وەك جارەکانی پێشوو هێرشی دوژمن تێك دەشکێو خەڵکی کوردستان سەردەکەوێ.

بۆ دابینکردنی ئەم سەرکەوتنە پێویستە:

هەموو خەڵکی کوردستان لە گشت ناوچەکاندا بۆ دیفاع لە ئازادیو شەرەفی خۆیان بەسیج بکرێن. کچو کوڕ، ژنو پیاو، گەنجو پیر هەموو پێکەوە دەبێ لەم دیفاعەدا بەشدار بن، تەنانەت نابێ یەك کوردی بەشەرەفیش تەماشاچی بێو لە یارمەتیدان بە دیفاعو شەڕ خۆی دوور رابگرێ، بەڵکوو دەبێ بە گیانو بە ماڵ بەشداری لەم خەباتە مێژوویی‌یەدا بکا.

هەرکەس، هەر ئینسانێکی بەشەرەفو ئازادیخواز کە چەکی پێ هەڵدەگیرێ دەبێ دەست بداتە چەكو دیفاع لە ناموسو شەرفی خۆیو ئازادیی ولاتەکەی بکا.

مەسئوولانو ئەندامانی حیزب دەبێ هەموو کاتێك لە نێزیك سەنگەری پێشمەرگەو مەیدانی شەڕدا بنو پشتی "جبهە" لە باری تەداروکاتەوە دابین بکەن. ورەی خەڵکی بەرز رابگرن، سیاسەتی فڕوفێڵی دوژمن ریسوا بکەنو خەبەرە درۆکانی دەزگای تەبلیغاتیی ڕێژیمی خومەینی ئیفشا بکەن.

کادرەکانی حیزبی لە هەر بەشێك کار دەکەن، چ کۆمەلایەتی بێ، چ تەشکیلاتی بێو هی دیکە، دەبێ هێزو ئیمکانی خۆیان بۆ "جبهە"و بەهێزتر کردنی "جبهە" تەرخان بکەن. ئەمڕۆ ئیدی بەهێز کردنی "جبهە" تەنیا کاری بەشی پێشمەرگە نیە، کاری هەموو مەسئوولانو ئەندامانی حیزبە.

ئەندامانی هێزی بەرگریی میللی دەبێ بە شێوەیەکی ڕێكوپێكو لە ژێر ئەمری فەرماندەکانی خۆیاندا لەگەڵ هێزی پێشمەرگە هاوکاری بکەنو ئەو ئەرکانە کە بە موشەخەسی بۆیان دیاری کراون بە جێ بهێنن. هێزی بەرگری ئەمجارەش دەبێ نیشان بدا چ هێزێکی بێپایانە.

هێزی پێشمەرگە دەبێ تاکتیکی پەلامار بردنی بەکار بێنێو ڕێگاو مۆڵەت نەدا کە دوژمن هێزی خۆی کۆ بکاتەوەو پێشڕەوی بکا. پێشمەرگە قارەمانەکان نابێ مەجالی سرەوتن بە هێزی دژمن بدەن. دەبێ هەموو ڕۆژێ زەبری توندترو کاریتر لە دوژمن بوەشێنن. تەنیا تاکتیکی دیفاعی بەکارهێنان، کارێکی دروست نیە، زەبر وەشاندن ئەسڵێکی هەرە گرنگی شەڕی پارتیزانییە.

خەڵکی هەموو گوندەکانی کوردستان دەبێ شەوانە کێشکی گوندی خۆیان بکێشنو ئەوپەڕی وریایی بەرامبەر بە جاسووسەکانو بەکرێگیراوەکانی دوژمن نیشان بدەن. شووراکانی دێیەکان دەبێ سەرپەرستیی ئەم کارە بکەن. هەروەها شووراکانی دێ دەبێ هەموو وەختێك ئامادە بن بۆ کۆکردنەوەی خواردەمەنیو شتومەکی پێویست بۆ پێشمەرگە. پێشمەرگە لە سەنگەردا نابێ موحتاجی هیچ شتێك بێ.

ئەندامانی یەکیەتیی لاوان دەبێ وەك جاران لە ریزی پێشەوەی دیفاع لە ئازادیدا بنو لە هەموو بارێکەوە یارو یاریدەدەری ڕێکخراوی حیزبو هێزی پێشمەرگە بن. ئەندامانی یەکیەتیی لاوان پێویستە کچانو کوڕانی گوندەکان بۆ بەشداری لە یارمەتی بە پێشمەرگەدا هان بدەن.

مامۆستایانی ئایینی دەبێ خەڵك تێبگەیەنن کە خومەینی بە ناوی ئیسلام کارێك دەکا کە هیچ کافرێك نەیکردوە، پێویستە جینایەتەکانی ڕێژیمی خومەینی بۆ هەموو خەڵك ڕوون بکرێنەوە. مامۆستایانی ئایینی دەبێ ئەسڵی ویلایەتی فەقیە وەك نەزەرێکی کۆنەپەرستانەو دژی ئیسلامی ڕەت بکەنەوەو کۆمەلانی خەڵك بۆ دیفاع لە ئازادیی نیشتمانی خۆیان هان بدەن.

مامۆستایانی شۆڕش لە مانگی دیفاع لە ئازادیدا دەبێ کاری کادرێکی شۆڕشگێڕ بکەن. لە باری فیکرییەوە خەڵکی ڕێنوێنی بکەنو بە کردەوە لەگەڵ کۆمەلانی خەڵکی زەحمەتکێشدا بن.

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

بە کورتی تەواوی خەڵکی کوردستان دەبێ هەموو هێزو تواناو ئیمکانی خۆیان بۆ "جبهە" تەرخان بکەن، "هەموو شتێك بۆ جەبهەو هەموو ئیمکاناتێك بۆ سەنگەر" ئەوەیە شوعاری ئەمڕۆی سەرانسەری کوردستان.

هەروەها بەم بۆنەوە داوا لە کۆمەڵە دەکەین کە لە ئەرکی پیرۆزی دیفاع لە ئازادیی کوردستاندا بەشدار بیو لەم هەلومەرجە ناسکەدا بەشی خۆی لەو مەسئوولییەتە تاریخی‌یە بە عۆدە بگرێ.

داوا لە هەموو ڕێکخراوەکانی شۆڕشگێڕی ئێران، لە سازمانی موجاهێدینی خەلقو لە هەموو ڕێکخراوو شەخسییەتەکانی ئەندامی شووڕای نیشتمانیی بەرگریو هەموو هێزەکانی نیشتمانی دەکەین کە ئەرکی سەرشانی خۆیان نیسبەت بە گەلی زۆرلێکراوی کورد بەجێ بهێننو لە هەر جێگایەکو بە هەر شێوەیەك دەتوانن زەربە لە هێزە چەکدارە بەکرێگیراوەکانی خومەینی بدەن. ڕێگای تەداروکاتی ڕێژیم بۆ کوردستان بەربەست بکەن، خەتی ئێرتباتاتی ببەستنو بە کورتی نیشان بدەن کە ئامادەن یارمەتیی سەنگەری ئازادیی ئێران، (کوردستان) بدەن. لە بیروڕای گشتی جیهانی، لە هەموو ڕێکخراوەکانی دێموکراتیو بەشەردۆستی دنیا، لە هەموو هێزەکانی شۆڕشگێڕی گشت وڵاتان داوا دەکەین دەنگی بێزاریی خۆیان دژی ئەم جینایەتە گەورەیەی ڕێژیمی خومەینی هەڵێننو یارمەتیی ئینسانیو دەرمانی بە خەڵکی کوردستان بگەیەنن.

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

گەلی کورد لەمێژە ئیسباتی کردوە کە عاشقی ئازادی‌یەو لە ڕێگای ئازادی‌دا ئامادەی هەر چەشنە فیداکاری‌یەکە. ئێمە دڵنیاین کە خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان ئەمجارەش هێرشی دڕندانەی ڕێژیمی خومەینی تێك دەشکێنێ. لە بەر فیداکاریی ڕۆڵە نەبەزەکانو لە بەر قارەمانەتیی پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، حیزبی خۆشەویستی گەلی کورد، جارێکی‌تر دەبێتە نموونە بۆ هەموو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان. بێگومان ئەمجارەش حیزبی ئێمە، حیزبی شەهید پێشەوا قازی محەممەد، مەسئوولییەتی تاریخیی خۆی بەجێ دێنیو گەلی کورد بەرەو ئازادیو بۆ وەدیهێنانی دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان ڕێنوێنی دەکا.

## ١٨٠ □ پەیام بە بۆنەی هێرشی دڕندانەی ڕێژیم

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

با هەمووومان پێکەوە بە خوێنی ئەو ڕۆڵە خۆشەویستانەی گەل کە گیانی خۆیان لە ڕێگای ئازادیدا بەخت کرد، بە خوێنی شەهیدانمان سوێند بخۆین کە تا سەرکەوتنی یەکجاری ڕێگایان بەر نادەین.

داوای خۆشیو سلامەتی بۆ گوێگرە خۆشەویستەکانو داوای سەرکەوتن بۆ گەلی کوردو هەموو گەلانی ئێران دەکەم.

سەرکەوێ خەباتی قارەمانانەی خەڵکی کوردستان

بڕووخێ ڕێژیمی کۆنەپەرستو دژیگەلیی خومەینی

سەرکەوێ شووڕای نیشتمانیی بەرگری بۆ هێنانە سەرکاری ڕێژیمێکی دێموکراتی لە ئێراندا.

# وتوویژی رادیۆی دەنگی کوردستانی ئێران لەگەڵ کاک دوکتور قاسملوودا*

پ: کاك دکتور پێشەکی سوپاست دەکەین کە قبووڵت کرد لەم وتوویژەدا بەشدار بیو لە ڕێگای رادیۆ دەنگی کوردستانەوە نەزەری خۆت لەسەر وەزعی ئێستای وڵات بە خەڵکی کوردستانو هەموو گوێگرە بەڕێزەکانی رادیۆ رابگەیەنن.

و: منیش سوپاسی رادیۆ دەنگی کوردستان دەکەم کە جارێکی دیکە فورسەتی دامێ لەگەڵ گوێگرە خۆشەویستەکانی قسە بکەم.

پ: پرسیاری یەکەمان ئەوەیە کە دوارۆژی رێژیمی خومەینی چۆن دەبینن؟

و: لە پێشدا سڵاو لە گوێگرە خۆشەویستەکان دەکەمو هیوام ئەوەیە کە هەموو بە خۆشیو ساغیو سڵامەتی بژین. رێژیمی خومەینی لە وەزعێکی زۆر شپرزەدایە، بە پێچەوانەی ئەوە کە دەیهەوێ بە هۆی دەزگای تەبلیغاتیی خۆیەوە نیشان بدا وەزعی رێژیمی خومەینی لە باری سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتیو نیزامییەوە بەڕاستی زۆر شپرزەیە. لێرە من پێموایە کە رێژیمی خومەینی کە لە زۆر جەبهەی سیاسیدا لە جەبهەی ئابووریدا، لە جەبهەی کۆمەڵایەتیدا، لە جەبهەی نیزامیدا، تووشی شکست بووە. ئێستا پێویستیی بە سەرکەوتن هەیەو هەوڵ دەدا هەرچۆنێك بێت تەنانەت بە قسەش لەسەر رادیۆو رۆژنامەکان ئەو سەرکەوتنە وەدەس بخا. ئەوە خۆی بە نەزەری من نیشانەی زەعفی ئەو رێژیمەیە، من رێژیمی خومەینی، ئێستا لە

* ئەم وتوویژە لە ڕێکەوتی ٢٧ی خەرمانانی ١٣٦١دا بڵاو کراوەتەوە.

هەلومەرجی ئێستادا زۆر کزترو زەعیفتر لە پار ئەو دەمانـە دەبینمو پێم وایـە بـە کردەوەکانی خۆیو بەو سیاسەتەی کە ئێستا ڕێژیمی خومەینی گرتوویەتیە پێش بەرەو رووخان دەڕواو هێندێ کاری واش دەکا کە ئـەو رووخانـە هـەرچی خێراتر جێبـەجێ ببێت. بۆیە ئەمن ڕێژیمی خومەینی کـە ڕێژیمی شـەڕو بوحرانـە بـە ڕێژیمێکـی کزو زەبوونو بێچارە دەزانمو پێم وایە کە خەباتی گەلانی ئێران بەتایبەتی خـەباتی گـەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا دەبێتە هۆی رووخانی ئەو ڕێژیمە لە دوارۆژێکی نێزیکدا.

پ: زۆر سوپاس کاك دوکتور، تکایە بفەرموون بە نەزەری ئێوە ئاکـامی هێرشـی ئەم جارەی ڕێژیمی ئاخوندی بۆ سەر کوردستانی قارەمان بە کوێ دەگا؟

و: ئەمە یەکەم هێرشی ڕێژیمی خومەینی بۆ سەر کوردستان نیە. ڕێژیمی خومـەینی هەتا ئێستا چەند جار هێزی خۆی کۆ کردوەتەوەو هێرشی هێناوەتە سەر گەلی کـورد لە کوردستانی ئێراندا، هەموو جاریش هێرشەکەی تێکشکاوە، ئەم جارە ڕێژیـم زۆری هەوڵ داوە کە هێزێکی زیاتر بۆ سەر کوردستان بنێرێو بە راستیش لـە سەرتاسـەری ئێران، ئەوەندە پێی کـراوە بەسیجو پاسـدارو ئەرتەشـیو ژانـدارمو جاشو هـەرچی خزمەتکاریەتی هەمووی هێناون بۆ کوردستان، بۆ ئەوە ئەم جارە هـەروا کـە عـەرزم کردن سەرکەوتنێکی وەدەست بێنێ، چونکە زۆر پێویستی بە سەرکەوتن هەیە، بـەڵام بە خۆشیەوە دەتـوانم بڵێم کـە یەکـەم رۆژەکـانی هـێرش کـە چـەند رۆژە دەسـتی پێکردوەو بەتایبەتی لە رۆژی ٢٥ی مانگی خەرمانان لە چەند جبهەوە ڕێژیم هێرشـی هێناوەتە سەر پێشـمەرگەکانی کوردسـتانو سـەر خـەڵکی کوردسـتان، دەتـوانم بـە خۆشیەوە بڵێم کـە ئـەو هێرشـە تێکشـکاوە. پێشـمەرگە قارەمانـەکانی ئێمـە بـە پشتیوانیی حیزبەکەمانو بە پشتیوانیی هەموو گەلی کـورد توانیویانـە زەربـەی زۆر توند لە دوژمن بدەنو لە جەبهەکانی پیرانشار، جەبهەی سەردەشت، جەبهەی بۆکـانو لە زۆر جێگای دیکە، جەبهەی نەغەدەو هەموو کوردستان نەهێڵن دوژمـن تەنانـەت بستێکیش بێتە پێش. ڕێگام بدەن بە ناوی حیزبی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێرانـەوە سوپاسـی هـەموو پێشـمەرگەکانی قارەمـانی کوردسـتان، پێشمەرگەکانی حـیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بکەم کە ئازایانەو پیاوانە لە سەنگەردا وەستاونو نـەك هەر هێرشەکانی دوژمن رەد دەکەنەوە بەڵکوو ئازایانە هێرش دەبەنـە سـەر دوژمـنو دڵنیامو هیواداریشم کە لە رۆژەکانی ئایندەدا زەربەی زۆر توندتر لە ڕێژیمو لـە هـێزە

چەکدارەکانی ڕێژیم بدەن. هەر وەها بەڕاستی ئەو کارەی کە هێزی بەرگری لەو ماوەیەدا کردوویەتی، هەروەها یەکیەتیی لاوان، جێگای سوپاسەو هیوام ئەوەیە کە هەموو خەڵکی زەحمەتکێشی کوردستان هەروەها کە لە پەیامی دەفتەری سیاسیدا چەند حەوتوو لەوەو پێش داوایان لیٚ کرابوو، هەروا ئامادە بن، وریا بن، جاریٚ ڕێژیم بە تەواوی تێك نەشکاوە، لەوانەیە هێرشی دیکەش بێنێتە سەرمان دەبیٚ ئامادە بین زەربەی لیٚ بدەین‌و هەر هێرشێکی کە جارێکی دیکە دێتە سەرمان بەتەواوی تێکی بشکێنین‌و تەفرو توونای بکەین.

پ: زۆر سوپاس. کاك دوکتور هەر وەك ئاگاردارن پزیشکەکانی نەخۆشخانەی حیزب پەردەیان لە سەر جینایەتێکی تازەی ڕێژیمی خومەینی هەڵداوەتەوەو ئاشکرایان کردوە کە ئەو ڕێژیمە لە شەڕەکانی ئەم دواییەی کوردستاندا کەڵکی لە بومبی فۆسفۆری وەرگرتوە، لەو بارەیەوە نەزەرتان چیەو بەکارهێنانی مەوادی شیمیایی بە نیشانەی چی دادەنێن؟

و: بەڵیٚ ئەو خەبەرەمان پیٚ گەیشت، نەك هەر پزیشکەکانی خۆمان بەڵکو ئەو پزیشکە فەرانسەوییانە کە لە لایەن یارمەتیی پزیشکی نێونەتەوەیی‌یەوە هاتوون‌و یارمەتیی خەڵکی کوردستان دەدەن، گۆیا ئەوانیش ئەوەیان کەشف کردوە کە ڕێژیم بەڕاستی لە شەڕی خۆیدا مەوادی شیمیایی بەکار دێنیٚ بۆ سەرکوت کردنی جووڵانەوەی ڕەواو دێموکراتی گەلەکەمان. هەروەها کە دەرکەوتوە لە ڕۆژی ٢٥ی مانگدا پزیشکەکان ئەوەیان کەشف کردو ئێستاش زۆر بریندارمان هەیە لە نەخۆشخانەی حیزب کە بە چەکی بڵێین فۆسفۆری بریندار کراون، ئەوە چەکێکی شیمیایی‌یە، بەکارهێنانی چەکی شیمیایی لە لایەن هەموو سازمانەکانی نێونەتەوەیی‌یەوە قەدەغە کراوە. دەبیٚ داوا بکەین‌و داواشمان کردوە کە سەلیبی سووری جیهانی‌و هەموو ڕێکخراوەکانی ئینسان‌دۆست بێن بە چاوی خۆیان ببینن کە ئەو ڕێژیمە کۆنەپەرستە چ دەکاو ئەو ڕێژیمە ریسوا بکەن. زیاتر لەوە کە هەتا ئێستا ریسوا بووە بە ئەفکاری عموومیی جیهانی نیشان بدەن کە بەڕاستی ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی بۆ پاراستنی خۆی لە هیچ جینایەتێك درێغ ناکا، بەڵام لە عەینی وەختیشدا دەبیٚ ئەوە بڵێم کە ئەو کارە یەعنی بەکارهێنانی چەکی شیمیایی دژی گەلی کورد نیشانەی زەعفی هەرە گەورەی ئەو ڕێژیمەیە، نیشانەی ئەوەیە کە ئەو

ڕێژیمە بەڕاستی هیچ وەسیلەیەکی دیکەی بە دەستەوە نەماوە، نیشانەی ئەوەیە کە ڕێژیمی خومەینی هەموو وەسیلەکانی خۆی هەموو ئیمکاناتی خۆی بەکار هێناوە، ئەو جارە گەیشتوەتە بەڕاستی بن. ئەوەندە ئەمن بزانم چەکی شیمیایی تەنیا ئامریکاییەکان لە ئاخری شەڕی خۆیاندا، ئیمپریالیزمی ئامریکا لەو وەختەدا کە بەتەواوی هاتبوو لە ویتنام بشکێ چەکی شیمیایی دژی میللەتی ویتنام بەکار هێناو ئەوە دیارە ڕێژیمی خومەینی هەروەها کە دەرکەوتوەو ئیسباتیش بوە ڕێژیمێکی سەر بە ئیمپریالیزمی ئامریکایە، ڕێژیمێکە کە بە چەکی ئیسرائیلی شەڕمان لەگەڵ ئەکا. ئەو ڕێژیمەش هەر شوێنی ئیمپریالیزمی ئامریکای هەڵگرتوەو دەیهەوێ بە چەکی شیمیایی شەڕمان لەگەڵ بکا. من لێرەدا ئەو کارە بە ناوی حیزبەکەمانو بە ناوی میللەتی کورد مەحکووم دەکەمو داوا لە هەموو گەلانی ئێران لە هەموو سازمانەکانی ئینساندۆست دەکەم کە ڕێژیمی خومەینی جارێکی دیکە مەحکووم بکەنو ئەو کردەوەیو ئەو جینایەتەی بەتەواوی لە لایەن هەموو ئەفکاری عوموومی جیهانییەوە مەحکوم بکرێو هەر لەو کاتەشدا بەڵێنی دەدەم بە گەلی کورد کە نە بەو جینایەتانە نە بە بەکارهێنانی چەکی شیمیایی، ڕێژیمی خومەینی ناتوانێ خۆی ڕزگار بکاو ئەم جارە تووشی شەڕێکی توندو تیژ بووە لە کوردستانداو ئێمە دڵنیاین کە لەو شەڕەدا دەشکێ، تەفرو توونا دەبێ. تێك شکانو تەفرو توونا بوونی لە کوردستاندا سەرەتای تێك شکانو تەفرو توونابوونی لە سەرانسەری ئێرانە.

**پ:** زۆر سوپاس. کاك دوکتور هەر وەك دەزانین ڕێژیمی خومەینی ئەم جارە شەڕی مانو نەمانی بەسەر گەلی کورددا سەپاندوە، ئێوە کە لە پەیامی رادیۆیی ڕۆژی ٢١ی خەرمانانی خۆتاندا بەوردی ئەرکی چینو توێژو دەستەو تاقمەکانی کۆمەڵی کوردەواریتان دیاری کردبوو ئامۆژگاریو پەیامێکی تازەتان بۆ خەڵکی کوردستان هەیە؟

**و:** هەروەها کە لە سەرەتای قسەکانمدا گوتم بەڕاستی جێی سوپاسە کە ئەو پەیامە لە لایەن هەموو خەڵکی کوردستانەوە بە جیدی وەرگیراو خەڵك لە ژنو پیاوو لە کچو کوڕ، هێزی بەرگری، یەکیەتیی لاوان، ڕێکخراوەکانی حیزبی ئێمە، هێزی پێشمەرگە بەکورتی هەموو خەڵك ئەرکی خۆیان بەتەواویو بە باشی بەجێ دەگەیەنن، بەڵام پێم خۆش بوو لێرەدا بەتایبەتی سوپاسێکی تایبەتیی گشت کچانو ژنانی

کوردستان بکەم، بەڕاستی خۆشکەکانمان لەو چەند ڕۆژەدا نیشانیان داوە کە شانبەشانی براکانی خۆیان ئامادەن بۆ هەموو جۆرە فیداکاریو پێم وایە ئەوە بۆ ئێمە دەبێ ببێتە تەعەهودێك بەرانبەر بە خوشکەکانمان کە لە ڕۆژی تەنگانەدا لە ڕۆژی شەڕدا ئامادەن بۆ هەموو جۆرە فیداکارییەكو ئەوە بەو شێوەیە نیشان دەدەن کە بەرابەرن، حەقی بەرابەریان هەیە لەگەڵ پیاوەکان کە بەڕاستی ئیسباتیان کرد کە لە کوردستاندا تەنیا پیاو نیە کە بەرانبەر بە ڕێژیمی خومەینی ڕاوەستاوە بەڵکوو خۆشکەکانیشمان بەرانبەری ڕاوەستاونو بەم جۆرە هەموو گەلی کورد بە کچو کوڕو بە ژنو پیاوەوە ئامادەی فیداکارین، پێم باش بوو کە ئەو سوپاسە بکەمو هیوادارم کە خوشکەکانمان ئەو خەباتە هەر درێژە پێ بدەن. دیارە پەیامی دیکەم ئەوەیە کە یەکەم هێرشی دوژمن تێكشکاوە، بەڵام ئەوە بە مانای ئەوە نیە کە ڕێژیمی خومەینی کە ڕێژیمێکی خوێنمژەو هێرشێکی دیکە دەکاتە سەرمان، دەبێ وریا بن پێشمەرگەکانمان دەبێ لە سەنگەرەکانیاندا ئامادە بن، نابێ لە هیچ جێگایەك هیچ پێشمەرگەیەك غافڵگیر بێت، غافڵگیربوونی پێشمەرگە هەم خەیانەت بە خۆیەتی هەم خەیانەت بە گەلەکەمان، دەبێ لە هەموو جێگا بە وشیاریو بە وریایی پێشمەرگەکانمان، هێزی بەرگری، یەکێتی لاوان، مامۆستایانی ئایینی، مامۆستایانی شۆڕشو بەکورتی هەموو میللەتەکەمان ئەو مانگەی کە بە مانگی دیفاع لە ئازادیمان ئیعلام کردوە لەو مانگەدا ئامادە بنو دیسانەکە شوعارەکەمان لە جێگای خۆیەتی هەموو کارەکانی خۆمان دەبێ لە لایەکی بنێینو بۆ جەبهە کار بکەین. هەموو ئیمکاناتمان دەبێ بۆ جەبهە بێت، هەموو فیداکاریمان دەبێ بۆ سەنگەر بێ لەبەر ئەوە هیوادارم کە هەر وەك هەتا ئێستا خەڵکەکەمان وشیار بووە لە دوارۆژیشدا وشیار بێ ئەندامانی حیزبەکەمان، ڕێکخراوەکانمان، هێزی پێشمەرگە بە هەموو ئیمکاناتیانەوە بەرانبەر بە دوژمن ڕابوەستنو چونکە ئێستا دوژمن شکستی خواردووە لە ئەوەڵ هێرشی خۆیدا نابێ دەرەتانی بدەنێ، دەبێ لێی بدەن، دەبێ زەربەی وا توندی لێ بوەشێنن کە نەتوانێ جارێکی دیکە هێزی خۆی کۆ بکاتەوەو هێرشمان بۆ بێنێتە سەر، هەروەها پێم خۆش بوو سڵاوێکی گەرم بنێرم بۆ هەموو دانیشتوانی شارەکانی کوردستان. شارەکانی کوردستان پشتی جەبهەی دوژمنن کەوابوو لە شارەکانی کوردستان دەکرێ زۆر زەربەی باش لە دوژمن بدرێ، دەبێ هەموو کارەکانی دوژمن ئەوەی کە دەیکا بۆ

ئەوەی جەبهەی خـۆی بـەقووەت بکـا لێیـان تێـك دەیـن. دوژمـن تـەداروکاتی لـە شارەکانەوەیە، دوژمن خۆی لە شارەکان کۆ دەکاتەوە، دوژمن ئازووقەی لـەوێڕا دێ. دەبێ کارێکی وا بکەین نەك هەر لـە دەرەوەی شـار کـە پێشـمەرگەی لێـیـە ڕێگـای لێدەگرێ، زەربەی لێدەدا، لە داخڵی شـاریشدا خرابکـاری بکـەین، هـەرچی پێمـان دەکرێ. ئیـدی ئـەوە دێڵـین بـە ئیبتکـاری هـەموو دانیشـتوانی شـاری کوردسـتان، شارەکانی کوردستان کە تەجروبەیان هەیە بۆخۆیان زۆر لەو مەسـائیلە شـارەزان، بـە ئیبتیکاری خۆیان لە هەر جێگایێ کە دەتوانن دەبێ زەربەی لێ بدەن نابێ لـە بیریـان بچێ کە هەرچەند ئەوان لە شارەکانو هەرچـەند بـە زاهـیر چـەکیان پـێ نیـە بـەڵام پێشمەرگەن، وەك پێشـمەرگە لـە سـەنگەردانو دەبـێ ئـەرکی خۆیـان بـۆ تێکدانـی نەخشەکانی دوژمن بۆ گەیاندنی ئەخبار بـۆ پێشـمەرگە بـۆ بەربەسـتکردنی ڕێگـای دوژمن لە هەر ڕێگایەکەوەو بە هەر شێوەیەك کە بتوانن کاری خۆیـان دەبـێ ئـەرکی خۆیان جێبەجێ بکەنو زەربە لە دوژمـن بـدەن لـە ئـاخری قسەکانیشـمدا لـە بـاتی هەموومانەوە ڕێزی شەهیدانی ئـەو چـەند ڕۆژەی خۆمـان دەگریـن یادیـان دەکـەین، سلاویان لێ دەکەین، لەو شەهیدانە کە ئازایانە بەرانبـەر بـە هێرشـی کۆنەپەرسـتی، بەرانبەر بە هێرشی ڕێژیمی خوێنمژی خومەینی ڕاوەستان تا گیانی خۆیان لـە ڕێگـای ئازادیی کوردستاندا بەخت کرد. ڕێگای ئەوان ڕێگای ئێمەیە. هەر وەختێك لـە هـەر جێگایەكو لە هەر سەنگەرێکیدا بین دەبێ ئەوەمان لە بیر بێ کە ڕێگای شـەهیدانمان نابێ بەر بدەینو هەتا سـەرکەوتنی دوایـی لـەو ڕێگایـەدا دەبـێ بچینـە پێـش. زۆر سوپاستان دەکەم.

پ: زۆر سوپاست دەکەین کاك دوکتورو هیوادارین هەمیشە ساغو سلامەت بـیو لە ڕێگای خزمەتکردن بە ئامانجەکانی گەلی کورددا سەرکەوتوو بی.

# پەیامی رادیۆیی کاك دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو به بۆنەی مانگی هێرش*

**هاونیشتمانانی بەڕێز!**
**گەلانی به شەرەفی ئێران!**
**خەڵکی کۆڵنەدەری کوردستان!**

له کانگای دڵمەوە سلاوێکی گەرمتان پێشکەش دەکەمو هیوام خۆشیو سلامەتیی هەمووتانو سەرکەوتنی خەباتی رەوای گەلی کوردو هەموو گەلانی ئێرانە. هەروەها با هەموومان پێکەوە سلاو بنێرین بۆ شەهیدانی رێگای رزگاریی کوردستانو سەرانسەری ئێران. ئەوانەی که گیانی خۆیان بەخت کرد بۆ ئەوە نیشتمانەکەمان ئازادی وەدەست بێنیو گەلەکەمان به ئازادی بژی.

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

ئەوە مانگی دیفاع له ئازادیو مەوجوودییەتی گەلی کورد خەلاس بوو. هەرچەند دوژمن هێزێکی زۆرو دەیان هەزار بەکرێگیراوی خۆی بۆ لەنێو بردنی ئازادیی خەڵکی کوردستانو بۆ سەرکوتکردنی جوولانەوەی دیموکراتیو نیشتمانیی کوردستانو هێرشێکی دڕندانەی بۆ سەر گەلی زەحمەتکێشی کورد هێنابوو بەلام سەرنەکەوتو نەیتوانی بەربەرەکانی هێزی پێشمەرگەو هێزی بەرگریو هێزە پشتیوانەکانو هەموو گەلی کورد تێك بشکێنێ. سەنگەری ئازادیی ئێران خاکی پاکی کوردستان هەر

* ۲۱ی رەزبەری ۱۳٦۱

ئازادەو ئازادیش هەناسە دەکێشێ. تەنیا کارێك کە دوژمنی زەبوون پێی کرا تۆپباران کردنی گوندەکانو وێرانکردنو سوتاندنی ماڵەکانو کوشتنو بریندارکردنی خەڵکی بێدیفاع بوو، بە دەیان ژنو منداڵ شەهید بوونو بریندار کران، هەزاران کەس لە خەڵکی گوندەکان ئاوارە بوون. بەڵام ئازایانە بەرانبەر بە هێرشی دوژمن راوەستانو خەبات هەر درێژەی هەیە. بەڕاستی خەڵکی کوردستان نیشانیان دا کە نیشتمانو ئازادیی خۆیان خۆش دەوێ. بەڕاستی زەحمەتکێشانی کوردستان ئیسباتیان کرد کە بۆ دیفاع لە شەرەفو مافی ئینسانیی خۆیان ئامادەی هەموو چەشنە فیداکارییەکن. بەڕاستی پێشمەرگە نەبەزەکان جارێکی دیکە دەریان خست کە بۆ پاراستنی ناموسو ئازادیی میللەتەکەیان ئامادەی خۆ بەخت کردنن. بەراستی هێزی بەرگری سەلماندی کە لە رۆژی تەنگانەدا یارو یاریدەدەری پێشمەرگەیە. بەڕاستی یەکیەتیی لاوان سابتیان کرد کە هەموو وەختێك لە ریزی هەرە پێشی خەباتدان. بەڕاستی ژنانی کوردستان نیشانیاندا کە لە هیچ تەنگو چەڵەمەو کەندو کۆسپێك باکیان نیەو لە جووڵانەوەی دیموکراتیی گەلەکەماندا چالاکانە بەشدارن. بەڕاستی خەڵکی شارو گوندەکانی سەرانسەری کوردستان بەناردنی یارمەتیو بە پشتیوانی هەمە چەشنە، یەكپارچەییو یەکگرتوویی خۆیان لە ژێر دروشمەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستاندا بە خەڵکی ئێرانو سەرانسەری جیهان راگەیاند. بە کورتی جێگای شانازییە کە دروشمی "هەموو شتێك بۆ جەبهە" و "هەموو ئیمکاناتێك بۆ سەنگەر" بوو بە شوعاری سەرانسەری کوردستان. بۆیە رێگام بدەن لە لایەن دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە سپاسی هەموو خەڵکی کوردستانو بەتایبەتی زەحمەتکێشانی شارو دێ بکەم، سپاسی ئەندامانو کادرەکانی حیزبی دەکەم کە هەموو زانینو لێوەشاوەیی خۆیان بۆ مانگی دیفاع لە ئازادییو مەوجوودییەتی گەلی کورد تەرخان کرد. سپاسی پێشمەرگە کۆڵنەدەرەکان دەکەم کە لە مەتەرێزی شەرەفدا تا دوا هەناسە خەبات دەکەن. سپاسی هێزە پشتیوانەکان دەکەم لە جێگایەکی پێویست بووە لە گەڵ پێشمەرگەکانی حیزب پێکەوە لە سەنگەردا بوون. سپاسی هێزی بەرگری، یەکیەتیی لاوان، مامۆستایانی قوتابخانەکانو مامۆستایانی ئایینی دەکەم کە ئەرکی خۆیان لەم مانگەدا بە چاکی بەجێ گەیاندووە. ئێستا کە مانگی دیفاع لە ئازادی تەواو بووەو دوژمن نەیتوانیوە بە ئامانجی خۆی بگاو تووشی

زۆر شکستی بەرچاو بووە، مانگێکی دیکە کە هەر بە قەد مانگی دیفاع گرینگە دەس پێدەکا. هێرشی دوژمن بەربەست کراوە بەڵام ئەمە کافی نیە ئەم جار نۆرەی هێرشی پێشمەرگەیە بۆیە لە ١٢ی مانگی رەزبەرەوە تا ٢٠ی مانگی خەزەڵوەر مانگی هێرش بۆ سەر دوژمن ئیعلام دەکەین. لەم مانگەدا شوعارەکەمان "هەموو شتێك بۆ جەبهە"و "هەموو ئیمکاناتێك بۆ سەنگەر"، هەر لە جێگای خۆیەتی. ئەندامانو کادرەکانی حیزبیو هەموو خەڵکی کوردستان هێزی خۆیان بۆ لێدانو دەرکردنی بەکرێگیراوانی رێژیمی خومەینی بەکار دێنن. پێشمەرگەکان نەك هەر لە سەنگەرەکانی خۆیانو لە هەموو بستێکی خاکی کوردستان دیفاع دەکەن بەڵکوو لەم مانگەدا لە سەرانسەری کوردستان هێرش دەبەنە سەر دوژمن. دەبێ شەوو رۆژ لە دوژمن بدەن، نابێ رێگای بدەن یەك ساعەتیش ئیستراحەتی هەبێ. دەبێ خومەینیو بەکرێگیراوەکانی تێبگەن کە کوردستان سەنگەری لە گیراننەهاتووی ئازادیی سەرانسەری ئێرانە. دەبێ هەموو جیهان بزانێ کە کوردستان بۆ دوژمنان تەنیا گۆڕستانەو هیچی دیکە. هێزی بەرگریو یەکیەتیی لاوان دەبێ لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی خۆیاندا بەردەوام بن. قوتابخانەکان دەبێ بکرێنەوەو مامۆستاکان خەریکی فێرکردنی قوتابییەکان بن. یارمەتیدان بە پێشمەرگەکانی حیزبو هێزە پشتیوانەکان ئەرکێکی هەرەگرنگو هەرە پیرۆزە. ناردنی شتومەكو خواردەمەنی بۆ سەنگەرەکان هەر دەبێ درێژەی هەبێ.

**هاونیشتمانە خۆشەویستەکان!**

لە مانگی دیفاع لە ئازادی، نیشانمان دا کە گەلێکی زیندوویـنو ئامادەین بۆ ئازادی فیداکاری بکەین بێگومان لە مانگی هێرش بۆ سەر دوژمنیشدا ئیسبات دەکەین کە گەلێکی خەباتگێڕو ئازاینو بۆ دەرکردنی دوژمنی خوێنمژ لە خاکی پاکی کوردستان لە هیچ گیانبازییەك دریغ ناکەین. پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان، هێزی بەرگریی میللی، یەکیەتیی لاوان، ژنو پیاوی شارو گوندەکانی کوردستان بۆ تێکشکاندنی دوژمن، بۆ وەدەرنانی لە خاکی کوردستان راپەڕن کوردستان بکەن بە گۆڕستانی بەکرێگیراوانی خومەینیو نۆکەرانی ئیمپریالیزمی ئامریکاو دارودەستەی خزمەتکاری ئیسرائیل.

هەموو خەڵکی کوردستانو ئازادیخوازانی سەرانسەری ئێران لەگەڵ ئێوەن. جێگای پێ خۆشحاڵ بوونە کە لە مانگی دیفاع لە ئازادیدا بەربەرەکانی دژی رێژیم لە بەشەکانی دیکەی ئێراندا بە تایبەتی خەباتی سازمانی موجاهێدینی خەڵك کە هاوپەیمانی ئێمەیە توندو تیژتر بووەو بێگومان لە دوارۆژدا پتریش پەرە دەستێنێ. رێژیمی خومەینی کزو زەبوونو بێچارەیە، هێرشی بۆ سەر کوردستان دوا پەلەقاژەیەتیو با ئەم پەلەقاژەیە بکەین بە سەرە مەرگیو هەلومەرجی رووخانی ئامادە بکەین. بیرورای گشتیی جیهانی لەگەڵ خەباتی رەوای گەلەکەمانە، ئەگەر وەختێك هیندێ کەس خومەینییان بە شۆڕشگێڕ دادەنا ئێستا کەس نیە خومەینیو رێژیمەکەی بە دژیگەلیو تەنانەت بە دژی ئینسانی دانەنێ بۆیە خەباتکردن دژی رێژیمی خومەینی جێگای شانازییە چونکە تەنیا خەبات بۆ مافی نەتەوەیی گەلی کورد نیە، تەنیا خەبات بۆ ئازادیو دیموکراسی نیە، بەڵکو خەباتە بۆ دیفاع لە ئینسانییەت، خەباتە بۆ گۆڕکردنی رێژیمێکی رەشی سەدەکانی نێوەنجی کە پەڵەیەکی شەرمە لە مێژووی چەند هەزار ساڵەی ئێراندا.

بڕووخێ رێژیمی دژی ئینسانیو سەر بە ئیمپریالیزمیی خومەینی. سەرکەوێ خەباتی گەلانی ئێران بۆ رووخانی رێژیمی خومەینیو هێنانە سەرکاری رێژیمێکی دێموکراتی لە ژێر بەڕێوەبەری شووورای نیشتمانیی بەرگریدا. سەرکەوێ خەباتی خەڵکی کوردستان بۆ تێكشکاندنی هێرشی دڕندانەی رێژیمی خومەینی. نەمان بۆ ئیمپریالیزمی جیهانیو کۆنەپەرستیی نێوخۆ، سلاو لە پێشمەرگە نەبەزەکانی کوردستانو هێزە پشتیوانەکانیان.

سلاو لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران رێکخەرو بەڕێوەبەری جووڵانەوەی دێموکراتیو نیشتمانیی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا.

# پەیامی کاك دوکتور قاسملوو لە سەر تەواو بوونی دوو مانگی دیفاعو هێرش*

هاونیشتمانانی بەڕێز!
گەلانی بەشەرەفی ئێران!
خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان!

سڵاوێکی گەرمو شۆڕشگێڕانەتان پێشکەش دەکەمو هیوام ساغیو سڵامەتیو خۆشی ئێوەو سەرکەوتنی گەلانی ئێران بە سەر ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی دایە. بە ناردنی سڵاو بۆ شەهیدانی ڕێگای ئازادیی کوردستانو سەرانسەری ئێرانو بەتایبەتی بۆ شەهیدانی ئەم دواییەی کوردستان قسەکانی خۆم دەست پێدەکەم.

ئەوە زیاتر لە پێنج مانگە هێرشی دڕندانەی ڕێژیمی دژی گەلیی خومەینی بۆ سەر خەڵکی زەحمەتکێشی کوردستان بەردەوامە. سێ مانگە کە خومەینی بە مەبەستی پەرەپێدانی شەڕ لە کوردستان قەرارگایەکی تازەی بە ناوی قەرارگای "حمزە" پێك هێناوە. ڕێژیمی خوێنمژی خومەینی بە هەموو هێزیەوە شەڕی خەڵکی کوردستان دەکا. بە تەیارە، تۆپو تانك هاتۆتە شەڕی گەلێك کە بۆ دیفاع لە شەرەفو ئازادیی خۆی ڕاپەڕیوە. بە سەدان گوند وێران کراون، بە دەیان هەزار ئینسانی زەحمەتکێش ئاوارەی شاخەکان بوون، بە سەدان ژنو منداڵی بێدیفاع کوژراونو بریندار بوون. بەڵام پیلانە ڕەشەکانی ڕێژیم وەدی نەهاتوون.

---

* خەزەڵوەری ١٣٦١ی هەتاوی

**گوێگرانی بەڕێز!**

ئێستا کە من قسەتان لەگەڵ دەکەم، شەڕ لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان هەر بەردەوامە، خەڵکی خەباتگێڕو پێشمەرگە کۆڵنەدەرەکانی کوردستان لە شەرەفو مەوجوودییەتی خۆیانو لە ئازادی سەرانسەری ئێران، قارەمانانە دیفاع دەکەن. ماوەیەکە کاربەدەستانی ڕێژیمی خومەینی هاوار دەکەن کە سەرکەوتنێکی گەورەیان وەدەست هێناوە پیرۆزبایی لە یەکتر دەکەن، نامە بۆ ئیمامی خۆیان دەنووسن، ئیمامی درۆزنیش وەڵامیان دەداتەوەو پتر لە جاران بۆ کوشتاری خەڵکی کوردستان هانیان دەدا. بازاڕی درۆو دەلەسە، بازاڕی ریاکاریو فریودان زۆر گەرمە. بۆ بەهێز کردنی ورەی کزی چەکدارە بەکرێگیراوەکانیان فەرمانبەرانی لەشکری خومەینی درۆ لە سەر درۆ تەحویلی گەلانی ئێران دەدەن. درۆی هێندە زل دەکەن کە لەوانەیە کەسانێك کە ئاگاداری وەزعی کوردستان نین تووشی ئاڵۆزی فکریو سەرگەردانی بن.

بۆیە بە پێویستی دەزانم واقعیی نیزامیی کوردستان پاش ٥مانگ هێرشی ڕێژیمی خومەینی بخەمە بەرچاوی خەڵکی کوردستانو بە تایبەتی گەلانی ئێران کە ئیمکانی ڕاستەوخۆی ئاگاداربوونیان لە وەزعی کوردستان نیە تەنیا دەسکەوتی ڕێژیمی خومەینی پاش ٥مانگ شەڕ، وەدەست هێنانی ئیمکانی هاتوچۆ بە جادەی پیرانشار - سەردەشت دایە ئەویش هەر بە ڕۆژ، بە شەو یەك پاسدارو ئەرتەشی ناوێرێ بەم جادەیەدا هاتوچۆ بکا، چونکە لە چەند جێگا کونترۆڵی جادە بەدەست پێشمەرگەکانەوەیە ئەوە تەواوی سەرکەوتنی ڕێژیمە کە پاش ٥مانگان توانیویەتی ڕێگای هاتوچۆی خۆی بە ڕۆژ لە ٧٠کیلومیتری دیکە لەم جادەیە دابین بکا کە هەتا ئێستا بە تەواوی لە دەس پێشمەرگەدا بوو. بێجگە لەوە هیچکام لە مەبەستەکانی هێرشی پانوبەرینی لەشکری خومەینی وەدی نەهاتەوە. کەوابوو بۆچی خومەینیو دارودەستەکەی ئەم کارە بە سەرکەوتنێکی گەورە لە قەڵەم دەدەن. ڕێژیمی خومەینی بۆ تەوجیهی شکستەکانی خۆیو بۆ سەرپۆش دانانی لە سەر تەنگو چەڵەمەکانی سیاسیو ئابووریو کۆمەلایەتیو فەرهەنگی لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستی بە سەرکەوتن هەیە. ئەم ڕێژیمە کە ڕەشترین ڕێژیمی مێژووی ئێرانەو نیشتمانی ئێمەی کردوە بە زیندانی گشت ئازادیخوازانو ئینسانە بە شەرەفەکانی ئێران، لە مەیدانی سیاسیدا ناتوانێ چووکترین سەرکەوتنێك وەدەس بێنێ. بەڵکوو بە پێچەوانە لە

ژوورەوە گەلانی ئیران بە گشتی لێی بێزارنو لە دەرەوەش تەنانەت یەك دۆستی راستەقینەی بۆ بەدی ناكرێو خومەینیو رێژیمەكەی لە سەرانسەری جیهاندا بە كۆنەپەرستو خوێنمژو سەرەڕۆ ناسراون. لە مەیدانی ئابووریدا خومەینیو دارودەستەكەی ئێرانیان كردووە بە وێرانەو تووشی قاتیو بێسەرو بەرەییەكی ئابووریی ئەوتۆیان كردوە كە لە مێژووی ولاتەكەماندا وێنەی نیە. هەژاریو بێكاریو بێخانوویيو ئاوارەیی، بەسەر ولاتەكەماندا زاڵ بووە، وەزعی ئیقتسادی رۆژبەرۆژ خراپترو پەریشانتر دەبێ. جا بۆیە چاوەڕوانیی سەركەوتوو بوون لە رێژیمی خومەینی لە مەیدانی ئیقتسادیدا ئینتیزارێكی لە خۆڕاییيە. لە مەیدانی كۆمەلایەتیدا ئەم رێژیمە بەرەنگاری هەزاران گیروگرفتی چارەسەرنەكراوی زەحمەتكێشانی شارو دێیە، بێ مەدرەسەییو بێ پزیشكیو بێدەرمانی، لەناو چوونی خزمەتەكانی كۆمەلایەتی، تەنانەت بێئاویو بێنانی هەڕەشە لە ژیانی زەحمەتكێشانی سەرانسەری ئێران دەكاو رێژیمی خومەینی نەك هەر لە توانایدا نیە ئەم هەموو گیروگرفتە چارەسەر بكا، بەڵكوو هیچ بەرنامەیەكیشی بۆ ئەم مەبەستە دانەناوەو ناشتوانێ دابنێو لە مەیدانی فەرهەنگیشدا ناكرێ تەنیا باسی بێفەرهەنگیو نەزانیی كاربەدەستانی رێژم بكەین بەڵكوو دەبێ بڵێین كە زانستو بنكە زانستییەكانیان لە نێو بردووەو فەرهەنگی ئێمەیان ساڵەها وەپاش خستوە. بۆیە تەنیا مەیدانێك كە رێژیم پێی وایە سەركەوتنی دەست دەكەوێ مەیدانی شەڕە. چونكە لە شەڕ لەگەڵ عێراقدا پاش بە كوشتدانی دەیان هەزار نەفەر لە لاوانی نیشتمان سەركەوتنێكی وەدەست نەهێناوە. پێی وایە لە كوردستان سەردەكەوێ هەر بۆیەش دەسكەوتەكانی خۆی گەورە دەكاتەوەو بە قەولی مەشهوور كایەك دەكا بە كێوێك. بزانین ئەم سەركەوتنە واتە كردنەوەی رێگای پیرانشار ـ سەردەشت كە خومەینیو دارو دەستەكەی ئەوەندە شانازیی پێوە دەكەن بە چ نرخێك بە دەست هاتوە. بە پێی ئاماری دەقیق، كە جارێ تەكمیل نیەو تەنیا ئی سێ مانگی دواییيە لەو رێگایەدا ٦١٩٧ پاسدارو بەسیجیو ئەرتەشی كوژراون، ٨٢٧٢ نەفەریش بریندار بوون. ٢٦٧ چەكداری خومەینی بە دیل گیراون، ٤٨٠ دەزگای ئوتۆمبیلی دوژمن لەبەین چوونو ٤٨ ماشینیش بە ساغی بە دەس پێشمەرگەكان كەوتوون. ١٧هیلیكوپتریش ئەنگاوتراونو زۆربەیان كەوتوونەتە خوارێ. لەو ماوەیەدا ٣٩بنكەی نیزامیی دوژمن گیراوەتەوەو ١١٣٠٠٠فیشەكو ٦٨١

تفەنگ، ١٩دەزگا بێسیمو١٤قەبزە چەکی قورسو ١٠ئار.پی.جیو زۆر کەلوپەلی دیکە، وەدەست پێشمەرگە کەوتووە. بەرانبەر بە ٦هەزار کوژراوی دوژمن ٢٦٨ نەفەر لە پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان شەهید بوون.

راستە زۆر پێشمەرگەی بە نرخو نموونەمان لە کیس چوو، بەڵام واقعییەت ئەوەیە کە بەرانبەر بە هەر پێشمەرگەی شەهید ٢٣کەس لە بەکرێگیراوەکانی رێژیم کوژراون. چونکە رێژیم لە شەڕ لەگەڵ پێشمەرگەدا زەبوونو بێچارە بوو هێرشی دەبردە سەر زەحمەتکێشانی بێدیفاعی گوندەکانی کوردستانو بەم شێوە سەدان نەفەر لە ژنو منداڵو لاوو پیری بێ‌دیفاع وەبەر گوللەی دوژمن کەوتنو شەهیدکران. بە تەواوی بۆ خەڵکی کوردستان دەرکەوت کە مەبەستی رێژیمی خومەینی لەنێو بردنی گەلی کوردەو بۆیەش لەشکری خومەینی شەڕ لە گەڵ پێشمەرگە یان ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ناکا، بەڵکوو شەڕ لەگەڵ گشت خەڵکی کوردستان دەکا. کاربەدەستانی رێژیمی خومەینی زۆر جار رایانگەیاندووە کە خەڵکی کوردستان پێشوازی لە هاتنی لەشکری جمهوریی ئیسلامی کردووە، ئەوە یەکێك لە درۆ زلەکانی رێژیمە. لە دەوروبەر یان لە سەر جادەی پیرانشار ـ سەردەشت کاتێك چەکدارانی خومەینی توانییان بچنە نێو گوندێك تەنانەت یەك نەفەریش لەو گوندەدا نەبووە هەتا پێشوازییان لێ بکا. لەشکری خومەینی پێش داگیرکردنی هەر گوندێك، ئەوەندە بە توپی دوورهاوێژ ئەو گوندەی کوتاوە کە نەك هەر زیندەوەری تێدا نەماوە بەڵکوو خانووەکانیشی وێران بوون. لە سەرانسەری کوردستان رێژیمی خومەینی، بێزراوی کۆمەڵانی خەڵکەو بە درۆو دەلەسەش ئەو راستییە ناگۆڕدرێ.

راستی ئەوەیە کە ناوچە داگیرکراوەکانی کوردستان لە بن پێی رێژیمی خومەینی‌دا دەلەرزێنو چەکدارەکانی خومەینی تەنیا چارەنووسیان یان بەجێ‌هێشتنی کوردستانە یا مردن. درۆی دیکەی کاربەدەستانی رێژیم ئەوەیە کە گوایە لەم ماوەیەدا زۆرکەس لە پێشمەرگەکانو ئەندامانی حیزبو تەنانەت مەسئوولەکانی حیزبیش مەتەرێزی شەرەفو خەباتیان بەجێ‌هێشتووەو خۆیان تەحویلی رێژیم داوەتەوە. جارێ با بەکوێری چاوی خومەینیو دارودەستەکەی ئەوەندە بڵێم کە جێگای پێشمەرگە شەهیدەکانمان بەتاڵ نەماوە. بە سەدان لاوی لەخۆبردوو لە ماوەی سێ مانگی رابردوودا چەکیان لە شان کردووەو بوون بە پێشمەرگە. تەنانەت نەگە. هێندێ لە لاوان کە پێشتر

پێشمەرگە بوون یان لە بەر دڵئێشە یان لەبەر کارو کاسبی چەکیان دانابوو، لە هەلومەرجی ناسکی ئێستادا بە ئەرکی نیشتمانی خۆیان زانی کە بێنەوە ریزی پێشمەرگەو نەهێڵن جێگای شەهیدە خۆشەویستەکانمان بەتاڵ بێ. بە شانازی‌یەوە دەڵێم نەك هەر جێگای شەهیدەکانمان پڕ کراوەتەوە بەڵکوو چەند هێندەی ژمارەی شەهیدەکانمان پێشمەرگە زیادی کردوە. دیسان بە شانازی‌یەوە دەڵێم کە بە پێچەوانەی تەبلیغاتی درۆزنانەی دوژمن تەنانەت یەك نەفەریش لە مەسئوولانی حیزب پەنایان بۆ دوژمن نەبردوە. بەڵکوو لەم ماوەیەدا ٨٥ نەفەر لەوانەی فریوان خواردبوو و هەروەها بە دەیان کەس لە پێرسونێلی ئەرتەش هاتوونەتە باوەشی گەلو بە گەرمی لە لایەن پێشمەرگەکانو خەڵکەوە وەرگیراون. رادیۆی درۆزنی دەنگی جمهوریی ئیسلامی ئیدیعای کرد کە گۆیا جێگای رادیۆ دەنگی کوردستان داگیر کراوە، دەزگای رادیۆکەشی دەست کەوتوە. هەروەها ئیدیعای کرد کە بەرێوەبەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بۆ دەرەوەی وڵات رایان کردوە.

**گوێگرە خۆشەویستەکان!**

ئایا ئەوە کە من وەك جاران لە رێگای رادیۆ دەنگی کوردستانەوە قسەتان لەگەڵ دەکەم باشترین بەڵگەی رسوا بوونی خومەینیو دارودەستەکەی نیە؟ ئەم پرسیارە دێتە پێش، ئایا زۆربەی زۆری تەبلیغاتی رێژیم لە سەر سەرکەوتنەکانی لە کوردستان، وەك گرتنی خەیاڵیی دەزگای رادیۆ کوردستان ناچێ؟ کاربەدەستانی رێژیم لە فەرماندەری قەرارگای حەمزەوە بگرە تا خودی خومەینی پیرۆزبایی‌یان لە یەکتر دەکردو وایان نواند کە کوردستان بە قەولی ئەوان پاکسازی کراوە. وایان نیشاندا کە پێشمەرگە لە کوردستاندا یان تێكشکاوە یان رای کردوە، لە نەکاو پێشمەرگە چوونە نێو شاری بۆکانو کونترۆڵی شاریان بە دەستەوە گرت. پاسدارانی نێو شاری بۆکان یان کوژران یان هەڵاتن. خەبەری گرتنی بۆکان بە دەست پێشمەرگەکانەوە وەك بۆمب لە سەرانسەری جیهان دەنگی دایەوە. رێژیم ئەوەندە سەرسامو شەرمەزار بوو کە تەنانەت خەبەرەکەشی بڵاو نەکردەوە. بەڵام جارێکی دیکە خومەینی ریسوا بوو و دەرکەوت کە هارتو پورتەکەی لە بارەی سەرکەوتن بە سەر پێشمەرگەدا درۆیەکی زلەو هیچی دیکە. نامەوێ لەوە زیاتر لە سەر درۆکانی خومەینیو دارودەستەکەی برۆم پێم خۆشە ئەوەندە بڵێم کە رێژیمی خومەینی لە رێگای پیرانشار ـ سەردەشتدا هەزاران لاوی

ئێرانی بە کوشتن داوە نرخی هەر کیلومیترێك پێشڕەوی ١٠٠ کوشتەو ١٥٠ بریندار بووە لە لایەکی دیکەوە دیاریی خومەینی بۆ کوردستان تەنیا ئاگرو گوللە بووە. وێرانکردنو کوشتنو بڕین، ئەوەیە نێوەرۆکی سیاسەتی ڕێژیمی خومەینی لە کوردستانی ئێران.

ئەگەر بە وردی چاوێك بە کارنامەی ڕێژیمی خومەینی لە ماوەی سێ مانگی ڕابردوودا بخشێنینەوە بۆمان دەردەکەوێ نەك هەر سەرکەوتنی وەدەست نەهێناوە بەڵکوو تووشی شکستێکی گەورەش بووە. ڕێژیمی خومەینی هەموو هێزو ئیمکاناتی خۆی بۆ لەنێوبردنی جوولانەوەی دێموکراتیی گەلی کوردو بۆ تێکشکانی سەنگەری ئازادیی ئێران (کوردستان) دانا. هەزاران لاوی نەزانو بێئاگای بە کوشتن دا. میلیاردها پوولی خەڵکی زەحمەتکێشی خەرج کرد. بەلام نەیتوانی بەربەرەکانێی خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان تێکبشکێنێ. لەوەش زیاتر ئێستا چەکدارەکانی خومەینی ئەوەندە بڵاو بوونو وەزعێکی ئەوتۆیان بۆ هاتۆتە پێش کە زەبر لێوەشاندنیان زۆر هاسانتر لە جارانە. لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا لە گەڵ خەڵکی زۆر لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان قسەم کردوە، بۆم دەرکەوتوە کە ورەیان بەڕاستی زۆر بەرزە. تەنانەت هێندێ لە پیاوە پیرە ماقووڵەکان لەو بڕوایەدان کە جێگیر بوونی چەکدارەکانی خومەینی لە سەر جادەکان دیارییەکە بۆ پێشمەرگەکانو لە ئێستاوە چەکو تەقەمەنیو کەلوپەلی لەشکری خومەینی لەم بنکانەدا بە ئی هێزی پێشمەرگە دەزانن.

هێندێ کەس دەپرسن باشە ئێستا مانگی دیفاعو مانگی هێرش خەلاس بووە، ئەمجارە ئەرکمان چیە؟ وەلامی من ئەوەیە کە ئەمجارە یەك ئەرکمان لە سەر شانە، هێرش بۆ سەر دوژمن لە سەرانسەری کوردستانە، هێرشی بێوچان، بێ ڕاوەستان، هێرش تا ڕووخانی خومەینی، هێرش تا سەرکەوتن. ئێستا زستان لەپێشە، زستان فەسڵی پێشمەرگەیە، نابێ لەم زستانەدا مەودا بە دوژمن بدەین. دەبێ زەبری زۆر کاریگەری لێوەشێنین. تەنانەت زۆر پێویستە تا بەهار زۆر لە بنکەو ڕێگاکانیشی پێچۆڵبکەین، من دڵنیام کە پێشمەرگە توانای ئەم کارەی هەیەو جێبەجێشی دەکا.

لە ماوەی ئەم سێ مانگەدا دیاردەیەکی نوێش بەرچاو بوو، پێشمەرگەکانی هێزی پشتیوان هاتنە یارمەتیی پێشمەرگەکانی کوردستانی ئێرانو فیداکارانە لە هێندێ

جەبهەدا بەشدارییان کرد، شەهیدیان داو برینداریشیان هەبوو. ئـەم پشـتیوانی‌یە لـە مێژووی نەتەوەکەماندا دیاردەیەکی نوێ‌یەو سەرەتای قۆناغێکی تازەیە لـە وریـایی‌و هاودەردی‌و هاوپەیمانیی گشت پارچەکانی کوردستان. بۆیە بەناوی حیزبی دێموکراتـی کوردستان‌و بە ناوی هەموو خەڵکی کوردستانەوە سلاو لە شەهیدانی هێزی پشـتیوان دەکەم‌و سپاسی هەموو پێشمەرگەکان‌و سەرکردایەتییان دەکەم کە بە کردەوە لە دیفاع لە ئازادی‌و شەرەفی کوردستانی ئێراندا بەشدارییان کرد.

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

لە لایەن دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتـی کوردسـتانەوە پڕ بـە دڵ سپاسـی فیداکاریی پێشمەرگە کۆڵنەدەرەکان دەکەم کە لەم ماوەیەدا دەرسێکی لەبیرنـەکراویان بە دوژمن دا. سپاس بۆ هەموو زەحمەتکێشانی کوردسـتان کـە جـارێکی دیکـە بـە کـردەوە پشـتیوانیی خۆیـان لـە ئامـانجی دیموکراسـی‌و خودموختـاری‌و لـە حـیزبی خۆشەویستی خۆیان، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەربڕی.

سپاس بۆ لایەنگران‌و ئەندامانی حیزب کە لە هەلومەرجێکی سەختی مێژوویـیدا لە ئەزموون سەربڵند دەرچوون‌و هـەورازو نشـێوی خـەبات لـە تێکۆشـان مـاندووی نەکردن.

سپاس بـۆ هـێزی بـەرگری، کـە لـە تـەواوی سـەنگەرەکاندا یـارو یـاریدەدەری پێشمەرگەکان بوون. سـپاس بـۆ یەکیـەتیی لاوان، کـە چ لـە جەبهـەو چ لـە پشـتی جەبهەدا ئەرکی نیشتمانیی خۆیان ئازایانە بەجێ گەیاند. سپاس بۆ ژنانی کوردسـتان کە لە پێشمەرگایەتی‌یەوە تا پەرەستاری‌و نانکردن لـە جەبهـەو لـە پشـتی جەبهـەدا هەموو کاتێك ئامادە بوون. سپاس بۆ مامۆستایانی شۆڕش کە مەدرەسەیان کرد بـە جەبهەو لە جەبهەشدا دەرسی گیانبازییان بە لاوانی کوردسـتان داو زۆریـان پێکـەوە لەگەڵ پێشمەرگە لە سـەنگەری شـەرەفدا شـەهید بـوون. سـپاس بـۆ هـەموو ئـەو ڕێکخراوو شەخسییەتانە کە چ لە ئێران‌و چ لە دەرەوەی ئێران پشـتیوانیی خۆیـان بـە وتارو بەکردەوە لە خەباتی خەڵکی کوردستانی ئێران دەربڕیوە. لەم بارەوە بە تایبەتی سپاسـی سـازمانی موجـاهێدینی خـەڵك‌و شـووڕای نیشـتمانیی بـەرگری دەکـەین‌و هیوادارین ئەم پشتیوانی‌یە لە دوارۆژدا بەهێزتر بێ‌و باشترو ڕێکوپێکتر خۆی بنوێنێ.

چونکه جارێکی دیکه دەرکەوت کە خەباتگێڕانی کوردستانی ئێران تەنیا دیفاع لە دەستکەوتەکانی خۆیان ناکەن بەڵکوو دیفاع لە ئازادیی سەرتاسەری ئێران دەکەن.

هاونیشتمانانی بەڕێز!

خەباتێکی توندو خوێناویمان لەپێشە. ڕێژیمی خومەینی بە زۆرو بە خەباتی چەکدارانە نەبێ ناڕووخێ. تا ئێستا کوردستانی ئێران بەشی هەرە گەورەی ئەم خەباتەی لە ئەستۆ بووەو بە چاکیو سەرفرازی ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە. بێگومان لە دوارۆژیشدا ئەرکی پێشەنگی خەباتی چەکدارانەی هەر دەخاتە سەرشانی خۆیو لە ئازادیی سەراسەریی ئێراندا نەخشێکی ئەساسیی دەبێ.

سلاو لە خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان!

سلاو لە پێشمەرگە کۆڵنەدەرەکانی کوردستان!

بڕووخێ ڕێژیمی دژی گەلیو دژی ئینسانی خومەینی.

سەرکەوێ خەباتی گەلانی ئێران بۆ هێنانەسەرکاری ڕێژیمێکی دێموکراتی.

سلاو لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێکخەرو بەڕێوەبەری خەباتی چەکدارانەی کۆمەلانی خەڵکی کوردستان!

# وتووێژی رادیۆیی لەگەڵ کاك دوکتور قاسملوو*

هاوڕێی تێکۆشەر کاك دوکتور قاسملوو سکرتێری گشتیی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەم رۆژانەدا دوای سەفەرێکی دوو - سێ مانگە بۆ دەرەوەی وڵات گەڕایەوە کوردستان. رادیۆی دەنگی کوردستانی ئێران ئەم هەلەی بە دەرفەتێك زانی بۆ ئەوەی وتووێژێك لەگەڵ هاوڕێ سکرتێری گشتیی حیزب پێك بێنێ و هێندێك مەسەلەی بخاتە بەرچاو بۆ ئەوەی وەڵامیان بداتەوەو ئێمەش بیخەینە بەر نەزەری گوێگرانی خۆشەویستی رادیۆو هاونیشتمانە بەڕێزەکان.

پ: کاك دوکتور لە پێشدا بە گەرمی بەخێرهاتنەوەت دەکەین و سوپاست دەکەین کە داوای ئێمەت قبووڵ کردو لەم وتووێژەدا بەشدار بووی.

و: منیش زۆر سپاستان دەکەم. سڵاو لە گوێگرە خۆشەویستەکانی رادیۆ دەنگی کوردستان دەکەم و زۆر خۆشحاڵم کە پاش ماوەیەك دیسان نەوە لە نێو خەڵکی کوردستان، لە نێو پێشمەرگە خۆشەویستەکان و لە نێو هەموو ئەندامان و لایەنگرانی حیزبدام. دیارە زۆر وڵات هەیە لە دەرەوە کە زۆر خۆشن و هەموو کەس بە وڵاتی زۆر خۆشیان دەناسێ، بەڵام من پێم وایەو ئێستا ئەم هەستەم بەهێزترە کە هاتوومەتەوە چۆنکە نیشتمانی خۆم لە هەمووان خۆشترەو بۆیە زۆر زۆر خۆشحاڵم کە هاتوومەتەوە.

پ: زۆر سوپاس کاك دوکتور، دەکرێ لە بارەی مەبەستی ئەساسیی سەفەری خۆتان بۆ دەرەوەی وڵات بۆ گوێگرە بەڕێزەکانی رادیۆ دەنگی کوردستان بدوێن؟

---

* ئەم وتووێژە لە ٢٤ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٦٢ی هەتاویدا بڵاو کراوەتەوە.

و: دیارە هەموو جارێ کە سەفەر دەکەم هێندێ ئەرکی حیزبیم لەسەر شانە کە دەبێ بەجێیان بگەیەنم. ئەم جارە وەك هەموو جاران لە پێشدا مەبەست ناساندنی خەباتی گەلی کورد لە قۆناغی ئێستای جوولانەوەماندا بە گەلانی دەرەوە، بە بیرورای گشتیی جیهان بووە. هەروەها ئەرکی سەرشانم ئەوە بوو کە لە کۆبوونەوەکانی شوورای نیشتمانیی بەرگری بەشدار بم کە باسی گەلاڵەی خودموختاری دەکردو بیرورای حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە ئەندامانی ئەو شوورایە رابگەیەنم‌و تێبکۆشم کە گەلاڵەی خودموختاری کە لە تەرەف حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە پێشنیار کرابوو پەسند بکرێ. ئەرکی دیکەم ئەوە بوو کە لە کۆنگرەی حیزبی سۆسیالیستی فەرانسەدا کە رەسمەن لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەعوەتیان کردبوو بەشدار بم، لەگەڵ برادەرێکی دیکەی دەفتەری سیاسی لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بووم‌و دیارە هێندێك ئەرکی دیکەشم بۆ دانرابوو، بۆ ئەوەی تێبکۆشم بەڵکوو یارمەتیی وڵاتانی دەرەوە، یارمەتیی رێکخراوەکانی پێشکەوتوو و یارمەتی ئەو سازمانانە کە بەشەردۆستن‌و پێیان خۆشە بە شێوەیەك یارمەتیی جوولانەوەی دێموکراتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا بکەن رابکێشم. دەتوانم بڵێم کە لە سەر جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکانە شێلگیر بووم‌و هیوادارم کە سەرکەوتوو بووبم.

پ: زۆر سوپاس، پرسیاری دووهەممان ئەوەیە داخوا خەڵکی دەرەوە چ لە سەر خەباتی گەلی کورد لە ئێران دەزانن‌و بەتایبەتی پێوەندی حیزبی ئێمە لەگەڵ هێزو رێکخراوو شەخسییەتە نیشتمانپەروەرو پێشکەوتووەکانی دەرەوە چۆنە؟

و: هەموو جارێ کە سەفەر دەکەم، بۆم دەردەکەوێ کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران باشتر لە جاری پێشوو ناسراوە. ئەوە نەتیجەی لە پێشدا خەباتی گەلەکەمان‌و نەتیجەی سیاسەتی دروست‌و مەسئوولانەی حیزبەکەمان‌و نەتیجەی فیداکاری‌و خەباتی بێوێنەی پێشمەرگەکانی کوردستانی ئێرانە. ئەم جارەش هەروا بوو، بۆم دەرکەوت کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران وەك حیزبێکی پێشکەوتوو و خاوەن نفووزو مەسئوول کە زۆربەی گەلی کورد پشتیوانیەتی لە دەرەوە ناسراوە. هەروەها بۆم دەرکەوت کە چ رێکخراوەکانی دەرەوەو چ ئێرانییەکان کە ئێستا ژمارەیەکی زۆریان لە دەرەوە دەژین، هەموویان هاتوونەتە سەر ئەو بروایە کە

کوردستان ئاڵاهەڵگری خەباتی هەموو گەلانی ئێرانەو تەنیا سەنگەری لە گیران نەهاتووی ئازادیی سەرانسەری ئێرانەو بەڕاستی ئەم جارەش وەك جارەکانی پێشوو شانازیم بەوە دەکرد کە ئەندامی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانم و وەك نوێنەری ئەو حیزبە، دەتوانم لەگەڵ ڕێکخراوەکانی سیاسی پێوەندی بگرم. زۆر لە ڕێکخراوەکانی سیاسی کە ئێمە پێوەندیمان لەگەڵیان هەیە پێشوازی‌یەکی باشیان لەو پێوەندییە کردو ئامادەیی خۆیان بۆ یارمەتی بە گەلی کورد لە کوردستانی ئێران و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران نیشان دا. دەتوانم ئەوەش بڵێم کە ئەم جارە بۆم دەرکەوت کە تەنانەت ئەو ڕێکخراوانەش کە دوو ساڵ لەوەی پێش پێیان وابوو کە ڕێژیمی خومەینی ڕێژیمێکی دژی ئیمپریالیستە کە ڕێژمێکە کە لە شۆڕش دەرچووەو بۆیە دەبێ ڕێژیمێکی شۆڕشگێڕ بێت، ئێستا هاتوونەتە سەر ئەو بڕوایە کە ئەو ڕێژیمە ڕێژیمێکی دژی گەلی‌یەو لەبەر ئەوە لە پشتیوانی‌کردن لە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران‌دا ئەگەر هەتا ئێستا شك‌و تەردیدێکیان هەبووە ئەو شك‌و تەردیدە نەماوەو بەڕاستی هەموو ڕێکخراوێکی بەشەردۆست، هەموو هێزێکی ئازادیخواز ئامادەیە یارمەتیمان بدا، دیارە ئەوەش دەبێ بڵێم کە ئێمە هەموو وەختێك یارمەتیی دەرەوەمان بە عاملێکی موساعید داناوەو زیاترو هەموو وەختێك تەکیەمان کردۆتە سەر خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران، سەر خەباتی حیزبەکەمان‌و پێشمەرگەی کوردستان.

پ: زۆر سوپاس کاك دوکتور، سێهەم پرسیارمان ئەوەیە داخوا دنیای دەرەوە لە سەر سیاسەتە دژی‌گەلییەکانی ڕێژیمی خومەینی بەتایبەتی لە نێوخۆی وڵاتدا تا چ ڕادەیەك ئاگادارەو بۆ ناساندنی ئەو ڕێژیمە بە بیروڕای گشتی چ هەنگاوێك هاوێژراوە؟

و: هەروەها کە گوتم بەڕاستی ئەم جارە ڕێکخراوێکی پێشکەوتوو، ڕێکخراوێکی بەشەردۆست نەماوە لە هیچ وڵاتێکی ئوورووپایی‌دا کە ڕێژیمی خومەینی بە ڕێژیمی دژی گەلی‌و دژی ئینسانی نەناسێ. جاران هێندێ کەس پێیان وابوو کە ئەو ڕێژیمە ڕاستە هێندێ کاری نالەبار لە نێو وڵاتدا دەکا بەڵام چونکو سیاسەتێکی لە سەر یەك دژی ئەمریکایی هەیە دەتوانێ بە ڕێژیمێکی دژی ئیمپریالیستی بناسرێ، ئێستا بۆ هەمووان دەرکەوتووە کە ئەو ڕێژیمە، ڕێژیمێکی پاشکەوتوو و قروونی وستایی‌یە، ڕێژیمێکی کۆنەپەرست‌و خوێنمژەو ڕێژیمێکە کە کاری بە ئیمپریالیزم نیە نەك هەر

ئەوە ئەو کارانەی کە بەکردەوە دەیکا نیشانەی ئەوەیە کە یارمەتیی سیاسەتی ئیمپریالیستی لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا دەداو زیاتر لەوە ئێستا ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئیمپریالیزمو بە تایبەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکا پێوەندی دامەزراندوە چەکی لێ وەردەگرێو ئەو چەکە بە کار دێنێ دژی گەلانی ئێرانو دژی گەلانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستو بەڕاستی ئێستا ڕێژیمی خومەینی بە ڕێژیمێکی تیرۆریست یا بە سەرکردەی تیرۆریزمی "بین‌المللی" ناسراوەو هەر بەو چاوەش تەماشای دەکەن. هەموو کەس دەزانێ کە زیندانەکانی ئێران پڕن لە زیندانیی سیاسی، ئەشکەنجە بەردەوامەو کاری ڕۆژانەی کاربەدەستانی ڕێژیمی خومەینی‌یە، دەزانن کە ئەو ڕێژیمە، ڕێژیمی دیکتاتۆریو خەفەقانەو هەروەها دەزانن کە ڕێژیمی خومەینیش ڕێژیمێکی شەڕخواز، بوحران خولقێنەرەو ئەگەر شەڕو بوحران نەبێ ناتوانێ بژی. هەربۆیەش پێم وایە کە وەك ڕێژیمێك ناسراوە کە ئاژاوە دەنێتەوەو کاری تەقاندنی بومبە. وەك ڕێژیمێك ناسراوە کە کاری تیرۆریزمو لە سەتحی "بین‌المللی"دا بە تاقی تەنیا ماوەتەوە کە تەنانەت ئەو دەوڵەتانەش کە پێوەندییان لەگەڵ ڕێژیمی خومەینی هەیە لە بەر میللەتەکانی خۆیان ناوێرن ئەو پێوەندییە ئاشکرا بکەن. پێم وایە لە مێژووی تازەی دنیادا هیچ دەوڵەتێك نیە کە بە ئەندازەی ڕێژیمی خومەینی لەبەر چاوی بیروڕای گشتیی جیهانی بەو شێوەیە ریسوا بووبێت. هەروەها کە ڕێژیمی خومەینی لەبەر چاوی گەلانی ئێرانیش‌دا بە تەواوی ریسوا بووە. چونکە بێجگە لە شەڕو بوحران لە وەزعێکی یەکجار زۆر نالەباری ئیقتیسادی هیچی دیکەی بۆ گەلانی ئێران نەهێناوەو بەڕاستی ئەوەش دەتوانین بڵێین کە لە مێژووی تازەی ئێراندا یەکەم جارە کە وڵاتەکەمان تووشی وەزعێکی ئیقتیسادیو کۆمەڵایەتیو حەتا نیزامیی نالەبار بووە. خومەینی لە لایەکەوە دەیهەوێ سەرکەوتن لەشەڕدا وەدەست بێنێ، لە لایەکی دیکەش بۆی دەرکەوتوەو تاقیکردنەوە نیشانی داوە کە هیچ سەرکەوتنێك لە ئینتیزاری خومەینی‌دا نیە لە نەتیجەدا وەزعێکی وای بۆ خولقاندوە کە لە بن‌بەستێکی تەواو دایە. لە لایەکەوە دەیهەوێ تا ڕادەیەکی زۆر بۆ ڕاگرتنی دەسەڵاتی خۆی مەجبوورە لە سەر شەڕ بەردەوام بێ، لە لایەکی دیکەش هیچ ئاسۆیەکی ڕوون لە بەردەوامبوونی ئەو شەڕەدا بۆ خومەینی دیار نیەو زۆر وێدەچێ کە هەرخودی ئەو شەڕە بگەڕێتەوە دژی خومەینیو ببێتە هۆی ڕووخانی جمهووری ئیسلامیی خومەینی.

پ: کاك دوکتور قاسملوو وەك دەزانین لە ماوەی بوونی ئێوە لە پاریس‌دا گەلاڵەی خوموختاریی کوردستان لە شوورای نیشتمانیی بەرگری‌دا پەسند کرا، دەکرێ نەختێك لە سەر ئەو گەلاڵەیە بۆ گوێگرانی رادیۆ دەنگی کوردستان بدوێن‌و نەزەری خۆتانی لە سەر دەربڕن؟

و: هەروەها گوێگرانی خۆشەویست دەزانن لە سەرەتای پێکهاتنی‌دا شورای نیشتمانیی بەرگری ئەسڵی خودموختاریی وەك ئەسڵێکی پیرۆز پەسند کردبوو، لە ماوەی دوو ساڵاندا بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەرکەوت کە لە سەر نێوەرۆکی خودموختاری لە نێو ئەندامانی شوورای نیشتمانیی بەرگری‌دا جیاوازی هەیەو هەر کەس، هەر شەخسییەتێك‌و هەر رێکخراوێك بە شێوەیەك خودموختاری لێك دەدەنەوە. لەلایەکی دیکەشەوە پاش ئەو هێرشە پانوبەرینە کە رێژیمی خومەینی بۆ سەر کوردستانی هێنا، حیزبی ئێمە پێی‌وابوو کە شوورای نیشتمانیی بەرگری بە شێوەیەك دەبێ یارمەتی بە جووڵانەوەی دێموکراتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران‌دا بداو ئەگەر لە باری نیزامی‌و ماددییەوە ناتوانێ ئەو یارمەتییە بەو شێوەیە کە پێویستە بدا، هەر نەبێ لە باری سیاسی‌یەوە پشتیوانیی خۆی لە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران دەربڕێ. کە بەڕاستی هەروەها کە گوتم ببوو بە ئاڵاهەڵگری خەبات بۆ رزگاریی سەرانسەری ئێران‌و هەروەها کە دەزانن ئەو خەباتە هەر ئێستاش بەردەوامە، پاش چەند مانگ وتووێژو چەند مانگ قسە لە سەر تەرحی خودموختاری کە لە لایەن حیزبی ئێمەوە پێشکێش کرابوو و هەروەها پاش موتالعە کردنی زۆر تەرحی دیکە لە لایەن شەخسیەت‌و رێکخراوەکانی دیکە هاتبوو خۆشبەختانە شوورای نیشتمانیی بەرگری تەرحێکی پەسند کرد کە دەتوانم بڵێم لە ئەساسی خۆی‌دا جیاوازی‌یەکی لەگەڵ تەرحی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران نیە. من ئەو پەسند کردنە بە سەرکەوتنێکی زۆر گرینگ، بە سەرکەوتنێکی مێژوویی دەزانم چونکە بۆ یەکەم جارە کە زۆر رێکخراوی پێشکەوتوو بەتایبەتی رێکخراوی سازمانی موجاهیدینی خەڵق‌و زۆر شەخسییەتی ناسراو هاتوونەتە سەر ئەو بڕوایە کە پەسندکردنی تەرحی خودموختاری نەك هەر بەپێچەوانەی قسەی زۆر دوژمنی ئازادیی ئێران نابێتە هۆی لەت لەت بوونی ئێران بەڵکوو یارمەتی دەدا بەوە کە یەکیەتیی ئێران پتەوتر بێ، یارمەتی دەدا بەوە کە گەلانی ئێران بە دڵەوە لە ئازادی‌و

سەربەخۆیی ئێران دیفاع بکەن. دیارە لە تەرحی ئەو مەسەلەیەداو هەروەها لە باس و تەنانەت جارجار کێشەش لە سەر تەرحی خودموختاری‌دا مەسئوولیەتی ئەساسی دەکەوێتە سەر شانی حیزبی ئێمەو بۆیەش بە شانازی‌یەوە دەڵێم کە پەسند کردنی تەرحی خودموختاری سەرکەوتنێکی گەورە بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە. بەڵام دەبێ بەحەق بڵێم کە سازمانی موجاهیدینی خەڵق لە جەریانی باس و جەرەیانی وتووێژ لە سەر تەرحەکەدا نەخشێکی بەرچاویان هەبوو و زەحمەتێکی زۆریان کێشا بۆ ئەوەی کە ئەو تەرحە بەو شێوەیە کە ئێستە پەسند کراوە لە واقعدا قبووڵ بکرێ. بارە گرینگەکانی ئەو گەلاڵەیە زۆر روونە، گوێگرانی خۆشەویست تەرحەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانیان لەبیرەو بەتایبەتی تەرحی ٦ مادەیی حیزبی ئێمەیان حەتمەن لە بیر ماوە، بەڵام من دەتوانم بە مەسئوولیەتەوە بڵێم کە ئەو تەرحە کە ئێستە پەسند کراوە زۆر لە تەرحی ٦ مادەیی حیزبی ئێمە زیاترە بە حەقیش چونکوو تەرحی ٦ مادەیی ئێمە ئەو کاتە هاتبووە مەیدان کە جارێ ئەو شەڕە دوورو درێژمان لەگەڵ رێژیمی خومەینی نەکردبوو، ئەو هەموو شەهیدەمان نەدابوو، ئەو هەموو فیداکاری‌یانە نەکرابوو، بۆیە ئێستا ئەو تەرحە ١٢ مادەیی‌یە کە پەسند کراوە بە تەرحێکی زۆر باشی خودموختاری دادەنێن و هەر چەند ئەو تەرحە تەرحی شورای نیشتمانیی بەرگری‌یەو تەرحی حیزبی ئێمە نیە، بەڵام دەتوانم بڵێم کە تەواوی داخوازەکانی ئەساسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەو تەرحەدا هاتوون. بۆیە هیوادارم کە هەموو شوورای نیشتمانیی بەرگری، هەموو ئەندامانی شوورا لەگەڵ حیزبی ئێمە پێکەوە هەمووومان تێ‌بکۆشین بۆ ئەوە کە ئەو تەرحە بە باشی بێتەدی و جێبەجێ ببێ. دەمەویست بڵێم کە لەو تەرحەدا چەند مەسەلەی گرینگ هەیە کە دەبێ باسیان بکەین.

یەکەم: دیارە دیاریکردنی سنووری جوغرافیایی ناوچەی خودموختاری کوردستان. هەروەها کە دەزانن رێژیمی کۆنەپەرستی شاهەنشاهی، کوردستانی دابەش کردوە بە چوار ئوستان. لەو تەرحەدا هاتوە کە ناوچەی خودموختار شامیلی هەموو کوردستانە. نەك هەر ئوستانی کوردستان کە تەنیا یەکێك لە ئوستانەکانە کە کوردی تێ‌دا دەژی. دیارە سنووری دەقیقی ئەو ناوچەیە بە دەنگ وەرگرتن لە خەڵکی ئەو ناوچەیە دیاری دەکرێ.

دووهەم: دیاریکردنی سەلاحییەتەکانی ئۆرگانەکانی خودموختارو دەوڵەتی مەرکەزی لەو تەرحەدا بە شێوەیەکی زۆر باش پەسند کراوە، لە پێشدا گوتراوە کە سەلاحییەتی دەوڵەتی مەرکەزی ئەمانەن وەك پێوەندییەکانی دەرەوە، وەك دیفاعی میللی، وەك سیستمی بانکیو لە پاشان گوتراوە بێجگە لەو سەلاحییەتانە کە دراون بە دەوڵەتی مەرکەزی، هەموو سەلاحییەتەکانی دیکە لە ئیختیاری ئورگانەکانی [ناوچەی] خودموختاردان کە شووراى عالی کوردستان کە برپیارە لە لایەن هەموو خەڵکی کوردستانەوە هەڵبژێردرێ خۆی ئەو ئۆرگانانە واتە ئۆرگانەکانی خودموختاری عالی دیاری دەکا.

سێهەم مەسەلە، کە موهیم بوو مەسەلەی ئینتزاماتی داخلی یا مەسەلەی هێمنی نێوخۆی کوردستانە. گوێگرانی خۆشەویست، باش دەزانن کە گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە دەست ژاندارم، پێشتر ئەمنییە لە پاشان ژاندارمو ئێستاش پاسدار، هەراسانە. بۆیە داوای ئێمە هەموو وەختێك ئەوە بوو کە خەڵکی کوردستان بۆخۆی ئاسایشی نێوخۆیی بەدەستەوە بگرێو ئەوە لەو تەرحەدا هاتووەو تەنانەت لەوەش زیاتر گوتراوە کە ئەرتەشیش بە هیچ جۆرێك حەقی دەخالەتی لە کاروباری ئاسایشو هێمنیی نێوخۆی وڵاتدا نیەو ئەرکی ئەرتەش لە واقیعدا دیفاعە لە سنوورەکانو لە سەربەخۆیی ئێران، پێم وایە بەو شێوەیە کە ئەو تەرحە باسی ئینتیزاماتی داخڵی کردوەو لە واقیعدا ئاسایشی داخلیی داوە بە دەست خودی ئورگانەکانی خودموختار، ئەوە جێبەجێ کردنی یەکێك لە پایەکانی خودموختارییە.
مەسەلەی گرینگی دیکە، مەسەلەی زمانی کوردییە. زمانی کوردی بە زمانی رەسمیی ناوچەی خودموختار ناسراوە. هەم لە مەدرەسەکانداو لە مەدرەسەی سەرتاییەوە بگرە هەتا دانشگاو هەم لە بەینی ئیدارەکاندا. گەلی کورد زۆر لەمێژە خەبات دەکا بۆ ئەوەی زمانەکەی بەرەسمی بناسرێو پێموایە ئەوە سەرکەوتنێکی گەورەیە. هەروەها لەو تەرحەدا هاتووە کە زمانی فارسیش، زمانی رەسمیی موشتەرەکی هەموو گەلانی ئێرانەو ئەوە شتێکە کە لە بەرنامەی حیزبی ئێمەشدا هاتووەو بۆ لێك حالیبوونو یەکیەتیی گەلانی ئێران دیارە پێویستە. ئەو چوار مەسەلەیە بە نەزەری من لە تەرحی خودموختاریدا ئەساسین. بەڵام ئەو تەرحە بەوەندە رازی نەبووە کە باری ئیقتسادیی کوردستان باس دەکا لەوێ گوتراوە کە دەبێ

لەمەو دوا زیاتر بوودجە دابنرێ بۆ پێشخستنی ناوچەی کوردستان چونکە لە زۆر لە ناوچەکانی ئێران پاشکەوتووترە، هەروەها بەندێك لە تەرحەکەدا کە دەوڵەتی مەرکەزی ناتوانێ لەو سەلاحییەتانەی کە ئۆرگانەکانی خودموختارن دەخاڵەت بکا.
من بە گشتی ئەو تەرحە بە تەرحێکی زۆر سەرکەوتوو دەزانم‌و دەتوانم بە مەسئوولییەتەوە بڵێم کە تەرحی خودموختاری زۆر وڵاتانم دیوە لە هیندوستانەوە بگرە تا ئیسپانیا، لە بەینی هەموو ئەوانەدا ئەو تەرحە دەتوانم بە تەرحێکی زۆر باش دابنێم. دیارە ئەم گەڵاڵەیە تەرحی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران نیەو حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە حەقی موسەلەمی خۆی دەزانێ کە بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەی خۆی خەبات بکاو لە دوارۆژیش‌دا لە سەر ئەو خەباتە بەردەوام بێت. بەڵام دەبێ ئەوەی بڵێم کە جێبەجێ کردنی تەرحی شوورای نیشتمانیی بەرگری خۆی لە ئەساس‌دا جێبەجێ کردنی داخوازەکانی ئەساسیی خەڵکی کوردستانی ئێرانە.
ئەگەر هێندێ کەس دژی ئەو تەرحەن دیارە من باسی ئەوانە ناکەم کە لە ریزی دوژمنانی خەڵکی کوردستانن. بەڵام باسی ئەوانە دەکەم کە لە ریزی دۆستانی جووڵانەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران‌و تەنانەت لە ریزی جووڵانەوەی دێموکراتی‌و میللیی کوردستانن. من پێم وایە ئەگەر واقیعبینانە تەرحەکە بخەنە بەرچاو ئەگەر تەعەسوب نیشان نەدەن، ئەگەر بەراستی دڵسۆزانەو سادقانە، بێ‌لایەنانە لە تەرحەکە بکۆڵنەوە دەگەنە ئەو نەتیجەیە کە تەرحی خودموختاری هەر ئاوا دەبێ، تەرحێك کە زۆربەی نوێنەرانی گەلانی ئێران پەسندی بکاو تەرحێك کە بەراستی لە چوارچێوەی وڵاتێك‌دا داخوازەکانی خۆی خولاسە کردبێ ناتوانێ زۆر لەوە زیاتر بێ ئەگەر بڵێین کە تەرحی خودموختاری زیاتر لەوە داوا بکا ئەوە ئیدی لە چوارچێوەی خودموختاری دەردەچێ‌و پێمان وایە کە ئێمە وەك حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە لە رۆژی یەکەمەوە رامان گەیاندوە کە هەموو داخوازەکانی خۆمان دەدمانەوێ لە چوارچێوەی ئێرانێکی دێموکراتیکی‌دا جێبەجێ بکەین. پێمان وایە بە جێبەجێ کردنی ئەو تەرحە ئەسڵی مەسەلەکە چارەسەر دەکرێ‌و خەڵکی کوردستان هەست بەوە دەکا کە چارەنووسی خۆی بە دەست خۆیەوە گرتوە. بۆیە من پێم‌وایە کە ئەو کەسانە بە خۆڕایی دژی ئەم تەرحە قسە دەکەن. ئەوانەی کە لە تەرحەکە باش حاڵی نەبوون‌و یا بەراستی مانای خودموختاری باش تێنەگەیشتوون،

دژی ئەم تەرحە تەبلیغات دەکەن. ئەوانە لە دوارۆژدا نەزەری خۆیان دەگۆڕنو ئەگەر سادیقانەو موخلیسانە خودموختارییان بوێ بێگومان لە دوارۆژدا ئەوانیش لەو تەرحە پشتیوانی دەکەن.

**پ:** زۆر سوپاس، پاشەڕۆژی ڕێژیمی خومەینی چۆن دەبینن؟

**و:** ئەم جارە کە لە دەرەوە بووم لە لێکدانەوەی وەزعی ئێرانو بەتایبەتی لە سەر دوارۆژی ڕێژیمی خومەینی تووشی دوو بیروباوەڕی چەوت بووم.

یەکەم: بیروباوەڕێ کە لە نێو بەشێك لە ئوپۆزیسیۆنی ئێرانیدا بڵاو بۆتەوە، کە نەزەریان ئەوەیە چونکە ئەو ڕێژیمە لە بوحران دایە ـ کە ئەوە ڕاستە ئەو ڕێژیمە لە بوحران دایە ـ لەبەر ئەوە نەتیجەگیری دەکەن کە ڕێژیمی خومەینی لە دوارۆژێکی نێزیکدا دەڕووخێ. ئێمەش نەزەرمان ئەوەیە کە ڕێژیمی خومەینی لە بوحران دایە، ئێمەش نەزەرمان ئەوەیە کە ئەو ڕێژیمە زۆر کزەو ئێمەش نەزەرمان ئەوەیە کە ئەو ڕێژیمە بە پێچەوانەی تەبلیغاتی خۆی زەعیفە، بەلاّم هەر لەو کاتەشدا نەزەرمان ئەوەیە کە هەتا ئەو کاتە کە هێزێکی ئەوتۆ پێك نەیەت کە بە زۆر ئەو ڕێژیمە بڕووخێنێ، ڕێژیم لە جێگای خۆیەتی. چونکە ڕێژیمی خومەینی ڕێژیمێك نیە کە لە هەڵبژاردن یا تەنانەت بە تەزاهورات لە بەین بچێ، ڕێژیمی خومەینی، ڕێژیمێکی زۆردارو دیکتاتۆرو خوێنمژەو بە ڕاپەرینی خەڵك نەبێ بە ڕاپەرینی چەکدارانە نەبێ ناڕووخێ. لە لایەکی دیکەوە نەزەرێکی چەوتی دیکە کە زیاتر لایەنگرانی دەوڵەتەکانی وەك ئەمریکاو ئاڵمانی ڕۆژئاواو ئینگلستان بڵاوی دەکەنەوە ئەوەیە کە گۆیا ڕێژیم چونکە ئەوە پێنج ساڵە لە سەر حوکمەو نەرووخاوە تەسبیت بووەو تازە دەبێ هەر پێوەندی لەگەڵ بگیرێ. ئێمە تێدەگەین بۆچی کاربەدەستانی ئەو وڵاتانە ئەو بیروباوەڕە بڵاو دەکەنەوە. چونکە گەلانی ئەو وڵاتانە ڕێژیمی خومەینی بە ڕێژیمێکی کۆنەپەرستو خوێنمژ دەناسن، بۆ ئەوە دامەزراندنەوەی پێوەندیی خۆیان لەگەڵ ئەو ڕێژیمە "توجیە" بکەن، کاربەدەستانی ئەو دەوڵاتانە، دەیانەوێ وا بنوێنن کە چونکە ڕێژیمی خومەینی تەسبیت بووە کەوابوو هیچ ڕێگامان نیە دەبێ هەر چۆنێ بێت پێوەندیی لەگەڵ دابمەزرێنینەوە. ئێمە پێمان وایە وەك حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەبێ واقیعبینانە سەیری وەزعی ڕێژیمی خومەینی بکەین. ڕێژیمی خومەینی نە ئەوەیە کە بەیانی یا چەند ڕۆژی دیکە بڕووخێو نە ئەوەیە کە تەسبیت

بووەو ئیدی نارووخێ. بە نەزەری ئێمە هەوڵو تەقەلای ئێمە دەبێ لە سەر ئەو ئەساسە بێت کە ئەو هێزە گرینگە پێك بێنین کە بتوانێ رێژیمی خومەینی برووخێنێ. رێژیمی خومەینی لە باری ئابوورییەوەو لە باری سیاسییەوە، لە باری کۆمەڵایەتییەوە، لە باری نیزامییەوە زۆر زەعیفە. تەنانەت ناکۆکی لە نێوان کاربەدەستانی رێژیمیش‌دا بە تەواوی ئاشکرا بووە، زۆر نموونە هەیە، بۆ ئەوە. من باسی یەك نموونە دەکەم، پاش جەنجالێکی زۆر مەجلیسێکیان هەڵبژارد بە ناوی مەجلیسی خوبرەگان کە گۆیا دەبوا جێنشین بۆ خومەینی دیاری بکا، ئێستا هەر باسی ئەو مەجلیسەش ناکەن، چونکە ئەو مەجلیسە لەگەڵ ئەوەی کە چەند جار کۆبووەوە نەیتوانی لەبەر ئەو ناکۆکییە کە لە بەینی خودی "آیت الله"کان دا هەیە، نەیتوانی جێنشینێك بۆ خومەینی دابنێ، ئەوەی خومەینییە دەیهەوێ مونتەزیری بە جێگای خۆی دابنێ کە دەستەی رەفسەنجانی پشتیوانی لێ دەکەن. ئەوەی "آیت الله" گەورەکانن ئەوان پێیان خۆشە کە شوورایەك پێك بێ، چونکە دەزانن کە لەو شوورایەدا قسەی ئەساسیو قسەی ئەسڵی دەبێتە ئی ئەوان، لە بەر ئەوە پێك نەهاتنو ئەوە خۆی دەگەیەنێ کە رێژیمی خومەینی نەك هەر ناکۆکییەکانی رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبن بەڵکوو ئەو ناکۆکییانە ئیدی ئاشکرا بوونو خەڵكو گەلانی ئێران هەموو ئاگادارن لەو ناکۆکییانە. بۆیە ئێمە هیوامان ئەوەیە کە رێژیمی خومەینی هەرچی زووتر برووخێ، بەڵام تەوەهومیشمان نیە، پێمان وایە کە خەباتی خۆمان دەبێ رۆژ بە رۆژ توندوتیژتر بکەین، وابکەین کە هەموو گەلانی ئێران، هەموو هێزەکانی سەلیمی (سەحی) ئێران بۆ ئەو خەباتە هان بدەین بەڵکوو بە یەکگرتوویی چ ئەوانەی کە لە شوورای نیشمانیی بەرگریدانو حەتا ئەوانەش کە لە شوورادا نین، ئەوانیش هان بدەین کە پێکەوە لەگەڵ هێزەکانی شوورا بۆ رووخاندنی رێژیمی خومەینی هەوڵ بدەن. ئێمە پێمان وایە کە بەرەبەرە وەختی ئەوە هاتووە کە ئەو هاندانە ببێ بە پایەی خەباتێکی توندوتیژ نەك هەر لە کوردستاندا کە ئەو خەباتە لەمێژە هەیەو بەردەوامە بەڵکوو لە جێگاکانی دیکەی ئێران لە شارە گەورەکانیو وەزعێکی وا پێك بێ کە بتوانین هەرچی زووتر رێژیمی خومەینی برووخێنین.

پ: زۆر سوپاست دەکەین کاک دوکتور قاسملوو، لە هەلومەرجی ئێستادا چ پەیامێکتان بۆ خەڵکی کوردستان و بەتایبەتی ئەندامان و لایەنگرانی حیزب و پێشمەرگە خۆشەویستەکان هەیە؟

و: پەیامی من بۆ خەڵکی کوردستان ئەوەیە کە هەرچی زیاتر یەکگرتوو بین، هەرچی زیاتر خەباتەکەمان توندوتیژتر بکەین، ئەوەندە زووتر بە ئامانجی خۆمان دەگەین، بۆیە داوا لە هەموو هێزەکانی کوردستانی دەکەم لە لایەن و بە ناوی حیزبی دێموکراتەوە لە هەموو ئەوانەی کە لە دێ و لە شار لە هەموو ئینسانە ئازادیخوازەکان داوا دەکەم کە هەر کام بە شێوەیەك بە پێی ئیمکانی خۆیان خەباتی خۆیان توندتر بکەن دژی ئەو ڕێژیمە خوێنمژە. ئەو ڕێژیمە بە بێ خەباتێکی توندوتیژ هەروا کە گوتم ناڕووخێ. داوا لە ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەکەم کە ڕێكوپێكتر لە جاران و وردتر و وشیارتر لە جاران خەباتی خۆیان درێژە پێ بدەن. زۆربەی خەڵکی کوردستان پشتیوانی خەباتی ئێمەیە. بەڵام ئەگەر ئێمە لە دوژمنی خۆمان ژێرتر نەبین و وردتر نەبین و کارەکانمان بە وشیاری جێبەجێ نەکەین، ناتوانین دوژمن مەجبوور بە تەسلیم بکەین. لەبەر ئەوە زۆر زۆر پێویستە هەموو ئەندامانی حیزب لە هەر جێگایەکی هەن سیاسەتی حیزب بە وردی و لە سەرەخۆ، بێ وەڕەزبوون بۆ گەلانی ئێران بۆ کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان ڕوون بکەنەوە و بەتایبەتی بەرانبەر بە فڕوفێڵی دژمن وریا بن، وشیار بن، چونکە دوژمن نابێ بە چووك بگرین واتە کە دوژمنەکەمان قروون وستاییە، پاشکەوتووە، کۆنەپەرستە، بەڵام شێوەی زۆر فێڵەزانانەش بەکار دێنێ کە ئێمە دەبێ وریا بین و پێشگیری لە جێبەجێ بوونی پیلانەکانی دوژمن بکەین. پەیامم بۆ پێشمەرگە خۆشەویستەکانم ئەوەیە کە هەر وەك لەو چەند مانگەی دواییدا نیشانیان داوە تاکتیکی تازەی خۆیان پەرە پێبدەن بەڕاستی ئەو کاتە کە لە سەفەردابووم لە دەرەوە بووم دەنگی خەباتی پێشمەرگەکان دەهاتە دەرێ لە ڕۆژنامەکانی دەرەوە لە ڕادیۆ و تەلەویزیونی دەرەوەدا باسی دەکرا، شانازیشم بەوە دەکرد کە پێشمەرگەی ئێمە بەپێچەوانەی تەبلیغاتی ڕێژیم کە دەیگوت کوردستانی پاکسازی کردوە ئیسباتیان کرد کە کوردستان هەر مەیدانی ئەوانە لەو چەند مانگەی دواییدا پێشمەرگەکانی ئێمە شەڕی زۆر باش و ئازایانەیان کردەوە و بەتایبەتی بە دانانی بەرنامەی ڕێكوپێك، بە گەڵاڵەی ڕێكوپێك بە دانانی

کەمینو مین توانیویانە زەربەی زۆر توند لە دوژمن بدەن کەوابوو هیـــوادارم لـە سـەر تاکتیکی خۆیان بەردەوام بن، بەتایبەتی لە هەموو شت زیاتر دەبێ فکریان ئـەوە بـێ کە زەربەی زیاتر لە دوژمن بدەنو بۆ خۆیان زەربەی کەمتر بخۆن، چونکە ئەوە بۆ ئێمە ئەساسە بۆیە دانانی کەمینو دانانی مین لـە دوارۆژیشدا دەبـێ ئەساسـی تـاکتیکی شەڕی پێشمەرگە بێو تەجروبە دەریخستووە کە ئـەو تاکتیکـە سـەرکەوتووە، ئـەرکی سەرشانی پێشمەرگەکانمان لە دوارۆژدا ئەوەیە کە دوژمن ماندوو بکەنو لەو جێگایـە زەربە لە دوژمن بدەن کە زەعیفە ئەو جێگایە بـاش هـەڵبژێرن، هـەروەها کـە کـاتی زەربە لێدانیش دەبێ باش هەڵبژێرن کە دوژمن هێزی زۆر کەمترە لە جاران، زەخـیرەی زۆر کەمترە لە جاران، تەماشای تەبلیغاتی دوژمن مەکەن، دوژمن زۆر لە هێزی خۆی لە دەست داوە، بێهێز بووە، بەڵام مانای ئەوە نیە کە خۆبەخۆ لـە خـۆڕا دەڕووخـێ، بەڵکوو دەبێ زەربەی زۆر توندی لێ بدرێو هەروەها کە گوتم، ئێمـە لـە کوردسـتانی ئێراندا هەروەها کە هەتا ئێستا پێشڕەوی خەبات دژی ڕێژیمـی خومـەینی بوویـن لـە دوارۆژیشدا دەبێ ئەو ئەرکە بە جوانی بەجێ بگەیەنین. داوای سەرکەوتن بـۆ هـەموو گەلانی ئێرانو بۆ خەڵکی کوردستان دەکـەمو هیـوادارم کـە هـەرچی زووتـر ڕێژیمـی خوێنمـژی خومەینی بڕووخێو لە جێگای ئەو ڕێژیمەدا، ڕێژیمێکی دێموکراتیـك پێـك بێ کە گەلانی ئێران بە ئاواتی خۆیان بگەنو گەلی کـورد لـە کوردسـتانی ئـێران بـە ئامانجی لەمێژینەی خۆی کە خودموختارییە بگا، بە ئاسایشو خۆشیو شادی بژیت.

پ: کاك دوکتور جارێکی دیکە سوپاست دەکەین کـە داخوازیـی ئێمـەت قبـووڵ کردو وەڵامی پرسـیارەکانت داینـەوە، هیوادارین لـە خزمـەتی ئامانجـەکانی گـەلی کورددا سەرکەوتوو بیو خەباتی گەلەکەشمان بە ڕێبەرایەتیی حـیزبی خۆشەویسـتمان، حیزبی دێموکراتی کوردستان ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێش بچێ.

و: منیش سوپاستان دەکەم.

# پەیامی سکرتێری گشتیی حیزب کاك دوکتور قاسملوو به بۆنەی ٢٥ی گەلاوێژ*

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

**گەلانی بەشەرەفی ئێران!**

**خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان!**

لە لایەن کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە، بە بۆنەی سیو نۆهەمین ساڵی دامەزرانی حیزبی خۆشەویستمان بە دڵەوە پیرۆزبایتان لێ دەکەمو سڵامەتیو خۆشیو سەرکەوتنی ئێوە بە ئاوات دەخوازم. ساڵێکی دیکە بە مێژووی پڕ هەورازو نشێوی حیزبەکەمان زیاد بوو، ساڵێکی دیکە خەباتی خوێناویی خەڵکی کوردستان درێژەی کێشاو ساڵێکی دیکە حیزبی دێموکرات، حیزبی هەموو گەلی کوردو بەتایبەت کرێکارانو جووتیارانو رووناکبیران سەدان حەماسەی تازەی خوڵقاندو سەدان رۆڵەی بەنرخی خۆی لە رێگای ئازادیی کوردستانو سەرانسەری ئێراندا فیدا کرد. بۆیە پێویستە لە روژی ٢٥ی گەلاوێژدا سڵاو بنێرین بۆ یادی شەهیدان، ئەو رۆڵە کۆڵنەدەرانەی گەل کە گیانی پاکی خۆیان بەخت کرد بۆ ئەوە گەلی کوردو گشت گەلانی ئێران لە دوارۆژدا بە ئازادیو خۆشیو بەختیاری بژین.

---

* ئەم پەیامە لە رۆژنامەی "کوردستان" ژمارەی ٩٨، لە گەلاوێژی ١٣٦٣دا بلاّو کراوەتەوە.

با ٥ ساڵ لەمەوبەر وەبیر بێنینەوە، ئەو رۆژەی ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٥٨ کە خومەینی دژی هەموو خەڵکی کوردستان ئێعلامی جیهادی دا، شەڕێکی سەرانسەریی لە کوردستاندا ساز کرد. لە شەڕێکی سێ مانگەدا لەشکری رێژیمی خومەینی لە کوردستان تووشی شکست هاتو خومەینی ناچار بوو پاشەکشە بکا. بەڵام کاربەدەستانی دژی گەلیی رێژیمو لە پێش هەمواندا خودی خومەینی پاش شەش مانگ پشوودان شەڕێکی پانوبەرینی دیکەیان بە سەر خەڵکی کوردستاندا سەپاند کە ئەمرۆش هەر درێژەی هەیە. پاش ٥ ساڵ شەڕ، رێژیمی جمهووریی ئیسلامی هێشتا نەیتوانیوە بەرهەڵستی قارەمانانەی زەحمەتکێشانی کوردستان تێک بشکێنێ. پاش ٥ ساڵ بە پێچەوانەی ئیددیعاکانی کاربەدەستانی رێژیم شەڕ لە سەرانسەری کوردستان هەر بەردەوامە. تەقەی پێشمەرگە لە دوورترین ناوچەی جنووبی کوردستانەوە تا شیمال هەر دەنگ دەداتەوە. لە بەهاری ئەمساڵدا دوژمنی کۆنەپەرست هێرشێکی پانوبەرینی نیزامیی لە ناوەندی کوردستان دەست پێکرد. لە جنووبو شیمالی کوردستانیش ئەم هێرشە بە هێزێکی زۆرەوە بۆ سەر ناوچە رزگارکراوەکانو بنکەکانی حیزبو هێزی پێشمەرگە دووپات کرایەوە.

دیسان وەك ساڵانی دیکە دوژمن پرۆپاگاندەیەکی درۆو ریاکارانەی دەست پێکرد کە گۆیا هەموو کوردستانی پاکسازی کردوەو گۆیا لە سەرتاسەری کوردستان حاکمییەتی هەیە. زۆری پێنەچوو دەرکەوت کە هەم لە جنووبو هەم لە ناوەندو هەم لە شیمالی کوردستان پاش دانی کوشتەیەکی زۆر تەنیا توانیویەتی لە چەند جێگا جێگیر بێ. بەڵام هێزی پێشمەرگە لە سەرانسەری کوردستان لە گەشت دایەو هەر وەخت ئیرادە بکاو بە دروستی بزانێ تەنانەت لە نێو شارەکانی کوردستانیشدا زەبر لە دوژمن دەوەشێنێ. لە ماوەی ئەم هێرشانە، لەشکری خومەینی زەبری زۆر توندی وێکەوت، بەرهەڵستی قارەمانانەی پێشمەرگەکانی حیزب لە جنووبو شیمالو هەروەها لە شەڕە گەورەکانی دەوروبەری شاری مەهابادو لە ناوچەی سەردەشت بەڕاستی جێگای شانازینو لاپەڕەیەکی زێڕین لە مێژووی بزووتنەوەی گەلەکەمانن.

ئێستا دوژمن هێزی لە جاران کەمترە، ورەی لەشکرەکەی هاتۆتە خوارێ، لە شەڕ ماندوو بووەو دەتوانین بڵێین کە هەناسەی بڕاوە. دوژمن دڵی بەوە خۆشە کە لە کوردستان پتر لە دووهەزار پایەگای داناوە، بەڵام ئایا ئەمە خۆی نیشانەی ترسو

کزیو لاوازیی دوژمن نیە؟ دوژمن دڵی بەوە خۆشە کە چەند سەد نەفەر جاشی خۆفرۆشی دژی خەڵکی کوردستان چەکدار کردوە. بەڵام لە سێ چوار ساڵی رابردوودا کە ژمارەری ئەم جاشانە چەند بەرابەری ئێستا بوو چیان پێکرا تا ئەمرۆ پێیان بکرێ؟ بە تایبەت کە ئێستا ورەیان بەر داوەو ژمارەیان رۆژبەرۆژ کەم دەبێتەوە. هەروەها دوژمن دڵی بەوە خۆشە کە چەند نەفەر بەزیوو ماندوو خۆیان تەحویلی ئەو داوەتەوە، بەڵام لە راستیدا لە جێگای هەر کام لەوانە کە مەتەرێزی شەرەفیان بەجێ هێشتوە دەیان لاوی دڵسۆزو ئازا هاتوونەتە نێو ریزی حیزبو پێشمەرگە. دوژمن بە خۆڕایی دڵی بەم شتانە خۆش دەکا. بە شانازییەوە دەتوانم بڵێم کە هێزی پێشمەرگە لە باری ژمارەوە نەك هەر کەمی نەکردوە بەڵکوو زیاتریش بووەو لەوەش گرنگتر لە باری چۆنیەتییەوە وەزعی هێزی پێشمەرگە زۆر باشترە، ئەزموونی شەڕی زیاتر بووە، ئینزباتو دیسیپلینی چۆتە سەر، ورەی بەرزە، زۆر کەس لە پێشمەرگە لاوەکان زانکۆی سیاسی ـ نیزامییان دیتوە. لە باری چەکو تەقەمەنیشەوە تەیارەو ئیمانی بە سەرکەوتن لە هەموو کاتێك زیاترە. ئەوە کە هێندێ کەسی ماندوو و بەزیوو ترسەنۆك، هێزی پێشمەرگەو ریزی حیزب بەجێ بێڵن بە قازانجی جووڵانەوەکەمانە. هەروەها کەسانی لادەرو دزو بێ ئەخلاق لە حیزب دەربکرێن هەر بە قازانجی خەباتەکەمانە. بەم جۆرە ریزەکانی حیزبەکەمان باشتر دەتوانێ بزووتنەوەی میللی ـ دێموکراتی خەڵکی کوردستان بەرەو سەرکەوتن رێنوێنی بکا.

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

رێژیمی خومەینی ئێستا لە هەموو کاتێك کزترو بێدەسەڵاتترە. ئەوەکە پاش چەندین هێرش لە کوردستان نەیتوانیوە بە مەبەستەکانی خۆی بگاو ئەوە کە پتر لە شەش مانگە هەڕەشە دەکا کە دوا هێرشی چارەنووسسازی خۆی بۆ سەر عێراق دەست پێدەکاو هێشتا هەر پێی نەکراوە، نیشانەی کزیو لاوازییەتی. سیاسەتی شەڕخوازانەی رێژیمی خومەینی بە بنبەستی تەواو گەیشتوە، ورەی لەشکرەکەی زۆر نزمە، چەکی قورسو باشو بە تایبەتی هی هێزی هەواییو زرێهی بە زەحمەت بۆی پەیدا دەبێ.

وەزعی ئابووریی وڵاتیش لەو پەڕی خراپیدایە. لە چەند مانگی رابردوودا نەوت زۆر کەمتر لە ساڵی رابردوو سادر کراوە، بۆیە داهاتی دەوڵەت کە کەم بوو، کەمتر

بۆتەوەو کەسریی بوودجەی سەر لە میلیاردها تمەن دەدا. بێکاریو تەوەرمو گرانی بێداد دەکەن. پایەی ژیانی زەحمەتکێشان ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دێتە خوارێ. شتێکی ئاساییە کە وەزعی نالەبارو ئالۆزی ولاّت لە نێو کاربەدەستانی ڕێژیمدا، دەنگ دەداتەوەو ناکۆکیو دووبەرەکی لە نێو ئاخووندەکانی حاکمدا توندو تیژتر دەکا. هەر چەند وا دێتە بەرچاو کە "مونتەزێری" وەك جێگری خومەینی دیاری کرابێ. بەلاّم شەڕو کێشە لە سەر جێنشینیی خومەینی هەر درێژەی هەیە. ناتەبایییەکانی نێوخۆی ڕێژیم ڕۆژبەڕۆژ ئاشکراتر دەبن.

ڕێژیم هیوای ئەوە بوو کە پاش بەناو هەلّبژاردنی مەجلیسی شووڕای ئیسلامی، ئەم مەجلیسە یەکگرتوو و یەکپارچە بێ، کە چی ئێستا مەجلیس بەرامبەر بە دەولّەت ڕاوەستاوەو پاش ڕەخنەیەکی توند لە دەولّەت چەند وەزیری پێشنیارکراوی سەرۆك وەزیری ڕەت کردۆتەوە. هەر بۆیە چاپەمەنییەکانی ڕێژیم وەك ڕۆژنامەی جمهووری ئیسلامی، بە ئاشکرا هەڕەشە لە نوێنەرانی مەجلیسی ئاخووندی دەکەن. لە لایەکی دیکەوە ناتەبایی لە نێو ئەرتەشو سوپای پاسداراندا گەیشتۆتە پلەیەکی بەرزتر. دیاردەی گرنگو هەرە تازە ئەوەیە کە ئێستا شەخسی خومەینیش لە توانایدا نیە ئەم دووبەرەکیو ناتەبایییانە چارەسەر بکا. هەروەکوو لە ڕاپۆرتی کومیتەی ناوەندی بۆ کونگرەی شەشەمدا هاتوە، هەموو ئەم ناکۆکییانە نیشانەی بوحرانی قوولّی ڕێژیمی خومەینین کە بەرەبەرە ئیسبات دەکا توانای حاکمییەتو بەڕێوەبردنی کاروباری ولاّتی نەماوە.

لە ڕادەی جیهانیشدا ڕێژیمی خومەینی بە تەواوی بێزراوەو تەریك ماوەتەوە، بۆیە دەستی داوەتە تەیارە ڕفاندنو دانانی مین لە کانالّی سوئێزو زۆر کردەوەی تیروریستیی دیکەو بەم شێوەیە دەیەوێ ئیسباتی وجوودی خۆی بکا. بۆ دەرچوون لەم وەزعەیە کە بەرەبەرە بەلاّم زۆر بە ئاشکرا ڕێژیمی خومەینی خەریکە لە ولاّتانی ڕۆژئاوا بە تایبەتی لە ئەمریکا نزیك دەبێتەوە بەلاّم ئەگەر وەزع بەم شێوەیە بڕواتە پێش بێگومان ناتوانێ ڕێژیمی خومەینی لەو گێژاوەی کە تێی کەوتوە ڕزگار بکا.

**خەلّکی خەباتگێڕی کوردستان!**

لە ڕۆژی جەژنی ٢٥ی گەلاوێژدا، بە خۆشبینیو هیوایەکی زۆرەوە دەڕوانینە داهاتووی جوولاّنەوەی میللی ـ دێموکراتیکی گەلەکەمان. لە کاتێکدا دوژمن بەرەو

کزیو زەبوونیو داماوی دەڕوا، کۆمەلانی خەلکو بە تایبەتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەهێزو تواناتر دەبن. هەر بۆیە ئەرکی سەرشانی هێزی پێشمەرگەیە کە بە پێڕەوی کردن لە تاکتیکی شەڕی پارتیزانی لە سەرانسەری کوردستاندا، لە زەبر وەشاندن لە دوژمنی خوێنمژ بەردەوام بێ. بۆیە ئەرکی سەرشانی گشت کۆمەلانی زەحمەتکێشە کە لە شارو دێ بەربەرەکانێی خۆیان دژی ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی توندوتیژتر بکەن. ڕێژیمی خومەینی بۆ خۆدەربازکردن لە بنبەست خەریکە پاشەکشە دەکاو رووی خۆش نیشان دەدا. بەلام هیچ کەس نابێ فریوی روالەتی ریاکارانەی ڕێژیمی ئاخووندی بخوا. دەبێ هەنگاو بە هەنگاو پاشەکشەی پێ بکەین، سەنگەر بە سەنگەر بچینە پێشو تا رووخاندنی ئەم ڕێژیمە ساتێك لە خەبات رانەوەستین.
ئەندامانی حیزب دەبێ تەشکیلاتی حیزبەکەمان کە چەکی هەرە گرنگمانە پتەوترو بەهێزتر بکەن. دەبێ یەکێتیو یەکپارچەیی فیکریو سیاسی لە هەموو ئورگانەکانی حیزبیدا بە تەواوی سەقامگیر بێو ڕێگا نەدرێ تێکدەرانو لادەرانو ورەدۆڕاوان ریزی حیزبە خۆشەویستەکەمان تێك بدەن. دەبێ بۆ بەهێزتر کردنی شووڕای نیشتمانیی بەرگری زیاتر تێبکۆشینو لە هەلومەرجی ئێستای ئێراندا تەنیا شووڕای نیشتمانیی بەرگرییە کە دەتوانێ وەك ئالترناتیڤێکی دێموکراتی جێنشینی ڕێژیمی خومەینی بێ. دەبێ هاوکاریی خۆمان لەگەل هەموو هێزەکانی جمهووریخوازی دژی ڕێژیم چ لە کوردستانو چ لە بەشەکانی دیکەی ئێراندا پتەوتر بکەینو هەموو پێکەوە بۆ هێنانە سەرکاری ڕێژیمێکی دێموکراتی تێبکۆشین.

هاونیشتمانانی بەڕێز، کۆمەلانی حەقخوازی خەلکی کوردستان، ئەندامانی خۆشەویستی حیزبی دێموکرات، پێشمەرگە نەبەزەکانی کوردستان، جەژنتان پیرۆز بێو بە خۆشیو شادی بژین.

# بەرەو جیهانی گەورەی ئابوری*

دوارۆژەکانی ساڵی ١٣٦٤ بوو، کۆماری ئیسلامی هیچ خەبەرێکی خۆشـیان پـێ نیـە تێکشـکانی بەتـەواوی لـە وەلفـەجری ٩داو پووچەڵبوونـەوەی هـەراو هوریـای تەبلیغاتی کاربەدەستانی رێژیم، ئاسۆی تاریکی شەڕی لە جبهەی فاو، ئـەویش پـاش قوربانی کردنی دەیان هەزار گەنجی ئێرانی، ئەو خەبەرە ناخۆشانەن کە هەر ئێستا لـە بەرچاون. بەڵام خەبەری ناخۆشی‌تر کە بێگومان ئەگەر وەزعەکە هەر بەم جۆرە بـێ وا پشـتی رێژیمـی خومـەینی دەشـکێنێ. هەلومـەرجی تـازە پێکـهاتووی ئابووریـــە. هەڵسـووڕێنەرانی رێژیـم تێ‌دەکۆشـن جـارێ باسـی ئـەو فاجەعەیــە نەکـەن کـە چاوەڕوانیانە. هەمووکەس دەزانێ کە بە پێچەوانەی ئیدیعاکانی کاربەدەستانی رێژیـم لە ماوەی حەوت ساڵی رابردوودا نەك هەر وەزعی ئابووری وڵات باش نـەبووە بـەڵکو لەبەر بێ‌بەرنامەیی‌و بیروباوەڕی تەنگنەزەرانەی ویلایەتی فەقیهی‌و لەبـەر درێژەدانـی شەڕ رۆژبەڕۆژ زیاتر بەرەو هەڵدێر رۆیشـتوە. هـەموو کەسیش دەزانـێ کـە دیسـان بەپێچەوانەی تەبلیغاتی رێژیم، ئابووری ئـێران زۆر پـتر لـە جـاران بەسراوەتەوە بـە داهاتی نەوت. بەڵام داهاتی نەوت هەتا دەڕوا کەمتر دەبێتەوە. لە بـەر هەلومـەرجی شەڕو بومبارانی لە لایەن عێراقەوە، کۆماری ئیسلامی کەمتر لە نیوەی ساڵی ١٣٦٣ نەوت سادر دەکا. بێجگە لەوە نرخی نەوتیش لە بازاڕی جیهانی‌دا نیوە بـووە لـە ٢٧ دولارەوە گەیشتوەتە ١٣،١٤ دولار. لە ماوەی چەند مانگی رابردوودا نرخی دولاریش کە زۆربەی داهاتی نەوت بەم دراوە وەردەگیرێ لە سەدا ٣٠ هاتۆتە خوارێ. بەم جۆرە

---

* ٢٦ی رەشەمەی ١٣٦٤ی هەتاوی

لە ساڵی ١٣٦٥ ئێران تەنیا یەك پێنجەمی داهاتی پێشبینی کراوی دەست دەکەوێو بە کورتی مانگی هەر نەبێ یەك ملیارد دولار کەسری بودجەی دەبێ. کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی هەموو ئەم راستیانەیان دەزانیو تێگەیشتوون کە دەبێ هەوڵ بدەن کە لە سەرچاوەکانی نێوخۆیەوە وەزعی شپرزەی ئابووری چارەسەر بکەن.

رێگای دروست ئەوەیە کۆتایی بە شەڕ بێننو پێش بە هەدەر چونی چەند ملیارد دولار لە ساڵێ بگرن. بەڵام رێژیمی ئاخوندی نە دەیهەوێ نە دەتوانێ کۆتایی بە شەڕ بێنێ چونکە ئاشتی هەڕەشە لە کۆماری ئیسلامی دەکا. بۆیە هەڵسووڕێنەرانی رێژیمی خومەینی، تەنیا رێگایان کەم کردنی بەشی خواردەمەنیو شتومەکی مەسرەفی واریداتیە واتە لەمەودوا گۆشتو برینجو پەنیرو شتی دیکە لە جارانیش کەمتر بە دەستی خەڵکی دەکا. بێجگە لەوە کۆمەلانی خەڵك کە هەر ئێستا داهاتیان زۆر لە زەمانی پێش شۆڕش کەمترە. دەبێ بەشێکی دیکە لەو داهاتە کەمە بە خۆشی خۆیانو یان بە زۆر بدەن بە رێژیم کە هەر نەبێ بتوانێ کەسری ریالی خۆی دابین بکاو بێگومان رێژیم دیسان هەر بە چاپ کردنی ئەسکەناس درێژە دەدا کە ئەم کارەش هەم دەبێتە هۆی گرانی زیاترو هەم وەزعی ئابووری ئالۆزتر دەکا. بەکورتی لەمەودوا کۆمەلانی خەڵك دەبێ کەمتر خەرج بکەن، کەمتر لەبەر بکەن، کەمتر بخۆنو خراپتر بژین. هەر چەندە کە فشارێکی بێوێنە بە سەر خەڵکی ئێراندا زاڵ دەبێ، بەڵام بێگومان ئەم سەرفەجوییەشو خەڵك بێبەش کردن دەردی کۆماری ئیسلامی دەرمان ناکا.

رێژیمی ئاخوندی بێجگە لە تەنگانە خستنی خەڵك رێگای دیکەی پێ شك نایەت. بۆیە ئێستا بۆ بەهاری سالی ١٣٦٥، بۆ رووتاندنەوەی زیاتری خەڵك بەرنامە دادەنێ. وا دێتە بەرچاو ئەم جارە شتێك وەك راگەیاندنی جیهادی گەورەی ئابووری لە سەرانسەری وڵاتی ئاخوندەکان دێتە دەر. رەنگە خومەینی دیسان چەند میسالی تاریخی لەسەرەتای ئیسلامەوە بێنێ کە چۆن موسڵمانەکان هەر بە نانو خورما یان بە نانو پیواز شەڕیان دەکرد. لەبەر ئەوە خەڵكو رەزمەندەکانی ئیسلامیش دەبێ بەوەندە رازی بن.

بێگومان مانای جیهادی ئابووری دەبێتە هۆی هەژار کردنی هەژارانو شپرزە کردنی وەزعی ئابووریو بۆ توندوتیژکردنی خەباتی سیاسیو کۆمەلایەتی

زەحمەتکێشانی شارو دێ. جیهادی گەورەی ئابووری نەك هەر گیروگرفتە ئابووریەکانی ڕێژیم چارەسەر ناکا بەڵکو هەنگاوێکی گرینگی دیکەیە بەرەو ڕووخانی کۆماری ئیسلامی. کاربەدەستانی ڕێژیم خۆیان بۆ جیهادی گەورەی ئابووری ئامادە دەکەن، بیانەوێ نەیانەوێ بەم کارە بۆ ڕاپەڕینی گەلانی ئێران لە پێناوی ڕووخاندنی ڕێژیمی کۆنەپەرستو شەڕخوازی ئاخوندیدا ڕێگا خۆش دەکەن. جیهادی گەورەی ئابووریش وەك زۆر کردەوی دیکەی، کۆماری ئیسلامی دەخاتە مەترسیەوە.

# شکستی ریسواییهێنەری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی*

سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی لە ماوەی ۹ساڵی رابردوودا بەچەند قۆناغی جیاوازدا تێپەڕ بووە. لەسەرەتادا وەختێک جارێ دەوڵەتی کاتی "مهدی بازرگان" لە سەرکار بوو، کەس نەیدەزانی رێژیمی خومەینی چ سیاسەتێکی هەیە. هێندێ لە کاربەدەستان کە لە دەوروبەری بازرگان کۆ بوونەوە دەیانەویست لە ئەساسدا سیاسەتی نێزیکی لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاواو بەتایبەتی لەگەڵ ئەمریکا پێ بدەن لە حاڵێکدا بەشێک لە ئاخوندەکان کە خۆیان بەنێو شۆڕشێکدا خزاندبوو کە دروشمی بمرێ ئەمریکای هەڵگرتبوو نەیاندەویستو لەماوەی شۆڕشدا هەر نەیاندەوێرا سیاسەتی دۆستایەتیو هاوپەیمانی لەگەڵ ئەمریکا بگرنە پێش. سەرلێشێواوی خاسیەتی ئەسڵیی سیاسەتی دەرەوەی ئەوکاتەی کۆماری ئیسلامی بوو. یا بە شێوەیەکی دیکە بڵێین سیاسەتی دەرەوەی رێژیمی خومەینی بێ سیاسەتی بوو. ئەم وەزعە تا داگیرکردنی سەفارەتی ئەمریکا لە تاران لەلایەن بەناو خوێندکارانی خەتی ئیمامەوە بەردەوام بوو. لەو کاتەوە سیاسەتی رێژیم بریتی بووە لە دوژمنایەتیی ئاشکرا لەگەڵ ئەمریکا، بەرێوەبردنی ئەم سیاسەتە هاوکات بوو لەگەڵ لابردنی بازرگانو هاوفیکرەکانی. ماوەیەکی زۆر کاربەدەستانی رێژیم بە شوعاری دژی ئەمریکا گوێی گەلانی ئێرانو دنیایان کەڕ کردبوو بەڵام هەر لەو هەلومەرجەدا هەوڵیان دەدا لەگەڵ زۆر دەوڵەتی رۆژئاوا وەک فەرانسەو ئینگلیستانو ئاڵمانو رۆژئاوا دۆستایەتی بکەن. ئەم قۆناخە نزیکەی ۵ ساڵ درێژەی هەبوو. تا

---

* ۱۰ی خەرمانانی ۱۳٦٦ی هەتاوی

ڕێژیم سیاسەتی دژی سۆڤییەتیی خۆی ئاشکرا کردو هێرشی بردە سەر تەشکیلاتی حیزبی تودەو بەڕێوەبەرانی ئەم حیزبەی بە جاسوسی یەکیەتیی سۆڤییەتی لەقەڵەم دا. سێهەم بایەخدانی ئاشکرا بە تیرۆرو تیرۆریزم. ڕێژیمی خومەینی ئێستا بەگەورەترین عامیلی تیرۆر ناوبانگی دەرکردوەو بەکرێگیراوانی ئەم ڕێژیمە لە هەر جێگایەك بتوانن پیاوە سیاسیەکان تیرۆر دەکەن‌و بۆمب دادەنێن‌و خەڵکی بێگونا دەکوژن، تەیارە دەرفێنن، بارمتە دەگرن، شانتاژ دەکەن، بەکورتی هەرچی کردەوەی دژی ئینسانیە بۆ وان بێگانە نیە.

زۆر مەنتیقیە سیاسەتێك کە لە سەر ئەم سێ ئەسڵە دانرابێ هۆی تاك‌و تەریك مانەوەی ڕێژیمی خومەینی لە مەیدانی سیاسەتی نێونەتەوەییدا بە شێوەیەك تەنانەت یەك دەستی‌و وەفاداریشی نیە، تەنیا جاروبار ئەم یان ئەو دەوڵەت وەك سوریەو لیبی لە سەر مەسەلەیەکی تایبەتی‌و لە بەر مەسڵەحەتێکی تایبەتی پشتیوانیی لێ‌دەکەن. کاربەدەستانی ڕێژیم زۆر نیە هەڕەشە لە ئەمریکا، لە فەرانسەو ئینگلستان، لەولاتانی غەربی‌و زۆر وڵاتی دیکە نەکەن. بەڵام زۆرجار کە دێتە سەر کردەوە پاشەکشە دەکەن‌و قسەی خۆیان قووت دەدەنەوەو هەر بە رووی خۆشیان ناهێنن کە پێشتر چیان گوتوە.

هەڵوێستی کۆماری ئیسلامی بەرامبەر بە ئۆرگانە نێونەتەوەییەکان وەك ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، شوورای ئەمنییەت‌و زۆری دیکەش پڕە لە ناتەبایی. ماوەیەك کۆماری ئیسلامی ئەم ڕێکخراوانە بە عامیلی ئیستکباری جیهانی دادەنێ، ماوەیەکی دیکە بە دوورو درێژی وتووێژیان لەگەڵ دەکاو تەنانەت پەناشیان بۆ دەبا. جاری واش هەیە لەیەك ئاندا ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان‌و شوورای ئەمنییەتی ئەم ڕێکخراوی قبوولّ نیەو بە لایەنگری عێراق‌و ئەمریکایان دادەنێ، کردەوەکانیان مەحکوم دەکا، بەڵام سکرتێری گشتی ئەم ڕێکخراوەی پێ باشەو بە بێ‌لایەنی دەزانێ!!

یەك مانگو نیو لەمەوبەر شوورای ئەمنییەت لە سەر وەستاندنی شەڕ بە تێکڕای دەنگ بڕیارێکی داوە، عێراق ئەو بڕیارەی قبوولّ کردوە بەڵام هەتا ئێستا کۆماری ئیسلامی نەی‌گوتووە ئەو بڕیارە پەسند دەکا یا ڕەدی دەکاتەوە. کاربەدەستانی ڕێژیمی خومەینی دەڵێن بەندی پێنجەمی ئەو بڕیارەمان قبووڵە بەڵام بەندەکانی دیکەمان پێ

باش نیە کە دیارە قسەی ئەوتۆ لە زمان نوێنەرانی رەسمی دەوڵەتێکەوە تەنیا بۆ پێکەنین باشە. پێویستە ئیشارە بەوەش بکرێ کە لە نێوان دیپلۆماتەکانی رێژیمی خومەینیدا لە سەر سیاسەتی دەرەوە هەماهەنگی نیە. ئەوەش نیشانەی بێسەرەوبەرەیی رێژیمە. بەڵام بێجگە لەوە لە نێو کاربەدەستانی هەرەبەرزی رێژیمیشدا لە سەر سیاسەتی دەرەوە ناتەبایی هەیە کە زۆرجار بە ئاشکرا خۆی دەنوێنێ. ئاخر نموونەی ئەوەیە کە رۆژی جومعەی رابردوو خامنەیی هێرشێکی زۆر توندی کردە سەر ئەمریکا، بەڵام رۆژی شەممۆ رەفسەنجانی گوتی ئامادەیە لەگەڵ ئەمریکا پێوەندیی سیاسی دامەزرێنێ.

بەکورتی لە هەلومەرجی زۆر ناسکی ئێستادا سیاسەتی دەرەوەی رێژیم دیسان بێسیاسەتیو سەرلێشێواویە بێگومان ئەم سیاسەتە کە بۆتە هۆی تاكو تەریك مانەوەی رێژیم لە مەیدانی جیهانیدا نەك هەر ئازادیخوازانو بەشەردۆستانی جیهان دژی کۆماری ئیسلامی هان دەدا بەڵکوو وەزعییەتێکی ئەوتۆی پێکهێناوە کە دەوڵەتەکانی زۆر وڵاتی گەورەو بچووکیش بە ئاشکرا دوژمنایەتیی لەگەڵ دەکەن. سیاسەتی ئەوتۆ، واتە سیاسەتێك کە بناغەی لە سەر تێرۆرو دووڕوویيو بێمەسئولیەتی دامەزرابێ بۆ دوارۆژی وڵاتەکەمان پڕە لەمەترسی، بەڵام لەپێش هەمواندا هەڕەشە لە خودی رێژیمی ئاخوندی دەکا. ئەم سیاسەتە زۆرجار نیشتمانی ئێمەی تووشی کارەساتی دڵتەزێن کردوەو ئاگری لە زۆر ناوچەی جیهان بەتایبەتی لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا هەڵایساندەوە، نیشانەی وای بەدەستەوەیە کە رەنگە ئەمجارە رێژیمی کۆماری ئیسلامیش لە نێو ئەو ئاگرەدا بسووتێ.

# وتوویژی ئاشتی له نێوان ئێرانو عێراقدا*

وەختێك له هاوینی پار، پاش ساڵێك ئەملاو ئەولا کردن، بە دوای شکستی پەیتا پەیتا لە مەیدانی شەڕو لە ژێر فیشاری کۆمەڵانی خەڵکدا ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی ناچار بوو بڕیارنامەی ٥٩٨ی شوورای ئەمنییەت قبووڵ بکاو شەخسی خومەینی ژەهرەکەی خواردەوە، هێندێ لە پسپۆڕانی سیاسیی ڕۆژئاوا لەو بڕوایەدا بوون کە ئێرانو عێراق بە خێرایی بەرەو ئاشتی‌یەکی بەردەوام دەڕۆن، بەڵام هەر ئەو کاتە حیزبی ئێمە پاش لێکدانەوەی هەموولایی ڕووداوەکانو جەوهەرو مەبەستی حکوومەتەکانی هەر دوو وڵات، ڕایگەیاند کە لە ئاگربەستەوە تا ئاشتیی بەردەوام، ڕێگاکە دوورە.

ئێستا هەشت مانگ لەو کاتە تێدەپەڕێو جارێ چووکترین ئاسۆیەکی ڕوونی ئ ... ی بەرچاو ناکەوێ. دانیشتنی چەند جاری نوێنەرانی ئێرانو عێراقو تەنانەت وەزیرەکانی دەرەوەی ئەم دوو وڵاتە تا ئێستا ئاکامێکی نەبووە.

... س هاتوچۆیەکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستو لە ئورووپاو ئەمریکا کە ... بوەرۆکی زۆربەیان فیشارهێنان بۆ سەر ئەم دوو حکوومەتە بوو، بۆ ئەوە پێکەوە نیـ ...ـنو بڕیارنامەکە جێبەجێ بکەن، ڕۆژی ٢٠ی مانگی ئاوریل واتە ٣١ی ... ەلێوە بۆ چاوپێکەوتنی وەزیرانی دەرەوە لە ژنێڤ دیاری کراوە. ئەم دانیشتنە لە ... نێنـ ...ـری سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان "پرێزدوکۆیار" پێکدێ.

---

* ... ١٣٦٧ی هەتاوی

هۆی ئەوە کە تا ئێستا وتووێژی ئاشتی بەرەوپێش نەچووە چیە؟ هۆی ئەسڵی ئەوەیە کە لە کاتێکدا عێراق هەر لە سەرەتای شەڕی هەشت ساڵەدا ڕایگەیاند، کە پەیمانی ساڵی ١٩٧٥ کە بە پەیمانی جەزایر ناوبانگی دەرکردوە، هەڵدەوەشێنێتەوە، کۆماری ئیسلامی ئێستاش هەر ئەو پەیمانەو بەتایبەتی ئەو سنوورانەی کە پەیمانی جەزایر دیاری کردوون، بە بناخەی وتووێژ دادەنێ. بۆیە ئێران داوا دەکا کە عێراق بکشێتەوە پشتی ئەو سنوورەی کە پەیمانی جەزایر دیاری کردووە. لە کاتێکدا عێراق لە ئەساسدا ئەو سنوورانەی قبووڵە کە پێش پەیمانی جەزایر بە سنووری نێو دوو وڵات دەناسران.

بە قسەی کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی، عێراق ئێستاش هەر هێندێ خاکی ئێرانی لە بەشی ناوەندی سنووری دوو وڵاتو بەتایبەتی لە "شطالعرب" داگیر کردووەو هەتا خاکی ئێران بەجێ نەهێڵێ، بەندەکانی دیکەی پەیماننامەکە، وەك گۆڕینەوەی دیلو هی دیکە جێبەجێ ناکرێن.

لە قسەکانی کارگێڕانی عێراقڕا دەردەکەوێ کە لە سەر دوو مەسەلەی گرینگ لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا ناکۆکی هەیە. یەکەم عێراق هەموو "شطالعرب" بە هی خۆی دەزانێ. ڕەنگە پاش وتووێژ، لە سنووری ناوەندی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئامادەی سازش بێ. بەڵام بە هیچ شێوەیەك ئامادە نیە واز لە بەشێکی "شطالعرب" بێنێو بیدا بە ئێران. دووهەم لە کاتێکدا ڕێژیمی خومەینی عێراق بە دەستدرێژکەر دەزانێ، عێراق لەو بڕوایەدایە کە ئێران ئەم شەڕەی ساز کردووە.

ڕاستی ئەوەیە کە ئەگەر ئاخوندە دەسەڵاتدارەکان ئەو کاتە کە شوورای ئەمنییەت بڕیارنامەی ٥٩٨ی پەسند کرد، واتە لە ساڵی ١٣٦١دا کە فاوو شەلەمچەو جەزایری مەجنوونو حاجی عۆمەرانیان بە دەستەوە بوو، بڕیارنامەکەیان قبووڵ کردبا، لە وتووێژی ئاشتیدا زۆر سەرکەوتوتر دەبوون. بەڵام خومەینی هەتا بە تەواوی ناچار نەبوو ملی نەداو کاتێك پاش ساڵێك بڕیارنامەکەی قبووڵ کرد کە عێراق سەرکەوتوو و ئێران تێکشکابوو. لە هەلومەرجی ئەوتۆدا زۆر مەنتقیيە کە لە وتووێژی ئاشتیدا عێراق لە هەڵوێستێکی بەهێزترەوە قسە بکا.

بێجگە لەوە چارەڕەشیی ئێران لەوەدایە کە کاربەدەستانی ئێستای لە سەر پێکهاتنو پێکنەهاتن لەگەڵ عێراق بەتەواوی یەك دەنگ نین. لە کاتێکدا هێندێکیان

کە واقیعبینن لەو بڕوایەدان کە ئێران توانای شەڕی نەماوەو باشترە بەرەو ئاشتیی بەردەوام بڕوا. زۆری دیکە ئەو ڕاستییە ناسەلمێننو هەر سیاسەتی هەڕەشەوگوڕەشەیان پیشە کردووە. پاش لاچوونی مونتەزیریو کەسانی وەك لاریجانیو مەحەلاتی کە ڕاستەوخۆ لە وتوویژ لەگەڵ عێراقدا دەستیان هەبوو، توندڕەوەکانو شەڕخوازەکان بەهێزتر بوون، کە ئەمە خۆی دیاردەیەکی لەبار بۆ پێشخستنی وتوویژی ئاشتی نیە. خامنەیی، سەرۆك کۆماری ئیسلامی بۆ بێئەسەر کردنی ئەو فکرە کە ئێران ئاشتی ناوێ، پێریّ گوتی کە ئێران لایەنگری ئاشتییەو ئەوە عێراقە کە وتوویژ بە جیددی ناگرێ. هەروەها پاش لاچوونی لاریجانی، مەحەلاتی بە پێویستی زانی ڕایگەیەنێ کە ویلایەتی وەزیری دەرەوە کە دەنگۆ هەبوو کە ئیستیعفا دەداو دەڕوا، جێگای بڕوای کۆماری ئیسلامیو شەخسی خومەینییە.

بێجگە لەوە کە جەوهەری ئەو دوو ڕێژیمە لێك جیانو بێجگە لەوەش کە دوژمنایەتیی کۆنی فارسو عەرەب شوێنەواری خۆی لە سەر پێوەندییەکانی ئەم دوو ولاتەدا لە کۆنەوە داناوەو ئێستاش پاش هەشت ساڵ شەڕ، برینەکانی بەو هاسانییەو خێراییە سارێژ نابن. بە تەواوی روون نیە کە بەڕاستی کارگێڕانی ئێران ئاشتیی بەردەوامیان بوێ. ئەوان مەبەستیان زۆرتر ئەوەیە کە لە ماوەی ئاگربەس کەڵك وەربگرن بۆ ئەوەی خۆیان بۆ شەڕێکی تازە ئامادە بکەن، ئەگەر ئێستا وەزعی شپرزەی ئابووریو سیاسیو کۆمەڵایەتی ڕێگای ئاژاوەگێڕییان ناداتێ، هیوادارن کە لە دوو سێ ساڵی داهاتوودا ئەم دەرەتانەیان بۆ پێك بێ.

عێراقیش هەم لە بەر ئەوە بە هیچ شێوەیەك بڕوای بە ئاخوندەکان نیەو هەم لە بەر ئەوە کە نازانێ لەگەڵ چ تاقمەو دەستەیەکی تەرەفە، جارێ بۆ گەیشتن بە ئاشتیی بەردەوام زۆر بەپەلە نیە. ڕەنگە عێراق لە سەر ئەوەش حیساب دەکا، کە بە نەمانی خومەینی، وەزعی کۆماری ئیسلامی لەوەش کە ئێستا هەیە شپرزەتر بێو ئەو کاتە ئێران ناچار دەبێ زۆر لە داواکانی عێراق قبووڵ بکا، کە لە هەلومەرجی ئێستادا، واتە هەتا خومەینی ماوە نەدەتوانێو نە ئامادەیە وەریان گرێ.

بەم جۆرە جارێ ڕێگای ئاشتیی بەردەوام لە نێو ئێرانو عێراقدا هەر دوورە. تەنانەت ئەگەر لە چاوپێکەوتنی ڕۆژی ٣١ی مانگی خاکەلێوەشدا پێشڕەفتێك لە وتوویژی ئاشتیدا هەبێ، هەتا بڕیارنامەی ٥٩٨ی وەدی بێ، وەختێکی زۆری دەوێ،

ئێران ٧٠ هەزار و عێراقیش ٣٠ هەزار دیلی لە لایە. خۆی گۆڕینەوەی ئـەم دیلانـە، تەنانەت ئەگەر لە سەریشی رێککەون، چەند مانگ وەختی پێویستە.

وادیارە لە ژێر فیشاری کۆڕوکۆمەڵی نێونەتەوەیی، هەر دوو وڵات ئامادە بوون کە وەزیرانی دەرەوەی خۆیان بۆ ژنێڤ بنێرن، بەڵام هیچ لا خۆی بە تەواوی بۆ رێککەوتن ئامادە نەکردووە. بە پێچەوانە هەر لایەك، لایەکەی دیکـە بـەوە تاوانبـار دەکـا کـە نیازی پاك نیەو ئامادە نیە بۆ رێککەوتن. لە چەند رۆژی داهاتوودا دەردەکـەوێ کـە وتووێژی ئاشتی لە نێوان ئـێرانو عـێراق چـەند هـەنگاو چۆتـە پێـش. جـارێ هیـچ پسپۆڕێکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەم بارەوە خۆشبین نیە.

# سەفەری دەرەوە*

پ: کاك دوکتور پێشەکی لە لایەن بەڕێوەبەرانی دەنگی کوردستانی ئێرانەوە بەخێر هاتننت دەکەم، بەتایبەتی لەوە کە دەعوەتی ئێمەت قبوولْ کردووەو لەم وتووێژەدا بەشداری دەکەی، بەخێر بێیتەوە. لەسەر ئیزنت یەکەم پرسیار دێنمە گۆڕێ ئەگەر هەڵەم نەکردبێ سەفەرەکەتان بۆ دەرەوەی وڵات چەند مانگێکی خایاند. دیارە کورتەیەك لە چۆنیەتی ئەم سەفەرەو ئەوە کە چ تێکۆشانێکتان لە دەرەوەی وڵاتدا هەبووە لە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارەی ١٤٤دا چاپ‌و بڵاو بۆتەوە. بەڵام پێمان خۆش بوو ئەگەر زەحمەت نەبێ‌و بە زەحمەتی نازانن بۆ ئاگاداریی گوێگرە بەڕێزەکانی دەنگی کوردستانی ئێران، بە کورتی لە بارەی سەفەرەکەتان باسمان بۆ بکەی، ئەوە کە چوویە کوێ، کێتان دیوەو چتان کردوە؟

و: لە پێشدا سڵاو لە گوێگرە خۆشەویستەکان دەکەم‌و هەروەها سپاسی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران دەکەم کە جارێکی دیکە بانگهێشتنیان کردوم بۆ ئەوە لەسەر سەفەری خۆم بۆ گوێگرە بەڕێزەکان قسە بکەم. ئەوەش نەك هەر بە زەحمەت نازانم بەڵکوو بە شانازی دەزانم‌و ئەرکی سەرشانی خۆمە کە هاونیشتمانانی خۆشەویست‌و هەروەها لایەنگرانی حیزب‌و ئەندامانی حیزب‌و پێشمەرگە خۆشەویستەکان لە ئاکامی سەفەرەکەم ئاگادار بکەمەوە. لەو ماوەیەدا من دوو سەفەرم بۆ دەرەوە کرد. پاش سەفەری یەکەم بۆ مانگێك گەڕامەوە کوردستان، دیسان چوومە دەرەوە، لە سەفەری یەکەمدا چووم بۆ ئەو وڵاتانە: فەرانسە، ئیسپانیا،

---

* زستانی ١٣٦٧ی هەتاوی

چێکۆسلۆڤاکی، سوئێد. لە سەفەری دووهەمدا چووم بۆ فەرانسەو ئۆتریش. لەم دوو سەفەرەدا چاوم بە نوێنەری دەوڵەتانو ڕێکخراوە سیاسی‌یەکانو شەخسیەتەکان کەوت. لە فەرانسە بێجگە لە شەخسیەتە هەرە بەرزەکانی دەوڵەتی، نوێنەرانی حیزبی سۆسیالیستو حیزبی کومۆنیستو چەند ڕێکخراوی دیکەم دیوە، لە ئیسپانیاش بێجگە لە نوێنەرانی پایەبەرزی دەوڵەت، نوێنەرانی حیزبە سۆسیالیستو دێموکراتەکانو چەند ڕێکخراوی دیکەم دیوەو هەروەها چاوم بە سەرۆك وەزیری دەوڵەتی خودموختاری کاتالاّن لە بارسلۆن کەوت کە ڕۆژێك میوانی بووم. لە سوئێد لەگەڵ نوێنەرانی پایەبەرزی دەوڵەتی، نوێنەرانی حیزبی سۆسیال دێموکرات، نوێنەرانی پارلمان، سکرتێری گشتیی سەلیبی سوورو زۆر کەسی دیکە دانیشتوم. ئورگانە ڕەسمی‌یەکانیش شەوێك بە ڕەسمی دەعوەتیان کردوم کە زۆر شەخسیەتی پایەبەرزی دەوڵەتیو نوێنەری ڕێکخراوەکانو نوێنەرانی پارلمانی تێی‌دا بەشدار بوون. لە چێکۆسلۆڤاکی‌دا میوانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی چێکۆسلۆڤاکی بوومو لەگەڵ نوێنەرانی ئەم حیزبە وتووێژم بووە لە ئۆتریش لەگەڵ دوکتور "هانس فیشر" کە زۆر لایەنگری کوردەو سەرۆکی فراکسیۆنی پارلمانی حیزبی سۆسیالیستەو چەند شەخسیەتی بەرزی سیاسیو دەوڵەتی چاوپێکەوتنم بووە لە فەرانسە لە وتووێژی چاپەمەنی کە زۆر بە ڕێکوپێکی پێك‌هاتبوو و نێزیك بە ٧٠ نوێنەری تەلەویزیۆنو رادیۆو ڕۆژنامەکانو هەروەها ڕێکخراوەکانی سیاسی بەشدارییان کرد. بێجگە لەوە لەگەڵ رادیۆ بی.بی.سی، دەنگی ئامریکا، هەر سێ کاناڵی گەورەی تەلەویزیۆنی فەرانسەو رادیۆی فەرانسەو چەند ڕۆژنامەی دیکەی فەرانسەو ڕۆژنامەکانی ئورووپاو کانادا وتووێژم کردوە کە هەموو لە وەختی خۆی‌دا بلاّو بوونەتەوە لە ئیسپانیا، بێجگە لە وتووێژ لەگەڵ گەورەترین ڕۆژنامەکانی ئیسپانیا وەك "الپایز"و "ئەدیاریو" لەگەڵ تەلەویزیۆنو چەند ڕۆژنامەی ئامریکای لاتینو هەروەها نوێنەرانی ڕێکخراوەکانیش وتووێژم کردوە. هەروەها لە ئیسپانیا لە کۆنفرانسێکدا کە لە لایەن ئەنستیتۆی ئامریکای لاتینو ئافریقاوە پێك‌هاتبوو بەشدار بوومو لە بارەی ئاکامی شەڕ لە نێوان ئێرانو عێراقو تەئسیری لەسەر جووڵانەوەی گەلی کورد کونفرانسم داوە، لەو کونفرانسەدا نێزیك بە ٤٠ کەس لە شەخسیەتە سیاسی‌یەکانو پسپۆڕەکان، بەشدار بوون. لە سوئێد وتووێژێکی درێژم لەگەڵ تەلەویزیۆنو رادیۆو هەروەها

ڕۆژنامەی "کوردستان پرێس" بووە کە لە لایەن کوردەکانی سوئێدەوە دەردەچێ، هەروەها لە سوئێد لە ئەنستیتۆی وەزارەتی دەرەوە کونفرانسێکم داوە کە لەوێش‌دا نیزیك بە ٤٠ کەس دیسان لە پسپۆڕەکان‌و شەخسیەتە سیاسی‌یەکان تێی‌دا بەشدار بوون. لە ئۆتریش‌دا وتووێژم هەبووە لەگەڵ ڕادیۆ کە بە درێژی بڵاو بووەتەوەو هەروەها لەگەڵ ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی ئوتریش وەك "دی‌پرس"و "ئەزباتین بای تونگ" کە ڕۆژنامەی حیزبی سۆسیالیستی سوئێدە. لە سەفەری دووهەمم لە فەرانسە، لە شووراى ئەنترناسیۆناڵی سۆسیالیست‌دا بەشدار بوومو هەروەها بەهۆی دەعوەتی حیزبی کومۆنیستی فەرانسە لە سەدەمین ساڵی دانانی سروودی ئەنترناسیۆناڵ کە سروودی زۆربەی حیزبە کومۆنیستەکان بووە لە شاری "لیل"دا بەشدار بووم. لەم دوو دەرەتانە کەڵکم وەرگرت بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ دەیان سەرۆك وەزیرو وەزیرو نوێنەری پارلمان‌و نوێنەرانی حیزبە سۆسیالیست‌و کومۆنیستەکان. بێجگە لەوە لەگەڵ زۆر شەخسییەتی کوردستانی عێراق‌و تورکیەو هەروەها زۆر لە شەخسییەتەکان‌و نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی ئوپۆزیسیۆنی ئێرانی دانیشتنم بووە. هەروەها لە هەموو ئەو وڵاتانەدا لەگەڵ ئەندامان‌و لایەنگرانی حیزب چەندین جار کۆبوونەوەم کردوەو وەزعی کوردستانی ئێرانم بۆ باس کردون، بەم جۆرە کە دەبینن لە ماوەی بوونم لە دەرەوەدا بێکار دانەنیشتوم!

پ: کاك دوکتور ئەوساڵ مەسەلەی کورد بە شێوەیەکی بەربڵاو کەوتە سەر زارو زمانان‌و لە ڕادەی جیهانی‌دا هاتە بەرباس‌و لە زۆر وڵات‌و بەتایبەت لە زۆر ڕۆژنامەو گۆڤاری موعتەبەرو بەناوبانگی جیهانی‌دا باسی کورد کراوە. پێم خۆش بوو نەزەری جەنابتان لەم بارەوە بزانم بەگشتی چۆن چاو لە مەسەلەی کورد لە ڕادەی جیهانی‌دا دەکرێ؟

و: ڕاستی ئەوەیە کە چۆنیەتیی هێنانەگۆڕی مەسەلەی کورد، ئێستا لە جیهان‌دا گۆڕاوە. مەسەلەی کورد باشتر ناسراوەو باشتر پشتیوانی لە مافی گەلی کورد دەکرێ. ئەو باشتر ناسینە، ئەوەندە چووەتە پێش کە مەسەلەی کورد خەریکە دەبێتە مەسەلەیەکی نێونەتەوەیی. زۆر دەرگا کە پێشتر داخرابوون، کراونەتەوەو نوێنەرانی کورد لە زۆر جێگا وەردەگیرێن کە پێشتر بە هاسانی وەرنەگیراون. یارمەتیی سیاسی‌و مەعنەوەیی بزووتنەوەی کورد لەمەودوا وا تێدەگەم کە زۆر زیاتر دەبێ، بەرەبەرە

ڕێگا خۆش دەبێ بۆ ئەوە مەسەلەی کورد لە نێو ڕێکخراوەکانی نێونەتەوەییش‌دا بێتە گۆڕێ. بۆ نموونە بڕیار دراوە کونفرانسێك بۆ دیفاع لە مـاف‌و هۆویەتی فەرهەنگیی گەلی کـورد لـە ڕۆژەکـانی ٢٨و ٢٩و٣٠ی مـانگی بانەمـەڕی سـاڵی داهـاتوو لـە دووسەدەمین ساڵی بلاوبوونەوەی بەیاننامەی مافی مرۆڤ لـە پـاریس پێـك بـێ کـە وەزیری موشاویری فەرانسە بۆ کردەوەی بەشەردۆستانە پێکی دێنێ. لەم کونفرانسەدا نوێنەرانی زۆر ڕێکخراوی گەورەو حیزبە سیاسی‌یەکان لە سەرانسەری جیـهان بەشـدار دەبن‌و هەروەها دیارە نوێنەری ڕێکخراوە کوردستانی‌یەکان، حیزبی ئێمەش بە ڕەسمـی داوەتی لیٚ‌کراوە کە نوێنەری خۆی بۆ ئەم کونفرانسە بنێرێ.

پ: کاك دوکتور بە نەزەری جەنابتان بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد وەك مەسەلەیەکی گشتی لە رادەیەکی جیهانی‌دا بێتە گۆڕێ‌و سەرنجی بیروڕای گشتیی جیـهانی بـۆ لای خۆی ڕابکێشێ، دەبێ چ بکەین؟ یانی تەنیا لەبـەر ئـەوە باسـی نـەکرێ کـە چـەکی شیمیایی لە دژی بەکار هێنراوە یا نا بەڵکوو وەك نەتەوەیەکی بندەست‌و بێ‌بـەش لـە هەموو مافێکی ئینسانی سەیری بکرێ؟

و: بەکارهێنانی چەکی شیمیایی مەسـەلەی کـوردی زیـاتر لـە جـاران لـە ڕادەی جیهانی‌دا هێنایە گۆڕێ. بەداخەوە زۆر کەس، بڵێم هەزاران کەس لە کـورد بکـوژرێ، هەتا مەسەلەی کورد وەك ئەمڕۆ لە ڕادەی جیهانی‌دا زەق بێ. بەڵام بـە نـەزەری مـن ڕێکخراوە سیاسی‌یەکان دەبێ لەو وەزعە تازەیە کە پێك‌هاتوە کەڵك وەربگرن بۆ ئـەوە مەسەلەی کورد تەنیا نەبەستنەوە بە چەکی شیمیایی‌یەوە. لـەوەش زیـاتر مەسـەلەی کورد تەنیا مەحدوود بە عێراقیش نەکرێ، مەسەلەی کورد لە هەموو ئەبعادی خۆی‌دا بەو شێوەیە کە هەیە لە واقیع‌دا مەسەلەی ٢٥ میلیۆن کوردە دەبێ مـەترەح بکـرێ‌و پێم‌وایە کە ئەگەر بەو شێوەیە ئێمە بچینە پێش سەرکەوتنمان زیاتر دەبێ. موهێمیش ئەوەیە کە ئەو پەیامەی کە ئێمە لەو وەزعە تازەیەدا دەینێرین پەیامێك بێ کە بـاش لە دەرەوە وەربگیرێ. دەبێ بە هەموو ئەو کەسانە کە گوێیـان لـە قسـەکانی ئێمەیـە بڵێین کە داوای کورد زۆر سادەو ڕەوایە، کورد مـافی نەتـەوەیی خـۆی دەوێ کـە لـە بەیاننامەی جیهانیی مافی مرۆڤدا هاتوە. واتە شتێکی زیادی نیە، بۆیە مەسـەلەن داوای خودموختاری مەسەلەیەکی نێوخۆیی نیە. چونکـە لـە زۆر لـە دەوڵـەتان وەك دەوڵەتی ئێران ئەگەر باسی خودموختاری دەکرێ دەڵێ ئەوە مەسەلەیەکی نێوخۆیـی‌و

داخلی خۆمە کەس هەقی نیە دەستی تێ وەربدا کەوابوو مەسەلەی خودموختاری مەسەلەیەکی نێوخۆیی نیەو بەشێکە لە مافی مرۆڤ. بۆیەش ئەو دەوڵەتو رێکخراوو شەخسییەتانە کە خۆیان بە لایەنگری مافی ئینسان دەزانن پێویستە لە داوا رەواکانی گەلی کورد پشتیوانی بکەن. نێونەتەوەیی کردنی مەسەلەی کورد یانی ئەوە، یانی راکێشانی پشتیوانیی جیهانی بۆ مافە رەواکانی گەلی کوردو هەرچی ئەم پشتیوانیە زیاتر بێ ئەوکاتە بێگومان فشارێکی پتر دێتە سەر ئەو وڵاتانەی کە کوردی تێدا دەژیو ناچاریان دەکا داوای بیروڕای گشتیی جیهانی بخەنە بەرچاو، هەرچەند هێندێك لەو دەوڵەتانە وەکو مەسەلەن رێژیمی خومەینی وا نیشان دەدا کە هەرچی لە دنیا بگوترێ گوێی ناداتێ، بەڵام لە راستیدا وانیە. بە تەجروبە بۆمان دەرکەوتوە کە فشاری نێونەتەوەیی تەئسیری زۆری هەیە. بۆ ئەوەی بزووتنەوەی کوردستان لە دەرەوە نەبێتە مەسەلەیەکی فەسڵی پێویستە بێجگە لە درێژەپێدان بە خەباتی نێوخۆ کە ئەسڵەو ئەوە دەبێ زۆر جار هەر بگوترێ کە هەرچی لە دەرەوە دەکرێ دەتوانێ یارمەتی بدا بە خەباتی ئێمە بەڵام خەباتی ئەسڵی، خەباتی خۆمانە لە نێوخۆی کوردستاندا. دەبێ لە دەرەوەش تێکۆشانی زیاتر بکرێو هێندێك هەماهەنگیش لەو تێکۆشانەدا پێك بێ، بۆ ئەوە کە هەم مەسەلەی کورد باشتر بناسرێو هەم بیروڕای گشتیی جیهانی پشتیوانیی زۆرتر لە مافی ڕەوای گەلی کورد بکا. بەتایبەتی زۆر پێویستە نیشان بدرێ کە بزووتنەوەی کورد بزووتنەوەیەکی دێموکراتی ئینسان دۆستە، ئەسیلە، رابردووی دوورو درێژی هەیە، دوورە لە تیرۆریزمو کردەوەی تیرۆریستی چ لە نێوخۆی وڵاتو چ لە دەرەوە. بە تەجروبە بۆم دەرکەوتووە کە ئەگەر ئێمە پەیامی خۆمان بەو شێوەیە بنێرینە دەرێ، بەو زمانە لەگەڵ نوێنەرانی تەنانەت دەوڵەتانیشو رێکخراوەکانی سیاسیو رۆژنامەنووسەکان قسە بکەین، قسەکانمان زۆر باشتر وەردەگیرێو زۆر زیاتر پشتیوانمان بۆ پەیدا دەبێ.

پ: کاك دوکتور ئەودەم کە لە دەرەوەی وڵات بوون، خەبەری بەشداریی حیزبی ئێمە لە کۆبوونەوەی ئەنترناسیۆناڵی سۆسیالیستدا لە رادیۆ بڵاو کرایەوە، بەتایبەتی باسی هەڵوێستی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستمان لەسەر مەسەلەی کورد کرد. ئێستا ئەگەر دەگونجێو ئیمکانی هەیە هێندێك زیاتر ئەم مەسەلەیە بۆ ئێمەو گوێگرە بەرێزەکانمان شی بکەنەوە بەتایبەتی ئەوە کە بۆخۆشتان لەو کۆبوونەوەدا بەشداریتان

هەبوو گومانی تێدا نیە لە هەڵوێستگرتنی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیت بەرانبەر بە مەسەلەی کورد نەخشتان هەبووە.

و: هەروەها کە دەزانن ئێمە یەکەم جار سێ ساڵ لەوەی پێش لە کۆنگرەی ١٧ی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە شاری لیما لە پرۆ بەشداریمان کرد وەك یەکەم حیزبی کوردستانی بووین کە بانگ کرابووین. هەر لەوێدا بۆ ناساندنی مەسەلەی کورد بۆ ئاشناکردنی حیزبە سۆسیالیستی‌یەکان لەسەر وەزعی کوردستان هەولێکی زۆر درا. ئەمساڵ لە ١٥و ١٦ی مانگی سەرماوەزدا، شوورای ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە شاری پاریس پێکهات کە زیاتر مەبەستی ئامادەکردنی کۆنگرەی ١٨ی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستە کە بڕیار وایە لە مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٦٨دا لە شاری ستۆکهۆلم پێك بێ. ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە لەو هەلومەرجەدا کە شوورای ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە پاریس گیرا هەروەها کە گوتت مەسەلەی کورد وەك مەسەلەیەکی زەق لە بەرچاو بوو. هەڵوێستی بیرورای گشتیی جیهانی نیسبەت بە مەسەلەی کورد زۆر گۆڕابوو، زۆر باشتر ببوو. بەشدارانی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستیش لەگەڵ مەسەلەی کورد زیاتر ئاشنا بوون. پاش مەشوەرەت لەگەڵ نوێنەرانی یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان کە ئەوانیش لەو شوورایەدا بەشدار بوون هاتینە سەر ئەو بڕوایە کە دەبێ زیاتر "ذهنی" بەشدارانی شووراو بەتایبەتی ئەوانە کە لە ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستدا دەسەڵاتیان هەیە روون بکەینەوە. لەسەر مەسەلەی کوردو پەیامی خۆمان ئەو پەیامەی کە باسم کرد ئەو پەیامەیان پێ رابگەیەنین. لە لایەکی دیکەشەوە ئەگەر دیتمان کە هەلومەرج لەبارەو ئامادەیە، ئەو کاتە شتێکیش بە نووسراوە پێشکەش بکەین ئەوە بوو کە دەستمان کرد بە دانیشتنو قسەکردن لەگەڵ زۆر لە نوێنەرانی حیزبە سۆسیالیستی‌یەکانو بەتایبەتی ئەوانەی کە لەواقیعدا سەرۆکایەتیی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستیان بەدەستەوەیە وەك "ویلی برانت" کە سەرۆکی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیتە وەك "پنتی وانن" کە سکرتێری ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستەو هەروەها "پیر موروا" کە سکرتێری یەکەمی حیزبی سۆسیالیستی فەرانسەیەو میوانداری ئەو شوورایە بوو، لەگەڵ نوێنەرانی حیزبی سۆسیال دێموکراتی ئاڵمانو سوئێد، لەگەڵ خودی سەرۆك وەزیری سوئێد "کالسۆن" کە ئامادە بوو لەوێ قسەمان کرد لەگەڵ نوێنەرانی حیزبی سۆسیالیستی ئۆتریشو

ئیسپانیاو زۆر لە حیزبە سۆسیالیستەکانی ئامریکای لاتین‌و وڵاتانی دیکەدا چاوپێکەوتنمان هەبوو و بۆمان دەرکەوت کە بێ ئەملاو ئەولا هەموویان ئامادەن پشتیوانی لە مافی ڕەوای گەلی کورد بکەن. ئەوە بوو کە دەستمان کرد بە ئامادەکردنی بەڵگەیەك کە لە رۆژنامە کوردستاندا چاپ بووە. ئامادەکردنی ئەو بەڵگەیە درا بە من‌و منیش پاش ئەوەی کە بە شێوەیەکی ئەوتۆ ئامادەم کرد کە لەواقیعدا هەموو کەس وەری‌بگرێ لە عەینی وەختیش‌دا داخوازەکانی، هەموو داخوازەکانی گەلی کوردی تێدا بێ. پاش ئامادەبوون بڵاوکرایەوە لە نێو هەموو نوێنەرانی شوورادا بەڵام چونکە لە بەرنامەدا مەسەلەیەکی وا نەگونجا بوو و لە لایەکی دیکەشەوە هەر بڕیارنامەیەك کە شوورای ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست پەسندی دەکا دەبێ پێشتر، مانگێك پێشتر کومیسیۆنی پێویست ئەو بەڵگەیە ئامادە بکا یا پەسندی بکا، لەبەر ئەوە باسی مەسەلەی کورد خرایە ئاخری دوادانیشتنی شوورای ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست. قازانجی ئەوە بوو کە هەموو وەختێك لە ئاخری بلێین ئاخرین کۆبوونەوە، لە دواکۆبوونەوەی شوورادا کە ئیدی خەریکە شوورا تەواو دەبێ، هەموو نوێنەران ئامادە دەبن لێرەدا سکرتێری گشتیی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست "وانن" مەسەلەی کوردی هێنایە گۆڕێ، داوای لە من کرد کە قسەی لەسەر بکەم. "ویلی برانت" کە سەرۆکی کۆبوونەوەکە بوو ئیجازەی قسەی دامێ، منیش قسەم کردو هەروەها ئاگادارن هەم سکرتێرو هەم خودی ویلی برانت پشتیوانی‌یەکی گەرمیان لە قسەکانی من کردو بەڕاستی تەواوی شوورا بە چەپڵەلێدانێکی زۆر گەرم قسەکانی ئێمەی وەرگرت‌و ئەو بەڵگەیەی پەسند کرد. بە نەزەری من ئەو بەڵگەیە لەم بارەوە گرینگە کە بۆ یەکەم جارە کە شوورایەکی ئەوتۆ گەورە بەڵگەیەکی ئاوا پەسند دەکا. لەم بەڵگەیەدا باسی گەلی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان کراوە باسی ٢٥ میلیۆن کورد دەکرێ. لەم بەڵگەیەدا هاتوە کە پشتیوانی لە مافی ڕەوای گەلی کورد دەگوترێ‌و ناگوترێ خودموختاری یا شتێکی دیکە، ئەویش هۆیەکەی ئەوە بوو کە ئەگەر ئێمە لە کوردستانی ئێراندا داوای خودموختاری دەکەین، هێندێك ڕێکخراو مەسەلەن لە کوردستانی تورکیە داوای شتێك زیاتر لە خودموختاری دەکەن. بۆیە ئێمە هەر مافی نەتەوەیی گەلی کوردمان لەوێ داناوە لە پاشان لەوێ گوتراوە کە مافی نەتەوەیی کورد بەشێکە لە مافی مرۆڤ و مەسەلەیەکی نێوخۆیی ئەو وڵاتە

نیە، بۆیە هەموو کەس دەبێ دیفاعی لیٚ بکا. هەروەها لــەو بەڵگەیــەدا هــاتوە کــە مەسەلەی کورد ڕێگای چارەســەر کردنــی نــیزامیی نیــە، بــەڵکوو ئــەویش وەك زۆر مەسەلەی دیکە دەبــێ لــە ڕێگــای وتوویــژەوە چارەســەر بکــرێ. بێجگــە لــەوە لــەو بەڵگەیــەدا هــاتوە کــە ڕێگــای چارەســەرکردنی ئــەو مەســەلەیە بــە دامــەزراندنی دێموکراسی لەو وڵاتانەدا کە کورد تێیاندا دەژی، باشترو لەبارتر پێك دێو مەســەلەی کورد باشتر چارەسەر دەکرێ. بەکورتی دەتوانم بڵێم کە ئەگەر هەمووی ئــەو بەڵگەیــە تەماشا بکەین لەواقیعدا شوعاری ئەســڵیی ئێمــە، حــیزبی دێموکراتــی کوردســتانی ئێران، دێموکراسیو خودموختاریی تێدایــە، پێــم خــۆش بــوو ئــەوەندەش بڵێــم کــە بێگومان لە کۆنگرەی داهاتووی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستدا بڕیاری زۆر مۆفەسەلترو ڕێکوپێکتر لەسەر مەسەلەی کورد دەدرێ. گرینگیــی ئــەو بڕیــارە هــەر ئەوەیــە کــە گەورەترین ئەنجومەنی حیزبە سیاسییەکانی جیــهان کــە بەڕاســتی ئەنجومــەنی پــانو بەرینتر لــە ئەنجومــەنی ئەنترناســیۆناڵ سۆسیالیســت نیــە کــە ئــەو هــەموو حیزبــە سیاسییەی لە نێوخۆدا کۆ کردبێتەوەو بەتایبەتی کە زیاتر لــە ١٧ حــیزبی بەشــداری ئەم ئەنترناسیوناڵە حکوومەتیان بەدەستەوەیە، بۆ یەکەم جار بەڵگەیەکی وایان پەسند کردوە، ئەوە مانای ئەوەیە کە بەرەبەرە دەوڵەتەکانی ئەو وڵاتانــەی کــە حیزبــەکانیان سۆسیالیستو حکوومەتیان، دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە، ئــەوانیش لــە دوارۆژدا زیــاتر موتەعەهیدو ناچار دەبن کە لە مافی ڕەوای گەلی کورد پشتیوانی بکەن.

پ: با بچینە سەر باس لە تێکۆشانی حیزبەکەمان. کاك دوکتور وەزعــی حــیزب لە ڕادەی نێونەتەوەییدا چۆنە، چۆن دەناسرێ، بە وتەیەکی دیکە چۆن خۆی ناساندوە؟ ئەگەر دەکرێ لەم بارەشەوە هێندێك باسمان بۆ بکەن.

و: دیارە زۆر جار باسی ئەو مەسەلەیەم کردوە، بەڵام هێندێك شت هەر پێم خۆشە دووپات بکەمەوە. ڕاستی ئەوەیە کە حیزبی ئێمە وەك حیزبێکی سیاسیی مەسئوولو خاوەن نفووزو دێموکرات ناسراوە، ڕۆژ بە ڕۆژیش ڕێزو قەدری لــە لای ڕێکخراوەکــانی سیاسیو ڕۆژنامەنووسەکانو بیروڕای گشتیی جیهانی دەچێتە سەر، تەنانەت بەرەبەرە هێندێك دەوڵەتیش ئامادەن کــە ڕاســتەوخۆ لەگــەڵ حــیزبی ئێمــە پێوەنــدی بگــرنو پشتیوانیمان لیٚ بکەن. ئەگەر من ناوی ئەو دەوڵەتانە ناهێنم، چونکــە هێنــدێ جــار مەحزووری سیاسییان هەیەو پێم باشە کە ئێمــە ڕەعایــەتی ئــەوان بکــەینو ئــەوەش

خۆی نیشانەی ئەوەیە کە ئێمە حیزبێکی سیاسیی مەسئوولین. ئەو وەزعەی کە ئێستا پێك هاتوە لە نەتیجەی دوو هۆی گەورەیە:

یەکێکیان کە ئەسڵەو ئەساسە، خەباتی حیزبی ئێمە لە نێو وڵاتدایە کە هەر باسی پاش شۆڕشی ئێرانیش بکەین ۱۰ ساڵە لەو مەیدانەدا موقاومەت دەکا، بەرامبەر بە ڕێژیمێکی وەك ڕێژیمی خومەینی راوەستاوەو ئێستاش کە ئێستایە زۆربەی زۆری خەڵکی کوردستان بەدڵەوە پشتیوانیی لیّ دەکەن.

دووهەم: سیاسەتی دروستو واقیعبینانەی حیزبەکەمانو ناساندنی ئەو سیاسەتە لە دەرەوەیە کە لە دەرەوە ڕێکخراوەکانی سیاسی، شەخسییەتەکان، دەوڵەتەکان، ڕۆژنامەنووسەکان، حیزبی ئێمە بە حیزبێکی واقیعبینو دێموکرات دەناسن کە تەبلیغاتی درۆ ناکا، خۆی هەڵ ناکێشێ وەك هێندێ کەسی دیکە، شوعاری توندوتیژی غەیری واقیعی نادا بەڵکوو تەحلیلەکانی لەسەر واقیعییەت داناوە، جا زۆرجار ئەو تەحلیلانە دەبنە هۆی پێناخۆشبوونی زۆر ڕێکخراوو شەخسییەتی بلێین ئوپۆزیسیۆن. بەڵام ئەوە دیارە مەربووت بە خۆیانە کەوابوو ئێمە دەبێ لەم بارەوە زیاتر هەوڵ بدەین، یانی سیاسەتی حیزبەکەمانو خەباتی گەلەکەمان زیاتر لە جاران لە دەرەوە بناسێنینو پێموایە ئەگەر ئێمە ئەو کارە بکەین تەئسیری یەکجار زۆری دەبێ، ئەوەش نابێ زیاد نەکەم کە بەڕاستی حیزبی ئێمە چونکە لە سەرەتاوە هەموو شێوەکارو کردەوەی تیرۆریستی ڕەت کردۆتەوە ئەوەش بۆخۆی پرستیژێکی تایبەتی بۆ حیزبی ئێمە لە نێو هێزە دێموکراتییەکانی جیهاندا پێك هێناوە. دەمەویست نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە ئەویش ئەوەیە حیزبی ئێمە تەنیا حیزبێکی کوردستانی بوو کە هەم لە ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستدا بەشدار بوو و هەم لەو دەعوەتەی کە حیزبی کومۆنیستی فەرانسە بۆ ۱۰۰ ساڵەی جێژنی سروودی ئەنترناسیۆناڵ سازی کردبوو، تەنیا حیزبێك بوو مەبەستم ئەوەیە کە لە هەموو لاوە حیزبی ئێمە بە حیزبێکی خاوەن نفووزو دێموکراتو مەسئوول دەناسن، زۆر دەرگا ئێستا ئاواڵەیە کە لە پێشدا ئاواڵە نەبوون، بێگومان لە دواڕۆژیشدا پێموایە لە دواڕۆژیشدا لەمەش باشتر دەبێ. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە من لە دەرەوە دەبمو پێوەندی دەگرم لەگەڵ زۆر شەخسییەتو ڕۆژنامەنووسو نوێنەری حیزبو ڕێکخراوەکان هەروەها کە باسم کرد لەو دەمەدا زۆر شانازی بەوە دەکەم کە نوێنەری حیزبی دێموکراتم.

پ: کاك دوکتور لە پەیامی جەنابتان بەبۆنەی ٢٢ی ڕێبەندان، ساڵڕۆژی شۆڕشی گەلانی ئێران هەروا بەکورتی ئیشارەیەکت بە وەزعی ئێستای ئێران‌و داهاتووی ئێران کردبوو. پێم وایە زەرەرێکی نیە ئەو بەشە بکەمە پرسیارێك‌و لێتان بپرسم نەزەرت بەرانبەر بە وەزعی ئێستای ئێران‌و داهاتووی ئێران چۆنە بەتایبەتی بەرانبەر بە پەیامی ئەم دوایانەی خومەینی؟

و: بە یەك وشە هەموو دیاردەیەکی وەزعی ئێستای ئێران نیشانەی بوحرانێکی قووڵە. ئەوەی کە ئێمە لە بەڵگە رەسمی‌یەکانی حیزبی خۆماندا پێش‌بینیمان کردبوو ئێستا هاتۆتە دی. لە واقیعدا کۆماری ئیسلامی لە گێژاوێك دایە کە نازانێ چۆن خۆی رزگار بکا. هیچ مەسەلەیەکی گرینگ نیە کە کاربەدەستانی ڕێژیم ناکۆکی‌یان لەسەر نەبێ. پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە، قەرز وەرگرتن یان وەرنەگرتن لە وڵاتانی دەرەوە، بازسازیی وڵات، بازسازیی وڵات بە دەس دەوڵەت بێ یا بە دەس بەشی خسووسی‌یەوە بێ، پێکهێنانی فەزای ئازاد ببێ یا نەبێ، ئازادیی تێکۆشانی سیاسی ببێ یا نەبێ، مەسەلەی کورد چارەسەر بکرێ یا چارەسەر نەکرێ، لەسەر هەموو ئەوانە کاربەدەستانی هەرە گەورەی ڕێژیم ناکۆکی‌یان لە بەیندا هەیە. مونتەزێری‌و رەفسەنجانی دەڵێن شۆڕشی ئیسلامی بە ئاواتەکانی نەگەیوە. خومەینی دەڵێ وا نیە بە ئاواتەکانی گەیوەو زۆریش سەرکەوتووە. ئەوان شەڕیان لە واقیعدا بە بەشێکی مەنفی لە رابردووی جمهووریی ئیسلامی داناوە. خومەینی دەڵێ لە شەڕیشدا ئێران سەرکەوتووەو بە ئاب‌و تابەوە لە پەیامەکەیدا تەعریفی دەسکەوتەکانی شەڕ دەکا، لە کاتێکدا کەم کەس هەیە نەزانێ کە شەڕ چی بەسەر گەلانی ئێراندا هێناوە، لە کوشتارو وێرانی‌و کوێرەوەری‌و بەدبەختی‌و هەژاری.

ئینسان خۆ ئەگەر زۆر بە وردی گوێ لە قسەکانی خومەینی دەگرێ وای دێتە بەرچاو کە هەر وابزانە خومەینی ئاگای لە دنیای ئەمڕۆ نیە. چونکە هەر ئەو قسانەی تیکرار دەکاتەوە کە لە سەرەتای شۆڕشی ئێراندا دەی‌کرد. ئەو کاتەی کە بەڕاستی لەبەر هێندێ هۆ کە پێم‌وایە لە پەیامی ٢٢ی ڕێبەنداندا باسم کردوە نفووزێکی زۆری پەیدا کردبوو و هێشتا هەر پێی وایە هەر شوعارێك کە ئەو بی‌دا گەلانی ئێران بە دڵ‌و گیان قبووڵی دەکەن، هێشتا هەر پێی وایە کە بە شوعارو هەراو هوریا دەتوانێ ڕێژیمی خۆی لە سەر پێ رابگرێ. بەڵام راستی ئەوەیە کە پاش

ئاگربەس لەگەڵ عێراق دەرکەوتوە کە کاربەدەستانی ئەم ڕێژیمە ناتوانن هیچ کام لە مەسەلە گرینگەکانی وڵات چارەسەر بکەن، هیچ بەرنامەیەکیشیان بۆ ئەوە نیە بۆیەش ئێمە دەڵێین کە ڕێژیم تەسبیت نەبووەو تەسبیتیش نابێ. ئێستا خومەینی مەسەلەیەکی بچووکی گرتوە بەقەد دنیایەك گەورەی کردوەو باسی دەکا ئەویش مەسەلەی "سەلمان روشدی"یە. دیارە نازانم بەڵام من ئێستاش دڵنیا نیم کە خومەینی کتێبی سەلمان ڕوشدی خوێندبێتەوە بەتەواوی، هەرچی بێ تەوهین بە دین‌و مەزهەبێك‌و بە موقەدەساتی هەر میللەتێك‌و یا بە موقەدەساتی خەڵك بەگشتی شتێکی خراپەو نابێ کەسێك کە ڕووناکبیرە کەسێك کە ئیعتیقادی بە ئازادیی بەیان هەیە تەوهین بە موقەدەساتی خەڵك بکا. بەڵام پرسیارێك هەیە لێرەدا ئەویش ئەوەیە ئایا ئاخوندە قشرییەکان کە ئێستا ڕەخنە لە "سەلمان ڕوشدی" دەگرن‌و حوکمی ئیعدامی ئەو نووسەرەیان دەرکردوە، ئایا ئەوان خۆیان لە ئێرانی خۆماندا کەم تەوهینیان بە ژنی پێغەمبەر کردوە کە ئێستا دیفاعی لێ دەکەن. من لە منداڵییەوە شتێکم لەبیرە خوشکەزایەکم هەبوو ناوی "عایشە" بوو. ئەو خوشکەزایەی منە ئەوەندە ئەزیەتیان دەدا لە شاری ورمێ بەتایبەتی ئەوانە کە گەورە بوون نە منداڵەکان، حەتا ئەوانەی کە ئاخووند بوون کە ناچار یا دەبوو ناوەکەی بگۆڕێ یا نەدەبوا قەت بێتە نێو شاری ورمێ. ئا ئەو هەموو تەوهینە کە بە خولەفای ڕاشیدینیان دەکرد. جێژنیان ساز دەکرد بە ناوی جێژنی عومەر خۆ ئەوانە هەموو شەخسی خومەینیش دەبێ بیزانێ. زۆر کەس لە خزم‌و کەس‌و کارو دۆست‌و ئاشنای ئێمە کە دەهاتنە نێو شار یا دەچوونە شارەکانی دیکەی ئێران، ناوەکانیان ئەبووبەکرو عومەرو عوسمان بوو یا ناچار دەبوون شارەکان بەجێ بهێڵن‌و بگەڕێنەوە کوردستان یا ناوی خۆیان بگۆڕن. ڕەنگە هەموو کەس بیستبێتی کە بە دەیان عومەر ناوی خۆیان کردوە بە ئەمیر بۆ ئەوە تووشی ناڕەحەتی نەبن. باشە ئەوە تەوهین بە موقەدەسات نیە کەوابوو بە نەزەری من ئەم هەرایە بە مەبەستی دیفاع لە ئیسلام نیە. ڕەواڵەتەکەی ئەوەیە، بەڵام ئەم هەرایە چەند هۆی تایبەتی هەیە کە پێم خۆش بوو باسیان بکەم.

یەکەم ئەوەیە: ڕاستی ئەوەیە کە پایەکانی کۆماری ئیسلامی دەلەرزێ. خومەینی دەیهەوێ بەم هەرایەو ناردنی پەیام، یەکەم سەرنجی گەلانی ئێران بۆ مەسایلی دەرەوە

رابکێشێ‌و ئەمە شتێکی تازە نیە، ئیمپراتورەکانی روومی قەدیمیش زۆر جار ئەگەر تووشی بوحران دەبوون لە دەرەوەی وڵاتی خۆیان شەڕیان ساز دەکرد.

دووهەمیش: بەڵکو بەو قسانە بتوانێ پایەکانی ڕێژیمی خۆی سەقامگیر بکا. لە پاشان باڵی توندڕۆ لە مەسەلەی "سەلمان ڕوشدی" کەڵك وەردەگرێ بۆ ئەوە باڵی پراگماتیك بکوتێ کە لایەنگری فەزای ئازادەو لە چوارچێوەی کۆماری ئیسلامی‌دا پێوەندی گرتن لەگەڵ ڕۆژئاواو بەتایبەتی ئامریکا بە قازانجی وڵات دەزانێ‌و ئەمە بەتایبەتی پاش ئاگربەس کە ئێران ئیحتیاجی بە بازسازی هەیەو ئیمکاناتی نیەو پوڵی نیەو پێویستی بەوە هەیە کە لە دەرەوەڕا یارمەتی بدەن. بەم شێوەیە باڵی توندڕەو تۆڵەی خۆی دەکاتەوە لە باڵی پراگماتیك‌و بۆ ماوەیەکی دیکە ڕێگا نادا کە ئەم باڵە پراگماتیکە لەگەڵ ڕۆژئاوا پێوەندی بگرێ یا مەسەلەن بەشی خسووسی تەقویەت بکا لە داخلی وڵاتدا با فەزایەکی کەمێك باز لە چوارچێوەی کۆماری ئیسلامی‌دا بە وجود بێنێ لە پاشان بە ناوی وەحدەتی کەلیمە بەم شێوەیە خومەینی دەیهەوێ هەموو موخالیفینی، ئەوانەی بە شێوەیەکی دیکە فکر دەکەنەوە سەرکوت بکاو ڕێژیمی دیکتاتۆری توندو تیژ هەروا بەردەوام بێ. جاران بە ناوی شەخس ئەو کارەیان دەکرد، ئێستا بە ناوی دیفاع لە موقەدەساتی ئیسلام ئەو کارە دەکەن. ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە خومەینی هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە کاری ئەوە بووە. وەختی خۆی بەرانبەر بە شۆڕش‌و جوولانەوەی پان‌و بەرینی گەلی کورد ئیعلانی جیهادی داو ئەو شەڕەی ساز کرد کە ئێستاش هەر بەردەوامە. جا ئێستاش لە پەیامەکەی‌دا باسی تەجزیەتەڵەبانی کوردستان دەکا کە گۆیا ڕێگای نەدا کە ئەوان لە کاروباری وڵاتدا بەشدار بن. پاشان مەسەلەی گرەوگانەکانی، گرەوگانگیری لە سەفارەتی ئامریکای پێك هێنابوو بۆ ئەوە دیسان وەحدەتی کەلیمەو یەکپارچەیی ڕێژیم بپارێزێ. ئێستاش کە کەوتۆتە گێژاوو بوحرانەوە ئەو مەسەلەی "سەلمان ڕوشدی"یەی کردۆتە ئاڵا بۆ ئەوە بە خەیاڵی خۆی یەکپارچەیی‌و یەکگرتوویی پێك بێنێ لە نێو ریزەکانی لایەنگرانی خۆی‌داو بەتایبەتی موخالیفینی سەرکوت بکا بۆ ماوەیەکی دیکە ڕێژیمەکەی بپارێزێ، بەڵام نەتیجەی ئەم کارە دەبێتە چی؟ نەتیجەی ئەم کارە دەبێتە ئەوە کە کۆماری ئیسلامی زیاتر تاك‌و تەریك دەکەوێتەوە، زیاتر لە وڵاتەکانی دنیا دوور دەکەوێتەوەو کەمترو زۆر سەختتر دەتوانێ گیروگرفتەکانی خۆی

چارەسەر بکا. لە دنیا بەتایبەتی لە بەرانبەر بە بیرو ڕای گشتی، پتر لە جاران ئابڕووی دەچێو بەڕاستی ئیدی بە چاوێکی زۆر سووکتر تەماشا دەکرێ کە تەنانەت لە ئینگلستان کابرایەك کتێبێکی نووسیوە بە پێچەوانەی مەنشووری نەتەوە یەکگرتوەکان لە ئێرانەوە حوکمی ئیعدامی بۆ دەردەکەنو هەر ئەوی ڕۆژیش ئەو حوکمە دەردەکرێ یا هەر لەو ڕۆژانەدا سەرۆك کۆماری ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی لەگەڵ دوو دەوڵەت لە ئوروپا بەیانیەی بڵێین هاوکاری ئیمزا دەکا کە لەوێدا گوتراوە کە کۆماری ئیسلامی تەعەهود دەدا لە کاروباری وڵاتانی دیکە دەس تێ وەرنەدا. لە پاشان بێگومان ناتەبایی‌یەکانی نێوخۆیی ڕێژیم توندتر دەبنو زیاتر بڵێم توندتر ڕێژیم بەرەو رووخان دەبەن، بەتایبەتی پاش خومەینی بێگومان ناکۆکی‌یەکان دەتەقێنەوەو وەزعێکی وا پێك دێ کە مەوجوودیەتی کۆماری ئیسلامی دەخرێتە مەترسی‌یەوە. من مەسەلەی پەیامی خومەینیو ئەو هەراو هوریایە کە لەسەری ساز کراوە، ئاوا تێدەگەم لە عەینی وەختدا ئەو پەیامە سەرگەردانیی کاربەدەستانی ڕێژیم نیشان دەدا. لە کاتێکدا هەموو کەس دەزانێ کە لەو پەیامەدا خومەینی هەم لە بنی سەرۆك کۆماری خۆی خامنەیی داوە هەم هێرشی کردۆتە سەر مونتەزیری، هەم هێرشی کردۆتە سەر رەفسەنجانی. ئێستا ئەو ئاغایانە هەر وابزانە کە هیچ نەبووە هەموویان قسە دەکەنو پەیامی خومەینی وەك بەرنامەیەك بۆ کۆماری ئیسلامی، بۆ دوارۆژی کۆماری ئیسلامی دادەنێنو هەر وابزانە کە ئەو پەیامە ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیی نەجات داوەو ئاسۆی روون کردۆتەوە بەم شێوەیە قسە لەسەر ئەو پەیامە دەکەنو پێم‌وایە هەموو ئەوانە زۆر بەجوانی جارێکی دیکە نیشان دەدا کە ڕێژیم لە هەموو بارێکەوە لە بوحرانێکی یەکجار زۆر قووڵدایەو دەبێ چاوەڕوان بین کە نەتیجەی ئەو بوحرانە لە دوارۆژدا زیاتر دەرکەوێ. بێگومان لەو بوحرانەشدا ڕێژیم تەنیا زەرەر دەکاو زەعیفترو کزتر دێتە دەر.

پ: باشە کاك دوکتور لەو وەزعە تا ڕادەیەك شپرزەیەی ڕێژیمدا یا لەم هەلومەرجە ناسکەدا کە ئێمە تێی‌داین ئەرکەکانمان چن، داهاتووی جووڵانەوەکەمان چۆن دەبینن، خەڵکی کوردستان بەگشتیو حیزبی ئێمە بەتایبەتی کە باری قورسی ئەم شۆڕشەی لەسەر شانە دەبێ چ بکەنو وەزیفەیان چیە؟

و: پاش ئاگربەس هێندێك كەس پێیان وابوو كە ساڵی ١٩٧٥ تكرار دەبێتەوە، ئەو كاتە لە كوردستانی عێراق ئاش بەتاڵ كرا. ئێمە هەر لە سەرەتاوە گوتمان كە ئەم وەزعە لە كوردستانی ئێراندا دووپات ناكرێتەوە. ئاش بەتاڵ بە خەیاڵی كەسدا نایەو خەبات هەر درێژەی دەبێ، رێژیم كزە، لە بوحراندایە كاربەدەستانی سەرگەردانن، ناتوانن بە شێوەی پێشوو حكوومەت بكەن. بۆیە بە نەزەری من ئاسۆ لە ساڵەكانی دیكە بۆ بزووتنەوەی كورد لە كوردستانی ئێران روونترە. وەختی ئەوە هاتوە كە لەو دەرەتانە كە پێكهاتوە چالاكترو باشترو پانو بەرینتر كەڵك وەربگرین. ئەركەكانمان چن؟ دیارە لە پێش هەمواندا دەبێ خەباتی خۆمان درێژە پێ بدەین، نیشان بدەین كە لە كوردستان هێزێكی سەربەخۆ، قایم لە مەیداندا بەرانبەر بە رێژیمی خومەینی راوەستاوین، نەك هەر ئەوە دەبێ زەربەی قورستر لە رێژیم بدەین عامیلی كورد وەك وەزنەیەكی گرینگ لە مەیدانی خەباتدا بەتەواوی دەردەخا. ئەركی دووهەممان ئەوەیە كە هەروەها كە باسی كرا، مەسەلەی كورد، داخوازەكانی گەلی كورد لە دەرەوە بە باشی بناسێنین. لەو دەرەتانە كە پێك هاتوە زۆر بە چاكی كەڵك وەربگرین. بۆ ئەوە پشتیوانیی بیرورای گشتیی جیهانی، رێكخراوە سیاسییەكان، تەنانەت دەوڵەتەكانیش بۆ لای گەلی كورد رابكێشین ئەركی سێهەممان ئەوەیە كە لەگەڵ هەموو هێزە دێموكراتییەكانی ئێراندا بۆ دێموكراسیو ئاسایشو ئاشتی كە داوای ٩٠ لە ١٠٠ی دانیشتوانی ئێرانە، تێبكۆشین. هەوڵی خۆمان بۆ پێكهێنانی بەرەیەكی پانو بەرین درێژە پێ بدەین، بەرەیەكی پانو بەرینی دێموكراسی پێك بێنین، كە بۆ پاش رێژیمی خومەینی ئاڵترناتیف بێ چونكە دەبێ دیسان تیكرار بكەمەوە كە بەداخەوە لە حاڵی ئێستادا ئێمە ئاڵترناتیڤمان بۆ رێژیم نیە، ئوپۆزیسیۆنی دێموكراتیك نەیتوانیوە ئاڵترناتیڤێكی ئەوتۆ پێك بێنێ كە دێموكراتیك بێ، كە بتوانێ پشتیوانیی زۆربەی زۆری گەلانی ئێرانی بۆ لای خۆی رابكێشێ. ئەوانی دیكەش خارج لە ئوپۆزیسیۆنی دێموكراتیك كە هەروەها كە گوتوومە ئاڵترناتیڤی ئەوتۆیان نەبووە، كەوابوو لەو هەلومەرجە ناسكەدا، ئەركی سەرشانمان قورسترە هەرچەند ئەركی سەرشانمان قورسترە ئەوەندەش ئاسۆی خەبات روونترەو دەتوانم بڵێم كە من ئەمساڵ زۆر زیاتر لە ساڵانی پێشوو خۆشبینمو سەركەوتن بە نێزیكتر دەبینم.

پ: پێم خۆش بوو پرسیارێکی دیکەش بکەم بەڵام لە راستیدا ئەو پرسیارە پێوەندی‌یەکی ئەوتۆی بە مەسەلەی ئێران‌و جووڵانەوەکەمانەوە نیە. دیارە ئەگەر ئیزنتان لەسەر بێ هەر وەك ئاگادارن لە رۆژنامەی کوردستاندا بەشێك بۆ تێکۆشانی حیزب لە دەرەوەی وڵات تەرخان کراوە، جا لەم بەشەی رۆژنامەی کوردستان ژمارەی ١٤٤دا باسی چاوپێکەوتنی ٤ ساعەتەتان لەگەڵ یاسر عەرەفات رێبەری رزگاریخوازی فەلەستین کراوە، دەکرێ بفەرموون داهاتووی فەلەستین چۆن دەبینن. ئایا رەوتی جووڵانەوەی فەلەستین کار دەکاتە سەر مەسەلەی کورد، مەبەستم ئەوەیە سەرکەوتنی گەلی فەلەستین قازانجی بۆ جووڵانەوەی کوردو مەسەلەی کورد بەگشتی هەیە یان نە؟

و: هەروەها کە پێشتر گوتت من چاوپێکەوتنێکی زۆر درێژم هەبوو لەگەڵ یاسر عەرەفاتدا کە زۆر بە گەرمی وەری گرتم میوانداری‌یەکی زۆر گەرمیشی لی کردم. دیارە یاسر عەرەفات دۆستێکی کۆنی ئێمەیە، ئێمە پێوەندیمان لەگەل گرت، ئامادە بوو کە لەسەر داخوازەکانی گەلی کورد لەگەڵ کاربەدەستانی رێژیم قسە بکا کە مافی خودموختاری بە رەسمی بناسن. بەڵام هەروەها کە ئەم جارە بۆخۆی گوتی، گوتی: "ئەمن بووم بە وەکیلی ئێوە بەڵام بەداخەوە وەکالەتەکەم سەرنەکەوت خەتاکەیش هی من نەبوو." بەڕاستیش خەتاکە هی وی نەبوو، ئێمە بۆخۆمان دەزانین کە لە دەرەوە خومەینی‌و رێژیمەکەی دۆستایەتی مووسادی دەس نەکەوت لەو چاوپێکەوتنەدا، ئێمە وەك هەموو جارێك پشتیوانیی خۆمان لە داخوازەکانی گەلی فەلەستین دەربڕی کە بریتی‌یە لە پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی فەلەستین لە خاکی فەلەستیندا لەم بارەشەوە حیزبی ئێمە لە سەرەتاوە سەربەخۆیی بووە ئەوەی کە ئێستا یاسر عەرەفات وەك نوێنەری بەرەی رزگاریخوازی فەلەستین دانا ئێمە لە ئەوەڵەوە هەر ئەوەمان گوتووەو پێمان وایە کە بەرەی رزگاریخوازی فەلەستین تاکە نوێنەری شەرعیی فەلەستینە. بۆ هەرکەس دەیهەوێ یا بیهەوێ ئاشتی پێك بێنێ لە خاکی فەلەستیندا دەبێ لەگەڵ نوێنەری ئەو میللەتە، میللەتی فەلەستین کە بەرەی رزگاریخوازی فەلەستین‌و یاسر عەرەفاتە قسە بکا. لەو باسەدا جارێکی دیکەش یاسر عەرەفات پشتیوانیی خۆی لە خەباتی رەوای گەلی کورد دەربڕی‌و نیشانی دا کە لە دوارۆژیشدا ئەو هەدەفە هەر درێژە پێ دەدا. دیارە ئەگەر ئاوا کە ئێمە ئاواتمانە گەلی فەلەستین سەرکەوێ لە چەند بارەوە جێگای خۆشحاڵی‌و هیوایە. یەکەم بۆ ئێمە ئوسوولەن کە

پێمان خۆشە وەك هەموو گەلێکی زۆرلێکراو کە گەلی فەلەستین سەرکەوێ‌و مافی دانانی چارەنووسی خۆی بەدەستەوە بگرێ، دەوڵەتی سەربەخۆی خۆشی دابنێ. دووهەم دیارە ئەو دەوڵەتە ئەگەر پێك بێ پێمان وایە قازانجی بۆ گەلی کوردیش هەیە، چونکە گەلی فەلەستین کە دەیان ساڵە خەبات دەکا بۆ مافی خۆی ئەگەر سەرکەوێ ئەوە بۆخۆی نموونەیەکە، سەرمەشقێکە بۆ ئێمە کە جێگای هەموو دەگرێ کە ئەوە بسەلمێنێ کە هەر نەتەوەیەك، هەر گەلێك لە خەبات بۆ مافی خۆی بەردەوام بێت ئاخرەکەی هەر سەر دەکەوێت. دووهەم بەرەی رزگاریخوازیی فەلەستین هاوشێوازی ئێمەیە هەم لە خەباتی دوورو درێژی خۆیدا کە نوێنەری گەلێکی زۆرلێکراوەو هەم ئەوە کە دۆستایەتی‌یەکی قووڵمان پێکەوە هەیە. بێگومان ئەگەر ئەم بەرەیە سەرکەوێ پشتیوانیی خۆی لە خەباتی ئێمە هەر درێژە پێ دەدا ئەگەر ئێستا بەرەیەك یا رێکخراوێك پشتیوانی ئێمەیە لە دوارۆژدا دەوڵەتێك پشتیوانی ئێمە دەبێ. سێهەم مەسەلەی کورد زەقتر دەبێ‌و زیاتر سەرنجی بیروڕای گشتیی وڵاتەکانی دیکە بۆ لای خۆی رادەکێشێ یانی بەرەبەرە دەبێتە مەسەلەی هەرە گرنگی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست، جا بۆیە ئێمە لە هەموو بارێکەوە پێمان خۆشە گەلی فەلەستین لە خەباتی خۆیدا سەرکەوێ. بە هەموو هێزمانەوە پشتیوانی لە ئنتفازەی گەلی فەلەستین دەکەین‌و هیواداریشین کە هەرچی زووتر ئەم گەلە بە ئاواتی خۆی بگا. ئێستاش وەزعەکە لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا گۆڕاوە. ئیسرائیل بەرەبەرە تاق‌و تەریك دەکەوێتەوەو لە دوارۆژدا هیچ رێگای نیە بێجگە لەوەی کە دابنیشێ یا لە کۆنفرانسێکی نێونەتەوەییدا یان راستەوخۆ لەگەڵ فەلەستینی‌یەکان ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکا. بە هیوای ئەو رۆژە.

**پ:** زۆر سپاس کاك دوکتور لە کۆتایی وتووێژەکەماندا ئەگەر پەیامێکت هەیە یان مەسەلەیەکی دیکە هەیە باسمان نەکردبێت فەرموو.

**و:** پەیامێکی ئەوتۆم نیە تازە پەیامم ناردوە. زۆر سپاسی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران دەکەم داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەم‌و داوای خۆشی‌و سەرکەوتن‌و ئازادی‌و دێموکراسی‌و خودموختاری بۆ هاونیشتمانانی خۆشەویست دەکەم.

# سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی*

سیاسەتی دەرەوەی هەموو وڵاتێك، ڕەنگدانەوەیەکە لە سیاسەتی نێوخۆی ئەو وڵاتە. حکومەتی کۆماری ئیسلامی لەگەڵ هەموو تایبەتمەندیەکانی خۆی پێڕەوی ئەم ئەسڵەیە. ڕێژیمی خومەینی لە نێوخۆی وڵاتدا تووشی بوحرانێکی قووڵی هەمەلایەنەیەو بۆ چارەسەرکردنی ئەم بوحرانە کە تەواوی لەشی ئەم ڕێژیمەی داگرتوە، ئاخوندە کاربەدەستەکان نە بەرنامەیەکی ڕوونیان هەیە نە ئامرازێکی پێویست. تازە ئەگەر بەدەگمەن ئەم دوو مەرجە کۆ ببێتەوە چوارچێوەی حکومەتداریی ویلایەتی فەقیهی خۆی کۆسپی هەرە گەورەیە لەسەر لابردنی بوحران، واتە جەوهەری کۆماری ئیسلامی بوحران خوڵقێنەرەو ژیانی خۆی بە ئاژاوەو دروستکردنی شەڕو کێشە درێژە پێدەدا. لە کۆنەوە باو بووە ئەگەر حوکمدارەکان لە نێوخۆی وڵاتدا تووشی تەنگو چەڵەمە دەبوون نەك بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتەکان، بەڵکوو بۆ خۆرزگار کردن لە تەنگانە، هەوڵیان دەدا کێشەیەك، ئاژاوەیەکو شەڕێك لە دەرەوەی وڵات ساز بکەن، بەم شێوەیە هەم سەرنجی خەڵکی وڵاتی خۆیانیان بۆ دەرەوە ڕادەکێشا بۆ ئەوە گیروگرفتە نێوخۆیەکانی وڵات لەبیر بەرنەوەو هەم بە ناوی یەکیەتیو دیفاع لە نیشتمان، سەرپۆشیان لە سەر ناتەباییەکانی نێوخۆی وڵات دادەناو بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ حاکمیەتی خۆیانیان چەسپاوتر دەکردو مەترسی تێکڕوخانی وڵاتی خۆیان دوور دەخستەوە. دەبێ دان بەوەدا بنێن کە کارگێڕانی کۆماری ئیسلامیو لە هەمووان زیاتر شەخسی خومەینی لە بەکارهێنانی ئەم شێوەیەدا دەستێکی باڵایان

---

* ٢٤ی خاکەلێوەی ١٣٦٨ی هەتاوی

هەیە. لە سەرەتای دەسەڵاتداریی ئاخوندەکانەوە شاهیدی چەندین نمونەی بەکارهێنانی سیاسەتی شوێنەونکە بوین. بەردەوام کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی، بە ناو تەوتەئە هەرچی‌یەکیان کەشف دەکرد بەقسەی ئەوان دەستی وڵاتانی دەرەوەی تێدابوو. دیفاعی گەلی زۆرلێکراوی کورد لە مافی نەتەوەیو ئینسانیی خۆی بە تەوتەئەی ئیستکباری جیهان دانرا بۆ ئەوەی دەیان هەزار لاوی بێ ئەزمونی نائاگا بۆ سەرکوت کردنی جوڵانەوەی کوردستان بەسیج بکرێن، باڵوێزخانەی ئەمریکا بە پێچەوانەی هەموو دابو شوێنێکی پێوەندیەکانی نێودەوڵەتی، داگیر کرا بۆ ئەوە لە ژێر دروشمی "مرگ بر آمریکا" سەرکوت کردنی موخالیفان لە تارانو شارە گەورەکان دەست پێبکەنو شەڕ دژی عێراق بوو بە ئاتۆیەکی بێوێنە بۆ لەنێوبردنی دوا شوێنەواری ئازادی لە سەرانسەری ئێراندا. رێژیمی سەرەڕۆییو نەزمی رەشو کۆنەپەرستی سەدەکانی نێونجی. ماوەی هەشت ساڵی تەواو هەر بزووتنەوەو **داخوازێکی** کۆمەڵایەتی خەڵك بە ناوی ئەوە کە یەکەم ئەرك شەڕەو **هیچی دیکە، بە گوللە** وەڵام دەداوە. لە چەند مانگی پاش قبوولکردنی ئاگربەس‌دا **کە بوحرانی** نێوخۆیی وڵات هەرچی دەڕۆی توندتر دەبوو بەتایبەتی ناتەبایی‌و کێشە **لە نێو کاربەدەستانی** رێژیم‌دا پەرەی دەگرت، خومەینی بڵاو بوونەوەی کتێبی "سەلمان روشدی" بە کوفری ئیلاهی دانا، هەرچی توانی ئەم روداوەی گرینگتر کردو ئاڵۆزیەکی نەدیتراوی لە پەیوەندیەکانی نێونەتەوەیی پێك‌هێنا، ئاکامی ئەو کارە تێکدانی پێوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ ئینگلستانو تێکدانی پێوەندی سیاسیو ئابووری لەگەڵ زۆربەی وڵاتانی سەنعەتیو پێشکەوتووی رۆژئاوادا بوو. خومەینی کە دەیهەویست بوحرانەکە بۆ دەرەوە سادر بکا، دەسکەوتی پێچەوانە بوو. هەوڵو تێکۆشانی بەشێك لە کارگێڕانی کۆماری ئیسلامی کە خەریك بوون ئێران لە تاكو تەریك کەوتنەوە دەرباز بکەن، بۆ بازسازی وڵاتو لە تەنگانە دەرهێنانی ئابووریەکی شپرزە لەگەڵ وڵاتانی ئورووپای رۆژئاوا پێوەندی دابمەزرێنن، پوچەڵ مانەوەو ئێران لەجاران زیاتر تاكو تەریك کەوتەوەو لە لای هەموو کۆڕو کۆمەڵو ئینسانێکی ئازادیخواز بە رێژیمێکی دڕندەو دوژمنی ئادەمیزاد ناسرا. فتوای کوشتنی "سەلمان روشدی" لە نێوخۆی وڵاتیش‌دا هیچ دەردێکی دەرمان نەکرد. ناکۆکیو ناڕێکی بوو بە هۆی لابردنی "منتظری" کە چەندین ساڵ بوو بە رەسمی بە جێ نشینی خومەینی ناسرا بوو، بە

پێی نوسراوەی رۆژنامەی ئیتلاعاتی سەر بە رێژیم، خومەینی جارێکی دیکە ناچار بوو ژەهر بخواتەوە. بەڵام خۆی ئەم کارە ناتەبایی‌و کێشەی نێوخۆی رێژیمی تیژ کردو لە نێو جەرگی رێبەرایەتی رێژیم واتە ئاخوندە گەورەکان، کە لە مەدرەسەکانی دینیی قوم‌و مەشهەدن، دووبەرەکیەکی قووڵی پێکهێنا. خومەینی دیسان لە تەنگانە دایە. هەراو هوریای سەلمان روشدی خەریکە خەلاس دەبێ، پێویستە بیانویەکی دیکە بدۆزێتەوە. رووداوەکانی دوو وڵاتی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست وەك تورکیەو لوبنان بۆ ئەو وڵاتە دەرەتانێکی باشیان پێکهێناوە. ئاخوندە دەسەڵاتدارەکان لەپێش‌دا لەگەڵ دەوڵەتی تورکیە دەستبەیەخە بوون. پاش کێشەیەکی زۆر دادگایەکی بەرزی تورکیە کە حکومەتێکی لاییك واتە غیرە مەزهەبی هەیە، بڕیاری دا کە کچان ناتوانن بە چادرو جلوبەرگی بەناو ئیسلامی‌یەوە بچن بۆ دانشگا. رێژیمی خومەینی کە لە مێژە خەریکی سازکردنی ئاژاوە لەم وڵاتەیە، ئەم روداوەی بۆ هەڵکەوت‌و هەراو هوریایەکی توندی تەبلیغاتی دژی تورکیە دەست پێکرد. دیسان خودی خومەینی هاتە مەیدان‌و هێرشی کردە سەر سیاسەتی غەیرە مەزهەبیی دەوڵەتی تورکیە. بەڵام حکومەتی ئانکارا کە لە ساڵانی رابردوودا بەرامبەر بە ئاژاوەگێڕیی کۆماری ئیسلامی بێدەنگ ببوو ئەم جارە بە توندی بەرامبەر بە ئاخوندەکان راوەستاو دەست تێوەردانی لە کاروباری تورکیەدا، مەحکوم کرد. هەرچەندە لە سەرەتاوە وا دەهاتە بەرچاوی خومەینی کە خەریکە گیروگرفتی دیکە وەك هی سەلمان روشدی ساز بکەن، بەڵام قایم راوەستانی تورکیە لە لایێك‌و نالەبار نەبونی وەزعیەتی نێونەتەوەیی لەلایەکی دیکەوە کارگێڕانی کۆماری ئیسلامیی ناچار بە پاشەکشە کردو ئاخوندەکان وایان بە باش زانی جارێ کێشەی خۆیان لەگەڵ تورکیە، زۆر پەرە پێ نەدەن. لوبنان بە هەلومەرجی ئاڵۆزیەوە چەندین ساڵە بەردەوام مەیدانێکی خودادادی‌یە بۆ ئاژاوەگێڕانی کۆماری ئیسلامی. ئاخوندەکان بۆ سادر کردنی شۆڕشی ئیسلامی بۆ لوبنان هەتا ئێستا سەدان ملیۆن دولاریان لە دارایی خەڵکی بێبەشی ئێران خەرج کردوە. بە بڵاوکردنەوەی دراوو کەڵكوەرگرتن لە هەستی مەزهەبیی بەشێك لە لاوانی شیعەی لوبنان، توانیویانە لەو وڵاتە پۆلی چەکداری حیزبوڵڵاهی ساز بکەن کە بۆ شەڕ لەگەڵ موخالیفینی کۆماری ئیسلامی یا بۆ بارمەتەگرتنی بیانیەکان بەکاریان دێنن. ئێستاش کۆماری ئیسلامی شەڕی دوبارەی نێوان مەسیحیەکان‌و موسڵمانەکانی بە

دەرفەت زانیوە بۆ ئەوەی مەسەلەی دیفاع لە موسڵمانەکانی لوبنان بێنێتە گۆڕێو ماوەیەکیش کۆمەڵانی خەڵکی ئێران بە گیروگرفتی لوبنانەوە مەشغوڵ بکا. زۆر ئیحتیمالی هەیە ئەم جارەش هەراو هوریای دەزگا تەبلیغاتیەکانی ڕێژیمی خومەینی زۆر سەرکەوتوو نەبنو سەرنجێکی ئەوتۆیان نەدرێتێ. ئاکامی گشتیو دوایی هەموو ئەو کردەوانە بە زیانی ڕێژیمی خومەینی‌یە. لە نێو دراوسێیەکانی خۆیدا کۆماری ئیسلامی تەنانەت یەك دەوڵەتی دۆستی نیە. لە باشترین حاڵەتدا ئەگەر لەگەڵ دراوسێیەکی لە گێرەو کێشەدا دوژمنایەتی ئاشکرای لەگەڵ ناکا. کۆماری ئیسلامی ئەمڕۆ لە مەیدانی نێونەتەوەیی‌دا ئەوەندە تاكو تەریك کەوتۆتەوە کە نە لەمێژووی ئێران نمونەی هەیەو نە لە جیهانی ئەمڕۆدا بە سەر هیچ وڵاتێکی دیکەدا هاتوە. ئەگەر لە نێوخۆی وڵاتدا ڕێژیمی خومەینی لە کۆمەڵانی خەڵك دوور کەوتۆتەوە، پشتیوانێکی ئەوتۆی لە نێوخۆی وڵاتدا نەماوە پەنای بردۆتە بەر سیاسەتی سەرکوتکردنو سەرەڕۆیی، لە دەرەوەی وڵاتیش‌دا دۆستو هاوپەیمانی نیەو بە تاقو تەنیا ماوەتەوە. ئەگەر ڕێژیم لە سیاسەتی نێو خۆی وڵات لە بن‌بەست دایە، ئێستا سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامیش کەوتۆتە گێژاوێك کە دەربازبوونی لێ دژوارە بەتایبەتی کە شەخسی خومەینی زیندوویەو ئەگەر دەرەتانێکی ئەوتۆش پێك بێ بە یەك پەیامو یەك فتوا پوچەڵی دەکاتەوە. بەڕاستی سیاسەتی دەرەوەی ڕێژیمی خومەینی ڕەنگدانەوەی سیاسەتی نێوخۆیەتی. ئەم سیاسەتە نەزانانەیە بۆتە هۆی کز بوونی پەیوەندی سیاسیو ئابووری ڕێژیم ئاڵۆزترو شپرزتر دەکا. بۆ دەربازبوون لە ئاڵۆزیو بوحران هەر نەبێ بۆ ماوەیەکی کورت خومەینیو لایەنگرانی ناچارن دیسان ئەم بوحرانە بۆ دەرەوە سادر بکەن کە پاش ماوەیەکی کەم دیسان دە گەڕێتەوەو هەلومەرجی بوحرانی نێوخۆی ڕێژیم بوحرانی‌تر دەکا. گێژاوێك کە ڕێژیمی خومەینی بە دەستی خۆی، خۆی تێ‌خستوە هەتا ئەم سیاسەتەی بەردەوام بێ، ڕزگاربوونی لەم گێژاوەیە بەدی ناکرێ.

# ڕێژیمی خومەینیو ڕێکخراوە نێونەتەوەیییەکان

هەڵوێستی ڕێژیمی خومەینی بەرامبەر بە ڕێکخراوە نێونەتەوەیییەکانی دەوڵەتیو بەشەردۆست نیشانەیەکی دیکەی سیاسەتی سەرەڕۆو پڕ لە ناتەبایی کۆماری ئیسلامییە. هەتا ئێستا چەند جار ئەم هەڵوێستە بەرامبەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، شوورای ئەمنییەت، خاچی سووری جیهانیو ئەمنێستی ئینترناشناڵ گۆڕاوە.

ئەگەر کومیسیۆنی دیفاع لە مافی ئادەمیزادی نەتەوە یەکگرتووەکان، باسی پێشێلکردنی مافی گەلانی ئێران بکا، ئەم ڕێکخراوە بەکرێگیراوو نۆکەری شەرقو غەربە، بەڵام ئەگەر سکرتێری ئەم ڕێکخراوە قسەیەك بە قازانجی کۆماری ئیسلامی بکا، نەتەوە یەکگرتووکان دەبێتە ڕێکخراوێکی واقیعبین ونوێنەری نەتەوەکانی جیهان.

ئەگەر خاچی سوور بێزاری خۆی لە کوشتنی دیلەکانی شەڕی عێراق لە ئێران دەربڕێ، ئەوە خۆی بە ئیمپریالیزمی خەبەری فرۆشتوە، هەر لە بناغەشەوە بۆ ئەوە پێکهاتووە کە دژایەتیی ئیسلام بکا. بەڵام ئەگەر هەمان خاچی سوور بە ئاکاری کاربەدەستانی عێراق سەبارەت بە دیلەکانی شەڕی ئێران لە عێراق ئیعتراز بکا، ئەوە ڕێکخراوێکی بەشەردۆستی نێونەتەوەیی جێی ڕێزو حورمەتە. ئەگەر شارێکی ئێرانیش لە لایەن فڕۆکەکانی عێراقییەوە بۆمباران بکرێن دەبێ خاچی سوور نوێنەری خۆی بۆ ئەم شارە بنێرێو کردەوەی عێراق مەحکووم بکا.

ئەمنێستی نێونەتەوەیی کە دیفاع لە هەموو زیندانی‌یەکانی جیهان دەکا، ئەگەر باسی ئازارو ئەشکەنجەی دەیان هەزار زیندانی لە زیندانەکانی کۆماری ئیسلامی بکا، ئەوە بەکرێگیراوی ئیمپریالیزمی جیهانیو خەبەری‌یە. ئەگەر دژی دادگاکانی فەرمایشیو ئیعدامی بێ‌موحاکەمەی سەدان رۆڵەی گەلانی ئێران دەنگی خۆی بەرز بکاتەوە، ئەوە ریکخراوێکی دەستکردی دوژمنانی ئیسلامەو هاواری قسەکەرانی کۆماری ئیسلامی دژی ئەم ڕێکخراوە دەچێتە ئاسمان.

بەلاّم ئەگەر ئەمنێستی باسی زیندانی‌یەك لە ئەفغانستان، عێراق، میسر، یەکیەتیی سۆڤیەتی بکا، ئەوە ڕێکخراوێکی بەشەردۆستەو بۆ ئازادیی زیندانیان خەبات دەکا.

ئەگەر شوورای ئەمنییەت دژی عێراق بوەستیو عێراق مەحکووم بکا، ئەوە ڕێکخراوێکی زۆر باشەو بە مەبەستی پاراستنی ئاشتیو ئاسایشی جیهانە. بەلاّم ئەگەر هەر ئەو شوورای ئەمنییەتە دەستدرێژیی کۆماری ئیسلامی بۆ سەر عێراق مەحکووم بکاو بێزاریی خۆی لە سیاسەتی شەڕخوازانەی کاربەدەستانی ڕێژیم دەربڕێ، ئەوە شوورای ئەمنییەت ئالەتی دەستی ئیمپریالیزمەو لە ژێر نفووزی شەرقو غەرب دایەو خزمەت بە دوژمنانی ئیسلام دەکا.

ئەوە چەند رۆژە دەزگای تەبلیغاتیی ڕێژیمی خومەینی کە دەیزانی شوورای ئەمنییەت خەریکە لە سەر دەستدرێژی ئێران بۆ سەر عێراق بڕیار دەدا، دووپاتی کردەوە کە ئەم شوورایە ئەزمونێکی گەورەی لە پێشە. مەبەستیشی ئەوە بوو ئەگەر شوورای ئەمنییەت عێراق مەحکووم بکا ئەوە بە باشی لەو ئەزموونە دەرچووەو ئەگەر کۆماری ئیسلامیش مەحکووم بکا ئەوە دژی گەلانەو لە ئەزموون دەرنەچووە.

ئێستا شوورای ئەمنییەت بێ‌ئەوەی ناوی ئێرانو عێراق بەرێ دەستدرێژی هەر کام بۆ خاکی ولاّتەکەی دیکەی مەحکووم کردووە، داواشی کردووە هەر دوو ولاّت دەست بەجێ شەڕەکە بوەستێننو بکشێنەوە پشتی سنوورەکانی خۆیان.

بەلاّم دیسان خامنەییو ڕەفسەنجانی سیاسەتی پڕ لە ناتەبایی کۆماری ئیسلامی دووپات دەکەنەوە، دەڵێن شوورای ئەمنییەت دەبوا عێراق بە ناو مەحکووم بکاو لە باتی مەحکووم کردنی دەستدرێژی کۆماری ئیسلامی بۆ خاکی عێراق دەبووا بێزاری خۆی لە خستنی فڕوکەی ئاخوندەکان کە بۆ جەبهە دەچون، نیشان بدا. ئەوەش یەکێك

لە تاکتیکەکانی کاربەدەستانی ڕێژیمە کە هەموو کاتێك هەوڵ دەدن مەسەلەی سەرەکی لە بن مەسەلەی لاوەکیدا بشارنەوە. شوورای ئەمنییەت باسی دەستدرێژی ئێران بۆ خاکی عێراق دەکا کە ئێستا هەموو ناوچەی خەلیجی خستۆتە مەترسیی شەڕەوە، بەلاّم خامنەیی پێی خۆشە شوورای ئەمنییەت باسی ئەم مەسەلە گرینگە نەکا، بەلّکوو باسی کەوتنی یەك فرۆکەو مردنی چەند ئاخوند بکا.

سەیر ئەوەیە کە کاربەدەستانی ڕێژیمی خومەینی بەشی سەرەکیی بڕیاری شوورای ئەمنییەتیان خستۆتە پشت گوێ کە داوا دەکا دەست بەجێ شەڕ بوەستێو هەر دوو لا بکشێنەوە بۆ پشت سنوورەکانی خۆیانو هەر باسی ئەو بەشەی دەکەن کە بێ ئەوە ناوی ولاتێك بەرێ، دەستدرێژی بۆ خاکی یەکتری مەحکووم کردووە. کەواتە شوورای ئەمنییەت بۆ کۆماری ئیسلامی باشە، چونکە لە بەشێکدا زمنی عێراقیشی مەحکووم کردووە، بەلاّم هەر ئەو شوورایە لە ژێر نفووزی ئیستیکباری جیهانی دایە چونکە داوای وەستاندنی شەڕ دەکا.

ڕێژیمی خومەینی پێیوایە کە ڕێکخراوە نێونەتەوەیی‌یەکان دەبێ لە خزمەتی سیاسەتی کۆماری ئیسلامی‌دا بن. هەر ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی، بەشەردۆست یا دەوڵەتی ئەگەر لە خەتی ئیمامدا بوو ڕێکخراوێکی باشە، دەنا دوژمنی ئیسلامو بەشەریەتە.

ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی ئەوەی بۆ خۆی ڕەوا دەبینێ بۆ خەڵکی دیکە ڕەوا نابینێ. لە مەیدانی سیاسەتی نێونەتەوەیی‌دا دیفاع لە ئازادیو دێموکراسی دەکا بەلاّم لە ئێران بە هەموو هێزیەوەو بە دەڕندەترین شێوە ئازادییە دێمۆکراتی‌یەکان پێشێل دەکاو ئازادیخوازان سەرکوت دەکا. لە مافی چارەنووسی گەلان لە سریلانکاوە تا ئەلسالوادۆر دیفاع دەکا، بەلاّم حەوت ساڵە شەڕێکی خوێناوی دژی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بەڕێوە دەبا، دیفاع لە ئازادیی بیروباوەڕ لە هەموو ولاّتانی جیهان دەکا، بەلاّم نەك هەر بیروباوەڕی دژی خۆی بەڵکو بیروباوەڕی جیاواز لە هی خۆشی دەکوتێ.

بە کورتی ئەو ڕێژیمە سیاسەتێکی هەیە بۆ تەبلیغات لە دەرەوەی ولاّتو سیاسەتێکی بە کردەوەشی هەیە دژی خەڵکی ئێران لە نێوخۆی ولاّت. لە دەرەوەی ولاّت بە قسە ئازادیخوازو بەشەردۆستە، لە نێوخۆی ولاّتیش بە کردەوە دوژمنی

ئازادیو ئینسانییەتە، بەڵام نەك هەر لە نێوخۆی ئێران بەڵکوو لە دەرەوەش دژیگەلی دژی ئینسانیی ڕێژیمی خومەینی ناسراوە. ڕێژیمی خومەینی لە دەرەوە بە ڕێژیمێکی بێمەسئوولییەت، ئاژاوەگێڕو تیرۆریست دەناسن کە بۆ هیچ قانوونو ڕێوڕەسمێکی نێونەتەوەیی ڕێزو ئیحترامی نیە. ئەم ڕێژیمە چ بڕیارەکانی ڕێکخراوەکانی نێونەتەوەیی دەوڵەتیو بەشەردۆست قبووڵ بکا، چ دژیان ڕابوەستێ، لە مەیدانی سیاسەتی جیهانیدا لە لایەن بیروڕای گشتیو هەموو ڕێکخراوێکی ئازادیخوازو بەشەردۆستو هەموو ئینسانێکی بەشەرەف مەحکوومە.

## فەسڵی سێهەم:

# هێندێك لەو باسانەی كە دوكتور قاسملوو لە كۆنگرەی پێنجەمی حیزبدا پێشكەشی كردوون

- خەباتی هێزی پێشمەرگە
- تێكۆشانی تەشكیلاتی
- تێكۆشانی تەبلیغاتی
- كاروباری كۆمەڵایەتی

## خەباتی هێزی پێشمەرگە

**خوشك‌و برا بەڕێزەکان!**

پێویستی بە دووپاتکردنەوە نیە کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە بزووتنەوەی میللی دێموکراتیکی ئێستای گەلی کورددا نەخشێکی گرنگ‌و لە بەربەرەکانێ‌و بەرپەرچدانەوەی پەلاماری هێزە سەرکوتکەرەکانی ڕژێمدا نەخشی ئەساسیی هەیە. ئەگەر بمانەوێ هۆیەکانی بنەڕەتیی سەرکەوتن لە خەباتی رزگاریخوازانەی ئەمڕۆی گەلەکەماندا لێك بدەینەوە، دەتوانین سێ هۆی ئەساسی دەستنیشان بکەین: یەکەم سیاسەتی دروست‌و ئوسوولیی حیزبەکەمان کە دەرکەوتوە لەسەر یەك لەگەڵ پێویستی‌یەکانی هەلومەرجی ئێستای خەباتی گەلەکەمان ڕێك دەکەوێ‌و دەتوانێ کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بۆ لای خۆی رابکێشێ. دووهەم پشتیوانیی بێ‌دریغ‌و هەموو لایەنی خەڵکی کوردستان لە سیاسەت‌و دروشمەکانی حیزب‌و سێهەم فیداکاری‌و گیانبازیی رۆڵە لەخۆ بوردووەکانی گەلی کورد کە لە ریزەکانی پێشمەرگەدا تفەنگ لەسەرشان‌و گیان لەسەر دەست بەرامبەر بە دوژمن راوەستاون.

پێشمەرگە ئەو ئینسانە واقعی‌یەیە کە لە پێناوی بەختیاری‌و رزگاری گەل‌و نیشتمانی‌دا لە هەموو خۆشی‌و ئاسوودەیی‌یەکی ژیان گوزەراوە‌و لە زستانی سارد‌و هاوینی گەرمدا دوور لە ماڵ‌و منداڵ‌و کەسوکاری لە سەنگەری شەرەف‌و پیاوەتی‌دا ژیان بەسەر دەبا. پێشمەرگە ئەو رۆڵە بەنەمەگەی خەڵکە کە هەموو سەرمایەی ژیانی بە سەخاوەتەوە لە خزمەتی ئامانجەکانی گەلدا وەکار خستوە، بێ ئەوەی لەو رێگایەدا چاوی لە حقووق‌و پاداش‌و تەنانەت سوپاسێکیش بێ. پێشمەرگە گلێنەی

**چاوی گەلی کوردو جێگەی هیواو هومێدی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە، هەربۆیە زۆر شتێکی سروشتی‌یە کە خەڵکی کوردستان هەموو ئیمکاناتی خۆیان لە خزمەتی پێشمەرگە داناوەو حیزبی ئێمەش بەلانی کەمەوە سەدی هەشتای ئیمکاناتی ماڵی خۆی بۆ ڕێکوپێککردنی کاروباری پێشمەرگە وەکار خستوە.**

لێرەدا زۆر بە پێویست دەزانین جارێکی دیکە سوپاسی گەرمی خۆمان لە قارەمانەتی‌و گیانبازیی پێشمەرگە خۆشەویستەکان دەربڕین‌و سەرکەوتن‌و لەشساغی‌و بەختەوەری زیاتریان بۆ بە ئاوات بخوازین. هەر بەو بۆنەشەوە جێگای خۆیەتی لە هێزی یارمەتیدەری پێشمەرگە، هێزی کۆمەکی‌و پشتی جەبهە، واتە هێزی بەرگریی میللی پڕ بە دڵ سوپاس بکەین. لە شەڕەکانی کوردستاندا هێزی بەرگریی میللی نەک هەر لە پشتی جەبهەوە یارمەتی پێشمەرگەی داوە، بەڵکوو لە زۆربەی مەیدانەکانی شەڕدا لە ریزی هەرە پێشەوەی جەبهەدا شانبەشانی پێشمەرگە لە سەنگەری دیفاع لە ئازادی‌و ئینسانیەتدا لێوەشاوەیی خۆی نیشان داوە.

جێگای شانازی‌یە کە ئەمڕۆ خەڵکی ئێران بەچاوی رێزو قەدرزانینەوە سەیری خەڵکی خەباتکەری کوردستان‌و پێشمەرگە بەجەرگەکانی کورد دەکەن. ئەوە خەڵکی کوردستان‌و پێشمەرگە فیداکارەکان بوون کە یەکەمجار بەرامبەر بە هێرشی چەنگیزانەی دەوڵەتی بەناو ئیسلامی راوەستاون‌و هەتا ئاوەدانبوونەوەی هەموو سەنگەرەکانی دیکەی دژی کۆنەپەرستی لە ئێراندا ئاڵای خەباتی دژی ئیمپریالیستی‌یان بەرز راگرت. حکوومەتی دژی گەلیی خومەینی لە هەموو ناوچەکانی ئێران هێرشی بردە سەر ماف‌و ئازادی‌یەکانی خەڵک‌و بەبێ بەزەیی پێشێلی کردن. تەنیا لە کوردستان بوو کە لووتی وەچیای سەخت‌و لای بێچوە شێرانی کورد کەوت‌و ناچار بوو پاشەکشە بکا. ئەوە شانازی‌یەکی زۆر گەورەی گەلی کوردو پێشمەرگەکانی کوردستانەو هیواداریین ئەو شانازی‌یە لە دوارۆژیشدا بە فیداکاری‌و لێوەشاوەیی پێشمەرگە قارەمانەکان بپارێزرێ.

شتێکی کە بۆ هەمووومان جێگای دڵخۆشی‌یە ئەوەیە کە لە ماوەی نێوان دوو کونگرەدا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەبارەی چەندی‌و چۆنی‌یەوە بەرەو پێش چووەو گۆڕانی گرنگی بەسەردا هاتووە. پێشمەرگەکان هەم لە کلاسەکانی دەرس‌و هەم لە تاقیکردنەوەی خۆیان زۆر دەرسی بەنرخ فێر بوون کە لە خەبات‌و تێکۆشانی

خۆیاندا کەڵکیان لــێوەرگرتوون. لـەباری هونـەرەکانی شـەڕو یارمــەتی گـەیاندنو پەلامارو پاشەکشەو ئاگاداری، واتە (اطلاعات)و تەدارۆکاتەوە کاروبـاری هێزەکـانی پێشمەرگە زۆر پێش کەوتووو زۆر کەموکوڕی لەنێو چـوون. بـەڵام بـۆ ئـەوەی هـێزی پێشمەرگە هەروا بەرەو پێش بڕواو لە دوارۆژدا باشتر بتوانێ ئەرکەکانی خـۆی بـەجێ بگەیەنێ، پێویستە زیاترو باشتر لە کاروباری پێشمەرگە ورد بینەوە، ناتەواوییەکانی دەستنیشان بکەینو ڕێگای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی بدۆزینەوە.

پێش هەموو شتێك دەبێ نێوەڕۆکی ئەو شەڕە کە پێشمەرگەی کوردستان دەیکـا، دیاری بکرێ. نابـێ لـەبیرمان بچـێ کـە پێشـمەرگە لـە پێنـاو وەدەسـتهێنانی ئـەو ئامانجانەی گەلی کورددا خەبات دەکا کە دوژمنانی ئـازادی بەئاشـتی حـازر نـەبوون قەبووڵیان بکەنو بۆ سەرکوتکردنی داخوازییەکانی گەلی کورد پـەلاماریان هێنـاوەو شەڕیان بەسەر خەڵکی کوردستاندا سەپاندوە. کەوابوو شـەڕی پێشـمەرگە شـەڕە بـۆ دیفاع لە ئازادی، شەڕە لە پێناو مافێکی رەواداو لە ئاکـامدا شـەڕە بـۆ گەیشـتن بـە ئاشتییەکی سەربەرزانەو عادڵانە.

لەبارەی شێوەی شەڕەوە، نابێ لەبیرمان بچــێ کـە هەرچـەند ئێسـتا لـە زۆربـەی ناوچەکاندا پێشمەرگەی کوردستان بەرامبەر بە هێزی سەرکوتکەری دوژمن سەنگەری گرتووەو ناهێڵێ بستێك بێتە پێش، بەڵام بـە چەشـنی ئوسـووڵی، شـێوەی ئەسـاسیی شەڕی ئێمە شـێوەی شـەڕی پارتیزانییـە. شـەڕی پـارتیزانیش قـانوونو ڕێوشـوێنی تایبەتیی خۆی هەیە کە بە خۆشییەوە پێشمەرگەکانی کوردسـتان ڕۆژ بـە ڕۆژ باشـتر ئەو ڕێوشوێنانە فێر دەبنو بە کاریان دەبەنو پێویست نیە لێرەدا باسیان بکەین. بەڵام پێمان وایە باشە لەو بارەوە هێندێ مەسەلەی گرنگ بێنینە گۆڕێ.

لە شەڕی پارتیزانیدا کــە شـێوەی بەربــەرکانی گـەلێکی کـەم دەرەتـان لـە دژی ئەرتەشێکی پۆشتەو پەرداخی دەوڵەتییە، پشـتیوانو تەکیـەگای ئەسـڵی پـارتیزان، کۆمەڵانی خەڵکن. هەر لەبەر ئەوەش پێویستە پارتیزانەکان بە بەرزکردنـەوەی پلـەی تێگەیشتنی سیاسیی خۆیانو بە نزیکبوونەوە لە کۆمەڵانی خەڵكو بە رەفتاری باشو ئاکاری جوان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر جێگای خۆیان لە نێو ئەواندا بکەنەوەو پتر پشـتیوانی خەڵکی بۆ لای خۆیان رابکێشن.

لەو شێوە شەڕەدا سەرچاوەی ئەسڵی چەكو تەقەمەنی پارتیزان هێزی دوژمنە. هەربۆیەش پێویستە پارتیزان بە وردی شوێنو كاتی دەست وەشاندن لە دوژمن دیاری بكاو لەو كاتو شوێنەدا دەست لە دوژمن بوەشێنێ كە بە زیانو تەلەفاتێكی زۆر كەمو بە مەسرەفكردنی لانیكەمی تەقەمەنی، زیانی گەورە لە پەلاماردەران بداو چەكو تەقەمەنی‌یەكی زۆر وەدەست بێنێ. لە هەموو حاڵێكدا پێویستە هێزی پێشمەرگەی حیزب وەك پارتیزانێك ئەوەندە بكرێ دەست بە تەقەمەنی‌یەوە بگرێو تەنانەت بە هەڵكەوت نەبێ چەكەكەی نەخاتە سەر ڕیز.

پێویستە هەمیشە لەبەرچاومان بێ كە شەڕی پارتیزانی شەڕی ماندووكردنی دوژمنە، بۆیە زۆر وێ دەچێ، شەڕی ئێمە لە دژی دەسەڵاتی كۆنەپەرستیو دیكتاتۆری شەڕێكی درێژخایەن بێ. كەوابوو پێشمەرگە دەبێ خۆی بۆ چەندین ساڵ شەڕو بەربەرەكانێ ئامادە بكاو لە پەلەپەلی بێجێو دانی تەلەفاتی زۆر خۆی بپارێزێ. نابێ لە بیرمان بچێ كە یەكێك لە گرنگترین ئەركەكانی پارتیزان پاراستنی گیانی خۆیەتیو سەركەوتووترین شەڕ ئەو شەڕەیە كە زیانی پێشمەرگە كەمتر بێ یان هەر زیانی نەبێ. ئەو كارەش پێویستیی بەوەد هەیە كە پێشمەرگەكانمان هونەری پەلامارو پاشەكشەو سەنگەرگرتنو زەبر وەشاندن باشترو باشتر فێر بن.

شەڕی پارتیزانی زیاتر شەڕی مەڵبەندە شاخاوی‌یەكانو ناوچە لادێی‌یەكانە. بەڵام بۆ ئەوەی لە هەموو دەرفەتێك بۆ زەبروەشاندن لە پەیكەری دوژمن كەڵك وەربگیرێ، پێویستە لە نێوان شەڕی چیاو پێدەشتەكانو دەستوەشاندن لە پێگەكانی دوژمن لە نێو شارەكاندا هەماهەنگی پێك بێ. بێ ئەوەی لە هیچ حاڵەتێكدا لە نێو شارەكان جەبهە بكرێتەوەو شەڕی سەنگەری بكرێ. چونكە سەنگەر گرتنو شەڕی جەبهەیی لە نێو شار لەلایەك دەبێتە هۆی وێرانی شارەكەو كوژرانی خەڵكی بێدیفاعو لە لایەكی دیكەش كەرەستەو تەقەمەنی‌یەكی زۆر تێدا دەچێ كە زۆر كەم وایە لەو جۆرە شەڕانەدا جێگای پڕ بكرێتەوە. بێجگە لەوەش ئێمە دەبێ لە نێوان خەباتی چەكدارانەو خەباتی هێمنانەی نێو شارەكاندا هاوئاهەنگیو ڕێكخستن پێك بێنین تاكوو بتوانین لە هەموو دەرەتانێك بۆ بەرەوپێشبردنی خەباتی خۆمان كەڵك وەربگرین. با نەیشارینەوە كە لە كاتێكدا پێشمەرگە بۆ فیداكاریو ئازایەتی نموونەیەو لەو بارەوە جێگای دەستخۆشیو ئافەرینە، هەتا ئێستا لەبارەی نەزمو

دیسیپلینەوە لە پاشە. لە کاتێکدا دیسیپلینو پاراستنی نەزمو گوێگرتن بۆ دەستووری بەرپرسانی سەرەوەتر لە ریزەکانی پێشمەرگەدا هەم بۆ سەرکەوتنی نەخشەو گەلاڵەکانی شەڕو هەم بۆ پاراستنی گیانی پێشمەرگە هۆیەکی زۆر بەسوودەو کاریگەرە. لە نێو پێشمەرگەکانی ئێمەدا نهێنیکاری بەو جۆرەی کە پێویستە، لەبەرچاو ناگیرێ. زۆر جار بینراوە کە پێشمەرگەیەك پێش بەجێ گەیاندنی ئەو ئەرکەی پێی ئەسپێردراوە، مەئموورییەتەکەی بۆ کەسانی دیکە باس کردوە. جاری واش هەبووە ئەو زار بڵاوییە بۆتە هۆی ئەوە کە دوژمن لە نەخشەی پێشمەرگە ئاگادار بێو لە ئاکامدا نەخشەکە سەرنەکەوێ. بەو جۆرە تەوسیە دەکرێ کە نهێنیکاریو دیسیپلین وەك دوو ئەسڵی گرنگی خەباتی سیاسیو دوو هۆی کاریگەری سەرکەوتنی خەباتی چەکدارانە، هەرچی زیاتر لە نێو ریزەکانی پێشمەرگەدا لەبەرچاو بگیرێنو خۆشكو برایانی پێشمەرگە لە هیچ حاڵێکدا ئەو دوو ئەسڵە بە کەم نەگرن.

کاری سیاسی نێو هێزی پێشمەرگەو هاودەنگیی نێوان بەشی سیاسیو نیزامی لە دوو ساڵی رابردوودا چۆتە پێش، بەڵام جارێ نەگەیشتۆتە رادەی پێویست. لەو بارەیەوە پێویستە بگوترێ کە هێزی پێشمەرگە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجە سیاسییەکانی حیزب دروست بووەو هەر وەخت ئامانجە سیاسییەکانی وەدی بێن، هێزی پێشمەرگە کاری دیکەی پێ ئەسپێردرێ. کەوابوو پێویستە هەموو کردەوەیەکی نیزامی لە خزمەتی ئامانجە سیاسییەکاندا بێو هەموو بڕیارێکی گرنگی نیزامی لە ناوچەکاندا بە ئاگاداری هەیئەتی ئیجرایی کۆمیتەی شارستان، یان هەر نەبێ بە هاوکاری مەسئوولی شارستان بگیرێ. دیارە تەکنیکی عەمەلیاتو وردەکاری لە نەخشە نیزامییەکاندا لە ئەستۆی فەرماندەری هێزو بەرپرسەکانی پێشمەرگەیەو بەشی سیاسی لەو بارەوە دەخالەت ناکا، بەڵام لەبەرە ئەوەی هەموو شەڕێك هێندێ ئەنجامی سیاسیی بەدواوەیە، پێویستە ئەنجامدانی هەر عەمەلیاتێکی نیزامی، ئاکامە سیاسییەکانی لە هەیئەتی ئیجراییدا لێك بدرێتەوە.

تەداروکاتیش لە نێو پێشمەرگەدا جارێ لاوازەو پێویستە کاری زیاتری لەسەر بکرێ. زۆر جار رێك کەوتووە پێشمەرگە لە سەنگەردا شەوو رۆژێك نانو ئاوی پێ نەگەیشتوە. جاری واش بووە کە تەقەمەنیو کەرەسەی شەڕ لەگەڵ ئەوەی کە لەبەر دەستیشدا بووە، بە وەخت نەگەیشتۆتە پێشمەرگەکانو لە ئاکامدا ناچار بوون جێگای

خۆیان بەجێ بێلّن. لەو بارەوە کومیتەکانی حیزبی رەخنەیان دێتەوە سەر. بەشی تەدارۆکاتی کومیتەی شارستانو هێزی مەلّبەند دەبێ هاوکارییەکی وایان لەنێودا هەبێ کە هەموو شتێك لە کاتی پێویستدا بگاتە جێگای خۆیو پێشمەرگە لەنێو سەنگەردا هەست نەکا کە پشتی جەبهەی نیە. دەبێ کارێك بکرێ کە بەرەبەرە هاودەنگی تەواو لە نێوان رێکخراوی حیزبو هێزی پێشمەرگەدا پێك بێ. بەڕاستی ئەو کاتە دەتوانین بە تەواوی هیوامان بە سەرکەوتن هەبێ کە هەموو پێشمەرگەکان بە تێگەیشتنەوە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی حیزب تێبکۆشنو هەموو ئەندامانی حیزبیش خۆیان بە پێشمەرگە بزانن.

کەموکوڕیەکی دیکە کە بەداخەوە هێشتا لە نێو پێشمەرگەکاندا بەرچاو دەکەوێ، بێموبالاتیو کەمتەرخەمی لە کێشكو نیگابانی دایە. هەتا ئێستا چەند جار زیانی گەورەمان لەو کەمتەرخەمییە دیوە. لەبەر نەبوونی نیگابانی پەلێکی پێشمەرگە گەمارۆ دراوەو بەداخەوە دە قارەمانیان لێ شەهید بوون. چەند جار رێك کەوتووە لە بێ مۆبالاتی پێشمەرگە کەلّکیان وەرگرتوەو لە زیندانی حیزبدا رایان کردوە کە بەختیارانە بەشی زۆریان بەهۆی کاری خەلّکەوە گیراونەوە.

تێکۆشان بۆ بەرزکردنەوەی پلەی تێگەیشتنی سیاسیو هونەرەکانی نیزامی لە نێو پێشمەرگەدا کەمتر لە رادەی پێویستە. زۆر جار دەبینرێ لەکاتی حەسانەوەدا وەختی پێشمەرگە بەفیڕۆ دەچێو بۆ تەمرین لەسەر بەکارهێنانی چەکە جۆربەجۆرەکان یان بۆ بردنەسەری پایەی تێگەیشتنی سیاسیو کۆمەلآیەتی کەلّکی لێ وەرناگیرێ. جگە لەوەش، وەرزشو پەروەردەی بەدەنی لەنێو هێزی پێشمەرگەدا زۆر کەمە. دیارە ئەوەش بە کەموکوڕیەك لەکاری پێشمەرگایەتیدا دەژمێردرێ. پارتیزان هەمیشە دەبێ لە وەزعێکی بەدەنیی ئەوتۆدا بێ کە بتوانێ چەندین سەعات کار بکا، بەرێگادا بڕوا و ئەگەر پێویست بوو غار بدا. ئاشکرایە کە ئەوەش بەبێ وەرزشو پەروەردەی بەدەنی لەتوانادا نیە.

بەجێیە ئەوەش بگوترێ کە هێندێ لە پێشمەرگەکان کارکردن بە پێچەوانەی شوغلّی پێشمەرگایەتی دەزانن‌و تەنانەت پێیان عەیبە کار بکەن. بەڕاستی ئەو بۆچوونە زۆ نادروستەو پێشمەرگە دەبێ لەگەلّ خەلّکی زەحمەتکێش کار بکا، وەك ئەوان لە کاروباری بەرهەمهێناندا هاوکاری بکا. بەتایبەتی هەق وایە پێشمەرگەکان

ئەوکاتەی لە جەبهەو لە مەیدانی شەڕدا نین، بە ڕەنجی شانو بازوی خۆیان خانوو بۆ بنکەکانیان دروست بکەنو بەو کارە هەم خۆیان لە بێکاریو ڕەقەپشت بوون، ڕزگار دەکەنو هەم یارمەتییەکیش بە حیزب بگەیەنن بۆ ئەوەی خەرجی خانوو دروستکردنو ئەو جۆرە کارانە نەکەوێتە سەرشانی حیزب.

**هاوڕێیانی خۆشەویست!**

لە ماوەی پاش کونگرەی چوارەمدا حیزبەکەمان لەبارەی کاروباری پێشمەرگەوە دوو دەسکەوتی گەورەی هەبووە: یەکەم، دامەزراندنو پەرەپێدانی نەخۆشخانەکانی حیزبە. زۆر بە شانازییەوە ڕادەگەیەنین کە ئێستا پزیشکەکانی نەخۆشخانە بە ئیمکاناتی کەمەوە کە بەشی زۆری بۆ خۆیان پێکیان هێناوە، سەختترین عەمەلی جەڕاحی بۆ بریندارو نەخۆشەکان دەکەنو هەموو مانگێك چەندین پێشمەرگەی بریندارو چەندین لاوی فیداکار بە تێکۆشانی دڵسۆزانەی پزیشکەکان لە مردن ڕزگار دەبنو دەگەڕێنەوە نێو سەنگەری خەبات. بۆیە جێگای خۆیەتی کە پڕ بەدڵ لە زەحمەتو کوێرەوەری تەواوی ئەو کەسانەی لە دامەزراندنو بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکاندا هاوکاریان کردوە، بەتایبەتی لە کارو ماندووبوونی شەوو ڕۆژی پزیشکەکانو کادری دەرمانی نەخۆشخانەکان سوپاس بکەین.

دووهەم دەسکەوتمان، دامەزراندنی سیستمی موخابراتە. موخابرات هەروەك هەمووتان دەزانن بۆ کاروباری خەباتی چەکدارانە شتێکی حەیاتییە. موخابرات لەڕاستیدا شاڕەگی کاروباری چەکدارییەو ئەگەر ئەو شاڕەگە کار نەکا، تەواوی بەشەکانی دیکەی خەباتی چەکدارانە تووشی شپرزەییو نابەسامانی دەبن. زۆر بە شانازیی دەزانین کە ئێستا دەتوانین ڕابگەیەنین لە شیماڵەوە تا جنووب لە هەموو ناوچە گرنگەکانی کوردستاندا دەزگای موخابراتی ئێمە چالاکانە کار دەکاو هەموو ڕووداوەکانی شەڕو پێداویستییەکانی پێشمەرگە لە زووترین کاتدا بە دەفتەری سیاسیی حیزب ڕادەگەیەندرێن. جگە لە شەبەکەی سەرتاسەری، زۆر لە دەستەو لکەکانی پێشمەرگە لەنێو خۆیاندا پێکەوە بە بێسیم پێوەندییان هەیەو لە زووترین کاتی مومکیندا دەتوانن کۆمەكو یارمەتی بە یەکتر بگەیەنن. جێگای باسە کە هەتا ئێستا دوو سێ کلاس بۆ فێرکردنی بێسیم دانراوەو هیواداریین لە داهاتووشدا تێکۆشان بۆ پەرەپێدانی موخابرات درێژەی هەبێ. بەو بۆنەوە ڕێگا بدەن بەناوی

هەموو بەشدارانی کونگرەوە لە تێکۆشانی بێوچانی موهەندیسو هەموو کادری بەشی موخابرات سوپاس بکەینو رێز بۆ کاری بەکەڵكو بەسوودی ئەوان دابنێین.

**خۆشكو برا بەڕێزەکان!**

سەرەڕای هەموو هەوڵو تەقەللای ئێمەو تێکۆشانی بێوچانی کادری پزیشکی نەخۆشخانەکان، بەداخەوە دیسانیش هێندێ لە بریندارەکانمان کە برینەکانیان کاریگەرە شەهید دەبنو هێندێکی دیکەش لاقو دەستو ئەندامی دیکەی لەشیان لەدەست دەدەن. زۆر ناخۆشە کە لە هەلومەرجی شەڕدا خزمەتێکی گەورەو بەرچاومان بۆ نقوستانەکان لەدەست نایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش پێویستە لە هەموو جۆرە کومەكو یارمەتی‌یەك کە لە دەستمان دێ، دەرهەق بەو رۆڵە فیداکارانە درێغی نەکەین. بەو هیوایەی کە دوای سەرکەوتنی شۆڕش، گەلەکەمان بتوانێ پاداشی لەخۆبردوویی ئەو رۆڵە بەنرخانەی بداتەوە.

ئەرکێکی دیکەی گرنگمان راگەیشتن بە خاوو خێزانی شەهیدانە. دەبێ ئەو راستی‌یەمان لەبیر بێ کە یەکێك لە ئێمە هەر ئەندازە لە رێگای گەلەکەی‌دا فیداکاری بنوێنێ، لەچاو هاوڕێ شەهیدەکانمان کە گەورەترین سەرمایەی ژیان، واتە گیانی خۆیان لەرێگای میللەتدا بەخت کردوە، هەر لە پاشە. ئێستا کە ئەو رۆڵە قارەمانانە سەریان لە رێگای بیروباوەڕیان داناوە، ئەرکی ئێمەو هەموومانە کە نەهێڵین کەسوکاریانو بەتایبەتی ژنو منداڵیان هەست بەبێ کەسی بکەن. دەبێ لە زاری خۆمانو تەنانەت پێشمەرگەکانیش بگێڕینەوە بۆ ژیانی خاوو خێزانی شەهیدەکانمان.

چەند مانگە کومیتەی ناوەندی بڕیاری داوە کە بێجگە لەو یارمەتی‌یەی بەناوی شەهیدانە دەدرێ بە بنەماڵەی شەهیدان، هەموو مانگێك یارمەتی پێشمەرگە شەهیدەکان بدرێ بە ژنو منداڵو کەسانی ژێر تەکەفوولی ئەوان. بە خۆشی‌یەوە ئەو بڕیارە لە زۆربەی ناوچەکاندا جێبەجێ کراوەو یارمەتی خێزانی شەهیدان بە رێکوپێکی دراوە. بەڵام دیارە ئەوەی تا ئێستا بۆ خێزانی شەهیدان لە دەستمان هاتووە زۆر کەمە. پێویستە لەمەودواش هەوڵ بدەین یارمەتی زیاتریان پێ بکرێ. هەتا ئەو رۆژەی کە هیوادارین گەلەکەمان سەربکەوێو خزمەتی بنەماڵەی شەهیدان بەو جۆرەی پێویستە، وەئەستۆ بگرێ.

ڕۆژنامەی "کوردستان پریس" بووە کە لە لایەن کوردەکانی سوئێدەوە دەردەچێ، هەروەها لە سوئێد لە ئەنستیتۆی وەزارەتی دەرەوە کونفرانسێکم داوە کە لەوێش‌دا نیزیك بە ٤٠ کەس دیسان لە پسپۆڕەکان‌و شەخسیەتە سیاسی‌یەکان تێی‌دا بەشدار بوون. لە ئۆتریش‌دا وتووێژم هەبووە لەگەڵ رادیۆ کە بە درێژی بڵاو بووەتەوەو هەروەها لەگەڵ ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی ئوتریش وەك "دی‌پرس"و "ئەزباتین بای تونگ" کە ڕۆژنامەی حیزبی سۆسیالیستی سوئێدە. لە سەفەری دووهەمم لە فەرانسە، لە شوورای ئەنترناسیۆناڵی سۆسیالیستدا بەشدار بوومو هەروەها بەهۆی دەعوەتی حیزبی کومۆنیستی فەرانسە لە سەدەمین ساڵی دانانی سروودی ئەنترناسیۆناڵ کە سروودی زۆربەی حیزبە کومۆنیستەکان بووە لە شاری "لیل"دا بەشدار بووم. لەم دوو دەرەتانە کەڵکم وەرگرت بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ دەیان سەرۆك وەزیرو وەزیرو نوێنەری پارلمان‌و نوێنەرانی حیزبە سۆسیالیست‌و کومۆنیستەکان. بێجگە لەوە لەگەڵ زۆر شەخسییەتی کوردستانی عێراق‌و تورکیەو هەروەها زۆر لە شەخسییەتەکان‌و نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی ئوپۆزیسیۆنی ئێرانی دانیشتنم بووە. هەروەها لە هەموو ئەو وڵاتانەدا لەگەڵ ئەندامان‌و لایەنگرانی حیزب چەندین جار کۆبوونەوەم کردووەو وەزعی کوردستانی ئێرانم بۆ باس کردون، بەم جۆرە کە دەبینن لە ماوەی بوونم لە دەرەوەدا بێکار دانەنیشتوم!

پ: کاك دوکتور ئەوساڵ مەسەلەی کورد بە شێوەیەکی بەربڵاو کەوتە سەر زارو زمانان‌و لە رادەی جیهانی‌دا هاتە بەرباس‌و لە زۆر وڵات‌و بەتایبەت لە زۆر ڕۆژنامەو گۆڤاری موعتەبەرو بەناوبانگی جیهانی‌دا باسی کورد کراوە. پێم خۆش بوو نەزەری جەنابتان لەم بارەوە بزانم بەگشتی چۆن چاو لە مەسەلەی کورد لە رادەی جیهانی‌دا دەکرێ؟

و: راستی ئەوەیە کە چۆنیەتیی هێنانەگۆڕی مەسەلەی کورد، ئێستا لە جیهان‌دا گۆڕاوە. مەسەلەی کورد باشتر ناسراوەو باشتر پشتیوانی لە مافی گەلی کورد دەکرێ. ئەو باشتر ناسینە، ئەوەندە چووەتە پێش کە مەسەلەی کورد خەریکە دەبێتە مەسەلەیەکی نێونەتەوەیی. زۆر دەرگا کە پێشتر داخرابوون، کراونەتەوەو نوێنەرانی کورد لە زۆر جێگا وەردەگیرێن کە پێشتر بە هاسانی وەرنەگیراون. یارمەتیی سیاسی‌و مەعنەوەیی بزووتنەوەی کورد لەمەودوا وا تێ‌دەگەم کە زۆر زیاتر دەبێ، بەرەبەرە

ڕێگا خۆش دەبێ بۆ ئەوە مەسەلەی کورد لە نێو ڕێکخراوەکانی نێونەتەوەییشدا بێتە گۆڕێ. بۆ نموونە بڕیار دراوە کونفرانسێك بۆ دیفاع لە مافو هۆویەتی فەرهەنگیی گەلی کورد لە رۆژەکانی ٢٨و ٢٩و٣٠ی مانگی بانەمەڕی ساڵی داهاتوو لە دووسەدەمین ساڵی بڵاوبوونەوەی بەیاننامەی مافی مرۆڤ لە پاریس پێك بێ کە وەزیری موشاویری فەرانسە بۆ کردەوەی بەشەردۆستانە پێکی دێنێ. لەم کونفرانسەدا نوێنەرانی زۆر ڕێکخراوی گەورەو حیزبە سیاسی‌یەکان لە سەرانسەری جیهان بەشدار دەبن‌و هەروەها دیارە نوێنەری ڕێکخراوە کوردستانی‌یەکان، حیزبی ئێمەش بە ڕەسمی داوەتی لێ کراوە کە نوێنەری خۆی بۆ ئەم کونفرانسە بنێرێ.

**پ:** کاك دوکتور بە نەزەری جەنابتان بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد وەك مەسەلەیەکی گشتی لە رادەیەکی جیهانی‌دا بێتە گۆڕێ‌و سەرنجی بیروڕای گشتیی جیهانی بۆ لای خۆی رابکێشێ، دەبێ چ بکەین؟ یانی تەنیا لەبەر ئەوە باسی نەکرێ کە چەکی شیمیایی لە دژی بەکار هێنراوە یا نا بەڵکوو وەك نەتەوەیەکی بندەست‌و بێبەش لە هەموو مافێکی ئینسانی سەیری بکرێ؟

**و:** بەکارهێنانی چەکی شیمیایی مەسەلەی کوردی زیاتر لە جاران لە رادەی جیهانی‌دا هێنایە گۆڕێ. بەداخەوە زۆر کەس، بڵێم هەزاران کەس لە کورد بکوژرێ، هەتا مەسەلەی کورد وەك ئەمڕۆ لە ڕادەی جیهانی‌دا زەق بێ. بەڵام بە نەزەری من ڕێکخراوە سیاسی‌یەکان دەبێ لەو وەزعە تازەیە کە پێك‌هاتوە کەڵك وەربگرن بۆ ئەوە مەسەلەی کورد تەنیا نەبەستنەوە بە چەکی شیمیایی‌یەوە. لەوەش زیاتر مەسەلەی کورد تەنیا مەحدوود بە عێراقیش نەکرێ، مەسەلەی کورد لە هەموو ئەبعادی خۆی‌دا بەو شێوەیە کە هەیە لە واقیعدا مەسەلەی ٢٥ میلیۆن کوردە دەبێ مەترەح بکرێ‌و پێم‌وایە کە ئەگەر بەو شێوەیە ئێمە بچینە پێش سەرکەوتنمان زیاتر دەبێ. موهێمیش ئەوەیە کە ئەو پەیامەی کە ئێمە لەو وەزعە تازەیەدا دەینێرین پەیامێك بێ کە باش لە دەرەوە وەربگیرێ. دەبێ بە هەموو ئەو کەسانە کە گوێیان لە قسەکانی ئێمەیە بڵێین کە داوای کورد زۆر سادەو رەوایە، کورد مافی نەتەوەیی خۆی دەوێ کە لە بەیاننامەی جیهانیی مافی مرۆڤدا هاتوە. واتە شتێکی زیادی نیە، بۆیە مەسەلەن داوای خودموختاری مەسەلەیەکی نێوخۆیی نیە. چونکە لە زۆر لە دەوڵەتان وەك دەوڵەتی ئێران ئەگەر باسی خودموختاری دەکرێ دەڵێ ئەوە مەسەلەیەکی نێوخۆیی‌و

داخلی خۆمە کەس هەقی نیە دەستی تێ وەربدا کەوابوو مەسەلەی خودموختاری مەسەلەیەکی نێوخۆیی نیەو بەشێکە لە مافی مرۆڤ. بۆیەش ئەو دەوڵەتو رێکخراوو شەخسییەتانە کە خۆیان بە لایەنگری مافی ئینسان دەزانن پێویستە لە داوا رەواکانی گەلی کورد پشتیوانی بکەن. نێونەتەوەیی کردنی مەسەلەی کورد یانی ئەوە، یانی راکێشانی پشتیوانیی جیهانی بۆ مافە رەواکانی گەلی کوردو هەرچی ئەم پشتیوانیە زیاتر بێ ئەوکاتە بێگومان فشارێکی پتر دێتە سەر ئەو وڵاتانەی کە کوردی تێدا دەژیو ناچاریان دەکا داوای بیرورای گشتیی جیهانی بخەنە بەرچاو، هەرچەند هێندێك لەو دەوڵەتانە وەکو مەسەلەن رێژیمی خومەینی وا نیشان دەدا کە هەرچی لە دنیا بگوترێ گوێی ناداتێ، بەڵام لە راستی‌دا وانیە. بە تەجروبە بۆمان دەرکەوتوە کە فشاری نێونەتەوەیی تەئسیری زۆری هەیە. بۆ ئەوەی بزووتنەوەی کوردستان لە دەرەوە نەبێتە مەسەلەیەکی فەسڵی پێویستە بێجگە لە درێژەپێدان بە خەباتی نێوخۆ کە ئەسڵەو ئەوە دەبێ زۆر جار هەر بگوترێ کە هەرچی لە دەرەوە دەکرێ دەتوانێ یارمەتی بدا بە خەباتی ئێمە بەڵام خەباتی ئەسڵی، خەباتی خۆمانە لە نێوخۆی کوردستاندا. دەبێ لە دەرەوەش تێکۆشانی زیاتر بکرێو هێندێك هەماهەنگیش لەو تێکۆشانەدا پێك بێ، بۆ ئەوە کە هەم مەسەلەی کورد باشتر بناسرێو هەم بیرورای گشتیی جیهانی پشتیوانیی زۆرتر لە مافی رەوای گەلی کورد بکا. بەتایبەتی زۆر پێویستە نیشان بدرێ کە بزووتنەوەی کورد بزووتنەوەیەکی دێموکراتی ئینسان دۆستە، ئەسیلە، رابردووی دوورو درێژی هەیە، دوورە لە تێرۆریزمو کردەوەی تیرۆریستی چ لە نێوخۆی وڵاتو چ لە دەرەوە. بە تەجروبە بۆم دەرکەوتووە کە ئەگەر ئێمە پەیامی خۆمان بەو شێوەیە بنێرینە دەرێ، بەو زمانە لەگەڵ نوێنەرانی تەنانەت دەوڵەتانیشو رێکخراوەکانی سیاسیو رۆژنامەنووسەکان قسە بکەین، قسەکانمان زۆر باشتر وەردەگیرێو زۆر زیاتر پشتیوانمان بۆ پەیدا دەبێ.

پ: کاك دوکتور ئەودەم کە لە دەرەوەی وڵات بوون، خەبەری بەشداریی حیزبی ئێمە لە کۆبوونەوەی ئەنترناسیۆناڵی سۆسیالیستدا لە رادیۆ بڵاو کرایەوە، بەتایبەتی باسی هەڵوێستی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستمان لەسەر مەسەلەی کورد کرد. ئێستا ئەگەر دەگونجێو ئیمکانی هەیە هێندێك زیاتر ئەم مەسەلەیە بۆ ئێمەو گوێگرە بەرێزەکانمان شی بکەنەوە بەتایبەتی ئەوە کە بۆخۆشتان لەو کۆبوونەوەدا بەشداریتان

هەبوو گومانی تێدا نیە لە هەڵوێستگرتنی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیت بەرانبەر بە مەسەلەی کورد نەخشتان هەبووە.

و: هەروەها کە دەزانن ئێمە یەکەم جار سێ ساڵ لەوەی پێش لە کۆنگرەی ١٧ی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە شاری لیما لە پرۆ بەشداریمان کرد وەك یەکەم حیزبی کوردستانی بووین کە بانگ کرابووین. هەر لەوێدا بۆ ناساندنی مەسەلەی کورد بۆ ئاشناکردنی حیزبە سۆسیالیستی‌یەکان لەسەر وەزعی کوردستان هەولێکی زۆر درا. ئەمساڵ لە ١٥و ١٦ی مانگی سەرماوەزدا، شوورای ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە شاری پاریس پێکهات کە زیاتر مەبەستی ئامادەکردنی کۆنگرەی ١٨ی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستە کە بڕیار وایە لە مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٦٨دا لە شاری ستۆکهۆڵم پێك بێ. ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە لەو هەلومەرجەدا کە شوورای ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە پاریس گیرا هەروەها کە گوتت مەسەلەی کورد وەك مەسەلەیەکی زەق لە بەرچاو بوو. هەڵوێستی بیروڕای گشتیی جیهانی نیسبەت بە مەسەلەی کورد زۆر گۆڕابوو، زۆر باشتر ببوو. بەشدارانی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستیش لەگەڵ مەسەلەی کورد زیاتر ئاشنا بوون. پاش مەشوەرەت لەگەڵ نوێنەرانی یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان کە ئەوانیش لەو شوورایەدا بەشدار بوون هاتینە سەر ئەو بڕوایە کە دەبێ زیاتر "ذهنی" بەشدارانی شووراو بەتایبەتی ئەوانە کە لە ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستدا دەسەڵاتیان هەیە روون بکەینەوە. لەسەر مەسەلەی کوردو پەیامی خۆمان ئەو پەیامەی کە باسم کرد ئەو پەیامەیان پێ رابگەیەنین. لە لایەکی دیکەشەوە ئەگەر دیتمان کە هەلومەرج لەبارەو ئامادەیە، ئەو کاتە شتێکیش بە نووسراوە پێشکەش بکەین ئەوە بوو کە دەستمان کرد بە دانیشتن‌و قسەکردن لەگەڵ زۆر لە نوێنەرانی حیزبە سۆسیالیستی‌یەکان‌و بەتایبەتی ئەوانەی کە لەواقیعدا سەرۆکایەتیی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستیان بەدەستەوەیە وەك "ویلی برانت" کە سەرۆکی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیتە وەك "پنتی وانن" کە سکرتێری ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستەو هەروەها "پیر موروا" کە سکرتێری یەکەمی حیزبی سۆسیالیستی فەرانسەیەو میوانداری ئەو شوورایە بوو، لەگەڵ نوێنەرانی حیزبی سۆسیال دێموکراتی ئاڵمان‌و سوئێد، لەگەڵ خودی سەرۆك وەزیری سوئێد "کالسۆن" کە ئامادە بوو لەوێ قسەمان کرد لەگەڵ نوێنەرانی حیزبی سۆسیالیستی ئۆتریش‌و

ئیسپانیاو زۆر لە حیزبە سۆسیالیستەکانی ئامریکای لاتینو ولآتانی دیکەدا چاوپێکەوتنمان هەبوو و بۆمان دەرکەوت کە بێ ئەملاو ئەولا هەموویان ئامادەن پشتیوانی لە مافی رەوای گەلی کورد بکەن. ئەوە بوو کە دەستمان کرد بە ئامادەکردنی بەڵگەیەك کە لە رۆژنامە کوردستاندا چاپ بووە. ئامادەکردنی ئەو بەڵگەیە درا بە منو منیش پاش ئەوەی کە بە شێوەیەکی ئەوتۆ ئامادەم کرد کە لەواقیعدا هەموو کەس وەری‌بگرێ لە عەینی وەختیش‌دا داخوازەکانی، هەموو داخوازەکانی گەلی کوردی تێدا بێ. پاش ئامادەبوون بڵاوکرایەوە لە نێو هەموو نوێنەرانی شوورادا بەڵام چونکە لە بەرنامەدا مەسەلەیەکی وا نەگونجا بوو و لە لایەکی دیکەشەوە هەر بڕیارنامەیەك کە شوورای ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست پەسندی دەکا دەبێ پێشتر، مانگێك پێشتر کومیسیۆنی پێویست ئەو بەڵگەیە ئامادە بکا یا پەسندی بکا، لەبەر ئەوە باسی مەسەلەی کورد خرایە ئاخری دوادانیشتنی شوورای ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست. قازانجی ئەوە بوو کە هەموو وەختێك لە ئاخری بلێین ئاخرین کۆبوونەوە، لە دواکۆبوونەوەی شوورادا کە ئیدی خەریکە شوورا تەواو دەبێ، هەموو نوێنەران ئامادە دەبن لێرەدا سکرتێری گشتیی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیست "وانن" مەسەلەی کوردی هێنایە گۆڕێ، داوای لە من کرد کە قسەی لەسەر بکەم. "ویلی برانت" کە سەرۆکی کۆبوونەوەکە بوو ئیجازەی قسەی دامێ، منیش قسەم کردو هەروەها ئاگادارن هەم سکرتێرو هەم خودی ویلی برانت پشتیوانی‌یەکی گەرمیان لە قسەکانی من کردو بەڕاستی تەواوی شوورا بە چەپڵەلێدانێکی زۆر گەرم قسەکانی ئێمەی وەرگرتو ئەو بەڵگەیەی پەسند کرد. بە نەزەری من ئەو بەڵگەیە لەم بارەوە گرینگە کە بۆ یەکەم جارە کە شوورایەکی ئەوتۆ گەورە بەڵگەیەکی ئاوا پەسند دەکا. لەم بەڵگەیەدا باسی گەلی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان کراوە باسی ٢٥ میلیۆن کورد دەکرێ. لەم بەڵگەیەدا هاتوە کە پشتیوانی لە مافی ڕەوای گەلی کورد دەگوترێو ناگوترێ خودموختاری یا شتێکی دیکە، ئەویش هۆیەکەی ئەوە بوو کە ئەگەر ئێمە لە کوردستانی ئێراندا داوای خودموختاری دەکەین، هێندێك رێکخراو مەسەلەن لە کوردستانی تورکیە داوای شتێك زیاتر لە خودموختاری دەکەن. بۆیە ئێمە هەر مافی نەتەوەیی گەلی کوردمان لەوێ داناوە لە پاشان لەوێ گوتراوە کە مافی نەتەوەیی کورد بەشێکە لە مافی مرۆڤ و مەسەلەیەکی نێوخۆیی ئەو وڵات...

نیە، بۆیە هەموو کەس دەبێ دیفاعی لیٚ بکا. هەروەها لـەو بەڵگەیـەدا هـاتوە کـە مەسەلەی کورد رێگای چارەسـەر کردنـی نـیزامیی نیـە، بـەڵکوو ئـەویش وەك زۆر مەسەلەی دیکە دەبـێ لـە رێگـای وتوویـێژەوە چارەسـەر بکـرێ. بێجگـە لـەوە لـەو بەڵگەیـەدا هـاتوە کـە رێگـای چارەسـەرکردنی ئـەو مەسـەلەیە بـە دامـەزراندنی دێموکراسی لەو وڵاتانەدا کە کورد تێیاندا دەژی، باشترو لەبارتر پێك دێو مەسـەلەی کورد باشتر چارەسەر دەکرێ. بەکورتی دەتوانم بڵێم کە ئەگەر هەمووی ئـەو بەڵگەیـە تەماشا بکەین لەواقیعدا شوعاری ئەسـڵیی ئێمـە، حیزبی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێران، دێموکراسیو خودموختاریی تیٚدایـە، پێم خـۆش بـوو ئـەوەندەش بڵێـم کـە بێگومان لە کۆنگرەی داهاتووی ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستدا بڕیاری زۆر مۆفەسەلترو رێکوپێکتر لەسەر مەسەلەی کورد دەدرێ. گرینگیـی ئـەو بڕیـارە هـەر ئەوەیـە کـە گەورەترین ئەنجومەنی حیزبە سیاسییەکانی جیـهان کـە بەڕاسـتی ئەنجومـەنی پـانو بەرینتر لـە ئەنجومـەنی ئەنترناسـیۆناڵ سۆسیالیسـت نیـە کـە ئـەو هـەموو حیزبـە سیاسییەی لە نێوخۆدا کۆ کردبێتەوەو بەتایبەتی کە زیاتر لـە ١٧ حـیزبی بەشـداری ئەم ئەنترناسیونالە حکوومەتیان بەدەستەوەیە، بۆ یەکەم جار بەڵگەیەکی وایان پەسند کردوە، ئەوە مانای ئەوەیە کە بەرەبەرە دەوڵەتەکانی ئەو وڵاتانـەی کـە حیزبـەکانیان سۆسیالیستو حکوومەتیان، دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە، ئـەوانیش لـە دوارۆژدا زیـاتر موتەعەهێدو ناچار دەبن کە لە مافی رەوای گەلی کورد پشتیوانی بکەن.

**پ:** با بچینە سەر باس لە تێکۆشانی حیزبەکەمان. کاك دوکتور وەزعـی حـیزب لە رادەی نێونەتەوەییدا چۆنە، چۆن دەناسرێ، بە وتەیەکی دیکە چۆن خۆی ناساندوە؟ ئەگەر دەکرێ لەم بارەشەوە هێندێك باسمان بۆ بکەن.

**و:** دیارە زۆر جار باسی ئەو مەسەلەیەم کردوە، بەڵام هێندێك شت هەر پێم خۆشە دووپات بکەمەوە. راستی ئەوەیە کە حیزبی ئێمە وەك حیزبێکی سیاسیی مەسئوولو خاوەن نفووزو دێموکرات ناسراوە، رۆژ بە رۆژیش رێزو قەدری لـە لای رێکخراوەکـانی سیاسیو رۆژنامەنووسەکانو بیروڕای گشتیی جیهانی دەچێتە سەر، تەنانەت بەرەبەرە هێندێك دەوڵەتیش ئامادەن کـە راسـتەوخۆ لەگـەڵ حـیزبی ئێمـە پێوەنـدی بگـرنو پشتیوانیمان لیٚ بکەن. ئەگەر من ناوی ئەو دەوڵەتانە ناهێنم، چونکـە هێنـدێ جـار مەحزووری سیاسییان هەیەو پێم باشە کە ئێمـە رەعایـەتی ئـەوان بکـەینو ئـەوەش

خۆی نیشانەی ئەوەیە کە ئێمە حیزبێکی سیاسیی مەسئوولین. ئەو وەزعەی کە ئێستا پێك هاتوە لە نەتیجەی دوو هۆی گەورەیە:

یەکێکیان کە ئەسڵەو ئەساسە، خەباتی حیزبی ئێمە لە نێو وڵاتدایە کە هەر باسی پاش شۆڕشی ئێرانیش بکەین ۱۰ ساڵە لەو مەیدانەدا موقاومەت دەکا، بەرامبەر بە ڕێژیمێکی وەك ڕێژیمی خومەینی ڕاوەستاوەو ئێستاش کە ئێستایە زۆربەی زۆری خەڵکی کوردستان بەدڵەوە پشتیوانیی لیٚ دەکەن.

دووهەم: سیاسەتی دروستو واقیعبینانەی حیزبەکەمانو ناساندنی ئەو سیاسەتە لە دەرەوەیە کە لە دەرەوە ڕێکخراوەکانی سیاسی، شەخسییەتەکان، دەوڵەتەکان، ڕۆژنامەنووسەکان، حیزبی ئێمە بە حیزبێکی واقیعبینو دێموکرات دەناسن کە تەبلیغاتی درۆ ناکا، خۆی هەڵ ناکێشیٚ وەك هێندیٚ کەسی دیکە، شوعاری توندوتیژی غەیری واقیعی نادا بەڵکوو تەحلیلەکانی لەسەر واقیعییەت داناوە، جا زۆرجار ئەو تەحلیلانە دەبنە هۆی پیٚناخۆشبوونی زۆر ڕێکخراوو شەخسییەتی بڵێین ئوپۆزیسیۆن. بەڵام ئەوە دیارە مەربووت بە خۆیانە کەوابوو ئێمە دەبیٚ لەم بارەوە زیاتر هەوڵ بدەین، یانی سیاسەتی حیزبەکەمانو خەباتی گەلەکەمان زیاتر لە جاران لە دەرەوە بناسێنینو پێموایە ئەگەر ئێمە ئەو کارە بکەین تەئسیری یەکجار زۆری دەبیٚ، ئەوەش نابیٚ زیاد نەکەم کە بەڕاستی حیزبی ئێمە چونکە لە سەرەتاوە هەموو شێوەکارو کردەوەی تیرۆریستی ڕەت کردۆتەوە ئەوەش بۆخۆی پرستیژێکی تایبەتی بۆ حیزبی ئێمە لە نێو هێزە دێموکراتییەکانی جیهاندا پێك هێناوە. دەمەویست نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە ئەویش ئەوەیە حیزبی ئێمە تەنیا حیزبێکی کوردستانی بوو کە هەم لە ئەنترناسیۆناڵ سۆسیالیستدا بەشدار بوو و هەم لەو دەعوەتەی کە حیزبی کومۆنیستی فەرانسە بۆ ۱۰۰ ساڵەی جێژنی سروودی ئەنترناسیۆناڵ سازی کردبوو، تەنیا حیزبێك بوو مەبەستم ئەوەیە کە لە هەموو لاوە حیزبی ئێمە بە حیزبێکی خاوەن نفووزو دێموکراتو مەسئوول دەناسن، زۆر دەرگا ئێستا ئاواڵەیە کە لە پێشدا ئاواڵە نەبوون، بێگومان لە دواڕۆژیشدا پێموایە لە دواڕۆژیشدا لەمەش باشتر دەبیٚ. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە من لە دەرەوە دەبمو پێوەندی دەگرم لەگەڵ زۆر شەخسییەتو ڕۆژنامەنووسو نوێنەری حیزبو ڕێکخراوەکان هەروەها کە باسم کرد لەو دەمەدا زۆر شانازی بەوە دەکەم کە نوێنەری حیزبی دێموکراتم.

پ: کاك دوکتور لە پەیامی جەنابتان بەبۆنەی ٢٢ی ڕێبەندان، ساڵڕۆژی شۆڕشی گەلانی ئێران هەروا بەکورتی ئیشارەیەکت بە وەزعی ئێستای ئێران و داهاتووی ئێران کردبوو. پێم وایە زەرەرێکی نیە ئەو بەشە بکەمە پرسیارێك و لێتان بپرسم نەزەرت بەرانبەر بە وەزعی ئێستای ئێران و داهاتووی ئێران چۆنە بەتایبەتی بەرانبەر بە پەیامی ئەم دوایانەی خومەینی؟

و: بە یەك وشە هەموو دیاردەیەکی وەزعی ئێستای ئێران نیشانەی بوحرانێکی قووڵە. ئەوەی کە ئێمە لە بەڵگە ڕەسمی‌یەکانی حیزبی خۆماندا پێش‌بینیمان کردبوو ئێستا هاتۆتە دی. لە واقیعدا کۆماری ئیسلامی لە گێژاوێك دایە کە نازانێ چۆن خۆی ڕزگار بکا. هیچ مەسەلەیەکی گرینگ نیە کە کاربەدەستانی ڕێژیم ناکۆکی‌یان لەسەر نەبێ. پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە، قەرز وەرگرتن یان وەرنەگرتن لە وڵاتانی دەرەوە، بازسازیی وڵات، بازسازیی وڵات بە دەس دەوڵەت بێ یا بە دەس بەشی خسووسی‌یەوە بێ، پێکهێنانی فەزای ئازاد ببێ یا نەبێ، ئازادیی تێکۆشانی سیاسی ببێ یا نەبێ، مەسەلەی کورد چارەسەر بکرێ یا چارەسەر نەکرێ، لەسەر هەموو ئەوانە کاربەدەستانی هەرە گەورەی ڕێژیم ناکۆکی‌یان لە بەیندا هەیە. مونتەزێری و ڕەفسەنجانی دەڵێن شۆڕشی ئیسلامی بە ئاواتەکانی نەگەیوە. خومەینی دەڵێ وا نیە بە ئاواتەکانی گەیوە و زۆریش سەرکەوتووە. ئەوان شەڕیان لە واقیعدا بە بەشێکی مەنفی لە ڕابردووی جمهووریی ئیسلامی داناوە. خومەینی دەڵێ لە شەڕیشدا ئێران سەرکەوتووە و بە ئاب و تابەوە لە پەیامەکەیدا تەعریفی دەسکەوتەکانی شەڕ دەکا، لە کاتێکدا کەم کەس هەیە نەزانێ کە شەڕ چی بەسەر گەلانی ئێراندا هێناوە، لە کوشتارو وێرانی و کوێرەوەری و بەدبەختی و هەژاری.

ئینسان خۆ ئەگەر زۆر بە وردی گوێ لە قسەکانی خومەینی دەگرێ وای دێتە بەرچاو کە هەر وابزانە خومەینی ئاگای لە دنیای ئەمڕۆ نیە. چونکە هەر ئەو قسانەی تیکرار دەکاتەوە کە لە سەرەتای شۆڕشی ئێراندا دەی‌کرد. ئەو کاتەی کە بەڕاستی لەبەر هێندێ هۆ کە پێم‌وایە لە پەیامی ٢٢ی ڕێبەنداندا باسم کردوە نفووزێکی زۆری پەیدا کردبوو و هێشتا هەر پێی وایە هەر شوعارێك کە ئەو بیدا گەلانی ئێران بە دڵ و گیان قبووڵی دەکەن، هێشتا هەر پێی وایە کە بە شوعارو هەراو هوریا دەتوانێ ڕێژیمی خۆی لە سەر پێ ڕابگرێ. بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە پاش

ئاگربەس لەگەڵ عێراق دەرکەوتوە کە کاربەدەستانی ئەم ڕێژیمە ناتوانن هیچ کام لە مەسەلە گرینگەکانی وڵات چارەسەر بکەن، هیچ بەرنامەیەکیشیان بۆ ئەوە نیە بۆیەش ئێمە دەڵێین کە ڕێژیم تەسبیت نەبووەو تەسبیتیش نابێ. ئێستا خومەینی مەسەلەیەکی بچووکی گرتوە بەقەد دنیایەك گەورەی کردوەو باسی دەکا ئەویش مەسەلەی "سەلمان روشدی"یە. دیارە نازانم بەلام من ئێستاش دلنیا نیم کە خومەینی کتێبی سەلمان ڕوشدی خوێندبێتەوە بەتەواوی، هەرچی بێ تەوهین بە دین‌و مەزهەبێك‌و بە موقەدەساتی هەر میللەتێك‌و یا بە موقەدەساتی خەڵك بەگشتی شتێکی خراپەو نابێ کەسێك کە ڕووناکبیرە کەسێك کە ئیعتیقادی بە ئازادیی بەیان هەیە تەوهین بە موقەدەساتی خەڵك بکا. بەلام پرسیارێك هەیە لێرەدا ئەویش ئەوەیە ئایا ئاخوندە قشری‌یەکان کە ئێستا رەخنە لە "سەلمان ڕوشدی" دەگرن‌و حوکمی ئیعدامی ئەو نووسەرەیان دەرکردوە، ئایا ئەوان خۆیان لە ئێرانی خۆماندا کەم تەوهینیان بە ژنی پێغەمبەر کردوە کە ئێستا دیفاعی لێ دەکەن. من لە منداڵی‌یەوە شتێکم لەبیرە خوشکەزایەکم هەبوو ناوی "عایشە" بوو. ئەو خوشکەزایەی منە ئەوەندە ئەزیەتیان دەدا لە شاری ورمێ بەتایبەتی ئەوانە کە گەورە بوون نە منداڵەکان، حەتا ئەوانەی کە ئاخووند بوون کە ناچار یا دەبوو ناوەکەی بگۆڕێ یا نەدەبوا قەت بێتە نێو شاری ورمێ. ئا ئەو هەموو تەوهینە کە بە خولەفای راشیدینیان دەکرد. جێژنیان ساز دەکرد بە ناوی جێژنی عومەر خۆ ئەوانە هەموو شەخسی خومەینیش دەبێ بیزانێ. زۆر کەس لە خزم‌و کەس‌و کارو دۆست‌و ئاشنای ئێمە کە دەهاتنە نێو شار یا دەچوونە شارەکانی دیکەی ئێران، ناوەکانیان ئەبووبەکرو عومەرو عوسمان بوو یا ناچار دەبوون شارەکان بەجێ بهێڵن‌و بگەڕێنەوە کوردستان یا ناوی خۆیان بگۆڕن. ڕەنگە هەموو کەس بیستبێتی کە بە دەیان عومەر ناوی خۆیان کردوە بە ئەمیر بۆ ئەوە تووشی نارەحەتی نەبن. باشە ئەوە تەوهین بە موقەدەسات نیە کەوابوو بە نەزەری من ئەم هەرایە بە مەبەستی دیفاع لە ئیسلام نیە. ڕەواڵەتەکەی ئەوەیە، بەلام ئەم هەرایە چەند هۆی تایبەتی هەیە کە پێم خۆش بوو باسیان بکەم.

یەکەم ئەوەیە: راستی ئەوەیە کە پایەکانی کۆماری ئیسلامی دەلەرزێ. خومەینی دەیهەوێ بەم هەرایەو ناردنی پەیام، یەکەم سەرنجی گەلانی ئێران بۆ مەسایلی دەرەوە

رابکێشیو ئەمە شتێکی تازە نیە، ئیمپراتورەکانی رووحی قەدیمیش زۆر جار ئەگەر تووشی بوحران دەبوون لە دەرەوەی وڵاتی خۆیان شەڕیان ساز دەکرد.

دووهەمیش: بەڵکو بەو قسانە بتوانێ پایەکانی رێژیمی خۆی سەقامگیر بکا. لە پاشان باڵی توندڕۆ لە مەسەلەی "سەلمان ڕوشدی" کەڵك وەردەگرێ بۆ ئەوە باڵی پراگماتیك بکوتێ کە لایەنگری فەزای ئازادەو لە چوارچێوەی کۆماری ئیسلامیدا پێوەندی گرتن لەگەڵ رۆژئاواو بەتایبەتی ئامریکا بە قازانجی وڵات دەزانێو ئەمە بەتایبەتی پاش ئاگربەس کە ئێران ئیحتیاجی بە بازسازی هەیەو ئیمکاناتی نیەو پوڵی نیەو پێویستی بەوە هەیە کە لە دەرەوەڕا یارمەتی بدەن. بەم شێوەیە باڵی توندڕەو تۆڵەی خۆی دەکاتەوە لە باڵی پراگماتیكو بۆ ماوەیەکی دیکە رێگا نادا کە ئەم باڵە پراگماتیکە لەگەڵ رۆژئاوا پێوەندی بگرێ یا مەسەلەن بەشی خسووسی تەقویەت بکا لە داخلی وڵاتدا یا فەزایەکی کەمێك باز لە چوارچێوەی کۆماری ئیسلامیدا بە وجود بێنێ لە پاشان بە ناوی وەحدەتی کەلیمە بەم شێوەیە خومەینی دەیهەوێ هەموو موخالیفینی، ئەوانەی بە شێوەیەکی دیکە فکر دەکەنەوە سەرکوت بکاو رێژیمی دیکتاتۆری توندو تیژ هەروا بەردەوام بێ. جاران بە ناوی شەخس ئەو کارەیان دەکرد، ئێستا بە ناوی دیفاع لە موقەدەساتی ئیسلام ئەو کارە دەکەن. راستییەکەی ئەوەیە کە خومەینی هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە کاری ئەوە بووە. وەختی خۆی بەرانبەر بە شۆڕشو جووڵانەوەی پانو بەرینی گەلی کورد ئیعلانی جیهادی داو ئەو شەڕەی ساز کرد کە ئێستاش هەر بەردەوامە. جا ئێستاش لە پەیامەکەیدا باسی تەجزیەتەڵەبانی کوردستان دەکا کە گۆیا رێگای نەدا کە ئەوان لە کاروباری وڵاتدا بەشدار بن. پاشان مەسەلەی گرەوگانەکانی، گرەوگانگیری لە سەفارەتی ئامریکای پێك هێنابوو بۆ ئەوە دیسان وەحدەتی کەلیمەو یەکپارچەیی رێژیم بپارێزێ. ئێستاش کە کەوتۆتە گێژاوو بوحرانەوە ئەو مەسەلەی "سەلمان ڕوشدی"یەی کردۆتە ئاڵا بۆ ئەوە بە خەیاڵی خۆی یەکپارچەییو یەکگرتوویی پێك بێنێ لە نێو ریزەکانی لایەنگرانی خۆیداو بەتایبەتی موخالیفینی سەرکوت بکا بۆ ماوەیەکی دیکە رێژیمەکەی بپارێزێ، بەڵام نەتیجەی ئەم کارە دەبێتە چی؟ نەتیجەی ئەم کارە دەبێتە ئەوە کە کۆماری ئیسلامی زیاتر تاكو تەریك دەکەوێتەوە، زیاتر لە وڵاتەکانی دنیا دوور دەکەوێتەوەو کەمترو زۆر سەختتر دەتوانێ گیروگرفتەکانی خۆی

چارەسەر بکا. لە دنیا بەتایبەتی لە بەرانبەر بە بیرو ڕای گشتی، پتر لە جاران ئابڕووی دەچێو بەڕاستی ئیدی بە چاوێکی زۆر سووکتر تەماشا دەکرێ کە تەنانەت لە ئینگلستان کابرایەك کتێبێکی نووسیوە بە پێچەوانەی مەنشووری نەتەوە یەکگرتوەکان لە ئێرانەوە حوکمی ئیعدامی بۆ دەردەکەنو هەر ئەوی ڕۆژیش ئەو حوکمە دەردەکرێ یا هەر لەو ڕۆژانەدا سەرۆك کۆماری ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی لەگەڵ دوو دەوڵەت لە ئورووپا بەیانیەی بڵێین هاوکاری ئیمزا دەکا کە لەوێدا گوتراوە کە کۆماری ئیسلامی تەعەهود دەدا لە کاروباری وڵاتانی دیکە دەس تێ وەرنەدا. لە پاشان بێگومان ناتەبایی‌یەکانی نێوخۆیی ڕێژیم توندتر دەبنو زیاتر بڵێم توندتر ڕێژیم بەرەو رووخان دەبەن، بەتایبەتی پاش خومەینی بێگومان ناکۆکی‌یەکان دەتەقێنەوەو وەزعێکی وا پێك دێ کە مەوجوودیەتی کۆماری ئیسلامی دەخرێتە مەترسی‌یەوە. من مەسەلەی پەیامی خومەینی‌و ئەو هەراو هوریایە کە لەسەری ساز کراوە، ئاوا تێ‌دەگەم لە عەینی وەختدا ئەو پەیامە سەرگەردانیی کاربەدەستانی ڕێژیم نیشان دەدا. لە کاتێکدا هەموو کەس دەزانێ کە لەو پەیامەدا خومەینی هەم لە بنی سەرۆك کۆماری خۆی خامنەیی داوە هەم هێرشی کردۆتە سەر مونتەزیری، هەم هێرشی کردۆتە سەر ڕەفسەنجانی. ئێستا ئەو ئاغایانە هەر وابزانە کە هیچ نەبووە هەموویان قسە دەکەنو پەیامی خومەینی وەك بەرنامەیەك بۆ کۆماری ئیسلامی، بۆ دواڕۆژی کۆماری ئیسلامی دادەنێنو هەر وابزانە کە ئەو پەیامە ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیی نەجات داوەو ئاسۆی روون کردۆتەوە بەم شێوەیە قسە لەسەر ئەو پەیامە دەکەنو پێموایە هەموو ئەوانە زۆر بەجوانی جارێکی دیکە نیشان دەدا کە ڕێژیم لە هەموو بارێکەوە لە بوحرانێکی یەکجار زۆر قووڵدایەو دەبێ چاوەڕوان بین کە نەتیجەی ئەو بوحرانە لە دواڕۆژدا زیاتر دەرکەوێ. بێگومان لەو بوحرانەشدا ڕێژیم تەنیا زەرەر دەکاو زەعیفترو کزتر دێتە دەر.

پ: باشە کاك دوکتور لەو وەزعە تا ڕادەیەك شپرزەیەی ڕێژیمدا یا لەم هەلومەرجە ناسکەدا کە ئێمە تێی‌داین ئەرکەکانمان چن، داهاتووی جووڵانەوەکەمان چۆن دەبینن، خەڵکی کوردستان بەگشتی‌و حیزبی ئێمە بەتایبەتی کە باری قورسی ئەم شۆڕشەی لەسەر شانە دەبێ چ بکەنو وەزیفەیان چیە؟

و: پاش ئاگربەس هێندێك کەس پێیان وابوو کە ساڵی ١٩٧٥ تکرار دەبێتەوە، ئەو کاتە لە کوردستانی عێراق ئاش بەتاڵ کرا. ئێمە هەر لە سەرەتاوە گوتمان کە ئەم وەزعە لە کوردستانی ئێراندا دووپات ناکرێتەوە. ئاش بەتاڵ بە خەیاڵی کەسدا نایەو خەبات هەر درێژەی دەبێ، رێژیم کزە، لە بوحراندایە کاربەدەستانی سەرگەردانن، ناتوانن بە شێوەی پێشوو حکوومەت بکەن. بۆیە بە نەزەری من ئاسۆ لە ساڵەکانی دیکە بۆ بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی ئێران روونترە. وەختی ئەوە هاتوە کە لەو دەرەتانە کە پێك‌هاتوە چالاکترو باشترو پانو بەرینتر کەڵك وەربگرین. ئەرکەکانمان چن؟ دیارە لە پێش هەمواندا دەبێ خەباتی خۆمان درێژە پێ بدەین، نیشان بدەین کە لە کوردستان هێزێکی سەربەخۆ، قایم لە مەیداندا بەرانبەر بە رێژیمی خومەینی راوەستاوین، نەك هەر ئەوە دەبێ زەربەی قورستر لە رێژیم بدەین عامیلی کورد وەك وەزنەیەکی گرینگ لە مەیدانی خەباتدا بەتەواوی دەردەخا. ئەرکی دووهەممان ئەوەیە کە هەروەها کە باسی کرا، مەسەلەی کورد، داخوازەکانی گەلی کورد لە دەرەوە بە باشی بناسێنین. لەو دەرەتانە کە پێك هاتوە زۆر بە چاکی کەڵك وەربگرین. بۆ ئەوە پشتیوانیی بیروڕای گشتیی جیهانی، رێکخراوە سیاسی‌یەکان، تەنانەت دەوڵەتەکانیش بۆ لای گەلی کورد رابکێشین ئەرکی سێهەممان ئەوەیە کە لەگەڵ هەموو هێزە دێموکراتی‌یەکانی ئێراندا بۆ دێموکراسیو ئاسایشو ئاشتی کە داوای ٩٠ لە ١٠٠ی دانیشتوانی ئێرانە، تێبکۆشین. هەولی خۆمان بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی پانو بەرین درێژە پێ بدەین، بەرەیەکی پانو بەرینی دێموکراسی پێك بێنین، کە بۆ پاش رێژیمی خومەینی ئاڵترناتیڤ بێ چونکە دەبێ دیسان تیکرار بکەمەوە کە بەداخەوە لە حاڵی ئێستادا ئێمە ئاڵترناتیڤمان بۆ رێژیم نیە، ئوپۆزیسیۆنی دێموکراتیك نەیتوانیوە ئاڵترناتیڤێکی ئەوتۆ پێك بێنێ کە دێموکراتیك بێ، کە بتوانێ پشتیوانیی زۆربەی زۆری گەلاتی ئێرانی بۆ لای خۆی رابکێشێ. ئەوانی دیکەش خارج لە ئوپۆزیسیۆنی دێموکراتیك کە هەروەها کە گوتوومە ئاڵترناتیڤی ئەوتۆیان نەبووە، کەوابوو لەو هەلومەرجە ناسکەدا، ئەرکی سەرشانمان قورسترە هەرچەند ئەرکی سەرشانمان قورسترە ئەوەندەش ئاسۆی خەبات روونترەو دەتوانم بڵێم کە من ئەمساڵ زۆر زیاتر لە ساڵانی پێشوو خۆشبینمو سەرکەوتن بە نێزیکتر دەبینم.

پ: پێم خۆش بوو پرسیارێکی دیکەش بکەم بەڵام لە راستی‌دا ئەو پرسیارە پێوەندی‌یەکی ئەوتۆی بە مەسەلەی ئێران‌و جووڵانەوەکەمانەوە نیە. دیارە ئەگەر ئیزنتان لەسەر بێ هەر وەك ئاگادارن لە رۆژنامەی کوردستان‌دا بەشێك بۆ تێکۆشانی حیزب لە دەرەوەی وڵات تەرخان کراوە، جا لەم بەشەی رۆژنامەی کوردستان ژمارەی ١٤٤دا باسی چاوپێکەوتنی ٤ ساعەتەتان لەگەڵ یاسر عەرەفات رێبەری رزگاریخوازی فەلەستین کراوە، دەکرێ بفەرموون داهاتووی فەلەستین چۆن دەبینن. ئایا رەوتی جووڵانەوەی فەلەستین کار دەکاتە سەر مەسەلەی کورد، مەبەستم ئەوەیە سەرکەوتنی گەلی فەلەستین قازانجی بۆ جووڵانەوەی کوردو مەسەلەی کورد بەگشتی هەیە یان نە؟

و: هەروەها کە پێشتر گوتت من چاوپێکەوتنێکی زۆر درێژم هەبوو لەگەڵ یاسر عەرەفات‌دا کە زۆر بە گەرمی وەری گرتم میوانداری‌یەکی زۆر گەرمیشی لێ کردم. دیارە یاسر عەرەفات دۆستێکی کۆنی ئێمەیە، ئێمە پێوەندیمان لەگەڵ گرت، ئامادە بوو کە لەسەر داخوازەکانی گەلی کورد لەگەڵ کاربەدەستانی رێژیم قسە بکا کە مافی خودموختاری بە رەسمی بناسن. بەڵام هەروەها کە ئەم جارە بۆخۆی گوتی، گوتی: "ئەمن بووم بە وەکیلی ئێوە بەڵام بەداخەوە وەکالەتەکەم سەرنەکەوت خەتاکەیش هی من نەبوو." بەڕاستیش خەتاکە هی وی نەبوو، ئێمە بۆخۆمان دەزانین کە لە دەرەوە خومەینی‌و رێژیمەکەی دۆستایەتی مووسادی دەس نەکەوت لەو چاوپێکەوتنەدا، ئێمە وەك هەموو جارێك پشتیوانیی خۆمان لە داخوازەکانی گەلی فەلەستین دەربڕی کە بریتی‌یە لە پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی فەلەستین لە خاکی فەلەستین‌دا لەم بارەشەوە حیزبی ئێمە لە سەرەتاوە سەربەخۆیی بووە ئەوەی کە ئێستا یاسر عەرەفات وەك نوێنەری بەرەی رزگاریخوازی فەلەستین دانا ئێمە لە ئەوەڵەوە هەر ئەوەمان گوتوەو پێمان وایە کە بەرەی رزگاریخوازی فەلەستین تاکە نوێنەری شەرعیی فەلەستینە. بۆ هەرکەس دەیهەوێ یا بیهەوێ ئاشتی پێك بێنێ لە خاکی فەلەستین‌دا دەبێ لەگەڵ نوێنەری ئەو میللەتە، میللەتی فەلەستین کە بەرەی رزگاریخوازی فەلەستین‌و یاسر عەرەفاتە قسە بکا. لەو باسەدا جارێکی دیکەش یاسر عەرەفات پشتیوانیی خۆی لە خەباتی رەوای گەلی کورد دەربڕی‌و نیشانی دا کە لە دوارۆژیش‌دا ئەو هەدەفە هەر درێژە پێ دەدا. دیارە ئەگەر ئاوا کە ئێمە ئاواتمانە گەلی فەلەستین سەرکەوێ لە چەند بارەوە جێگای خۆشحاڵی‌و هیوایە. یەکەم بۆ ئێمە ئوسوولەن کە

پێمان خۆشە وەك هەموو گەلێکی زۆرلێکراو کە گەلی فەلەستین سەرکەوێ‌و مافی دانانی چارەنووسی خۆی بەدەستەوە بگرێ، دەوڵەتی سەربەخۆی خۆشی دابنێ. دووهەم دیارە ئەو دەوڵەتە ئەگەر پێك بێ پێمان وایە قازانجی بۆ گەلی کوردیش هەیە، چونکە گەلی فەلەستین کە دەیان ساڵە خەبات دەکا بۆ مافی خۆی ئەگەر سەرکەوێ ئەوە بۆخۆی نموونەیەکە، سەرمەشقێکە بۆ ئێمە کە جێگای هەموو دەگرێ کە ئەوە بسەلمێنێ کە هەر نەتەوەیەك، هەر گەلێك لە خەبات بۆ مافی خۆی بەردەوام بێت ئاخرەکەی هەر سەر دەکەوێت. دووهەم بەرەی رزگاریخوازیی فەلەستین هاوشێوازی ئێمەیە هەم لە خەباتی دوورو درێژی خۆیدا کە نوێنەری گەلێکی زۆرلێکراوەو هەم ئەوە کە دۆستایەتی‌یەکی قووڵمان پێکەوە هەیە. بێگومان ئەگەر ئەم بەرەیە سەرکەوێ پشتیوانیی خۆی لە خەباتی ئێمە هەر درێژە پێ دەدا ئەگەر ئێستا بەرەیەك یا رێکخراوێك پشتیوانی ئێمەیە لە دوارۆژدا دەوڵەتێك پشتیوانی ئێمە دەبێ. سێهەم مەسەلەی کورد زەقتر دەبێ‌و زیاتر سەرنجی بیروڕای گشتیی وڵاتەکانی دیکە بۆ لای خۆی رادەکێشێ یانی بەرەبەرە دەبێتە مەسەلەی هەرە گرنگی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست، جا بۆیە ئێمە لە هەموو بارێکەوە پێمان خۆشە گەلی فەلەستین لە خەباتی خۆیدا سەرکەوێ. بە هەموو هێزمانەوە پشتیوانی لە ئنتفازەی گەلی فەلەستین دەکەین‌و هیواداریشین کە هەرچی زووتر ئەم گەلە بە ئاواتی خۆی بگا. ئێستاش وەزعەکە لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا گۆڕاوە. ئیسرائیل بەرەبەرە تاق‌و تەریك دەکەوێتەوەو لە دوارۆژدا هیچ رێگای نیە بێجگە لەوەی کە دابنیشێ یا لە کۆنفرانسێکی نێونەتەوەییدا یان راستەوخۆ لەگەڵ فەلەستینی‌یەکان ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکا. بە هیوای ئەو رۆژە.

پ: زۆر سپاس کاك دوکتور لە کۆتایی وتووێژەکەماندا ئەگەر پەیامێکت هەیە یان مەسەلەیەکی دیکە هەیە باسمان نەکردبێت فەرموو.

و: پەیامێکی ئەوتۆم نیە تازە پەیامم ناردوە. زۆر سپاسی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران دەکەم داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەم‌و داوای خۆشی‌و سەرکەوتن‌و ئازادی‌و دیموکراسی‌و خودموختاری بۆ هاونیشتمانانی خۆشەویست دەکەم.

## سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی*

سیاسەتی دەرەوەی هەموو ولاتێك، رەنگدانەوەیەکە لە سیاسەتی نێوخۆی ئەو ولاتە. حکومەتی کۆماری ئیسلامی لەگەلْ هەموو تایبەتمەندیەکانی خۆی پێڕەوی ئەم ئەسلەیە. رێژیمی خومەینی لە نێوخۆی ولاتدا تووشی بوحرانێکی قوولی هەمەلایەنەیەو بۆ چارەسەرکردنی ئەم بوحرانە کە تەواوی لەشی ئەم رێژیمەی داگرتوە، ئاخوندە کاربەدەستەکان نە بەرنامەیەکی روونیان هەیە نە ئامرازێکی پێویست. تازە ئەگەر بەدەگمەن ئەم دوو مەرجە کۆ ببێتەوە چوارچێوەی حکومەتداریی ویلایەتی فەقیهی خۆی کۆسپی هەرە گەورەیە لەسەر لابردنی بوحران، واتە جەوهەری کۆماری ئیسلامی بوحران خولقێنەرەو ژیانی خۆی بە ئاژاوەو دروستکردنی شەڕو کێشە درێژە پیْدەدا. لە کۆنەوە باو بووە ئەگەر حوکمدارەکان لە نێوخۆی ولاتدا تووشی تەنگو چەلّەمە دەبوون نەك بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتەکان، بەلّکوو بۆ خۆرزگار کردن لە تەنگانە، هەولّیان دەدا کێشەیەك، ئاژاوەیەکو شەڕێك لە دەرەوەی ولات ساز بکەن، بەم شێوەیە هەم سەرنجی خەلّکی ولاتی خۆیانیان بۆ دەرەوە رادەکێشا بۆ ئەوە گیروگرفتە نێوخۆیەکانی ولات لەبیر بەرنەوەو هەم بە ناوی یەکیەتیو دیفاع لە نیشتمان، سەرپۆشیان لە سەر ناتەبایی‌یەکانی نێوخۆی ولات دادەناو بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ حاکمیەتی خۆیانیان چەسپاوتر دەکردو مەترسی تێکڕوخانی ولاتی خۆیان دوور دەخستەوە. دەبیْ دان بەوەدا بنێین کە کارگێڕانی کۆماری ئیسلامیو لە هەمووان زیاتر شەخسی خومەینی لە بەکارهێنانی ئەم شێوەیەدا دەستێکی بالایان

---

* ٢٤ی خاکەلێوەی ١٣٦٨ی هەتاوی

هەیە. لە سەرەتای دەسەڵاتداریی ئاخوندەکانەوە شاهیدی چەندین نمونەی بەکارهێنانی سیاسەتی شوێنەونکە بوین. بەردەوام کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی، بە ناو تەوتەئە هەرچی‌یەکیان کەشف دەکرد بەقسەی ئەوان دەستی وڵاتانی دەرەوەی تێدابوو. دیفاعی گەلی زۆرلێکراوی کورد لە مافی نەتەوەیی‌و ئینسانیی خۆی بە تەوتەئەی ئیستکباری جیهان دانرا بۆ ئەوەی دەیان هەزار لاوی بێ ئەزمونی نائاگا بۆ سەرکوت کردنی جوڵانەوەی کوردستان بەسیج بکرێن، باڵوێزخانەی ئەمریکا بە پێچەوانەی هەموو دابو شوێنێکی پێوەندیەکانی نێودەوڵەتی، داگیر کرا بۆ ئەوە لە ژێر دروشمی "مرگ بر آمریکا" سەرکوت کردنی موخالیفان لە تارانو شارە گەورەکان دەست پێبکەنو شەڕ دژی عێراق بوو بە ئاتۆیەکی بێوێنە بۆ لەنێوبردنی دوا شوێنەواری ئازادی لە سەرانسەری ئێراندا. ڕێژیمی سەرەڕۆیی‌و نەزمی ڕەش‌و کۆنەپەرستی سەدەکانی نێوەڕاست. ماوەی هەشت ساڵی تەواو هەر بزووتنەوەو **داخوازێکی** کۆمەڵایەتی خەڵك بە ناوی ئەوە کە یەکەم ئەرك شەڕەو **هیچی دیکە، بە گوللە** وەڵام دەداوە. لە چەند مانگی پاش قبوولکردنی ئاگربەس‌دا **کە بوحرانی** نێوخۆیی وڵات هەرچی دەڕۆی توندتر دەبوو بەتایبەتی ناتەبایی‌و کێشە **لە نێو** کاربەدەستانی ڕێژیم‌دا پەرەی دەگرت، خومەینی بڵاو بوونەوەی کتێبی "سەلمان روشدی" بە کوفری ئیلاهی دانا، هەرچی توانی ئەم ڕوداوەی گرینگتر کردو ئالۆزیەکی نەدیتراوی لە پەیوەندیەکانی نێونەتەوەیی پێکهێنا، ئاکامی ئەو کارە تێکدانی پێوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ ئینگلستانو تێکدانی پێوەندی سیاسی‌و ئابووری لەگەڵ زۆربەی وڵاتانی سەنعەتی‌و پێشکەوتووی ڕۆژئاوادا بوو. خومەینی کە دەیهەویست بوحرانەکە بۆ دەرەوە سادر بکا، دەسکەوتی پێچەوانە بوو. هەوڵو تێکۆشانی بەشێك لە کارگێڕانی کۆماری ئیسلامی کە خەریك بوون ئێران لە تاكو تەریك کەوتنەوە دەرباز بکەن، بۆ بازسازی وڵاتو لە تەنگانە دەرهێنانی ئابووریەکی شپرزە لەگەڵ وڵاتانی ئورووپای ڕۆژئاوا پێوەندی دابمەزرێنن، پوچەڵ مانەوەو ئێران لەجاران زیاتر تاكو تەریك کەوتەوەو لە لای هەموو کۆڕو کۆمەڵو ئینسانێکی ئازادیخواز بە ڕێژیمێکی دڕندەو دوژمنی ئادەمیزاد ناسرا. فتوای کوشتنی "سەلمان روشدی" لە نێوخۆی وڵاتیش‌دا هیچ دەردێکی دەرمان نەکرد. ناکۆکی‌و ناڕێکی بوو بە هۆی لابردنی "منتظری" کە چەندین ساڵ بوو بە ڕەسمی بە جێ نشینی خومەینی ناسرا بوو، بە

پێی نوسراوەی رۆژنامەی ئیتلاعاتی سەر بە رێژیم، خومەینی جارێکی دیکە ناچار بوو ژەهر بخواتەوە. بەلاّم خۆی ئەم کارە ناتەبایی‌و کێشەی نێوخۆی رێژیمی تیژ کردو لە نێو جەرگی رێبەرایەتی رێژیم واتە ئاخوندە گەورەکان، کە لە مەدرەسەکانی دینیی قوم‌و مەشهەدن، دووبەرەکیەکی قووڵی پێکهێنا. خومەینی دیسان لە تەنگانە دایە. هەراو هوریای سەلمان روشدی خەریکە خەلاّس دەبیّ، پێویستە بیانویەکی دیکە بدۆزێتەوە. رووداوەکانی دوو وڵاتی رۆژهەلاّتی نێوەڕاست وەك تورکیەو لوبنان بۆ ئەو ولاّتە دەرەتانێکی باشیان پێکهێناوە. ئاخوندە دەسەلاّتدارەکان لەپێشدا لەگەلّ دەوڵەتی تورکیە دەستەبەیەخە بوون. پاش کێشەیەکی زۆر دادگایەکی بەرزی تورکیە کە حکومەتێکی لاییك واتە غیرە مەزهەبی هەیە، بڕیاری دا کە کچان ناتوانن بە چادرو جلوبەرگی بەناو ئیسلامی‌یەوە بچن بۆ دانشگا. رێژیمی خومەینی کە لە مێژە خەریکی سازکردنی ئاژاوە لەم ولاّتەیە، ئەم روداوەی بۆ هەلّکەوت‌و هەراو هوریایەکی توندی تەبلیغاتی دژی تورکیە دەست پێکرد. دیسان خودی خومەینی هاتە مەیدان‌و هێرشی کردە سەر سیاسەتی غەیرە مەزهەبیی دەولّەتی تورکیە. بەلاّم حکومەتی ئانکارا کە لە سالاّنی رابردوودا بەرامبەر بە ئاژاوەگێڕیی کۆماری ئیسلامی بێدەنگ ببوو ئەم جارە بە توندی بەرامبەر بە ئاخوندەکان راوەستاو دەست تێوەردانی لە کاروباری تورکیەدا، مەحکوم کرد. هەرچەندە لە سەرەتاوە وا دەهاتە بەرچاوی خومەینی کە خەریکە گیروگرفتی دیکە وەك هی سەلمان روشدی ساز بکەن، بەلاّم قایم راوەستانی تورکیە لە لایێك‌و نالەبار نەبونی وەزعیەتی نێونەتەوەیی لەلایەکی دیکەوە کارگێڕانی کۆماری ئیسلامیی ناچار بە پاشەکشە کردو ئاخوندەکان وایان بە باش زانی جاریّ کێشەی خۆیان لەگەلّ تورکیە، زۆر پەرە پیّ نەدەن. لوبنان بە هەلومەرجی ئالّۆزیەوە چەندین سالّە بەردەوام مەیدانێکی خودادادی‌یە بۆ ئاژاوەگێڕانی کۆماری ئیسلامی. ئاخوندەکان بۆ سادر کردنی شۆڕشی ئیسلامی بۆ لوبنان هەتا ئێستا سەدان ملیۆن دولاریان لە دارایی خەلّکی بیّ‌بەشی ئێران خەرج کردوە. بە بلاّوکردنەوەی دراوو کەلّکوەرگرتن لە هەستی مەزهەبیی بەشێك لە لاوانی شیعەی لوبنان، توانیویانە لەو ولاّتە پۆلی چەکداری حیزبوللاّهی ساز بکەن کە بۆ شەڕ لەگەلّ موخالیفینی کۆماری ئیسلامی یا بۆ بارمەتەگرتنی بیانیەکان بەکاریان دێنن. ئێستاش کۆماری ئیسلامی شەڕی دوبارەی نێوان مەسیحیەکان‌و موسلّمانەکانی بە

دەرفەت زانیوە بۆ ئەوەی مەسەلەی دیفاع لە موسڵمانەکانی لوبنان بێنێتە گۆڕێو ماوەیەکیش کۆمەڵانی خەڵکی ئێران بە گیروگرفتی لوبنانەوە مەشغوڵ بکا. زۆر ئیحتیمالی هەیە ئەم جارەش هەراو هوریای دەزگا تەبلیغاتیەکانی ڕێژیمی خومەینی زۆر سەرکەوتوو نەبن‌و سەرنجێکی ئەوتۆیان نەدرێتێ. ئاکامی گشتی‌و دوایی هەموو ئەو کردەوانە بە زیانی ڕێژیمی خومەینی‌یە. لە نێو دراوسێیەکانی خۆی‌دا کۆماری ئیسلامی تەنانەت یەك دەوڵەتی دۆستی نیە. لە باشترین حاڵەتدا ئەگەر لەگەڵ دراوسێیەکی لە گێرەو کێشەدا دوژمنایەتی ئاشکرای لەگەڵ ناکا. کۆماری ئیسلامی ئەمڕۆ لە مەیدانی نێونەتەوەیی‌دا ئەوەندە تاكو تەریك کەوتۆتەوە کە نە لەمێژووی ئێران نمونەی هەیەو نە لە جیهانی ئەمڕۆدا بە سەر هیچ وڵاتێکی دیکەدا هاتوە. ئەگەر لە نێوخۆی وڵاتدا ڕێژیمی خومەینی لە کۆمەڵانی خەڵك دوور کەوتۆتەوە، پشتیوانێکی ئەوتۆی لە نێوخۆی وڵاتدا نەماوە پەنای بردۆتە بەر سیاسەتی سەرکوتکردن‌و سەرەڕۆیی، لە دەرەوەی وڵاتیش‌دا دۆستو هاوپەیمانی نیەو بە تاقو تەنیا ماوەتەوە. ئەگەر ڕێژیم لە سیاسەتی نێو خۆی وڵات لە بن‌بەست دایە، ئێستا سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامیش کەوتۆتە گێژاوێك کە دەربازبوونی لێ دژوارە بەتایبەتی کە شەخسی خومەینی زیندوویەو ئەگەر دەرەتانێکی ئەوتۆش پێك بێ بە یەك پەیامو یەك فتوا پوچەڵی دەکاتەوە. بەڕاستی سیاسەتی دەرەوەی ڕێژیمی خومەینی ڕەنگدانەوەی سیاسەتی نێوخۆیەتی. ئەم سیاسەتە نەزانانەیە بۆتە هۆی کز بوونی پەیوەندی سیاسی‌و ئابووری ڕێژیم ئاڵۆزترو شپرزتر دەکا. بۆ دەربازبوون لە ئاڵۆزی‌و بوحران هەر نەبێ بۆ ماوەیەکی کورت خومەینی‌و لایەنگرانی ناچارن دیسان ئەم بوحرانە بۆ دەرەوە سادر بکەن کە پاش ماوەیەکی کەم دیسان دە گەڕێتەوەو هەلومەرجی بوحرانی نێوخۆی ڕێژیم بوحرانی‌تر دەکا. گێژاوێك کە ڕێژیمی خومەینی بە دەستی خۆی، خۆی تێ‌خستوە هەتا ئەم سیاسەتەی بەردەوام بێ، ڕزگاربوونی لەم گێژاوەیە بەدی ناکرێ.

# ڕێژیمی خومەینیو ڕێکخراوە نێونەتەوەیی‌یەکان

هەڵوێستی ڕێژیمی خومەینی بەرامبەر بە ڕێکخراوە نێونەتەوەیی‌یەکانی دەوڵەتیو بەشەردۆست نیشانەیەکی دیکەی سیاسەتی سەرەڕۆو پڕ لە ناتەبایی کۆماری ئیسلامی‌یە. هەتا ئێستا چەند جار ئەم هەڵوێستە بەرامبەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، شوورای ئەمنییەت، خاچی سووری جیهانیو ئەمنێستی ئینترناشناڵ گۆڕاوە.

ئەگەر کومیسیۆنی دیفاع لە مافی ئادەمیزادی نەتەوە یەکگرتووەکان، باسی پێشێلکردنی مافی گەلانی ئێران بکا، ئەم ڕێکخراوە بەکرێگیراوو نۆکەری شەرقو غەربە، بەلاّم ئەگەر سکرتێری ئەم ڕێکخراوە قسەیەك بە قازانجی کۆماری ئیسلامی بکا، نەتەوە یەکگرتووکان دەبێتە ڕێکخراوێکی واقیعبێن ونوێنەری نەتەوەکانی جیهان.

ئەگەر خاچی سوور بێزاری خۆی لە کوشتنی دیلەکانی شەڕی عێراق لە ئێران دەربڕێ، ئەوە خۆی بە ئیمپریالیزمی خەبەری فرۆشتوە، هەر لە بناغەشەوە بۆ ئەوە پێکهاتووە کە دژایەتیی ئیسلام بکا. بەلاّم ئەگەر هەمان خاچی سوور بە ئاکاری کاربەدەستانی عێراق سەبارەت بە دیلەکانی شەڕی ئێران لە عێراق ئیعتراز بکا، ئەوە ڕێکخراوێکی بەشەردۆستی نێونەتەوەیی جێی ڕێزو حورمەتە. ئەگەر شارێکی ئێرانیش لە لایەن فرۆکەکانی عێراقی‌یەوە بۆمباران بکرێن دەبێ خاچی سوور نوێنەری خۆی بۆ ئەم شارە بنێرێو کردەوەی عێراق مەحکووم بکا.

ئەمنێستی نێونەتەوەیی کە دیفاع لە هەموو زیندانی‌یەکانی جیهان دەکا، ئەگەر باسی ئازارو ئەشکەنجەی دەیان هەزار زیندانی لە زیندانەکانی کۆماری ئیسلامی بکا، ئەوە بەکرێگیراوی ئیمپریالیزمی جیهانیو خەبەری‌یە. ئەگەر دژی دادگاکانی فەرمایشیو ئیعدامی بێ‌موحاکەمەی سەدان ڕۆڵەی گەلانی ئێران دەنگی خۆی بەرز بکاتەوە، ئەوە ریکخراوێکی دەستکردی دوژمنانی ئیسلامەو هاواری قسەکەرانی کۆماری ئیسلامی دژی ئەم ڕێکخراوە دەچێتە ئاسمان.

بەڵام ئەگەر ئەمنێستی باسی زیندانی‌یەك لە ئەفغانستان، عێراق، میسر، یەکیەتیی سۆڤیەتی بکا، ئەوە ڕێکخراوێکی بەشەردۆستەو بۆ ئازادیی زیندانیان خەبات دەکا.

ئەگەر شوورای ئەمنییەت دژی عێراق بوەستێو عێراق مەحکووم بکا، ئەوە ڕێکخراوێکی زۆر باشەو بە مەبەستی پاراستنی ئاشتیو ئاسایشی جیهانە. بەڵام ئەگەر هەر ئەو شوورای ئەمنییەتە دەستدرێژیی کۆماری ئیسلامی بۆ سەر عێراق مەحکووم بکاو بێزاریی خۆی لە سیاسەتی شەڕخوازانەی کاربەدەستانی ڕێژیم دەربڕێ، ئەوە شوورای ئەمنییەت ئالەتی دەستی ئیمپریالیزمەو لە ژێر نفووزی شەرقو غەرب دایەو خزمەت بە دوژمنانی ئیسلام دەکا.

ئەوە چەند ڕۆژە دەزگای تەبلیغاتیی ڕێژیمی خومەینی کە دەیزانی شوورای ئەمنییەت خەریکە لە سەر دەستدرێژی ئێران بۆ سەر عێراق بڕیار دەدا، دووپاتی کردەوە کە ئەم شوورایە ئەزمونێکی گەورەی لە پێشە. مەبەستیشی ئەوە بوو ئەگەر شوورای ئەمنییەت عێراق مەحکووم بکا ئەوە بە باشی لەو ئەزموونە دەرچووەو ئەگەر کۆماری ئیسلامیش مەحکووم بکا ئەوە دژی گەلانەو لە ئەزموون دەرنەچووە.

ئێستا شوورای ئەمنییەت بێ‌ئەوەی ناوی ئێرانو عێراق بەرێ دەستدرێژی هەر کام بۆ خاکی وڵاتەکەی دیکەی مەحکووم کردووە، داواشی کردووە هەر دوو وڵات دەست بەجێ شەڕەکە بوەستێننو بکشێنەوە پشتی سنوورەکانی خۆیان.

بەڵام دیسان خامنەیی‌و ڕەفسەنجانی سیاسەتی پڕ لە ناتەبایی کۆماری ئیسلامی دووپات دەکەنەوە، دەڵێن شوورای ئەمنییەت دەبوا عێراق بە ناو مەحکووم بکاو لە باتی مەحکووم کردنی دەستدرێژی کۆماری ئیسلامی بۆ خاکی عێراق دەبووا بێزاری خۆی لە خستنی فڕوکەی ئاخوندەکان کە بۆ جەبهە دەچون، نیشان بدا. ئەوەش یەکێك

لە تاکتیکەکانی کاربەدەستانی ڕێژیمە کە هەموو کاتێك هەوڵ دەدن مەسەلەی سەرەکی لە بن مەسەلەی لاوەکی‌دا بشارنەوە. شوورای ئەمنییەت باسی دەستدرێژی ئێران بۆ خاکی عێراق دەکا کە ئێستا هەموو ناوچەی خەلیجی خستۆتە مەترسییەوە، بەڵام خامنەیی پێی خۆشە شوورای ئەمنییەت باسی ئەم مەسەلە گرینگە نەکا، بەڵکوو باسی کەوتنی یەك فڕۆکەو مردنی چەند ئاخوند بکا.

سەیر ئەوەیە کە کاربەدەستانی ڕێژیمی خومەینی بەشی سەرەکیی بڕیاری شوورای ئەمنییەتیان خستۆتە پشت گوێ کە داوا دەکا دەست بەجێ شەڕ بوەستێ‌و هەر دوو لا بکشێنەوە بۆ پشت سنوورەکانی خۆیان‌و هەر باسی ئەو بەشەی دەکەن کە بێ ئەوە ناوی وڵاتێك بەرێ، دەستدرێژی بۆ خاکی یەکتری مەحکووم کردووە. کەواتە شوورای ئەمنییەت بۆ کۆماری ئیسلامی باشە، چونکە لە بەشێك‌دا زمنی عێراقیشی مەحکووم کردووە، بەڵام هەر ئەو شوورایە لە ژێر نفووزی ئیستیکباری جیهانی دایە چونکە داوای وەستاندنی شەڕ دەکا.

ڕێژیمی خومەینی پێی‌وایە کە ڕێکخراوە نێونەتەوەیی‌یەکان دەبێ لە خزمەتی سیاسەتی کۆماری ئیسلامی‌دا بن. هەر ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی، بەشەردۆست یا دەوڵەتی ئەگەر لە خەتی ئیمام‌دا بوو ڕێکخراوێکی باشە، دەنا دوژمنی ئیسلام‌و بەشەریەتە.

ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی ئەوەی بۆ خۆی ڕەوا دەبینێ بۆ خەڵکی دیکە ڕەوا نابینێ. لە مەیدانی سیاسەتی نێونەتەوەیی‌دا دیفاع لە ئازادی‌و دێموکراسی دەکا بەڵام لە ئێران بە هەموو هێزی‌یەوەو بە دڕندەترین شێوە ئازادی‌یە دێموکراتی‌یەکان پێشێل دەکاو ئازادیخوازان سەرکوت دەکا. لە مافی چارەنووسی گەلان لە سریلانکاوە تا ئەلسالوادۆر دیفاع دەکا، بەڵام حەوت ساڵە شەڕێکی خوێناوی دژی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بەڕێوە دەبا، دیفاع لە ئازادیی بیروباوەڕ لە هەموو وڵاتانی جیهان دەکا، بەڵام نەك هەر بیروباوەڕی دژی خۆی بەڵکو بیروباوەڕی جیاواز لە هی خۆشی دەکوتێ.

بە کورتی ئەو ڕێژیمە سیاسەتێکی هەیە بۆ تەبلیغات لە دەرەوەی وڵات‌و سیاسەتێکی بە کردەوەشی هەیە دژی خەڵکی ئێران لە نێوخۆی وڵات. لە دەرەوەی وڵات بە قسە ئازادیخوازو بەشەردۆستە، لە نێوخۆی وڵاتیش بە کردەوە دوژمنی

ئازادیو ئینسانییەتە، بەلاّم نەك هەر لە نێوخۆی ئێران بەڵکوو لە دەرەوەش دژیگەلی دژی ئینسانیی ڕێژیمی خومەینی ناسراوە. ڕێژیمی خومەینی لە دەرەوە بە ڕێژیمێکی بێمەسئوولییەت، ئاژاوەگێڕو تیرۆریست دەناسن کە بۆ هیچ قانوونو ڕێوڕەسمێکی نێونەتەوەیی ڕێزو ئیحترامی نیە. ئەم ڕێژیمە چ بڕیارەکانی ڕێکخراوەکانی نێونەتەوەیی دەوڵەتیو بەشەردۆست قبوول بکا، چ دژیان ڕابوەستێ، لە مەیدانی سیاسەتی جیهانیدا لە لایەن بیروڕای گشتیو هەموو ڕێکخراوێکی ئازادیخوازو بەشەردۆستو هەموو ئینسانێکی بەشەرەف مەحکوومە.

## فەسڵی سێهەم:

# هێندێك لەو باسانەی كە دوكتور قاسملوو لە كۆنگرەی پێنجەمی حیزبدا پێشكەشی كردوون

- خەباتی هێزی پێشمەرگە
- تێكۆشانی تەشكیلاتی
- تێكۆشانی تەبلیغاتی
- كاروباری كۆمەڵایەتی

## خەباتی هێزی پێشمەرگە

**خوشك‌و برا بەڕێزەکان!**

پێویستی بە دووپاتکردنەوە نیە کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە بزووتنەوەی میللی دێموکراتیکی ئێستای گەلی کورددا نەخشێکی گرنگ‌و لە بەربەرەکانێ‌و بەرپەرچدانەوەی پەلاماری هێزە سەرکوتکەرەکانی رێژیمدا نەخشی ئەساسیی هەیە. ئەگەر بمانەوێ هۆیەکانی بنەڕەتیی سەرکەوتن لە خەباتی رزگاریخوازانەی ئەمڕۆی گەلەکەماندا لێك بدەینەوە، دەتوانین سێ هۆی ئەساسی دەستنیشان بکەین: یەکەم سیاسەتی دروست‌و ئوسوولیی حیزبەکەمان کە دەرکەوتوە لەسەر یەك لەگەڵ پێویستی‌یەکانی هەلومەرجی ئێستای خەباتی گەلەکەمان رێك دەکەوێ‌و دەتوانێ کۆمەلانی خەڵکی کوردستان بۆ لای خۆی رابکێشێ. دووهەم پشتیوانیی بێ‌دریغ‌و هەموو لایەنی خەڵکی کوردستان لە سیاسەت‌و دروشمەکانی حیزب‌و سێهەم فیداکاری‌و گیانبازیی رۆڵە لەخۆ بوردوەکانی گەلی کورد کە لە ریزەکانی پێشمەرگەدا تفەنگ لەسەرشان‌و گیان لەسەر دەست بەرامبەر بە دوژمن راوەستاون.

پێشمەرگە ئەو ئینسانە واقعی‌یەیە کە لە پێناوی بەختیاری‌و رزگاری گەل‌و نیشتمانی‌دا لە هەموو خۆشی‌و ئاسوودەیی‌یەکی ژیان گوزەراوە‌و لە زستانی سارد‌و هاوینی گەرمدا دوور لە ماڵ‌و منداڵ‌و کەسوکاری لە سەنگەری شەرەف‌و پیاوەتی‌دا ژیان بەسەر دەبا. پێشمەرگە ئەو رۆڵە بەئەمەگەی خەڵکە کە هەموو سەرمایەی ژیانی بە سەخاوەتەوە لە خزمەتی ئامانجەکانی گەل‌دا وەکار خستوە، بێ ئەوەی لەو رێگایەدا چاوی لە حقووق‌و پاداش‌و تەنانەت سوپاسێکیش بێ. پێشمەرگە گلێنەی

چاوی گەلی کوردو جێگەی هیواو هومێدی حیزبی دێموکراتــی کوردســتانی ئێرانــە، هەربۆیە زۆر شتێکی سروشتی‌یە کە خەڵکی کوردستان هەموو ئیمکاناتی خۆیـان لـە خزمەتی پێشمەرگە داناوەو حیزبی ئێمەش بەلانی کەمەوە سەدی هەشتای ئیمکاناتی ماڵی خۆی بۆ ڕێکوپێککردنی کاروباری پێشمەرگە وەکار خستوە.

لێرەدا زۆر بە پێویسـت دەزانـین جـارێکی دیکـە سوپاسـی گـەرمی خۆمـان لـە قارەمانەتی‌و گیانبازیی پێشمەرگە خۆشەویستەکان دەربڕین‌و سەرکەوتن‌و لەشساغی‌و بەختەوەری زیاتریان بۆ بە ئاوات بخوازین. هەر بـەو بۆنەشـەوە جێگـای خۆیـەتی لـە هێزی یارمەتیدەری پێشمەرگە، هێزی کۆمەکی‌و پشتی جەبهە، واتە هێزی بــەرگریی میللی پڕ بە دڵ سوپاس بکەین. لە شەڕەکانی کوردستاندا هێزی بەرگریی میللی نەك هەر لە پشتی جەبهەوە یارمەتی پێشمەرگەی داوە، بەڵکوو لە زۆربـەی مەیدانـەکانی شەڕدا لە ریزی هەرە پێشەوەی جەبهەدا شانبەشانی پێشمەرگە لە سەنگەری دیفاع لە ئازادی‌و ئینسانیەتدا لێوەشاوەیی خۆی نیشان داوە.

جێگای شانازی‌یە کە ئەمڕۆ خەڵکی ئـێران بـەچاوی رێـزو قەدرزانینـەوە سـەیری خەڵکی خەباتکەری کوردستان‌و پێشمەرگە بەجەرگەکانی کورد دەکەن. ئەوە خـەڵکی کوردسـتان‌و پێشـمەرگە فیداکارەکـان بـوون کـە یەکـەمجار بەرامبـەر بـە هێرشـــی چەنگیزانەی دەوڵەتی بـەناو ئیسـلامی راوەسـتاون‌و هـەتا ئاوەدانبوونـەوەی هـەموو سـەنگەرەکانی دیکـەی دژی کۆنەپەرسـتی لـە ئـێراندا ئـالای خـەباتی دژی ئیمپریالیستی‌یان بـەرز راگـرت. حکوومـەتی دژی گـەلیی خومـەینی لـە هـەموو ناوچەکانی ئێران هێرشی بردە سەر ماف‌و ئازادی‌یەکانی خەڵك‌و بەبێ بەزەیی پێشێلی کردن. تەنیا لە کوردستان بوو کە لووتی وەچیای سەخت‌و لای بێچـوە شـێرانی کـورد کەوت‌و ناچار بوو پاشەکشـە بکـا. ئـەوە شـانازی‌یەکی زۆر گـەورەی گـەلی کـوردو پێشمەرگەکانی کوردستانەو هیوادارین ئەو شانازی‌یە لە دوارۆژیشدا بـە فیداکـاری‌و لێوەشاوەیی پێشمەرگە قارەمانەکان بپارێزرێ.

شتێکی کە بۆ هەمووومان جێگای دڵخۆشی‌یە ئەوەیە کـە لـە مـاوەی نێـوان دوو کونگرەدا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان لــەبارەی چـەندی‌و چۆنی‌یـەوە بـەرەو پێش چووەو گۆڕانی گرنگی بەسەردا هاتووە. پێشمەرگەکان هـەم لـە کلاسـەکانی دەرس‌و هەم لە تاقیکردنەوەی خۆیان زۆر دەرسی بەنرخ فێر بوون کە لە خـەبات‌و تێکۆشـانی

خۆیاندا کەڵکیان لـێوەرگرتوون. لـەباری هونـەرەکانی شـەڕو یارمـەتی گـەیاندنو پەلامارو پاشەکشەو ئاگاداری، واتە (اطلاعات)و تەدارۆکاتەوە کاروبـاری هێزەکـانی پێشمەرگە زۆر پێش کەوتووو زۆر کەموکوڕی لەنێو چوون. بـەڵام بـۆ ئـەوەی هـێزی پێشمەرگە هەروا بەرەو پێش بڕواو لە دوارۆژدا باشتر بتوانێ ئەرکەکانی خـۆی بـەجێ بگەیەنێ، پێویستە زیاترو باشتر لە کاروباری پێشمەرگە ورد بینەوە، ناتەواوی‌یەکانی دەستنیشان بکەینو ڕێگای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی بدۆزینەوە.

پێش هەموو شتێك دەبێ نێوەڕۆکی ئەو شەڕە کە پێشمەرگەی کوردستان دەیکـا، دیاری بکرێ. نابـێ لـەبیرمان بچـێ کـە پێشـمەرگە لـە پێنـاو وەدەسـتهێنانی ئـەو ئامانجانەی گەلی کورددا خەبات دەکا کە دوژمنانی ئـازادی بەئاشـتی حـازر نـەبوون قەبووڵیان بکەنو بۆ سەرکوتکردنی داخوازی‌یەکانی گەلی کورد پـەلاماریان هێنـاوەو شەڕیان بەسەر خەڵکی کوردستاندا سەپاندوە. کەوابوو شـەڕی پێشـمەرگە شـەڕە بـۆ دیفاع لە ئازادی، شەڕە لە پێناو مافێکی ڕەواداو لە ئاکـامدا شـەڕە بـۆ گەیشـتن بـە ئاشتی‌یەکی سەربەرزانەو عادڵانە.

لەبارەی شێوەی شەڕەوە، نابێ لەبیرمان بچـێ کـە هەرچـەند ئێسـتا لـە زۆربـەی ناوچەکاندا پێشمەرگەی کوردستان بەرامبەر بە هێزی سەرکوتکەری دوژمن سەنگەری گرتوەو ناهێڵێ بستێك بێتە پێش، بەڵام بـە چەشـنی ئوسـووڵی، شـێوەی ئەساسـیی شەڕی ئێمە شـێوەی شـەڕی پارتیزانی‌یـە. شـەڕی پـارتیزانیش قـانوونو ڕێوشـوێنی تایبەتیی خۆی هەیە کە بە خۆشی‌یەوە پێشمەرگەکانی کوردسـتان ڕۆژ بـە ڕۆژ باشـتر ئەو ڕێوشوێنانە فێر دەبنو بە کاریان دەبەنو پێویست نیە لێرەدا باسیان بکەین. بەڵام پێمان وایە باشە لەو بارەوە هێندێ مەسەلەی گرنگ بێنینە گۆڕێ.

لە شەڕی پارتیزانی‌دا کـە شـێوەی بەربـەرکانی گـەلێکی کـەم دەرەتـان لـە دژی ئەرتەشێکی پۆشتەو پەرداخی دەوڵەتی‌یە، پشـتیوانو تەکیـەگای ئەسـڵی پـارتیزان، کۆمەڵانی خەڵکن. هەر لەبەر ئەوەش پێویستە پارتیزانەکان بە بەرزکردنـەوەی پلـەی تێگەیشتنی سیاسیی خۆیانو بە نزیکبوونەوە لە کۆمەڵانی خەڵكو بە ڕەفتاری باشو ئاکاری جوان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر جێگای خۆیان لە نێو ئەواندا بکەنەوەو پتر پشـتیوانی خەڵکی بۆ لای خۆیان ڕابکێشن.

لەو شێوە شەڕەدا سەرچاوەی ئەسڵی چەكو تەقەمەنی پارتیزان هێزی دوژمنە. هەربۆیەش پێویستە پارتیزان بە وردی شوێنو كاتی دەست وەشاندن لە دوژمن دیاری بكاو لەو كاتو شوێنەدا دەست لە دوژمن بوەشێنێ كە بە زیانو تەلەفاتێكی زۆر كەمو بە مەسرەفكردنی لانیكەمی تەقەمەنی، زیانی گەورە لە پەلاماردەران بداو چەكو تەقەمەنی‌یەكی زۆر وەدەست بێنێ. لە هەموو حاڵێكدا پێویستە هێزی پێشمەرگەی حیزب وەك پارتیزانێك ئەوەندە بكرێ دەست بە تەقەمەنی‌یەوە بگرێو تەنانەت بە هەڵكەوت نەبێ چەكەكەی نەخاتە سەر ریز.

پێویستە هەمیشە لەبەرچاومان بێ كە شەڕی پارتیزانی شەڕی ماندووكردنی دوژمنە، بۆیە زۆر وێ دەچێ، شەڕی ئێمە لە دژی دەسەڵاتی كۆنەپەرستیو دیكتاتۆری شەڕێكی درێژخایەن بێ. كەوابوو پێشمەرگە دەبێ خۆی بۆ چەندین ساڵ شەڕو بەربەرەكانێ ئامادە بكاو لە پەلەپەلی بێجێو دانی تەلەفاتی زۆر خۆی بپارێزێ. نابێ لە بیرمان بچێ كە یەكێك لە گرنگترین ئەركەكانی پارتیزان پاراستنی گیانی خۆیەتیو سەركەوتووترین شەڕ ئەو شەڕەیە كە زیانی پێشمەرگە كەمتر بێ یان هەر زیانی نەبێ. ئەو كارەش پێویستیی بەوەد هەیە كە پێشمەرگەكانمان هونەری پەلامارو پاشەكشەو سەنگەرگرتنو زەبر وەشاندن باشترو باشتر فێر بن.

شەڕی پارتیزانی زیاتر شەڕی مەڵبەندە شاخاوی‌یەكانو ناوچە لادێیی‌یەكانە. بەڵام بۆ ئەوەی لە هەموو دەرفەتێك بۆ زەبروەشاندن لە پەیكەری دوژمن كەڵك وەربگیرێ، پێویستە لە نێوان شەڕی چیاو پێدەشتەكانو دەستوەشاندن لە پێگەكانی دوژمن لە نێو شارەكاندا هەماهەنگی پێك بێ. بێ ئەوەی لە هیچ حالەتێكدا لە نێو شارەكان جەبهە بكرێتەوەو شەڕی سەنگەری بكرێ. چونكە سەنگەر گرتنو شەڕی جەبهەیی لە نێو شار لەلایەك دەبێتە هۆی وێرانی شارەكەو كوژرانی خەڵكی بێدیفاعو لە لایەكی دیكەش كەرەستەو تەقەمەنی‌یەكی زۆر تێدا دەچێ كە زۆر كەم وایە لەو جۆرە شەڕانەدا جێگای پڕ بكرێتەوە. بێجگە لەوەش ئێمە دەبێ لە نێوان خەباتی چەكدارانەو خەباتی هێمنانەی نێو شارەكاندا هاوئاهەنگیو رێكخستن پێك بێنین تاكوو بتوانین لە هەموو دەرەتانێك بۆ بەرەوپێشبردنی خەباتی خۆمان كەڵك وەربگرین. با نەیشارینەوە كە لە كاتێكدا پێشمەرگە بۆ فیداكاریو ئازایەتی نموونەیەو لەو باردوە جێگای دەستخۆشیو ئافەرینە، هەتا ئێستا لەبارەی نەزمو

دیسیپلینەوە لە پاشە. لە کاتێکدا دیسیپلین‌و پاراستنی نەزم‌و گوێگرتن بۆ دەستووری بەرپرسانی سەرەوەتر لە ریزەکانی پێشمەرگەدا هەم بۆ سەرکەوتنی نەخشەو گەلاڵەکانی شەڕو هەم بۆ پاراستنی گیانی پێشمەرگە هۆیەکی زۆر بەسوودەو کاریگەرە. لە نێو پێشمەرگەکانی ئێمەدا نهێنی‌کاری بەو جۆرەی کە پێویستە، لەبەرچاو ناگیرێ. زۆر جار بینراوە کە پێشمەرگەیەك پێش بەجێ گەیاندنی ئەو ئەرکەی پێی ئەسپێردراوە، مەئموورییەتەکەی بۆ کەسانی دیکە باس کردوە. جاری واش هەبووە ئەو زار بڵاوی‌یە بۆتە هۆی ئەوە کە دوژمن لە نەخشەی پێشمەرگە ئاگادار بێ‌و لە ئاکامدا نەخشەکە سەرنەکەوێ. بەو جۆرە تەوسیە دەکرێ کە نهێنی‌کاری‌و دیسیپلین وەك دوو ئەسڵی گرنگی خەباتی سیاسی‌و دوو هۆی کاریگەری سەرکەوتنی خەباتی چەکدارانە، هەرچی زیاتر لە نێو ریزەکانی پێشمەرگەدا لەبەرچاو بگیرێن‌و خۆشك‌و برایانی پێشمەرگە لە هیچ حاڵێکدا ئەو دوو ئەسڵە بە کەم نەگرن.

کاری سیاسی نێو هێزی پێشمەرگەو هاودەنگیی نێوان بەشی سیاسی‌و نیزامی لە دوو ساڵی رابردوودا چۆتە پێش، بەڵام جارێ نەگەیشتۆتە رادەی پێویست. لەو بارەیەوە پێویستە بگوترێ کە هێزی پێشمەرگە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجە سیاسی‌یەکانی حیزب دروست بووەو هەر وەخت ئامانجە سیاسی‌یەکانی وەدی بێن، هێزی پێشمەرگە کاری دیکەی پێ ئەسپێردرێ. کەوابوو پێویستە هەموو کردەوەیەکی نیزامی لە خزمەتی ئامانجە سیاسی‌یەکاندا بێ‌و هەموو بڕیارێکی گرنگی نیزامی لە ناوچەکاندا بە ئاگاداری هەیئەتی ئیجرایی کۆمیتەی شارستان، یان هەر نەبێ بە هاوکاری مەسئوولی شارستان بگیرێ. دیارە تەکنیکی عەمەلیات‌و وردەکاری لە نەخشە نیزامی‌یەکاندا لە ئەستۆی فەرماندەری هێزو بەرپرسەکانی پێشمەرگەیەو بەشی سیاسی لەو بارەوە دەخالەت ناکا، بەڵام لەبەرە ئەوەی هەموو شەڕێك هێندێ ئەنجامی سیاسیی بەدواوەیە، پێویستە ئەنجامدانی هەر عەمەلیاتێکی نیزامی، ئاکامە سیاسی‌یەکانی لە هەیئەتی ئیجرایی‌دا لێك بدرێتەوە.

تەداروکاتیش لە نێو پێشمەرگەدا جارێ لاوازەو پێویستە کاری زیاتری لەسەر بکرێ. زۆر جار رێك کەوتووە پێشمەرگە لە سەنگەردا شەوو رۆژێك نان‌و ئاوی پێ نەگەیشتوە. جاری واش بووە کە تەقەمەنی‌و کەرەسەی شەڕ لەگەڵ ئەوەی کە لەبەر دەستیش‌دا بووە، بە وەخت نەگەیشتۆتە پێشمەرگەکان‌و لە ئاکامدا ناچار بوون جێگای

خۆیان بەجێ بێڵن. لەو بارەوە کومیتەکانی حیزبی رەخنەیان دێتەوە سەر. بەشی تەدارۆکاتی کومیتەی شارستانو هێزی مەڵبەند دەبێ هاوکاری‌یەکی وایان لەنێودا هەبێ کە هەموو شتێك لە کاتی پێویستدا بگاتە جێگای خۆیو پێشمەرگە لەنێو سەنگەردا هەست نەکا کە پشتی جەبهەی نیە. دەبێ کارێك بکرێ کە بەرەبەرە هاودەنگی تەواو لە نێوان رێکخراوی حیزبو هێزی پێشمەرگەدا پێك بێ. بەڕاستی ئەو کاتە دەتوانین بە تەواوی هیوامان بە سەرکەوتن هەبێ کە هەموو پێشمەرگەکان بە تێگەیشتنەوە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی حیزب تێبکۆشنو هەموو ئەندامانی حیزبیش خۆیان بە پێشمەرگە بزانن.

کەموکوڕی‌یەکی دیکە کە بەداخەوە هێشتا لە نێو پێشمەرگەکاندا بەرچاو دەکەوێ، بێ‌موبالاتیو کەمتەرخەمی لە کێشكو نیگابانی دایە. هەتا ئێستا چەند جار زیانی گەورەمان لەو کەمتەرخەمی‌یە دیوە. لەبەر نەبوونی نیگابانی پەلێکی پێشمەرگە گەمارۆ دراوەو بەداخەوە دە قارەمانیان لێ شەهید بوون. چەند جار رێك کەوتووە لە بێ مۆبالاتی پێشمەرگە کەڵکیان وەرگرتوەو لە زیندانی حیزبدا رایان کردوە کە بەختیارانە بەشی زۆریان بەهۆی کاری خەڵکەوە گیراونەوە.

تێکۆشان بۆ بەرزکردنەوەی پلەی تێگەیشتنی سیاسیو هونەرەکانی نیزامی لە نێو پێشمەرگەدا کەمتر لە رادەی پێویستە. زۆر جار دەبینرێ لەکاتی حەسانەوەدا وەختی پێشمەرگە بەفیرۆ دەچێو بۆ تەمرین لەسەر بەکارهێنانی چەکە جۆربەجۆرەکان یان بۆ بردنەسەری پایەی تێگەیشتنی سیاسیو کۆمەڵایەتی کەڵکی لێ وەرناگیرێ. جگە لەوەش، وەرزشو پەروەردەی بەدەنی لەنێو هێزی پێشمەرگەدا زۆر کەمە. دیارە ئەوەش بە کەموکوڕی‌یەك لەکاری پێشمەرگایەتی‌دا دەژمێردرێ. پارتیزان هەمیشە دەبێ لە وەزعێکی بەدەنیی ئەوتۆدا بێ کە بتوانێ چەندین سەعات کار بکا، بەرێگادا بڕواو ئەگەر پێویست بوو غار بدا. ئاشکرایە کە ئەوەش بەبێ وەرزشو پەروەردەی بەدەنی لەتوانادا نیە.

بەجێ‌یە ئەوەش بگوترێ کە هێندێ لە پێشمەرگەکان کارکردن بە پێچەوانەی شوغڵی پێشمەرگایەتی دەزانن‌و تەنانەت پێیان عەیبە کار بکەن. بەڕاستی ئەو بۆچوونە زۆ نادروستەو پێشمەرگە دەبێ لەگەڵ خەڵکی زەحمەتکێش کار بکا، وەك ئەوان لە کاروباری بەرهەمهێناندا هاوکاری بکا. بەتایبەتی هەق وایە پێشمەرگەکان

ئەوکاتەی لە جەبهەو لە مەیدانی شەڕدا نین، بە رەنجی شانو بازوی خۆیان خانوو بۆ بنکەکانیان دروست بکەنو بەو کارە هەم خۆیان لە بێکاریو رەقەپشت بوون، رزگار دەکەنو هەم یارمەتییەکیش بە حیزب بگەیەنن بۆ ئەوەی خەرجی خانوو دروستکردنو ئەو جۆرە کارانە نەکەوێتە سەرشانی حیزب.

**هاوڕێیانی خۆشەویست!**

لە ماوەی پاش کونگرەی چوارەمدا حیزبەکەمان لەبارەی کاروباری پێشمەرگەوە دوو دەسکەوتی گەورەی هەبووە: یەکەم، دامەزراندنو پەرەپێدانی نەخۆشخانەکانی حیزبە. زۆر بە شانازییەوە رادەگەیەنین کە ئێستا پزیشکەکانی نەخۆشخانە بە ئیمکاناتی کەمەوە کە بەشی زۆری بۆ خۆیان پێکیان هێناوە، سەختترین عەمەلی جەراحی بۆ بریندارو نەخۆشەکان دەکەنو هەموو مانگێك چەندین پێشمەرگەی بریندارو چەندین لاوی فیداکار بە تێکۆشانی دڵسۆزانەی پزیشکەکان لە مردن رزگار دەبنو دەگەڕێنەوە نێو سەنگەری خەبات. بۆیە جێگای خۆیەتی کە پڕ بەدڵ لە زەحمەتو کوێرەوەری تەواوی ئەو کەسانەی لە دامەزراندنو بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکاندا هاوکاریان کردوە، بەتایبەتی لە کارو ماندووبوونی شەوو رۆژی پزیشکەکانو کادری دەرمانی نەخۆشخانەکان سوپاس بکەین.

دووهەم دەسکەوتمان، دامەزراندنی سیستمی موخابراتە. موخابرات هەروەك هەمووتان دەزانن بۆ کاروباری خەباتی چەکدارانە شتێکی حەیاتییە. موخابرات لەڕاستیدا شاڕەگی کاروباری چەکدارییەو ئەگەر ئەو شاڕەگە کار نەکا، تەواوی بەشەکانی دیکەی خەباتی چەکدارانە تووشی شپرزەییو نابەسامانی دەبن. زۆر بە شانازیی دەزانین کە ئێستا دەتوانین رابگەیەنین لە شیماڵەوە تا جنووب لە هەموو ناوچە گرنگەکانی کوردستاندا دەزگای موخابراتی ئێمە چالاکانە کار دەکاو هەموو رووداوەکانی شەڕو پێداویستییەکانی پێشمەرگە لە زووترین کاتدا بە دەفتەری سیاسیی حیزب رادەگەیەندرێن. جگە لە شەبەکەی سەرتاسەری، زۆر لە دەستەو لکەکانی پێشمەرگە لەنێو خۆیاندا پێکەوە بە بێسیم پێوەندییان هەیەو لە زووترین کاتی مومکیندا دەتوانن کۆمەكو یارمەتی بە یەکتر بگەیەنن. جێگای باسە کە هەتا ئێستا دوو سێ کلاس بۆ فێرکردنی بێسیم دانراوەو هیواداریین لە داهاتووشدا تێکۆشان بۆ پەرەپێدانی موخابرات درێژەی هەبێ. بەو بۆنەوە رێگا بدەن بەناوی

هەموو بەشدارانی کونگرەوە لە تێکۆشـانی بێوچـانی موهـەندیسو هـەموو کـادری بەشی موخابرات سوپاس بکەینو رێز بۆ کاری بەکەڵكو بەسوودی ئەوان دابنێین.

**خۆشكو برا بەڕێزەکان!**

سەرەڕای هەموو هەوڵو تەقەللای ئێمەو تێکۆشـانی بێوچـانی کـادری پزیشـکی نەخۆشـخانەکان، بەداخـەوە دیسـانیش هێنـدێ لـە بریندارەکانمـان کـە برینـەکانیان کاریگەرە شەهید دەبنو هێندێکی دیکەش لاقو دەستو ئـەندامی دیکـەی لەشـیان لەدەسـت دەدەن. زۆر ناخۆشـە کـە لـە هەلومـەرجی شـەڕدا خزمـەتێکی گـــەورەو بەرچاومان بۆ نقوستانەکان لەدەست نایە، بەڵام لەگەڵ ئـەوەش پێویسـتە لـە هـەموو جۆرە کومەكو یارمەتییەك کە لە دەستمان دێ، دەرهەق بەو رۆڵە فیداکارانە درێغـی نەکەین. بەو هیوایەی کـە دوای سـەرکەوتنی شـۆڕش، گەلەکـەمان بتوانـێ پاداشـی لەخۆبردوویی ئەو رۆڵە بەنرخانەی بداتەوە.

ئەرکێکی دیکەی گرنگمان راگەیشتن بـە خـاوو خـێزانی شـەهیدانە. دەبـێ ئـەو راستییەمان لەبیر بێ کە یەکێك لە ئێمە هەر ئەندازە لە رێگای گەلەکەیدا فیداکاری بنوێنێ، لەچاو هاوڕێ شەهیدەکانمان کە گـەورەترین سـەرمایەی ژیـان، واتـە گیـانی خۆیان لەرێگای میللەتدا بەخت کردوە، هەر لە پاشە. ئێستا کە ئەو رۆڵە قارەمانانە سەریان لـە رێگـای بیروباوەڕیـان دانـاوە، ئـەرکی ئێمـەو هەموومانـە کـە نـەهێڵین کەسوکاریانو بەتایبەتی ژنو منداڵیان هەست بـەبێ کەسـی بکـەن. دەبـێ لـە زاری خۆمانو تەنانەت پێشمەرگەکانیش بگێڕینەوە بۆ ژیانی خاوو خێزانی شەهیدەکانمان.

چەند مانگە کومیتەی ناوەندی بڕیاری داوە کە بێجگە لەو یارمەتییـەی بـەناوی شەهیدانە دەدرێ بـە بنەماڵـەی شـەهیدان، هـەموو مـانگێك یارمـەتی پێشـمەرگە شەهیدەکان بدرێ بە ژنو منداڵو کەسانی ژێر تەکەفوولی ئەوان. بە خۆشـییەوە ئـەو بڕیارە لـە زۆربـەی ناوچـەکاندا جێبـەجێ کـراوەو یارمـەتی خـێزانی شـەهیدان بـە رێکوپێکی دراوە. بەڵام دیارە ئەوەی تا ئێسـتا بـۆ خـێزانی شـەهیدان لـە دەسـتمان هاتووە زۆر کەمە. پێویستە لەمەودواش هەوڵ بدەین یارمەتی زیاتریـان پـێ بکـرێ. هەتا ئەو رۆژەی کە هیوادارین گەلەکەمان سەربکەوێو خزمەتی بنەماڵەی شـەهیدان بەو جۆرەی پێویستە، وەئەستۆ بگرێ.

**هاورێیانی خۆشەویست!**

بۆ ئەوەی لە داهاتوودا کاروباری پێشمەرگە بەرەوپێش بچێ، پێشنیار دەکەین لە هەموو هێزەکاندا بەرنامە بۆ فێرکردنو پێگەیاندنی پێشمەرگە لەباری سیاسیو کۆمەڵایەتیو نیزامییەوە دابنرێ. رێوشوێنو ئوسوولێکی روون بۆ تەشویقو سزادانی پێشمەرگە دیاری بکرێ تاکوو ئەوانەی لێوەشاوەیی زیاتر لە خۆیان نیشان دەدەن، رێزیان لێ بگیرێو کەسانێکیش کە ئەرکی خۆیان بەجێ ناگەیەنن، سزا بدرێن. حیسابو کیتابی چەكو تەقەمەنیو ئەموالی پێشمەرگە بە وردی رابگیرێو چاوەدێری بەسەر مەسرەفی بەجێی موهیماتدا بکرێ، لە هەموو بنکەکانی پێشمەرگە وەرزش وەك بەرنامەی کاری رۆژانە بە ئەرك دابنرێو هەموو بەیانیان ماوەیەك وەرزش ئیجباری بێ.

# تێكۆشانی تەشكیلاتی

**بەشدارانی بەڕێزی کۆنگرە!**

لە مێژە لەنێو حیزبی ئێمەدا دروشمێكی مەشهوور جێگـای خـۆی كردۆتـەوە كـە دەڵێ: "رێكخراو چەكی هەرە گرنگی ئێمەیە"، با لە نزیكەوە نـەختێك لـەو دروشمـە ورد بینەوە. ئەگەر چاوێك بە مێژووی خەباتی رزگاریخوازانەی گەلی كورددا بخشـێنین، دەبینین كە زۆربەی بزووتنەوەكانی گـەلی كـورد شـێخێك، ئاغایـەك، مەلایـەك یـان سەرۆك عەشیرەتێك سەركردایەتیی كردوون. نەتیجـەی ئـەم وەزعـە ئـەوە بـووە كـە هەروەخت سەرۆكی بزووتنەوەكە كوژراوە، مردوە، فریودراوە، یان خەیانـەتی كـردوە، بزووتنەوەكەش مەحكووم بە پاشەكشە بووە. چونكە هەموو كارەكان بە وجوودی ئـەو سەركردەوە بەستراونەوە. بۆ دەربازبوون لە دووبارەبوونەوەی ئەو كارەساتەیە كە ئێمـە دەمانەوێ سـەركردایەتی گـەلی كـورد بەدەسـت رێكخراوەیەكـەوە بـێ‌و لـە چنگـی سەركردایەتیی تاكەكەسـی رزگـاری بـێ. ئێمـە رێكخراوێكمـان دەوێ زینـدوو، بـە حەرەكەت‌و چالاك، رێكخراوێـك كـە بـە وجـوودی هیـچ كـام لـە ئەندامەكانی‌یـەوە رانەوەستابێ. ئەگەر رۆژێك لە رۆژان خودا نەخواستە نیـوەی ئـەندامانی رێبەرایـەتی یان زیاتریش لەنێو بچن، ئەوانەی دەمێننەوە كارەكان بەڕێوە بەرن، تەنانـەت ئەگـەر تەواوی رێبەرایەتی‌یەكـەش لـەنێو بچـێ، كادرەكـانی خـوارەوە وەك ئۆرگانیزەیـەكی زیندوو رێبەرایەتی‌یەكی نوێ پێك بێنن‌و رێگاكە درێژە پێ بدەن.

وەختێك رێكخراو بە چەكی هەرە گرنگی خۆمان دادەنێین، دەبێ بزانین ئەو دروشمە هەروا و لە خۆڕا نـەهاتووە. نێوەرۆكـی ئـەو دروشمـە لـەوەڕا دێ كـە ئێمـە دەتوانـین

هەرچەشنە چەکێك بە پووڵ بکڕین، بە قەرز وەری بگرین، لە دوژمنی بستێنین، یان لە کەسێك‌و دۆستێك‌و وڵاتێکی دیکە وەری بگرین، بەڵام ڕێکخراو نە بە پووڵ دەکڕێ، نە شتێکە بە ئەمانەت وەری بگرین‌و نە هیچ کەسیش دەتوانێ بمانداتێ. ڕێکخراو هەر دەبێ لەنێو ئەو میللەتە سەر هەڵبداو لە مەیدانی خەباتدا گەشە بکا. تاقیکردنەوەش نیشانی داوە کە ئەگەر ڕێکخراومان هەبێ، هەموو پێویستی‌یەکی دیکەی وەك چەك‌و پووڵ‌و هی‌تر دەتوانین پەیدا بکەین. بەڵام زۆریش چەك‌و پووڵمان هەبێ‌و ڕێکخراومان نەبێ، هیچمان لە دەست نایە. هەر ئێستا دەبینین لەهەر جێگایەك ڕێکخراوی بەهێزمان هەیە، کاروباری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و نیزامیشمان ڕێکوپێکە. بە پێچەوانەش لەهەر شوێنێك ڕێکخراوی چوست‌و چالاکمان نیە، هەموو کارێکی ئابووری‌و نیزامی‌و کۆمەڵایەتیمان لەدوایە.

کە باسی ڕێکخراو دەکەین، مەبەستمان ڕێکخراوێکە شانەبەندی‌و کومیتەبەندی ڕێکوپێکی هەبێ، بەرنامەی کارو تێکۆشانی هەبێ‌و ببێتە ئەڵقەیەك لەنێوان سیاسەتی حیزب‌و کۆمەڵانی خەڵکدا. ئەگەر سەرنجێکی وەزعی ئێستای کوردستان بدەین، دەبینین ڕێبەرایەتیی حیزبی ئێمە لەسەر یەك، سیاسەتێکی دروست‌و ئوسووڵی هەیە کە وەڵامدەری قۆناغی ئێستای خەباتی گەلەکەمانە. لەولاشەوە کۆمەڵانی خەڵك بە هەموو توانایانەوە پشتیوانی لەو سیاسەتە دەکەن. بەڵام لەنێوان سیاسەتی دروست‌و ئوسووڵی حیزب‌و کۆمەڵانی بەرینی گەلدا کە پشتیوانی ئەو سیاسەتەن، ئەڵقەیەکی پێوەندی هەیە کە بەداخەوە هەتا ئێستا زۆر بەهێز نیە. ئەو ئەڵقە پێوەندی‌یە تەشکیلاتە. ئێمە پێویستیمان بە ڕێکخراوێك هەیە کە بەزوویی‌و چالاکانە هەموو بڕیارەکانی ڕێبەرایەتیی حیزب بە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بگەیەنێ، هەر بەو چوست‌و چالاکی‌یەش ویست‌و داخوازەکانی خەڵك بگەیەنێتەوە بە ڕێبەرایەتی، تاکوو بتوانێ سیاسەتەکانی خۆی بەچەشنێکی دروستتر لە سەر ئەو داخوازانە دابنێ.

کومیتەو شانەکانی حیزبی پێویستە بەرنامەی ڕێکوپێکی کۆبوونەوەیان هەبێ، لە کۆبوونەوەکانی کومیتەو شانەی حیزبی‌دا دەبێ مەسەلە سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌یەکانی ڕۆژ باسیان لەسەر بکرێ‌و ڕێگای چارەسەر بۆ گیروگرفتەکان بدۆزرێتەوە. ئۆرگانەکانی حیزبی دەبێ هەمیشە خەریکی خۆفێرکردن‌و بەرزکردنەوەی

پلەی تێگەیشتنی سیاسیی خۆیان‌و ئەندامان‌و لایەنگرانی حیزب بن. لە کۆبوونەوەکاندا دەبێ لەسەر هەموو مەسەلەیەکی گرنگ باس بکرێ‌و بڕیاری بەکۆمەڵی لەسەر بدرێ. ئەمجار بۆ جێبەجێکردنی، مەسئوولییەت بە یەکێك لە ئەندامان بدرێ. هەروەك لە پەیڕەوی نێوخۆی حیزبدا گوتراوە، کارو بڕیاری تاکەکەسی مەحکوومەو دەبێ لە تەکڕەوی‌و تەکپەرستی خۆ بپارێزێ.

بە شانازی‌یەوە دەبینین لە کونگرەی چوارەمەوە هەتا ئێستا تەشکیلاتی حیزبی ئێمە پێشکەوتنی بەرچاوی هەبووەو لەو بارەوە سوپاسی هەموو کادرو بەرپرسەکانی حیزب‌و بەتایبەتی بەشی تەشکیلات دەکەین. دیارە هەر ئەم کۆنگرەیەش بەو تەرکیبەوە کە هەیەتی، نیشانەی پێشکەوتنی کاری تەشکیلاتی‌یە. بەڵام بە لەبەرچاو گرتنی ئەو ئەرکە پیرۆزو قورسە کە مێژووی گەلەکەمان خستوویەتە سەرشانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، دەبێ قەبووڵ بکەین کە ئەو پێشکەوتنە بەس نیە. ئەوەی کراوەو لەگەڵ ئەوەی دەبێ بکرێ، بۆ ئەوە نابێ بەراوردی بکەین. ئێستا با کەمێك باسی ناتەواوی‌یەکانی کاری تەشکیلاتی بکەین بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بەپێی توانا بۆ لەنێوبردنیان هەنگاو هەڵێنین:

یەکێك لە ئەسڵە گرنگەکانی کاری تەشکیلاتی لە حیزبی ئێمەدا، سانترالیزمی دێموکراتیکە. ئەو ئەسڵە گرنگە لە پەیڕەوی نێوخۆی حیزبدا بەجوانی شی کراوەتەوە. زۆر بەداخەوە دەبێ بڵێین تا ئێستاش ئەو ئەسڵە لە بەشێکی زۆر لە ڕێکخراوەکانی حیزبدا جێگیر نەبووە. لە هێندێ جێگا سانترالیزمەکە ئەوەندە توند گیراوە کە شێوەی فەرمانبەرایەتیی بە خۆیەوە گرتووەو لە هێندێ شوێنیش دێموکراسی‌یەکە ئەوەندە پێشی بەربلاوە کە بە کردەوە بۆتە ئەنارشیسم‌و هەرکەس هەرکەس. هەتا ئێستا هەڵبژاردنی ئۆرگانەکان لە خوارەوە بۆ سەرێ ـ کە بەشێکی ئەساسی لە سانترالیزمی دێموکراتیکە ـ نەکەوتۆتە سەر ڕێبازی ئوسووڵی خۆی. هۆیەکەشی ئەوەیە کە هێندێك جار بەشێك لە ئەندامانی حیزب پێوەندیی دۆستایەتی‌و خزمایەتی لەگەڵ کاروباری حیزبی تێکەڵ دەکەن. بەشی تەشکیلاتی دوای کۆنگرە دەبێ بەتوندی بۆ سەقامگیرکردنی ئەسڵی سانترالیزمی دێموکراتی هەوڵ بداو ئەو ئەسڵە گرنگە لە هەموو ئۆرگانەکانی حیزبی ئێمەدا جێگیر بکا. یەکی دیکە لە ناتەواوی‌یەکانی تەشکیلاتی لە حیزبی ئێمەدا نەبوونی کادرە. کادر بڕبڕەی پشتی

حیزبو ئەڵقەی ئەساسـی نێوان ڕێبەرایـەتیو ڕێکخراوەکـانی حـیزبو لـە ڕێگـای ئەوانیشەوە کۆمەڵانی خەڵکە. ئێستا بزانین مەبەست لە کادری حـیزبی کـە ئـەوەندە بایەخی بۆ دادەنێین چیە؟ ئێمە کادرێکمان دەوێ کە پێش هەموو شتێك ئینسـانێکی بە بیروباوەڕو نیشتمانپەروەر بێ، ئەمجار لە سیاسەتو سـتراتیژیو تـاکتیکی حـیزب باش شارەزا بێ، لە فیداکاریو لەخۆبردوویی‌دا بۆ ئـەندامانی دیکـەی حـیزب نموونـە بێ، بەشێك بێ لە خەڵك، لەگەڵ ئەوانو وەك ئەوان بژیو دەردو مەرگی ئـەوان بـاش تێ‌بگا، لە کاتی تەنگانەدا دەستو پێی خۆی لـێ ون نـەبێ، بتوانـێ بەربـەرەکانێی دوژمن بکاو لەکاتی لێقەوماندا ڕێکخراوەکانی حیزب لە پەلاماری دوژمن بپـارێزێ. لە هەلومەرجی ئێستادا کـە حیزبەکـەمان خـەباتی چەکدارانـەی بەسـەردا سـەپاوە، ئینسانێکی ئازا بێو لەکاتی شەڕو پەلاماری دوژمـندا ورە بـەر نـەداو لـە ئاکـامدا بتوانێ لەکاتی پێویستدا سەربەخۆ بڕیار بدا.

لەماوەی نێوان دوو کونگرەدا توانیومانە چەندین کلاسی کادر بکەینەوەو زیاتر لە دووسەد لاوی خوێنگـەرم وەك کـادری حـیزبی پـەروەردە بکـەین کـە لـە فـێرکردنو پێگەیاندنی ئەو لاوانەدا هاوکارییان کردوە، بـەڵام پێویسـتە ئـەو ڕاستـی‌یەش وەبـیر بێنینەوە کە کادری حیزبی هەر بە دیتنی کەلاس نابێتە کادرێکی تـەواوو تـەنیا لـە مەیدانی کاری حیزبی دایە کە کادر پێ دەگاو لێوشاوەیی خۆی نیشان دەدا. کلاسـی کادر هەر بۆ ئەوەیە کە هێندێ ئوسووڵی گشتیی تێ‌دا باس بکرێو کادرەکـان بۆخـۆ فێرکردنو موتالاو ئەزموون وەرگرتن هان بدرێن.

کەموکوڕی‌یەکی دیکەی کاری تەشکیلاتیمان تێکەڵکردنی شێوەی کاری حـیزبیو کاری نیزامی‌یە، یان کاری حیزبیو کاری ئیداری‌یە. ڕێـك دەکـەوێ کـە هاوڕێیـەکی حیزبی بەشێوەی فەرماندەرێکی نیزامی دەستوورێك دەداو پێی وایە کـە ئـەو شـێوە کارە دەتوانێ لە بردنەپێشی کاری حـیزبی‌دا کاریگـەر بـێ. واش دەبـێ ئۆرگـانێکی حیزبی ڕێنوێنی‌یـەکانی خـۆی تـەنیا بـە بەخشـنامە بـڵاو دەکاتـەوەو چاوەڕوانیشـە نەتیجەی باشی لـێ وەرگرێ. لە کاتێك‌دا هیچ کام لەو دوو شێوەیە لەگـەڵ ئوسـووڵی کاری حیزبی باش ڕێك ناکەونو ناتوانن بەرهەمی باشیان هەبێ. بۆ ئەوەی ڕێنوێنـیو دروشمو سیاسەتەکانی حیزب بەرینە نێو ئەندامانو کـارێك بکـەین کـە بـە ئیمـانو بڕواوە بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی حیزب تێ‌بکۆشن، پێویستە تێ‌بگەین کـە کـاری

زبی لەگەڵ ئەندامانو لایەنگران، کاری زیندووو پێوەندیی راستەوخۆیە، دەبێ لە
بکەوە لەگەڵیان دانیشین، مەسەلەکانیان بۆ روون بکەینەوەو ئەوەندە ئەو کارە
وپات بکەینەوە هەتا تێبگەنو قانیع بن لە نێو حیزبداو لەگەڵ هاوڕێیانی خۆمان
قانیعکردن بەولاوە ناتوانین شێوەیەکی دیکە بەکار بێنین. دیارە ئەمە بەو مانایە
ە کە هیچ وەخت بەخشنامە نەکەینو یان ئەگەر ئەندامێك ئەرکەکانی خۆی بەجێ
گەیاند، لێی نەپرسینەوە. مەبەست هەر ئەوەیە کە پێویستە شێوەی قانیعکردن
ك شێوەی ئەساسیی کاری حیزبی رەچاو بکەینو شێوەکانی دیکە ئەگەر جاروبار
ڵکمان لێ وەرگرتن، لە خزمەتو لە چوارچێوەی شێوە حیزبییەکەدا بن.

ناتەواوییەکی دیکەی کاری تەشکیلاتیمان نەبوونی بڵاوکراوەیەکی تیئۆریکی بۆ
گەیاندنی ئەندامانی حیزبە. کۆنگرەی چوارەم بریاری دابوو کە بڵاوکراوەی
کۆشەر "نامیلکەی نێوخۆیی حیزب" کە پێش کونگرە بیست ژمارەی لێ
رچووبوو، درێژە بە بڵاوکردنەوەی بدرێ، بەڵام بەداخەوە هەلومەرجی دژواری
کۆشان ئەو دەرەتانەی نەدا کە بەشی تەشکیلاتی ئەو ئەرکە گرنگە بەجێ
گەیەنێ. هیوادارین رێبەرایەتیی نوێی حیزب لە دواڕۆژدا دەرکردنی ئۆرگانێکی
ئۆریکی بە ئەرکێکی گرنگی خۆی دابنێو بەخێرایی هەنگاوی بۆ هەڵێنێتەوە.

ئەو کەموکورییانەی باسمان کردن لە کاروباری تەشکیلاتی حیزبی ئێمەدا هەنو بۆ
وەی لە نێویشیان بەرین، نابێ بیانشارینەوە. بەڵام پێویستە بگوترێ کە هەمووی
و ناتەواوییانە هێندێ هۆی عەینیو زەینییی تایبەتیشیان هەیە. هۆی عەینی
وەیە کە لەوەتە حیزبی ئێمە دەستی بە تێکۆشانی ئاشکرا کردۆتەوە، لەگەڵ
ەڕێکی داسەپاو دەستەویەخە بووەو ئۆرگانەکانی حیزبی دەرەتانی پێویستیان بۆ
نێوبردنی ئەم کەموکوڕیانە نەبووە. بێجگە لەوەش لە جێدا گەلەکەمان زۆر فێری
اری تەشکیلاتیو حیزبی نەبووەو وەختو دەرەتانێکی زیاتری دەوێ هەتا پێویستیو
یەخی کاری تەشکیلاتی تێ بگا. هۆی زەینیش نەبوون یان کەمبوونی کادرە کە
داخەوە تا ئێستاش بەتایبەتی لە هێندێ ناوچەدا زۆر بەرچاوە.

لەگەڵ هەمووی ئەوانەش ئێمە بەچاوی هیواو هومێدەوە دەڕوانینە دوارۆژی کارو
تکۆشانی حیزبیمانو شانازی بەو پێشکەوتنانەوە دەکەین کە هەتا ئێستا بە
دەستمان هێناون. دڵنیاین کە هاوڕێیانی بەرپرسی ئێمەو بەتایبەتی ئەو رێبەرایەتییە

کە لە کۆنگرەی پێنجەمدا هەڵدەبژێردرێ، بایەخی پێویست بەکاری تەشکیلات دەدەن‌و هەتا دەگەینە کۆنگرەی شەشەم، بەشی هەرە زۆری ئەو ناتەواوی‌یانەی ئێستە دێتە بەرچاو، لەنێو دەچن. بەڵام مەسەلەیەکی گرنگ دەخەینە بەرچاوی کۆنگرە هیوادارین کۆنگرەی شەهیدان بایەخی تەواوی پێ بداو داوا لە رێبەرایەتیی نوێی حیزب بکا کە بە توندو تۆڵی کاری لەسەر بکا. ئەویش بایەخدان بە دوو توێژی زۆر گرنگی کۆمەڵ واتە ژنان‌و لاوانە.

چاوخشاندنێکی سادە بە تەرکیبی ئەم کۆنگرەیەدا بەئاسانی دەری دەخا کە حیزبی ئێمە لەنێو ژناندا کاری تەشکیلاتی زۆر کەم کردوە، چونکە لە کاتێکدا ژنان نیوەی تەواوی کۆمەڵن، نوێنەرانی ژن لە دە یەکێکی نوێنەرانی پیاو تێناپەڕن. دیارە بۆ حیزبێکی شۆڕشگێڕ ئەو دیاردەیە زۆر ناتەواوی‌یەکی گەورەو تەنانەت عەیبێکی گەورەشە. هەرچی ژنان لە تێکۆشانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری کۆمەڵێک زیاتر بەشدار بن، ئەو کۆمەڵە پێشکەوتووترەو زیاتر دەتوانێ بەدوارۆژی خۆی هیوادار بێ. بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلەبەرە پێویستە خۆشکانی ئەندامی حیزب زیاتر خۆیان ماندوو بکەن‌و پتر خۆشکەکان بۆلای کارو تێکۆشانی سیاسی‌و کۆبوونەوە لە دەوری حیزب هان بدەن. برایانی کادرو ئەندامی حیزبیش دەبێ ئەو مەسەلەیە زۆر بە گرنگ بگرن‌و لە پێش‌داش لە خێزان‌و کەسوکاری خۆیانەوە دەست پێ بکەن‌و ئەوان هان بدەن بێنە نێو ریزەکانی حیزب‌و پاشان کاری تەشکیلاتی لەنێو ژناندا وەئەستۆ بگرن.

بە بەراورد لەگەڵ کۆنگرەی چوارەم بۆمان دەردەکەوێ کە بەڕاکێشانی لاوەکان بەلای حیزبدا زۆر چۆتە پێش. کومیتەی ناوەندی لە پلینۆمی مانگی پووشپەڕی ئەمساڵدا بڕیاری دا بایەخێکی زیاتر بە راکێشانی لاوەکان بدرێ‌و بە خۆشی‌یەوە لەو بارەوە هێندێ هەنگاوی بەکەڵکیش هاوێژراون. یەکیەتیی لاوانی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەسەر رێوشوێن‌و ئوسوولێکی روون پێکهاتووەو چالاکانە دەستی بەکار کردوە، لە کۆنفرانسەکانی حیزبی‌دا بەشێکی زۆر لە ئەندامانی کومیتەکانی ناوچەو شارستان لەنێو لاواندا هەڵبژێراون. بەڵام بە باوەڕی ئێمە ئەوەندە بەس نیە لەبەر ئەوەی لاوەکانمان ئەزموونی کاری تەشکیلاتییان زۆر نیە. پێویستە لەدوای کۆنگرەش بەجیددی هاوکاری نێوان رێکخراوەکانی حیزب‌و لاوان بەهێز بکرێ لاوەکان رێنوێنی بکرێن‌و بۆ کارو تێکۆشانی زیاتر هان بدرێن. ئەم کۆنگرەیە

پێویستە ئامۆژگاری ڕێبەرایەتیی نوێی حیزب بکا کە چالاکتر لە جاران لە نێو خۆشکەکانو لاواندا کاری سیاسی بکا. هەرچی ژنان زیاتر لە دەوری حیزبەکەمان کۆ ببنەوە، زیاتر دەتوانین بە پێشکەوتنی حیزب هیوادار بینو هەر ئەندازەش لاوەکان زیاتر لەنێو حیزبدا جێ بکرێنەوە، حیزبەکەمان دوارۆژێکی ڕووناکتری دەبێ.

هاوڕێیانی خۆشەویست!

وەك هەموومان دەزانین هەولو تەقەللای تێکدەرانەی ڕێبەرایەتیی حیزبی توودەو ناردنی هێندێك لە لایەنگرانی ئەو حیزبە بۆ نێو ریزەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، سەرەنجام لە مانگەکانی دوای کۆنگرەی چوارمدا بوو بەهۆی ئەوە کە دەستەیەکی بچووك لە کادری ڕێبەرایەتیی هەڵبژێراوی کۆنگرەو چەند کەسیش لە ئەندامانو لایەنگرانی حیزب ڕێگای خۆیان لە ڕێگای خەباتکەرانی گەلی کوردو حیزبی دێموکراتی کوردستان جیا بکەنەوەو بە قەولی ڕێبەرایەتیی حیزبی توودە "بگەڕێنەوە باوەشی حیزبی دایك"! ئەوانە لە مێژووی گەلی کوردو حیزبی ئێمەدا بە تاقمی جاشی حەوت کەسی ناوبانگیان دەرکردوە.

لەسەرەتای ئاشکرابوونی خەیانەتی ئەو تاقمەڕا، حیزبی توودەو چڵکاوخۆرانی ڕێژیمی خومەینی مەسەلەکەیان گەورە کردەوەو وایان نیشان دا کە لەتبوونێکی گرنگ لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێراندا ڕووی داوە. تەنانەت بەشێك لە کۆمەلانی دڵسۆزی خەڵکی کوردستانو بگرە هێندێك لە ئەندامانو لایەنگرانی حیزبیش نیگەرانی ئەوە بوون کە ئەو تاقمە بتوانن کۆسپێکی گەورە لەسەر ڕێگای تێکۆشانی حیزبەکەمان دروست بکەن، ئەوان لەوە دەترسان کە دەوڵەتی کۆنەپەرستی خومەینی ئیمتیازی بچووك بدا بەو تاقمەو لە ئاکامدا کۆمەلانی خەڵك تووشی گومانو دوو دڵی بکا.

بەڵام ئێمە لە سەرەتاوە دڵنیا بووین کە خەڵکی وشیارو بێداری کوردستان زۆر زوو لە جەوهەری خەیانەتی ئەوان شارەزا دەبنو ریسوای مێژووی گەلی کوردو گەلانی ئێرانیان دەکەن. چونکە دەمانزانی ئەوانە پشتیان لە قازانجو ئامانجی خەڵکی کوردستان کردوەو خۆیان لە باوەشی ڕێژیمێك هاویشتوە کە حازر نیە تەنانەت دان بە بوونی گەلی کوردیشدا بنێ. هەمووشمان دیتمان کە ئەو بۆچوونەی ئێمە ڕاست بوو. ئەندامانو لایەنگرانی حیزبو تەواوی خەڵکی کوردستان زۆر زوو مۆری خەیانەتیان

بەنێو چاوانی ئەوانەوە ناو بەكردەوە تاقمی حەوت كەسی بوونە دەستەیەكی بچووكی تەریك لە كۆمەڵانی گەلو ترازاو لە ڕێبازی پڕ لە شانازیی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی خەڵكی كوردستان.

رەنگە ئەو پرسیارە بێتە بێش كە چۆن بوو رێبەرایەتیی حیزب زووتر هەستی بە خەیانەتی ئەو تاقمە نەكردو لە ریزەكانی حیزب وەدەری نەنان؟ دیارە ئەو پرسیارە زۆر بەجێیە. راستییەكەشی ئەوەیە كە لە كاتی بەسترانی كۆنگرەی چوارەمداو تەنانەت پێش كۆنگرەش جموجۆڵی گومانلێكراوی ئەوانە هەست پێ دەكرا. بەڵام لێكدانەوەی رێبەرایەتی ئەوە بوو كە ئەگەر حیزب لە دەركردنیان پەلە بكاو نەهێڵێ روخساری خائینانەی خۆیان بۆ خەڵك دەربخەن، ئەوانە قیافەیەكی مەزلوومانە بە خۆوە دەگرنو قارەمانێكی بەدرۆیان لێ دروست دەبێ. هەربۆیەش راوەستاین هەتا بەدەستی خۆیان تەواوی پەردەكانیان لەسەر رووی دزێوی خۆیان وەلا داو خەڵكی كوردستان لە نەخشەو پیلانی خائینانەی خۆیانو نەسیحەتكارەكانیان حاڵی بوون. ئێستاش ئێمە لەو باوەڕە داین كە رەنگە لەو مەسەلەیەدا تووشی هێندێك كەمتەرخەمی بووبین، بەڵام لەسەریەك ئەو رێگایە بۆ ریسواكردنو ناساندنی ئەو تاقمە هەڵمانبژاردوە، رێگایەكی راستو ئوسووڵی بووە. هەربۆیەش كاتێك سێ كەسی دیكە لە ئەندامانی كومیتەی ناوەندی رەگەڵ ئەو تاقمە كەوتن، گەلی كورد زۆر زوو لە ریزی خۆی وەدەری نانو بەلادەری لە قەڵەم دان.

## تێکۆشانی تەبلیغاتی

**خوشك‌و برا بەڕێزەکان!**

**نوێنەرانی بەڕێزی کونگرە!**

زۆر بەداخەوە تا ئێستاش زۆر کەس لە ئێمە بەو جۆرەی پێویستە گرنگی‌و بایەخ بە کاری تەبلیغاتی نادەین، لە کاتێکدا پاش کاری تەشکیلاتی، تەبلیغات گرنگترین‌و کاریگەرترین بەشی کاری حیزبی‌یە. لەڕاستی‌دا تەشکیلات بە هەموو نرخەوە کە هەیەتی، ئەگەر تەبلیغاتی دروست‌و ئوسوولّی لەسەر نەبێ، دەبێتە لەشێکی بێ‌گیان‌و دەرەتانی پێشکەوتن‌و گەشەکردنی نامێنێ. بەتایبەت لە هەلومەرجی خەباتی ئەمڕۆی گەلەکەماندا کە هەموو ئیمکاناتی تەبلیغاتیی ڕێژیم دژی هێزە شۆڕشگێڕەکانی ئێران‌و بەتایبەتی حیزبی ئێمە وەکار خراوە، کاری تەبلیغاتی گرنگی‌و پێویستی‌یەکی تایبەت پەیدا دەکا.

تەبلیغاتی حیزبی دەبێ بیروباوەڕو سیاسەت‌و ستراتیژی‌و تاکتیکی حیزب‌و بڕیارەکانی ڕێبەرایەتی بەرێتە نێو کۆمەلانی خەلك‌و ئەوان بۆ خەبات لە پێناوی وەدیهێنانی ئامانجەکانی حیزبدا کە ئامانجی هەموو خەلکی کوردستانن، بەسیج بکا. نەخشەو پیلانە شەیتانی‌یەکانی دوژمن لە دژی گەلی کوردو بزووتنەوەی حەقخوازانەی لەقاو بداو لە هەمووی گرنگتر تەبلیغاتی ژەهراوی دەزگای درۆ بلاوکردنەوەی ڕێژیم بەرپەرچ بداتەوەو خەلکی کوردستان‌و سەرانسەری ئێران لەباری ڕاستیی ڕووداوەکان ئاگادار بکا.

بە خوشحاڵی‌یەوە دەتوانین بڵێین تەبلیغاتی حیزبی ئێمە لەماوەی نێوان دوو کونگرەدا زۆر چۆتە پێش. هەلومەرجی دژواری تێکۆشانی سیاسیو خەباتی چەکدارانە دەرەتانی ئەوەی پێ نەداین رۆژنامەی "کوردستان" بکەینە رۆژانە یان هەفتانە. جاروبار وەزعێکی وا هاتۆتە پێش کە "کوردستان" جارێکیش بە رێکوپێکی دەرنەچێ، بەڵام لەسەر یەك "کوردستان" وەك رۆژنامەیەکی زۆر جیددیو جێگای باوەڕی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەردەوام بڵاو بۆتەوەو خوێنەرانی خۆی زۆر لە چاوەڕوانی‌دا نەهێشتۆتەوە. جێگای شانازی‌یە کە "رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران" ئەو بەتاڵایی‌یەی پڕ کردۆتەوە کە کەمبوونی چاپەمەنی پێکی هێناوە. رادیۆی دەنگی کوردستان لەڕاستی‌دا رۆژنامەیەکی وێژەر "گویا"یە کە هەموو رۆژێ لە سەدان هەزار نوسخەدا دەردەچێو دەگاتە هەموو شارێك، هەموو دێیەكو سەربە هەموو ماڵێك‌دا دەکا. لەوەش گرنگتر خوێندەوارو نەخوێندەوار کەڵکی لێ‌وەردەگرنو کرێکار لە کارگەو جووتیار لە کێڵگەو شوان لە چیاو لەوەرگە گوێی بۆ دەگرنو لێی حاڵی دەبن.

"رادیۆ دەنگی کوردستان" ئێستا رۆژێ سێ سەعاتو چارەکێك بە زمانی سێ نەتەوەی گەورەی ئێران، فارسو ئازەربایجانیو کورد، بەرنامە بڵاو دەکاتەوە. بەڕاستی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران بۆ حیزبی ئێمەو هەموو خەڵکی کوردستان جێگای شانازی‌یە. ئەمە یەکەمجارە لە مێژووی گەلی کورددا کە رادیۆیەك لە خاکی کوردستان‌داو بە ئیمکانی ماڵیو تەکنیکی خۆوڵاتیو بێ‌کۆمەکی خاریجی دامەزراوە، ساڵو نیوێکە بێ پسانەوە بەرنامە بڵاو دەکاتەوەو هەروا لە بەرەوپێشچوونیش دایە. بەرنامەکانی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران سەرنجو رەزامەندیی خەڵکی کوردستانو بەشێکی زۆر لە خەڵکی ئێرانیان بۆ لای رادیۆ راکێشاوە. هەربۆیەش هەموو رۆژێ دەیان نامەی سوپاسو رێزدانانی لەلایەن گوێگرەکانی‌یەوە پێ دەگا.

لێرەدا رێگام بدەن بەناوی هەموو بەشدارانی کونگرەوە لە زەحمەتو ماندوونەبوونی تەواوی ئەو کەسانە کە لە دانانو بەڕێوەبردنی رادیۆدا هاوکارییان کردوە، لە هەموو نووسەرانو وەرگێڕانو وێژەرانی بەرنامەکانی رادیۆو لە هەموو ئەو پێشمەرگانەی شەوو رۆژ ئاگایان لە رادیۆ هەیەو وەك گلێنەی چاویان پارێزگاریی لێ دەکەن، سوپاس بکەین. هیواداریین رۆژێك بێ کە موهەندیسو کرێکارو نووسەرو

وەرگێڕو وێژەرو پارێزەرانی رادیۆی کوردستان بە هەموو خەڵکی کوردستان بناسێنین تا کۆمەڵانی بە ئەمەگو هەقناسی کورد بەگەرمی ئەو رۆڵە بەنرخو دڵسۆزانەیان گوڵباران بکەن.

بە پێویست دەزانین جارێکی دیکە لە هەموو هاوڕێیانی حیزبیو لە هەموو گوێگرانی رادیۆی دەنگی کوردستان داوا بکەین کە لە جاران زیاتر هاوکاری لەگەڵ رادیۆ بکەن. وتارو شیعری جوانی بۆ بنێرنو لە دەنگوباسی رووداوەکانی ناوچەی خۆیان ئاگاداری بکەن. ئەوە شتێکی ئوسوولی نیە کە هێندێ لە رێکخراوەکان تەنیا دەنگوباسی شەڕەکان بۆ رادیۆ دەنێرن. رادیۆ دەبێ لە هەموو بارێکەوە ببێتە ئەڵقەی پێوەندیی کۆمەڵانی خەڵك لە کوردستانو سەرانسەری ئێران. ئەوەش هەر نادروستە کە یەکێك تەنیا گوێ لە دەنگوباسی رادیۆ دەنگی کوردستان رابگرێو دوایە گوێی نەداتێ. ئێمە بەچاوی مامۆستایەكو کەرەستەیەکی فێرکردن سەیری رادیۆ دەکەین. پێویستە ئەندامانو لایەنگرانی حیزبی بە وردی گوێ بۆ تەواوی بەرنامەکانی رادیۆ راگرن، ئەوەی نایزانن لێی فێر بنو ئەوەی دەشیزانن بینووسنو بۆی بنێرن تا خەڵکی دیکە لێی فێر بن.

**هاوڕێیانی خۆشەویست!**

لەگەڵ هەمووی ئەو نرخە کە بۆ رادیۆی دەنگی کوردستانمان داناوە، نابێ گرنگی نەخشی تەبلیغاتی راستەوخۆمان لەبیر بچێ. دەبێ ئەوەی بزانین کە هیچ جۆرە تەبلیغاتێك ناتوانێ جێگای تەبلیغاتی راستەوخۆو زیندوو پڕ بکاتەوە. لەو شێوە تەبلیغاتەدایە کە ئێمە دەتوانین بە زمانی خەڵك لەگەڵ خەڵك بدوێینو دەردو مەرگو داخوازییەکانیان تێبگەین. هەربۆیە پێویستە لێپرسراوانو کادرەکانی حیزبی هەرچەندە بکرێ، زیاتر بچنە نێو خەڵك، لەسەر مەسەلە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان قسەیان بۆ بکەنو نەزەرو بیروڕای ئەوان بەباشی وەربگرنو بۆ ئورگانەکانی رێبەرایەتیی حیزبی بنێرن.

لەباری تەبلیغاتییەوە گرنگترین کەموکوڕیی ئێمە ئەوە بوو کە دەنگمان نەدەگەیشتە بەشەکانی دیکەی ئێران. بە خۆشییەوە ئێستا رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران بەشێکی زۆری ئەو ناتەواوییەی پڕ کردۆتەوەو جگە لەوەش، هێندێ لە رێکخراوە نیشتمانپەروەرەکانی سەرانسەری ئێران، وەك موجاهیدینی خەڵق، چریکە

فیدایی‌یەکانو گرووهی ئازادیی کارو شوورای موتەحیّدی چەپ لەو بارەوە زۆریان یارمەتی داوینو دەنگی ئێمەیان بە گەلانی ئێران گەیاندوە کە بەو بۆنەوە سوپاسیان دەکەینو هیواداڕین ئەو هاوکاری‌یە لە دوارۆژیش‌دا هەروا درێژەی هەبێ.

# کاروباری کۆمەڵایەتی

نوێنەرانی بەڕێزی کۆنگرە دەزانن کە بەهۆی هەلومەرجی تایبەتیی کوردستانەوەو لەبەر نەبوونی هیچ چەشنە ئیدارەو دامودەزگایەکی دەوڵەتی لە ناوچەی رزگارکراوی کوردستان، بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵایەتی وەك ئەرکێکی گرنگ بۆتە سەرباری ئەرکە سیاسیو تەشکیلاتیو نیزامی‌یەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. دەوڵەتی خومەینی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا تەواوی ئیدارەکانی هەڵوەشاندەوەو رۆڵەکانی خەڵکی کوردستان بۆ چاری گیروگرفتە کۆمەڵایەتی‌یەکانی خۆیان لە جێگایەك دەگەڕێن کە سکاڵاو شکایەتی خۆیانی بۆ بەرن. ئەو جێگایەش بۆ خەڵکی کوردستان بێجگە لە بنکەکانی ئێمە ناتوانێ شوێنێکی دیکە بێ. چونکە تەنانەت لە سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتیی حەمەرەزا شاشدا هەر کاتێكو لە هەر جێگایەك ئیمکانی موراجیعە بە لێپرسراوانی حیزب هەبوایە، خەڵکی کوردستان بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانیان نەدەچوونە لای ژاندارمە بەرتیل خۆرەکانی رێژیم.

بە شانازی‌یەوە دەکرێ بڵێین لێپرسراوانی حیزبی ئێمە سەرباری کاری سیاسیی خۆیان، لەگەڵ ئەوەش کە هەمیشە گیروگرفتەکانی شەڕو پەلاماری دوژمنیشیان لە پێش بووە، توانیویانە بە هاوکاریی خەڵکی کوردستان بە مەسەلە کۆمەڵایەتی‌یەکانیش رابگەن. گوتمان بە هاوکاریی خەڵك، بەڕاستی هاوکاریی رۆڵەکانی گەلی کورد لەو بارەشەوە هۆی هەرە ئەساسیی سەرکەوتنی ئێمە بووە. بۆ دەرکەوتنی راستیو دروستی ئەم قسەیەمان ئەوەندە بەسە کە بزانین لەو وەختەوە کە

دەسەڵاتی پێشمەرگە لە کوردستاندا جێگیر بووە، لە تەواوی ناوچەی رزگارکراودا دوو رووداوی چەتەیی‌و رێگری نەبینراوە، لەگەڵ ئەوەی زۆربەی خەڵکی کوردستان چەکی گەرمیان لە دەست دایە، لە ماوەی ساڵێکی تەواودا ناوچەی پانو بەرینی مەهاباد تاقە رووداوێکی پیاو کوشتن هەبووە، ئەویش بە چەقۆ نە بە چەکی گەرم. بێجگە لەوەش لە هەر جێگایەك دوو یان چەند کەس بۆ چارەسەریی گیروگرفتو ناکۆکی‌یەکانی خۆیان چوونە لای لێپرسراوانی حیزبی‌و پێشمەرگە، هەردوو لای ناکۆکی‌یەکە هاوکاری لێپرسراوانیان کردووەو لە رێنوێنی‌و پێشنیاری دڵسۆزانەی هاوڕێیانی مەسئوول دەرنەچوون. ئێمە ئەم دیاردەیە بە نیشانەی تێگەیشتوویی‌و پێگەیشتوویی رۆڵەکانی گەلی خۆمان دەزانینو شانازیی پێوە دەکەین. ئێستا بەڕاشکاوی دەتوانین بڵێین کوردستان ئەمنترینو بێ‌گیروگرفتترین ناوچەی سەرانسەری ئێرانە.

بۆ ئەوەی گیروگرفتەکان لە رێگای ئوسووڵی‌یەوە چارەسەر بکرێن، حیزب بەشێکی قەزایی بە بەشداریی چەند قازیی کارامەو لێوەشاوە پێك هێناوە. بەشی قەزایی بێجگە لە قانوونە گشتی‌یەکانی وڵات، قانوونێکی تایبەتیشی بەناوی قانوونی سزادانی گشتی داناوە کە لەگەڵ دابو شوێنو گیروگرفتەکانی کۆمەڵی کوردەواری باشتر رێك دەکەوێ. کارو تێکۆشانی براکانی بەشی قەزایی جێگای سوپاسەو هیوادارین لە دوارۆژدا زیاتریش بتوانن خزمەت بکەن. بە پێچەوانەی ویستی خۆمان ئێمە ناچار بووین زیندانێکی مەرکەزی‌و چەند زیندانێکی ناوچەییش دروست بکەین. دیارە ئەو زیندانانە زیاتر بۆ راگرتنی خائینانی گەلو ئەو ئەرتەشی‌و پاسدارانە کەڵکیان لێ وەردەگیرێ کە لە مەیدانی شەڕدا بە دیل دەگیرێن. بەڵام جارو باریش ئەو کەسانەی کە بە پێچەوانەی قانوونو رێوشوێنە کۆمەڵایەتی‌یەکان دەجووڵێنەوە، لەو زیندانانەدا رادەگیرێن.

گوتمان بە پێچەوانەی ویستی خۆمان زیندانمان دروست کردوە. بۆ بەڵگەی راستی‌و دروستی ئەم قسەیە ئەوەندە بەسە کە بزانین لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا زیاتر لە ٥٠٠ کەس لەو سەربازو دەرەجەدارو ئەفسەرانە کە لە مەیدانی شەڕدا بە چەکداری بەدیل گیراون، بەڵام جینایەتی گەورەیان دەرهەقی گەلی کورد نەکردوە، بەبێ

گۆڕینەوەو بەبێ قەیدو شەرت ئازاد کراون. ئەوانەش لە زینداندا ڕاگیراون، هەموو ئیمکاناتی ژیانیان لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی چاوەدێری زیندانەکان دەکەن، وەك یەکە.

خوشكو برا بەڕێزەکان!

هەموومان دەزانین کە ڕێژیمی خومەینی لە هەموو بارێکەوە لەگەڵ تەواوی خەڵکی کوردستان شەڕ دەکا. ئەو ڕێژیمە دژی گەلییە بۆ ئەوەی زۆڵم لە بەرەی دوارۆژی گەلیش بکا، دوو ساڵە ئیدارەی پەروەردەو فێرکردنی کوردستانی هەڵوەشاندوەو لە تەواوی ئوستانە کوردنشینەکان لە هەر جێگایەك دەسەلاتی جەهەنەمی خۆی جێگیر نەبووبێ، ڕێگای نەداوە مندالانی کورد دەرگای قوتابخانەیان لێ بکرێتەوەو تیشکی خوێندەواریو زانستیان لێبدا. بەرامبەر بەو سیاسەتە دژی ئینسانییەش حیزبەکەمان دەست لەسەر دەست دانەنیشتوە. بە هەست بە مەسئوولییەت بەرامبەر پاشەرۆژی مندالانی کوردستان بۆ کردنەوەی قوتابخانەکان دەست بەکار بووە. لە ساڵی خوێندنی ٦٠ ـ ١٣٥٩دا لە هەموو ناوچە رزگارکراوەکان بەپێی توانا بەشێك لە قوتابخانەکان کرانەوەو بۆ نموونە لە ناوچەی مەهاباد ژمارەی ئەو قوتابخانانەی بە هاوکاریو تێکۆشانی لێپرسراوانی حیزب کرابوونەوە، لە ١٤٠ قوتابخانە زیاتر بوو.

لە هاوینی رابردوودا حیزبی ئێمە بانگەوازێکی بۆ ڕووناکبیرانی کورد بلاو کردەوەو داوای لێ کردن کە بۆ کردنەوەی قوتابخانەکانو دەرس گوتن بە مندالانی کورد یارمەتی بدەن. بە خۆشییەوە خوێندەوارانو ڕووناکبیران بە هەستی مەسئوولییەتەوە پێشوازییان لەو بانگەوازە کرد. لە زۆربەی ناوچە رزگارکراوەکاندا کلاسی پێگەیاندنی مامۆستا (تربیت معلم) بەبەشدارییی ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستاو ڕووناکبیرانی بەرپرسی کچو کوڕ پێك هاتو ڕووناکبیران بۆ بەجێ گەیاندنی ئەو ئەرکە مێژوویییەی سەرشانیان ئامادە بوون.

ئێستا جێگای شانازییە کە بڵێین لەبەشێکی یەکجار زۆری دێیەکانی ناوچەی رزگارکراودا قوتابخانە کراونەوەو مندالانی کورد بۆ وەئەستۆگرتنی مەسئوولییەتەکانی دوارۆژیان پەروەردە دەکرێن. باشە ئەوەش زیاد بکەین کە کتێبی کوردی کلاسی یەکەمی سەرەتایی دراوە بە چاپو هیواداریـن بەم زووانە بگاتە دەستی مندالە خۆشەویستەکانی کوردستان. بێگومان حیزبی ئێمە لەمەو بەدواش بۆ خزمەتی زیاتر بە پەرەپێدانی فەرهەنگو زانست هەنگاو هەڵبێنێتەوەو هیواداریـن بە هاوکاری

بێدریغی رووناکبیرانی بەرپرس بەرعۆدەی گەلەکەمان سەرکەوتنی زیاتر وەدەست بێنن. بەو بۆنەوە سوپاس‌و شانازی خۆمان لە زەحمەتی کۆڕی پەروەردەو فێرکردن‌و لە هەستی مەسئوولییەتی خۆشك‌و برا رووناکبیرەکان بەتایبەتی لە مامۆستایانی قوتابخانەکان کە لەو بارەوە هاوکاری حیزبیان کردوە، دەربڕین.

هاورێیانی خۆشەویست!

لە بەرنامەی حیزبی ئێمەدا گوتراوە پێویستە لە وەزعی ئێستای مالکیەتی زەوی‌دا بە قازانجی وەرزێرانی هەژارو بێزەوی ئالوگۆڕێکی ئەساسی پێك بێ. هەر چەند لە پێشەکی بەرنامەدا وەدیهێنانی هەموو ئامانجەکانی حیزب بۆ حکوومەتی خودموختاری کوردستان دانراوە، بەلام کومیتەی ناوەندیی هاتۆتە سەر ئەو باوەڕە ئێستا بەشێکی زۆری ناوچە وەرزێری‌یەکان لە ژێر دەسەلاتی پێشمەرگەدایە، هەق نیە ئێمە خەلکی کوردستان لە چاوەڕوانی‌دا رابگرین‌و پێویستە هەر لە ئێستارە هێندێ هەنگاوی بەکەلك بە قازانجی کۆمەلانی زەحمەتکێشی گەلی کورد هەلێنینەوە.

بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجە کومیسیۆنی زەوی‌و زار گەلالەیەکی بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی زەوی داناوەو بۆ هەموو رێکخراوەکانی حیزبیی ناردوە. هەرچەند ئەو گەلالەیە لەجێ‌دا بە هاوکاری زۆر کەسی شارەزا لە مەسەلەی زەوی‌و زاردا دانراوە، بەلام لەبەر گرنگی مەسەلەکە بە پێویست دەزانین جارێکی دیکەش بە وردی موتالای لەسەر بکرێ‌و پاش پەسندکرانی یەکجاری لەبەهاری سالی ١٣٦٠ەوە پیادە بکرێ. لەو بارەوە بە ئەرکی سەرشانی هەموو بەرپرسانی رێکخراوەکانی حیزبی دەزانین کە ئەو گەلالەیە بەوردی بخوێننەوە، لەگەل هەلومەرج‌و وەزعییەتی زەوی‌و زار لە ناوچەی خۆیاندا بەراوردی بکەن‌و تێبینی‌یەکانی خۆیان لانیکەم هەتا ئاخری رێبەندانی سالی ١٣٦٠ بنێرنەوە بۆ کۆمیسیۆنی زەوی‌و زار لە دەفتەری سیاسی بۆ ئەوەی لە سەرەتای بەهاری سالی تازەوە بەتەواوی ئامادەی جێبەجی‌کردن بێ.

یەکی دیکە لەو مەسەلە کۆمەلایەتی‌یانە کە حیزبی ئێمە لە ماوەی دوو سالی رابردوودا کاری لەسەر کردوون، مەسەلەی رێگاو بانە. بەشی رێگا سازکردن لە ماوەی ئەو دوو سالەدا بەو ئیمکاناتە کەمەوە کە بوویەتی، توانیویەتی نزیکەی ٥٠٠ کیلومیتر رێگای تازە لێ بداو بۆ خۆشکردن‌و چاککردنەوەی رێگا کۆنەکانیش بە پێی توانا هەولێکی زۆری داوە. سەرنج راکێش ئەوەیە کە هەر جیگایەکی کوردستان

کە حیزب ڕێگایەکی تازەی کێشاوە، کۆمەڵانی خەڵك دەسبەجێ ناوی "جاددەی دێموکرات"یان لەسەر داناوە. جێگای خۆیەتی لێرە لە کارو ماندووبوونی موهەندیس‌و شۆفێرو تەواوی ئیشکەرانی بەشی ڕێگا سازکردن‌و هەروەها لە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان کە لەو بارەوە زۆریان یارمەتی حیزب داوەو هاوکاریان کردوە، سوپاس بکەین‌و سەرکەوتنی زیاتریان بۆ بەئاوات بخوازین.

مەسەلەیەکی زۆر گرنگی دیکە کە کومیتەی ناوەندی هەنگاوی بۆ هاویشتوە، مەسەلەی شووراکانە. کومیتەی ناوەندی لەو باوەڕەدا بوو کە وەختێك ئێمە داوای خودموختاری دەکەین‌و دەمانەوێ لە دواڕۆژدا چارەنووسی خەڵکی کوردستان بدرێتە دەست خۆیان‌و بۆ خۆیان کارو باری وڵاتەکەیان بەڕێوە بەرن، پێویستە هەر لە ئێستاوە لە ناوچە رزگارکراوەکاندا ئەو ئەسڵە، واتە ئەسپاردنی کاروباری نێوخۆیی بەدەستی نوێنەرانی خەڵك جێبەجێ بکەین. هەر ئێستاش لە زۆربەی دێیەکانی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا شووراکان هەڵبژێراون‌و چارەسەرکردنی گیروگرفتە کۆمەڵایەتی‌یەکانیان وەئەستۆ گرتوە.

بەڵام لەم دواییانەدا کومیتەی ناوەندی بڕیاری داوە بە شێوەیەکی ئوسووڵی‌تر بۆ هەڵبژاردنی شووراکانی دێ‌و ناوچەو شارو شارستان هەنگاو هەڵێنێتەوە. بۆ ئەو مەبەستەش گەڵاڵەیەکیشی بۆ پێکهێنانی شووراکان داناوە، بە باوەڕی ئێمە ئەگەر کونگرەی پێنجەم پێویستیی پێکهێنانی شووراکان پەسند بکا، پێویستە ئامۆژگاری ڕێبەرایەتیی هەڵبژێراوی کونگرە بکا کە پاش تەواوکردنی ئەو گەڵاڵەیە بە زووترین کات لە سەرتاسەری ناوچەی رزگارکراوی کوردستان پیادەی بکاو بۆ هەڵبژاردنی شووراکانی دێ‌و ناوچەو شارو شارستان بە خێرایی هەنگاو هەڵێنێتەوە.

ئەو ڕاستی‌یە نابێ لەبیر بچێ کە لە نێوان کاری حیزبی‌و کاری کۆمەڵایەتی‌دا پێوەندی‌یەکی پتەوی ئورگانێك هەیە، هەرچەندی کاری حیزبی لە نێو خەڵکدا زیاتر بکرێ، ئەوەندەش زیاتر سەرنجی ئەوان بۆ لای حیزب ڕادەکێشرێ‌و لە ئەنجامدا کۆمەڵانی خەڵك بۆ چارەسەریی گیروگرفتە کۆمەڵایەتی‌یەکان ڕوو دەکەنە حیزب. لەو لاشەوە هەرچەندە حیزب باشتر بتوانێ بەکارە کۆمەڵایەتی‌یەکاندا ڕابگا، ئەوەندەش دەتوانێ ڕۆڵەکانی گەل لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە. هەر لەو کاتەدا دەبێ ئەوەشمان لە بیر بێ کە خەریکبوونی کادرەکانی حیزبی بە چارەسەری مەسەلە

کۆمەڵایەتی‌یەکانەوە دەبێتە هۆی دواکەوتنیان لەبەجێ گەیاندنی ئەرکی حیزبی‌و تەشکیلاتی‌دا.

جا بۆ ئەوەی هەم کاروباری سیاسی‌و تەشکیلاتی حیزبی کۆسپی نەیەتە سەر ڕێگاو دوا نەکەوێ‌و هەم کاروباری کۆمەڵایەتیش بە جوانی بەڕێوە بچێ، باشترین ڕێگا ئەوەیە کە بە ئیبتکارو هاندانی حیزب لە هەموو شوێنێك خەڵك نوێنەرانی خۆیان بۆ ئەندامەتی شووراکانی دێ‌و ناوچەو شارو شارستان هەڵبژێرن‌و لە ئاکامدا کاروباری کۆمەڵایەتی بدرێتە دەستی شووراکان‌و کادرو بەرپرسەکانی حیزبیش خەریکی کاروباری سیاسی‌و تەشکیلاتی خۆیان بن.

حیزبی ئێمە هەموو کاتێك ڕێزێکی تایبەتی بۆ هونەرو هونەرمەندان‌و نووسەران‌و شاعیران داناوە. ئێستا کە ڕێژیمی خومەینی ڕێگای پەرەگرتنی هەموو چەشنە هونەرێکی لە سەرانسەری ئێراندا بەربەست کردوە، بەرەوپێشچوونی هونەر لە کوردستانی رزگارکراودا ئەهەمییەتێکی تایبەتی هەیە. حیزبی ئێمە بۆ پێکهێنانی کۆڕی تیئاترو موسیقی هەوڵێکی بەنرخی داوەو بۆ ئەم کۆڕانە لە زۆر شارو گوندی کوردستان بەرنامەیان بۆ گێڕاوە. لە هونەری دروستکردنی پوستەرو پلاکاردو تەنانەت لە پەیکەرتاشیشدا دەسکەوتی بەنرخمان هەبووە. هەروەها بە ڕێنوێنیی حیزب‌و هاوکاری یەکیەتیی لاوانی دێموکراتی کوردستان زۆر فیلمی باش‌و شۆڕشگێڕانە لە گوندەکانی کوردستاندا نیشان دراون. بەشی فیلم هەڵگرتنی حیزب توانیویەتی یەکەم فیلمی خۆی لە وەزعی ژیان‌و خەباتی گەلی کورد ئامادە بکا کە هیوادارین ئەوە ببێتە سەرەتا بۆ پەرەئەستاندنی هونەری فیلم‌و سینەمای نەتەوەیی لە کوردستاندا. بەو بۆنەوە لە هەموو ئەو هاوڕێیانەی کە بۆ پێشخستنی هونەر زەحمەتیان کێشاوە، سوپاس دەکەین‌و هیوادارین لە کاری خۆیاندا سەرکەوتنی زیاتر وەدەست بێنن.

بە شانازی‌یەوە دەبێ بڵێین کە حیزبەکەمان لەم سێ ساڵەی دوایی‌دا خزمەتێکی زۆری بە پێشخستنی زمان‌و ئەدەبیاتی کوردی کردوە. نەك هەر پشتیوانیی لە شاعیران‌و نووسەرانی کورد کردوە، بەڵکوو بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەو بەیاننامەو چاپەمەنی حیزبی بە زمانی کوردی لە لایەك ڕووناکبیرەکانی فێری خوێندنەوەو

نووسینی زمانی کوردی کردوەو لـە لایـەکی دیکـەش زمانەکـەمان پـتر دەوڵەمـەند کردوەو پەرەی پێ داوە.

خوشك‌و برا خۆشەویستەکان، نوێنەرانی بەڕێزی کونگرە!

تاقیکردنەوەی دوو ساڵی رابـردوو نیشـانی داوە کـە حـیزبی ئێمـە هەلومـەرجی قۆناخی ئێستای خەباتی رزگاریخوازانەی گـەلی کـورد لـە کوردسـتانی ئـێرانی بـاش ناسیوەو لە ویست‌و دڵخوازەکـانی خـەڵکی کوردسـتان بـاش تێگەیشـتووە. هـەموو رووداوەکان دەریان‌خستوە کە حیزبەکەمان لە هەر قۆنـاخێکی دیـاریکراوی خـەبات‌دا سیاسەتی ئوسووڵی گرتۆتە پێش‌و توانیویەتی دروشمی گونجـاو لەگـەڵ ئـەو قۆناخـەدا بێنێتە گۆڕێ. هەر لە ماوەی نێوان کونگرەی چوارەم‌و کونگـرەی پێنجـەم‌دا جـارێکی دیکە بەتەواوی دەرکەوتووە کـە زۆربـەی هـەرەزۆری خـەڵکی کوردسـتان پشـتیوانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانن‌و ئەو حیزبە بە رێبەرێکی لێوەشـاوەو دڵسـۆزی خەباتی رزگاریخوازانەی خۆیان دەزانن. ئێستا ئەرکی سەرشانی بەرێوەبـەران‌و کـادرو ئەندامانی حیزبە کە تێبکۆشـن ئـەو لێـك نزیکـی‌و هاوپێوندی‌یـەی نێـوان حـیزبی دێموکراتی کوردستان‌و گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بپارێزن‌و بەهێزتری بکەن.

لـە مێـژووی خـەباتی رزگاریخوازانـەی گـەلانی زۆرلێکـراوی جێـهان‌دا زۆر کـەم هەڵکەوتووە حیزبێك بەو رادەیە جێگای باوەڕو خۆشەویستیی کۆمەلانی خـەڵك بـێ‌و بەو جۆرە هێزی بێ‌پایانی گەلی لە پشت بێ. ئەو پشتیوانی‌یەی گەلی کورد لە حیزبی ئێمە دەی‌کا پشتیوانی‌یەکی زۆر گەورەو شانسێکی بەنرخە کە بەدەگمەن بۆ حیزبێکی سیاسی رێك دەکەوێ. نابێ رێگـا بدەیـن ئـەو رێـزو خۆشەویسـتی‌یەی گـەلی کـورد بەرامبەر بە حیزبەکەمان کەم بێتەوە. دەبێ بە هـەموو توانـا پشـتیوانی خـەڵك لـە حیزبەکەمان کە هۆی ئەساسی سەرکەوتنمانە، بپارێزین.

هیچ گومان لەوەدا نیە ئەگەر لە دواڕۆژیش‌دا هەروەك جاران‌و تەنانەت باشـتریش لـە خزمـەتی گەلەکـەمان‌دا بـین، ئەگـەر قـازانج‌و ئامـانجی گـەلی کـورد رێنوێـن‌و رێ‌نیشاندەرمان بێ، ئەگەر پێوەندی خۆمان لەگەڵ خەڵکی کوردستان پتەوتر بکـەین‌و بەفیداکاری‌و لـەخۆبردوویی لـە رێگـای چارەسـەری گیروگرفتـەکانیان‌دا تێبکۆشـین‌و ئەگەر سیاسەت‌و دروشمەکانمان هەروەك جاران ئاوێنەی بـاڵانوێنی داخـوازە رەواکـانی

خەڵکی کوردستان بن، کۆمەڵانی گەلی کورد هەروەك رابردوو زیاتریش پشتی حیزبەکەمان دەگرن.

لەوەشدا گومان نیە کە هەر هێزێکی سیاسی بتوانێ سەرنج و پشتیوانی زۆربەی رۆڵەکانی گەل بۆ لای خۆی رابکێشێ، دەبێتە جێگای رێزو خۆشەویستی هەموو هێزە پێشکەوتووەکانو تەواوی شەخسییەتە نیشتمانپەروەرەکانی ژوورەوەو دەرەوەی وڵاتو دۆستو لایەنگری زۆری دەبێ. حیزبێکیش سیاسەتەکانی راست بێو داخوازەکانی رەوا بێو کۆمەڵانی خەڵك پشتیوانی بنو هێزە دێموکراتو پێشکەوتنخوازەکانی جیهانو بیروڕای گشتیی مرۆڤایەتیی پێشکەوتووی لە پشت بێ، سەرکەوتنی مسۆگەرەو شکانو بەچۆکدا هاتنی بۆ نیە.

بۆ دابینکردنی شەرتەکانی سەرکەوتن تەنیا یەك رێگامان لە پێشە، ئەویش بریتییە لەوەی ئەرکەکانمان باش بناسینو بە چەشنێکی شێلگیرو بێوچان لە پێناوی وەدیهێنانیاندا خەبات بکەین. ئەرکە ئەساسییەکانی حیزبی ئێمە لە قۆناغی ئێستای خەباتدا ئەمانەن:

١ـ هەروەك لە پێشەوە گوتمان، بەداخەوە تا ئێستاش تەشکیلاتی حیزبی ئێمە نەگەیشتۆتە ئەو رادەیە کە وەڵامدەری ئەو مەسئوولییەتانە بێ کە قۆناغی ئێستای خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران خستوونیەتە سەرشانی. هەرچەند بەبێ خۆهەڵکێشان دەتوانین بڵێین حیزبی ئێمە یەکێك لە بەهێزترینو رێکوپێکترین حیزبو رێکخراوە سیاسییەکانی ئێرانە، بەڵام دەتوانین قەبووڵ بکەین کە هێشتا زۆرمان ماوە بگەینە ئەو جێگایە کە پێویستەو هێشتاش نوقتە زەعفی هەرە ئەساسیمان تەشکیلاتە، کەوابوو گرنگترین ئەرکی ئێمە لە دوای کۆنگرەش هەروەك جاران پەرەپێدانی تەشکیلاتی حیزبو بەرەوژوور بردنی پلەی تێگەیشتنی سیاسی کادرو ئەندامانو لایەنگرانی حیزبەکەمانە.

٢ـ بەرەو پێشبردنو پەرەپێدانی کاری تەبلیغاتی یەکی دیکە لە ئەرکە گرنگەکانی حیزبی ئێمە لە قۆناغی ئێستا دایە. لە رێگای تەبلیغاتەوەیە کە حیزب دەتوانێ بیروباوەڕو سیاسەتو دروشمەکانی خۆی بەرێتە نێو خەڵك، پشتیوانی کۆمەڵانی گەل بۆ لای خۆی رابکێشێ، پڕوپاگەندەی ژەهراویی دوژمن بەرپەرچ

بداتەوەو لە ئاکامدا بیروباوەڕی خۆی وەها بەرێتە نێو کۆمەڵانی خەڵك کە ببێتە هێزێکی ماددیی تواناو گەورەترین سەرکەوتنەکان مسۆگەر بکا.

٣ـ هەوڵدان بۆ خودکەفایی لە مەسەلەی ماڵیدا، یەکی دیکە لەو ئەرکە پیرۆزانەیە کە دوای کۆنگرەی پێنجەم دەکەونە سەرشانی ڕێبەرایەتیو هەموو ئورگانەکانی حیزب. مەبەست لە خودکەفایی ئەوەیە کە هەموو خەرجو دەرچوونی حیزب لە تەنیا سەرچاوەی داهاتی حیزبی وەك هەقی ئەندامەتیو یارمەتی ئەندامانو لایەنگرانو دۆستانی حیزبو داهاتی بنکەکانی حیزبی دابین بکریو هەموو جۆرە داهاتێکی دیکە تەنیا بە عامیلێکی یادریدەدەر دابنرێ.

٤ـ بەرەوژووربردنی لێوەشاوەیی خەباتگێڕانی هێزی پێشمەرگە لەبارەی "چەندیو چۆنیو کەمیو کەیفی"یەوە، بەشێکی دیکە لە ئەرکە گرنگەکانی حیزبی ئێمە پێك دێنێ. ڕێبەرایەتی تازەی حیزب دەبێ بە هەموو تواناوە بۆ باشترکردنی باری سیاسی، نیزامیو تەدارۆکاتی هێزی پێشمەرگە تێبکۆشێ. هەوڵ بدا کەرەستەو تەقەمەنی پێشمەرگە باشترو پتر بێ تا پێشمەرگەی کوردستان باشتر بتوانێ لە ئازادیو مەوجوودیەتی گەلەکەی دیفاع بکا. بە پێی توانا دەبێ یارمەتی پێشمەرگە زیاد بکریو بۆ باشترکردنی بەرگو پێڵاوو خواردنی پێشمەرگە هەوڵ بدرێ.

مەسەلەی زۆر گرنگ لە کاروباری پێشمەرگەدا بردنەسەری پلەی زانستی - سیاسی پێشمەرگەکانە. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ لە پێشدا هەوڵ بدرێ پێشمەرگە نەخوێندەوارەکان فێری نووسینو خوێندنەوە بکرێن. بەڕاستی جێگای داخە لە پەلێکی پێشمەرگەدا چەند پێشمەرگەیەکی دیپلۆمەمان هەبێو ماوەیەکی زۆریش بمێننەوە، بەڵام ئەو پەلە دیسان پێشمەرگەی نەخوێندەواری تێدا مابێ.

بۆ ڕاگەیشتن بە فێرکردنی سیاسیی پێشمەرگەکان، بۆ ڕێکخستنی کاری خوێندەوارکردنیان پێشنیار دەکرێ، هەر نەبێ بۆ هەر دەستەیەکی پەنجا کەسی پێشمەرگە، کادرێکی سیاسی دیاری بکرێ کە تەواوی وەختی خۆی لەگەڵ پێشمەرگەکان بەسەر بەرێو ئەم ئەرکە گرنگە وەئەستۆ بگرێ.

٥ـ بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵایەتیو خزمەتی باشتر بە خەڵکی کوردستان پێویستە بەزوویی شوورا گەلییەکان لە هەموو ناوچەو دێو شارەو شارەدێیەکی ڕزگارکراو دابمەزرێنو کاروباری نێوخۆی کوردستانیان بدرێتە دەست. بۆ ئەوەش کە

شووراکانی هەڵبژێراوی خەڵك هێزێکی ئیجرایی لە پشت خۆیان هەست پێ بکەن، پێویستە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە جیددی هاوکارییان لەگەڵ بکا.

٦ـ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی زەوی‌و زار بەو جۆرە لە پێشەوە باسمان کردو لە بەرنامەی حیزبدا هاتوە، وەك ئەرکێکی فەوری لەسەر شانی ڕێکخراوەکانی حیزبی ئێمەیە. پێویستە لە هەموو ئیمکاناتی حیزبەکەمان بۆ یارمەتی بە جووتیارانی زەحمەتکێش کە هێزی ئەساسیی بزووتنەوەی میللی ـ دێموکراتی گەلی کوردن، کەڵك وەربگرین‌و بە پێی توانا ژیانێکی باشتریان بۆ دابین بکەین.

٧ـ ئێستا کە ڕێژیمی خومەینی خەڵکی کوردستانی لە هەموو پێداویستی‌یەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بێبەش کردوە، ئەرکی سەرشانی حیزبی ئێمەیە کە بۆ پەرەپێدانی فەرهەنگو برەوپێدانی ڕێوشوێنی لەشساغی بە پێی توانا هەوڵ بدا. ئەوە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە کە دەبێ لە خەمی دوارۆژی منداڵانی کوردستاندا بێ، حیزبی ئێمەیە کە دەبێ ڕێوشوێن‌و ئوسووڵی لەشساغی فێری خەڵك بکاو حیزبی ئێمەیە کە پێویستە یارمەتی هونەرمەندانی کورد بدا بۆ ئەوەی بتوانن خزمەتی هونەرو موسیقاو فولکلۆری کوردی بکەن.

٨ـ هاوکاری‌و هەنگاو ڕێکخستن لەگەڵ هێزە دێموکراتی‌و شۆڕشگێڕەکانی سەرانسەری ئێران، هۆیەکی کاریگەری سەرکەوتنی خەباتی گەلەکەمانە. هەربۆیەش هەوڵدان بۆ هاوکاری‌و هاودەنگی لەگەڵ هێزە شۆڕشگێڕەکانی ئێران تا دەگاتە رادەی پێکهێنانی بەرەی هاوبەش ئەرکێکی گرنگی سیاسی‌یە کە دەکەوێتە ئەستۆی ڕێبەرایەتیی هەڵبژێراوی کۆنگرەی پێنجەم.

٩ـ گەیاندنی دەنگی حەقخوازانەی گەلەکەمان بە گەلانی جیهان‌و بە مرۆڤایەتی پێشکەوتوو، ناساندنی قارەمانەتیی پێشمەرگەکانی کوردستان بە بیروڕای گشتیی خەڵکی دنیاو ڕاکێشانی یارمەتی‌و پشتیوانی ڕێکخراوە بەشەردۆستە نێونەتەوەیی‌یەکان بۆ لای خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران‌و هەموو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی خەڵکی ئێران، یەکێکی دیکە لەو ئەرکە پیرۆزانەیە کە ڕێبەرایەتیی هەڵبژێراوی کۆنگرەی پێنجەم پێویستە بە هەموو تواناوە بۆ بەجێ گەیاندنی تێبکۆشێ.

خۆشك‌و برایانی خۆشەویست!

بێگومان گرنگترینو پێویستترین ئەرکی گشت گەلانی ئێرانو بەتایبەتی هێزە شۆڕشگێڕو ئازادیخوازەکانو یەك لەوان حیزبی ئێمە کە لە ریزی پێشەوەی خەبات دایە، لە هەلومەرجی ئێستادا رووخاندنی رێژیمی زۆردارو کۆنەپەرستی خومەینی‌یە. ئێستا لە شوورای نیشتمانی بەرگری‌دا باشترینو خەباتگێڕترین رێکخراوە رەسەنە شۆڕشگێڕەکان کۆبوونەتەوە، بەرنامەی دەولەتی کاتی دەبێ وەك بەدیلێك جێگای رێژیمی خومەینی بگرێتەوەو لەسەر یەك بەرنامەیەکی روونو دێموکراتی‌یەو دێموکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستانیش دابین دەکا.

شێوەی خەباتی چەکدارانە وەك شێوەی هەرە ئەساسیی خەبات لەلایەن بەنفووزترین رێکخراوە سیاسی‌یەکانەوە وەك حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانو سازمانی موجاهیدینی خەلق دیاری کراوە. بەڕاستیش رێژیمی دیکتاتۆریی خومەینی هیچ رێگایەکی خەباتی قانوونیو ئاشتیخوازانەی نەهێشتۆتەوەو خەباتی چەکدارانە بە زۆر بەسەر شۆڕشگێڕەکانی سەرانسەری ئێران‌دا سەپاوە.

ئێستا دروشمی "بروخێ رێژیمی خومەینی" نەك هەر دروشمی هێزە پێشکەوتنخوازو شۆڕشگێڕەکانە، بەڵکوو زۆربەی زۆری خەڵکی ئێران لەم دروشمە پشتیوانی دەکەن. هێزی رەسەنو شۆڕشێگێڕ لەگەڵ دەستەو تاقمی ئانارشیست کە کاریان تەنیا رووخاندنە، جیاوازیی هەیە، بۆیە هێزە شۆڕشگێڕەکانی ئێران نەك هەر دەیانهەوێ رێژیمی خومەینی بڕوخێنن، بەڵکوو دەیانهەوێ رێژیمێکی دێموکراتی لە جێگای‌دا دابنێن. کەوابوو ئەم هێزانە تەنیا نالێن بروخێ رێژیمی زۆرداری خومەینی، بەڵکوو دەشلێن، "بژی رێژیمێکی دێموکراتی هەڵقولاو لە نێو جەرگەی کۆمەڵانی خەڵکەوە." بەم جۆرە ئاسۆی خەبات روونە. ئەرکی هەرە پێویستیش دیارە کە روخاندنی رێژیمی خومەینیو هێنانە سەرکاری رێژیمێکی دێموکراتی‌یە لە رێگای خەباتی چەکدارانەوە.

بە بیروڕای ئێمە هەروەك لەم راپۆرتەدا هاتوە، هەموو هەلومەرجێك بۆ ڕووخاندنی رێژیمی ئامادە بوە. ئێمە دڵنیاین کە یەکیەتیی کردەوەو هاودەنگیی نێوان هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ئێران دەتوانێو دەبێ رێژیمی خوێنمژی خومەینی برۆخێنێ. حیزبی ئێمە لەو رێگایەداو هەروەها لە رێگای دامەزراندنی رێژیمی دێموکراتی لە دوارۆژدا ئامادەیە لەگەڵ تەواوی هێزەکانی بەڕاستی شۆڕشگێڕو مەسئوول هاوکاری

بکاو ئەرکی خۆی بە لێوەشاوەیی بەجێ بگەیەنێ. بەڵام ڕێگا بدەن جارێکی دیکە ئەو ڕاستی‌یە دووپات بکەینەوە کە حیزبی ئێمە لە هیچ هەلومەرجێکدا ئامادە نیە لەگەڵ دەستەو تاقمی سەڵتەنەتخوازەکان‌و لەگەڵ ئەوانەی لە ڕابردوودا هاوکاریی ڕێژیمی پاشایەتی‌یان کردوە، هاوکاری بکا.

لە کۆتایی‌دا جارێکی دیکە بەخێرهاتنتان دەکەین‌و سەرکەوتنتان بۆ بەئاوات دەخوازین. هیوادارین چالاکانە لە باس‌و لێکۆڵینەوەکانی کۆنگرەدا بەشدار بن‌و ئەم کۆنگرەیە بتوانێ بڕیاری زۆر بە کەڵك‌و بە قازانجی گەلی کورد و بزووتنەوەی دێموکراتی‌و دژی ئیمپریالیستی گەلانی ئێران دەربکا.

سەرکەوێ کۆنگرەی پێنجەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران (کۆنگرەی شەهیدان)

سڵاو لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێنوێنی خەباتی حەقخوازانەی خەڵکی کوردستان

سڵاو لە شەهیدانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

سڵاو لە گەلی قارەمانی کورد و هەموو گەلانی خەباتگێڕی ئێران

سڵاو لە پێشمەرگەی کوردستان خۆبەختکەری ڕێگای ئازادیی کوردستان‌و سەرانسەری ئێران

سڵاو لە هێزە دێموکراتی‌و دژی ئیمپریالیستەکانی سەرانسەری ئێران

## پەیامی سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکرات بە بۆنەی پێکهاتنی میتینگێك لە شاری مەهاباد*

**هاونیشتمانانی بەڕێز!**
**میوانانی خۆشەویست!**
**خەڵکی بەشەرەفو شۆڕشگێری مەهاباد!**
**هاوڕێیانی تێکۆشەر!**

ڕێگام بدەن بە ناوی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە بەخێرهاتنێکی گەرمتان لێ بکەمو بەختیاریو دڵخۆشی خۆمو هاوڕێیانم لە پێك هاتنی ئەم کۆبوونەوە مەزنو مێژوویی‌یە دەربڕم. سوپاسی هەموو خوشكو برایانی خۆشەویستو میوانانی بەڕێز دەکەم کە زەحمەتیان کێشاوەو لە شارەکانی دوورو نیزیکی کوردستانو ئێرانەوە بۆ بەشدار بوون لەم میتینگەدا لێرە ئامادە بوون. هەروەها سوپاسی دانیشتوانی مەهابادی قارەمان دەکەم کە هەم بە بەشداری‌یان لەم کۆبوونەوەداو هەم بە میوانداری‌یان ئیمکانی تەشکیلی ئەم میتینگەیان پێك هێنا.

سڵاو لە یادی شەهیدانی ڕێگای ئازادی ئێرانو گەلی کورد کە بە خوێنی گەشی خۆیان ئەم ڕۆژە پیرۆزەیان بۆ ئێمە ئامادە کرد. سڵاو لە گیانی پاکی هەموو ڕۆڵە بەشەرەفەکانی گەل کە لە ساڵانی ڕەشی ئیستبدادی پاشایەتی‌دا نیشانەی بەرزی فیداکاریو ئینسانییەت، نیشانەی زیندووبوونی گەلو سەمبولی درێژە پێدانی

---

* ئەم پەیامە لە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارەی ٥٤ لە مانگی ڕەشەمەی ١٣٥٧دا بڵاو کراوەتەوە.

خەبات‌و تێکۆشانی نیشتمانەکەمان بوون. سڵاو لەو قارەمانانە کە لە زیندان‌و لە ژێر ئەشکەنجەدا بە ئامانجی حیزب‌و گەلەکەیان وەفادار مان‌و بەرامبەر بە دوژمنی زۆردار ئازایانە راوەستان‌و بەرەبەرەکانێیان کرد. سڵاو لەو شۆڕشگێڕانە کە ساڵەهای ساڵ لە نیشتمان‌و کەس‌و کاریان دوور بوون، بەڵام هەرگیز مەیدانی خەباتیان بەجێ نەهێشت. سڵاو لە زەحمەتکێشان، کرێکاران‌و جووتیارانی کوردستان کە هێزی ئەساسیی شۆڕشی سەرانسەری ئێران‌و ئێستاش زامنی ئەسڵیی پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆڕشن. سڵاو لە رووناکبیرانی شۆڕشگێڕ، خوێندکاران، مامۆستایان‌و کارمەندان کە شانبەشانی زەحمەتکێشان لە خەبات‌و تێکۆشانن بۆ دابین کردنی داخوازە سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌یەکانی گەل درێغی‌یان نەکردوە. سڵاو لە بازاڕی‌یان کە لەو شۆڕشە بەرینەدا بە هەموو توانایانەوە بەشدار بوون. سڵاو لە عەشیرەتە نیشتمان پەروەرەکان کە بە یەکگرتوویی‌و تێکۆشان پشتیوانی شۆڕش بوون‌و ئێستاش رێگا بە دوژمنانی شورشی ئێران نادەن کە دووبەرەکی‌و ناکۆکی بخەنە نێو گەلی کوردەوە. سڵاو لە ژنانی کوردستان کە لە ماوەی شۆڕش‌دا ئەرکێکی زۆر قورسی نیشتمانی‌یان لە سەر شان بوو. سڵاو لە پیاوە ئایینی‌یە پێشکەوتووەکانی کوردستان کە لە هەموو تەنگ‌و چەڵەمەیەکی خەباتدا هەر لە سەنگەری کۆمەڵانی خەڵکدا بوون. سڵاو لە سەربازو دەرەجەدارو ئەفسەرە شۆڕشگێڕەکان کە بە هاوکاریی هێزە دێموکراتەکان لە بەرپا کردنی شۆڕشی ئێراندا نەخشێکی بەرچاویان هەبوو.

سڵاو لە پێشمەرگەکانی کورد کە پارێزەری ئاسایشی خەڵک‌و دەسکەوتەکانی شۆڕش لە کوردستان‌دان. سڵاو لە برایانی فارس، ئازەربایجانی، بەلووچ، تورکەمەن، ئاسۆری، ئەرمەنی‌و کەلیمی‌و هاوخەباتانی ئێمە لە شۆڕشی ئێراندا.

**هاونیشتمانان!**

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، حیزبی خۆشەویستی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، پاش ٣٢ ساڵ خەباتی نهێنی، ئەمڕۆ تێکۆشانی ئاشکرای خۆی دەست پێ دەکا. لە ماوەی ساڵانی تێکۆشانی نهێنی‌دا، ئەندامانی حیزبی ئێمە چ فیداکاری‌یەك کە نەیان کردووە چ زەحمەتێك کە نەیان کێشاوە، چ تەنگ‌و چەڵەمەیەك کە تووشی نەبوون. حیزبی دێموکراتی کوردستان شەهیدی زۆری داوە، زیندانی زۆری بووە، ئەندامان‌و لایەنگرانی بەدبەختی‌و کوێرەوەری‌یان زۆر دیوە، بەڵام حیزبی ئێمە بە

پشتیوانیی خەڵك رێگای خەباتی بەرنەداوەو ئێستا سەربەرزو دڵنیا لە هێزی خۆیو هێزی بێ پایانی گەل بەرامبەر بە کۆمەڵانی (خەڵك) راوەستاوەو پەیمان تازە دەکاتەوە کە لە دوارۆژیشدا بۆ دابینکردنی مافی نەتەوایەتی گەلی کورد (...) بە هەق هەرچاوەڕوانی ئەوەیە لە حیزبی دێموکراتی کوردستان کە حیزبی پێشەوا قازیو شەهیدانی چوارچرایە، حیزبی شەهیدانی فەیزوڵلابەگی، مەلائاوارە، برایانی موعینی، شەریفزادە، مەحموودی زەنگەنە، نحۆ، وێردی، حیزبی عەزیزی یووسفیو سەدان شەهیدی کرماشانو سنەو سەقزو سەدان زیندانیی قارەمانی هەموو ناوچەکانی کوردستان. حیزبی دێموکراتی کوردستان پێکهێنەری کۆماری مەهاباد یەکەم حکوومەتی گەلی کورد لە مێژووی نوێی کوردستاندایە یادی ئەو کۆمارە، سەرکەوتنەکانو دەسکەوتەکانی، ئێستاش لە دڵی کۆمەڵانی خەڵکدا هەر زیندووە.

حیزبی دێموکراتی کوردستان حیزبی راپەڕینی چەکداریی ساڵەکانی ٤٧ ـ ١٣٤٦، کە بە سەرکردەیی کومیتەی شۆڕشگێڕی حیزب هەتا دوا هەناسەو هەتا شەهید بوون، دیفاعیان لە گەلو ئامانجەکانی حیزب کرد. حیزبی ئێمە لە ماوەی ٢٥ ساڵ دیکتاتۆریی رەشی حەمەرەزا شادا، لە دیفاع لە مافی گەلی کوردو لە قازانجە ئابووریو کۆمەڵایەتی‌یەکانی زەحمەتکێشانی کوردستان درێغیی نەکردووەو ئەندامانو لایەنگرانی هەمیشە لە ریزەکانی پێشەوەی خەباتدا بوون.

**هاونیشتمانان!**

حیزبی ئێمە لە سەرەتاوە لە شۆڕشی سەرانسەری ئێراندا بە رابەرایەتی ئیمام خومەینی بەشدار بوو و هەموو هێزو ئیمکاناتی خۆی لە پێناوی ئامانجی گشتیی گەلانی ئێران، یانی رووخاندنی رێژیمی نگریسی شاهەنشاهی دانا.

ئەوە رێژیمی زۆرداری شاهەنشاهی رووخاوەو شۆڕشی بەرینی خەڵك لە سەرانسەری ئێراندا سەرکەوتووە.

کۆمەڵانی خەڵك بە هێزو یەکگرتوویی خۆیان بە شێوەیەکی نەدیتراو لە مێژوودا، شوڕشێکی ئەفسانەیی‌یان بەرپا کردوە. هەر بۆیە ئێمەش دەتوانین لە مەهابادی خۆشەویستدا کە هیچ بنکەیەکی رێژیمی کۆنەپەرستی پێشووی (تێدا) نەماوە، بە ئازادی تێکۆشانی ئاشکرای حیزبی دێموکراتی کوردستان رابگەیەنین. ئەوە سەرکەوتنێکی گرنگو مێژوویی‌یە کە دەبێ رێزی بۆ دابنێینو بیپارێزین. بەڵام نابێ

وشیاریو وریایی خۆمان لە دەست بدەین. دوژمنانی شۆڕش، ئیمپریالیزم، کۆنەپەرستی بە تەواوی سەریان دانەنواندوەو بە تەواوی تەسلیم نەبوون. زۆر هێزی وەفادار بە ڕێژیمی شا لە ناوچەکانی کوردستانو لە سەرانسەری ئێراندا ماون کە دەبێ تەفرو توونا بکرێن. هەموو پێکەوە دەبێ تێبکۆشین جارێکی دیکە ڕێژیمی شاو هەر چەشنە ئیستیبدادێکی دیکە زیندوو نەبێتەوە.

پاراستنی ئازادییە دێموکراتییەکانو دامەزراندنی ڕێژیمێکی دێموکراتیی ڕاستەقینە لە سەرانسەری ئێراندا دەستەبەری سەرەکی بەرەو پێشچوونی شۆڕشو وەدەستهێنانی مافی ڕەوای نەتەوایەتیی گەلەکەمانە.

بێ ڕێژیمێکی دێموکراتی ڕاستەقینە مافی گەلی کورد بە تەواوی دابین ناکرێو بە بێ دابین کردنی مافی نەتەوایەتیی گەلی کورد ڕێژیمێکی دێموکراتی تا سەر پێک نایە. گەلی کورد هەروەك چالاكانە لە شۆڕشی ئێراندا بەشدار بووە، ئێستاش بۆ قووڵ کردنی ئەم شۆڕشەو بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆڕش ئامادەیە. گەلی کورد چاوەڕوانی ئەوەیە کە ڕابەری شۆڕش، ئیمام خومەینی بە ئاشکرا دیفاع لە مافە نەتەوایەتییەکانی هەموو گەلانی ئێران بکا. مافی نەتەوایەتی هەر وەك مافی ئازادی، مافێکی ئینسانیی هەرەبنەڕەتییە. شۆڕشی ئێران کە بۆ وەدەست هێنانی هەموو مافەکانی ئینسانی خەڵکی ئێران بەرپا بووە، زۆر مەنتقیو پێویستە کە مافی گەلانی ئێران لە دانانی چارەنووسی خۆیاندا بە ڕەسمی بناسێ، بۆیە پێویستە دەوڵەتی شۆڕشگێڕی مەهدی بازرگان هەڵوێستی بەرامبەر بە مەسەلەی نەتەوایەتی کە یەکێك لە گیروگرفتەکانی هەرە ئەساسی شۆڕشە بە ئاشکراو بێ وچان ڕابگەیەنێ. گەلی کورد وەك هەموو گەلانی دیکەی ئێران هەقی هەیە بە ڕەسمی پێی بگوترێ کە ستەمی نەتەوایەتی، میراتی شوومی ڕێژیمی کۆنەپەرستی شا لەنێو دەچێو شوێنەواری نامێنێ. دەبێ نوێنەرانی کورد لە مەجلیسی موئەسیسانداو لە دانانی قانوونی ئەساسیی تازەی ئێراندا بەشدار بن تا بتوانن مافی گەلانی ئێرانو گەلی کورد لەم قانوونەدا بگونجێنن. تاوانبار کردنی گەلی کورد بە جیاوازی خوازی ( تجزیه طلبی) گۆرانییەکی کۆنە کە هەر وەختێك گەلی کورد داوای مافی خوراوی خۆی کردوە، ئەم تاوانەیان بە سەردا بڕیوە. ئێمە لە کاتێکدا کە ئەم تاوانە بە نەخشەی دوژمنی شۆڕش دەزانینو بە تەواوی ڕەتی دەکەینەوە، ڕادەگەیەنین کە لە سەرانسەری

کوردستانی ئێراندا هیچ هێزێکی سیاسیی جیاوازیخواز نیەو گەلی کورد بە تێکڕایی داوای مافی نەتەوایەتی خۆی لە چوارچێوەی ئێراندا دەکا.

ئەگەر دوژمنانی شۆڕشی ئێران‌و گەلی کورد پێیان وایە کە بە ساز کردنی تاوانی جیاوازی خوازی دەتوانن گەلی کورد ناچار بکەن حاڵەتی دیفاع بە خۆیەوە بگرێ‌و داوای مافی ڕەوای خۆی نەکا، زۆر بە هەڵە چوون.

ئێمە مافی دانانی چارەنووسی خۆمان دەوێ‌و بۆ ئەم مافە بە هەموو هێزمانەوە تێدەکۆشین. دەمانەوی لەو میتینگە گەورەیەدا رابگەیەنین کە هەر وەك بە درێژایی مێژوو گەلی کورد نیشانی داوە، ئێستاش شان بە شانی گەلانی دیکەی ئێران پارێزەری سنوورەکانی ئێران‌و ئازادی‌و سەربەخۆیی ئێرانە، بەرامبەر بە هەموو دەستدرێژی‌یەك لە هەر لایەکەوە بێ، بە هەموو هێزیەوە بەربەرەکانێ دەکا.

**هاونیشتمانانی خۆشەویست!**

حیزبی دێموکراتی کوردستان لەو بڕوایە دایە کە لە کۆمەڵی ئەمڕۆی کوردەواری‌دا ئیمکانی ئەوە هەیە کە یەکیەتیەکی پتەوو نەدیتراو لە نێو هەموو چین‌و توێژەکانی گەل، کرێکاران، جووتیاران، ووناکبیران، بازاڕیان‌و عەشیرەتە نیشتمانپەروەرەکاندا پێك بێ، یەکیەتیی ئەوانەو تێکۆشانیان لە پێناوی داخوازەکانی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەلایەتیی هەموو دانیشتوانی کوردستاندا، هێزێکی ئەوتۆیە کە هەموو کەس دەبێ حیسابی لە سەر بکا.

حیزبی ئێمە هەموو ئەو هێزە سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌یانە کە لە کوردستانی ئێران‌و لە ئێراندا دژی ئێمە ڕاناوەستن‌و دوژمنایەتی‌یان لەگەڵ ناکرێ، بە دۆستی خۆی دەزانێ. سیاسەتی ئێمە ئەوە نیە کە هەر کەس دۆستمان نەبێ دوژمنمانە بەڵکو ئەوەیە کە هەر کەس دوژمنمان نەبوو دۆستمانە.

حیزبی دێموکراتی کوردستان ئیمانێکی قووڵی بە دێموکراسی هەیەو ئامادەیە هاوکاری لەگەڵ هەموو حیزب‌و دەستەیەکی سیاسی لە سەرانسەری ئێران‌و ناوچەی کوردستاندا بکا. ئێمە لە کانگای دڵەوە دەڵێین کە زۆر نوقتەی هاوبەش هەیە کە لە سەریان دەتوانین لەگەڵ هەموو هێزەکانی نیشتمانی‌و پێشکەوتوو هاوکاری بکەین.

١ ـ دامەزراندنی جمهوریی دێموکراتی لە ئێراندا.

٢ ـ دابینکردنی مافی خودموختاریی هەموو گەلانی ئێران لە چوارچێوەی ولآتدا.

٣ ـ دابینکردنی ئازادیيە دێموکراتیيەکان بۆ هەموو حیزبو دەستەیەکی سیاسیی نیشتمانی بێ جیاوازی.

٤ـ دارِشتنی سیاسەتێکی ئابووری بۆ پاراستنی قازانجی خەڵكو بەرز کردنی پایەی ژیانی زەحمەتکێشان.

٥ ـ چارەسەرکردنی گیروگرفتی زەوی بە قازانجی جووتیارانی هەژارو نێوەنجی، زەوی دەبێ بدرێ بەو کەسە کە دەیکێڵێ.

٦ ـ مەحدوود کرنی سەعاتی کاری هەفتەیی کرێکارانو دابینکردنی بیمەی کۆمەڵایەتی بۆ هەموو کرێکارانو زەحمەتکێشان.

٧ ـ لەنێو بردنی نەخوێندەواریو بەرز کردنی پایەی فەرهەنگیی کۆمەڵانی ئێران لە سەر بناخەی پەرەپێدانی زمانی زگماکیی هەموو نەتەوەیەك .

٨ ـ دوایی هێنان بە نفووزی ئیمپریالیزمو هاتنە دەر لە پەیمانەکانی نیزامیو گرتنە پێشی سیاسەتێکی سەربەخۆی دەرەوە.

٩ ـ هاودەردیو لایەنگری هەموو جوولآنەوەکانی رزگاریخوازیو پشتگرتنی دانانی چارەنووسی نەتەوەکان بە دەست خۆیان.

١٠ ـ دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ هەموو ولآتێك لە سەر ئەساسی رێزگرتنی یەکترو ناسینی حاکمییەتی نەتەوایەتیو دەست تێوەرنەدان لەکاروباری ناوەوەی یەکترو پێکهێنانی پێوەندی دۆستایەتیو هاوکاری لەگەڵ ولآتانی سۆسیالیستیو دژی ئیمپریالیستی.

ئێستا کە لە ئێراندا هەلومەرجێکی شۆرِشگێرِی پێكهاتوە، پێمان خۆشە رابگەیەنین کە دەوڵەتی شورِشگێرِی مەرکەزی نابێ هەوڵ بدا ژاندارمریو شارەوانی بە شێوەی پێشوو لە کوردستانو لە سەرانسەری ئێراندا زیندوو بکاتەوە.

هەڵسووراندنی کاروباری نێوخۆی کوردستان دەبێ بە دەست خەڵکی کوردستانەوە بێو هێزی ئیجرایی نێوخۆ دەبێ پێرِەوی لە شووراکانی ئینقلابی بکا کە لە شارو دێ پێك هاتوون.

لە سەر ئەرتەش نەزەرمان ئەوەیە کە ئەرتەشی کۆنەپەرستی شاهەنشاهی دەبێ هەڵوەشێ و لە جێگای ئەو ئەرتەشی گەلی کە برای خەڵکیو تەنیا ئەرکی دیفاع لە سنوورەکانی وڵات بێ، دابمەزرێ. لە دوارۆژدا نابێ رێگا بدرێ ئەرتەش دەستدرێژی بۆ سەر خەڵك بکاو ببێ بە گۆپاڵی دەست بۆ سەرکوت کردنی جووڵانەوەی خەڵك. کوردستانی ئێران دەبێ لە حاڵەتی ناوچەیەکی میلیتاریزە (نیزامی کراو) بێتە دەرو ئەو پادگانانە کە بۆ دیفاع پێویستن دەبێ نێزیك سنوور بن نەك لە نێو شارەکانی کوردستاندا.

**خوشكو برا بەرێزەکان!**

شۆڕشی ئێران هەتا ئێستا هەنگاوی گەورەی هەڵێناوە بەڵام رێگایەکی دووری لە بەرە. بۆ ئەوەی سەرکەوتنی تازە وەدەست بێنین، یەکیەتیو خۆ رێکخستنمان پێویستە نابێ رێگا بدەین دوژمن لەنێوماندا رەخنە بکاو دووبەرەکیو ناکۆکی پێك بێنێ. نابێ رێگا بدەین هیچ چینو توێژێکی نیشتمانی دژی چینو توێژێکی نیشتمانی دیکە، عەشیرە دژی عەشیرەتێکی دیکە هان بدرێ. نابێ ریگا بدەین دەستەو حیزبێکی سیاسیی پێشکەوتوو هێزی خۆی بۆ کوتانی دەستەو حیزبێکی سیاسیی پێشکەوتووی دیکە تەرخان بکا. با فێری دێموکراسی بینو تەمرینی دێموکراسی بکەین. کوردستان هەروەك هەموو ئێران پاوانی هیچ حیزبو دەستەیەکی سیاسیی تایبەتی نیە. با هەموومان بیروڕاو بەرنامەی خۆمان بخەینە بەر چاوی خەڵكو خەڵك ئازادانە رێو شوێنی خۆی هەڵبژێرێ. هەر چەشنە تیرۆرێکی فیکری دەبێ لە نێو بچێو هیچ کەس لەبەر بیرو باوەڕی خۆی نابێ بخرێتە ژێر فشار.

لە سەر دۆستانو لایەنگرانو ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستان پێویستە کە بیروڕاو بەرنامە دڵخوازەکانی حیزبی ئێمە لە نێو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستاندا بە شێوەیەکی دێموکراتی بڵاو بکەنەوەو پشتیوانی ئەوان بۆ لای حیزب رابکێشن لە سەر کادرەکانو ئەندامانی حیزبی ئێمەیە کە بە هەموو هێزیانەوە بۆ بووژاندنەوەو دامەزراندنەوەی رێکخراوەکانی حیزبی تێبکۆشنو هەرگیز نابێ لە بیریان بچی کە رێکخراو، کە تەشکیلات، چەکی هەرە گرنگی ئێمەیە. ئەو چەکەمان پێ بێ، هەموو قەڵاتێکمان پێ دەگیرێ.

**هاونیشتمانان، هاوڕێیان، میوانانی خۆشەویست!**

جارێکی دیکە بەخێر هاتن‌و پیرۆزباییتان لێ دەکەم. هیوام ئەوەیە کە گەلی کورد بە تێکۆشانی هەموو ڕۆڵە بەشەرەفەکانی‌یەوە، هەر بیرو باوەڕێکیان هەبێ، شان بە شانی گەلانی دیکەی ئێران لەم خەباتە مێژوویی‌یەدا سەرکەوێ با بەرهەمی خەباتی شێلگیرو یەکگرتووی ئێمە، جمهووری‌یەکی دێموکراتی راستەقینە بۆ ئێران‌و خودموختاری بۆ کوردستانی ئێران بێ.

بژی شۆڕشی سەرانسەریی گەلانی ئێران.

سەرکەوێ خەباتی یەکگرتووی کۆمەلانی خەلکی ئێران لە ڕێگای دێموکراسی‌و سەربەخۆیی ئێراندا.

سەرکەوێ خەباتی گەلی کورد لە ڕێگای خودموختاریی کوردستانی ئێراندا.

سلاو لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران حیزبی خۆشەویستی گەلی کورد.

١٣٥٧/١٢/١١

## وتاری هاوڕێ دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو لەسەر "فیلم"*

ئەوباسەمان دوو بەشی هەیە. لە بەشی یەکەمدا، من تێدەکۆشم ئەو مەسەلانە کە هەرە گرینگو ئەساسین بۆتان باس بکەم. لە بەشی دووهەمدا هاوڕێیان دەتوانن هەم پرسیار بکەن. لە پێشدا پرسیارەکانیان وەلام بدرێنەوەو هەم ئەگەر نەزەرێکیان هەیە دەتوانن نەزەری خۆشیان بڵێنو هەم ئەگەر پێشنیارێکیان هەیە دەتوانن پێشنیاری خۆشیان بڵێن.

لە پێشدا پێم خۆش بوو، باسی ئەوە بکەم کە بۆچی ئێمە پێمان وایە پێویستە... دەبێ فیلم هەڵگرین. ئەوە دوو هۆی ئەساسی هەیە. یەکەم ئەوە کە پێمان خۆشە حیزبەکەمان، کە ئەو هەموو ڕووداوەی تێدا هەیە، ئەو هەموو فیداکارییەی تێدا دەکرێ ئەو هەموو زەحمەتەی تێدا دەکێشرێ، بەڵگەکانی بۆ دوارۆژ بمێننەوە، خۆتان دەزانن کە هیچ بەڵگەیەك لە فیلم زیندووتر نیە. ڕەنگە بە نووسراو زۆر شتمان هەبێ یا بە قسە زۆر شت مابێ، ئەوانەی کە بە چاوی خۆیان شتەکە دەبینن دوایە بیگێڕنەوە بەڵام، هیچیان واقیعیترو باشتر لە فیلم نین. بەتایبەت کە ئێستا ئیمکانی تێکنیکی بۆ ئەوە پێك هاتوە. چونکە جاران بمانویستبا یەکێك فیلم هەڵبگرێ، هەر خۆشمان ئەوەمان کرد. چەند ساڵ لەوەو پێش دەبوایە دەزگایەکی فیلمبەرداری هەبێ. لە فیلمبەرداری بزانێ. دەزگاکەش زۆر قورس بوو بۆی هەڵنەدەگیرا، دەبوایە چەند کەس یارمەتی بدەن. ئەوە ئێستا بە خۆشییەوە لەبەر پێشچوونی تێکنیك وای لێ هاتوە کە دەزگایەکی چکۆلەیە، یەك نەفەر دەتوانێ هەڵیگرێو بۆخۆشی دەتوانێ

---

* ئەم وتارە لە ڕێکەوتی ١٣٦٨/٢/٢دا لە لایەن دوکتور قاسملوو [illegible]

کارەکانی بکا. یانی ئەو ئیمکانە لە واقیعدا پێك هاتوە. کە وابوو بەڵگە بۆ حیزبەکەمان، بۆ ئەوەی رابردووی حیزبەکەمان، ئێستای حیزبەکەمان کە لە دوارۆژدا دەبێتە رابردوو لەبیر نەچێ‌و بمێنێتەوە بۆ ئەو کەسانەی سبەینێ یان مێژووی حیزبەکەمان دەنووسن یا بۆ ئەو نەسڵانە کە لە دوارۆژدا پێمان خۆشە بزانن کە حیزب چی کردوە.

بۆخۆتان دەزانن کە مەسەلەن ئێمە زۆر بەڵگەیەکی کەممان هەیە لە زەمانی کۆماری مەهاباد. ئەوەی کە هەیە یەکجار زۆر کەمە، هەتا یەك فیلممان بۆ نموونە نیە. مەسەلەن ئێستا لێرە هەمووومان پێمان خۆش بوو کە فیلمێك هەبا هی دووی رێبەندان، رۆژی دووی رێبەندان، ئەوەڵی دووی رێبەندان کە لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد پێك هاتوە سەیرمان کردبا، چونکوو نوختەیەکی تاریخی‌یە لە ژیانی هەموو حیزبەکەمان‌و هەتا میللەتەکەشماندا، بەڵام نیە. هەر وا دەبێ بە عەکسێك کەفایەت بکەین یا مەسەلەن بەوە کە شتێك بوو لەوێ باس کراوەو نووسراوەو شتێکی لێ بەجێ ماوە، جا بۆیە رەنگە ئێمە بۆخۆمان ئەوەندە سەرنج نەدەینە سەر ئەو مەسەلەیە. ئێستا کە هێندێ شت روو دەدا بۆ دوارۆژ زۆر موهیمە. بەڵام هەر لەو دە ساڵەشدا ئەوەمان بۆ دەرکەوتوە، مەسەلەن ئێمە لە ئەو میتینگانەی کە هەمان بووە، چ لە شارەکانی کوردستان، چ هەتا لە گوندەکانی کوردستاندا زۆر کەم بەڵگەمان هەیە، بەداخەوە ئەوانی سەرەتایی فەرز دەکەین، ئێمە میتینگی زۆر گەورەمان هەبوو کە لە رۆژی ۱۱ی رەشەمە پێك هات لە مەهابادو بوو بە هۆی ئەوە کە ئێمە (خەباتی ئاشکرای) حیزبەکەمان راگەیاند. بۆ یەکەم جار پاش چەندین دە ساڵ کە حیزبەکەمان بۆتە حیزبێکی ئاشکرا، نزیك بە ۱۵۰هەزار کەس لەو میتینگەدا بەشدار بوون، بە دەیان نوێنەری رۆژنامەنووس‌و ئەوانە هاتبوون. فیلمیشیان لێ هەڵگرتوە هی دەرەوە، بەڵام بۆخۆمان هیچمان نیە بۆخۆمان هیچ فیلمێکمان بەدەستەوە نیە. رەنگە بە واسیتە بتوانین مەسەلەن لەوانەی لە ئەمریکاو لەوانی هاتبوون ئەو وەختە بۆ دوارۆژ شتێك وەربگرین، بەڵام بۆخۆمان هیچمان نیە. یەك نەفەرمان نەبووە فیلمێك هەڵبگرێ. یان بەڵگەیەکی ئەوتۆمان بۆ بمێنێتەوە، ئەوە بوو کە پاش کونگرەی پێنجەمەوە دیارە هەوڵمان داوە کە فیلم هەڵگرین، عەکس هەڵگرین بەتایبەتی لە رووداوە گرینگەکان‌و ئێستا پێمان خۆشە کە ئەو کارە

بە ڕێکوپێکی بکرێ. تەنیا کونگرە نەبێ بەڵکوو ژیانی پێشمەرگەی سادە، خەباتی پێشمەرگەی سادە، ژیانی خەڵکەکەمان، ئەوانەش هەموو خەباتی خەڵکەکەمان لەواقیعدا چ لە شارو چ لە گوندەکان، لەو بەڵگانەدا بن‌و بۆ دوارۆژ یانی بۆ تاریخ بمێنن. ئەوە یەك هۆی ئەساسییە. هۆی دووەمی کە ئەویش زۆر گرینگە، ئێمە یەکێك لە عەیبەکان یا ڕەخنەکان ئەو ڕەخنانەی کە دێتە سەرمان لە تێکۆشانی حیزبەکەماندا ئەوەیەو دەبێ قبووڵی بکەین وەك ئینسانێکی دێموکرات کە هێشتا نەمانتوانیوە ئەو خەباتەو ئەو فیداکاری‌یە ئەو گیانبازی‌یە کە ئەندام‌و کادرو پێشمەرگەکانی ئێمە لە نێوخۆی کوردستاندا دەیکەن نەمانتوانیوە بەو شێوەیە کە پێویستە لە دەرەوە مونعەکیسیان بکەین، بەو شێوەیە کە هەیە لە دەرەوە نیشانیان بدەین‌و ئەوە بە نەزەری ئێمە نەقسێکی گەورەیە. ئەمن زۆر جار گوتوومە بۆ ئەوەی کە خۆمان موقایەسە بکەین مەسەلەن ئێمەو سازمانی موجاهیدین لەواقیعدا فەرقمان ئەوەیە. هەر وا بزانن ئەوان دووکانێکی چکۆلووکەیان هەیە، وەك کوردی خۆمان دەڵێن دووکانی بەکرێ‌و دوو قالبە سابوون، بەڵام وا تەبلیغاتی بۆ دەکەن، خەڵك لە دەرەوە پێیان وایە سوپێرمارکێتیان هەیە، بەڵام ئێمە تەبلیغاتەکەمان ئەوەندە کزە لەو بارەوە خەڵك پێیان وایە دووکانی بەکرێ‌و دوو قاڵب سابوونە کە هی ئێمەیە.

لە دەرەوە زۆر گرینگە بۆ ئێمە بتوانین ئەوەی کە دەگوزەرێ نیشان بدەین. ڕەنگە بگوترێ باشە ئەوە خەبەرنیگاری دەرەوە دێن‌و بۆخۆشمان دەتوانین خەبەرەکان بنێرینە دەرێ، ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەوەی کە لە دەرەوە لە هەمووان مەرغووبترەو مەقبووڵترە هەر لە واقیعدا هەر تەسویرە، هەر فیلمە. چونکە ئێستا دونیای دەرەوە بەرەو ئەوەدەڕوا کە ئەو نەخشەی کە مەسەلەن تەلەفزیۆن هەیەتی لە ژیانی خەڵكدا هەتا لە پێکهێنانی بیرو ڕای گشتی‌دا، لە پەروەردەکردنی ئەفکاری خەڵك لە هەموو بارێکەوە نە ڕۆژنامە ئەو نەخشەی هەیە نە هەتا رادیۆ ئەو نەخشەی هەیە. ئێستا تلویزیون هەرچی تێکنیك دەچێتە پێشتر نەخشی زیاتر دەبێ. مەسەلەن ئێمە زەحمەتێکی بکێشین، کنفرانسێکی مەتبووعاتی ساز بکەین یان مەقالەیەکی دوورو درێژی زۆر باش بنووسین لەسەر کوردستان باشترین ڕۆژنامەی وڵاتەکەش سازی بکا، ئەوە زۆر زۆر بێ ڕەنگە، لە باشترین حاڵەتدا چەند سەد هەزار نەفەر بیخوێننەوە، بەڵام

تەسویرێکی تەلەفزیۆنی ٢ دەقیقە ٣ دەقیقەش بێ بەجارێك چەندین میلیۆن کەس تەماشای دەکاو خەڵك بەتایبەتی مەعموولی کە ئێمە پێمان خۆشە زیاتر شتەکەمان، خەبەرەکەمان، بەوان بگا. ئەوان زۆریان رۆژنامەی هەر ناخوێننەوە، ئینسانی سیاسی، ئینسانی شارەزا، ئینسانێك کە عەلاقەی بە سیاسەت هەیە ئەو شتانە دەخوێنێتەوە. بەڵام ئەوی دیکە هەر نایخوێنێتەوە، بەڵام تەلەویزیۆنە کە ئەخبارەکەی دەکاتەوە هەموو کەس تەماشای دەکا. هەموو کەس، کەوابوو مەسەلەی ئەوەیە کە بەڵگەی تەلەویزیۆنیمان هەبێ، فیلممان هەبێ کە لە دەرەوە چ لە سینەما، چ لە تەلەویزیۆن نیشان بدرێ ئەو بۆخۆی ئەهەمیەتێکی زۆری هەیە بۆ لەواقیعدا بۆ لەنێوبردنی ئەو رەخنەیە کە لەسەرمانە، کە بتوانین لە دوارۆژدا زۆر باشتر لە جاران خەبات و ژیانی خەڵکی خۆمان لە دەرەوە مونعەکیس بکەین. ئەوە دوو هۆی ئەساسییە. بەڵام هۆیەکی دیکەش هەیە کە پێمان خۆشە هەمان بێ، ئەویش ئەوەیە کە ئەو فیلمانە هەتا ئێستا بۆمان دەرکەوتوون دەگەڵ ئەوەی کە زۆر کەم فیلم هەڵگیراوە بە هەموو رەنگە ١٠ کاسێتمان نەبێ هەتا ئێستا، بەڵام خودی ئەوانە هێندێ شت بە ئێمە نیشان دەدەن کە زۆر جێی سەرنجن ئەویش ئەوەیە کە ئێمە وەك بەرپرسیاری ئەو حیزبە راستەوخۆ ئێستا ئیمکانمان نیە بچینە نێو خەڵك و هەموو ئەندامی دەفتەری سیاسی دەگەڵ پێشمەرگە بێ یان هەموو ئەندامی کومیتەی ناوەندی بەتایبەتی لەگەڵ پێشمەرگە بن بەتایبەتی لە جەرەیانی شەڕەکەو لە جەرەیانی عەمەلیاتدا، بەڵام ئەو فیلمانە زۆر باری موسبەتی ئەو عەمەلیاتە بە ئێمە نیشان دەدەن. بەڵام زۆر باری مەنفیش نیشان دەدەن. بۆمان دەردەکەوێ کە پێشمەرگەی ئێمە بەراستی چۆن عەمەلیات دەکا. بۆمان دەردەکەوێ کە لەو عەمەلیاتەدا چی دەبوایە بخاتە بەرچاو چی لە بیر چووە بۆچی تاکتیکەکەی باش بووە یا بۆچی غەڵەت بووە. چونکە ئێمە دیومانە هەتا ئێستاو موقایسەشمان کردوە زۆر شتی لەو بارەوە بەسوودی تێدا بووە، ئەو فیلمە کە بۆخۆمان تەجربەمان لێ وەرگرتوە بۆ ئەوەی کە تاکتیکی دوارۆژی خۆمان لە باری نیزامییەوە باشتر بکەین یان ئەگەر ژیانی خەڵك دەبینین مەسەلەن لەو ژیانە دیسانەکە نەتیجە وەردەگرین کەچی دەبێ بۆ ئەو میللەتە بکەین (یان ئەگەر ژیانی خەڵك دەبینین مەسەلەن) یان ئەوەی کە دەبینین کابرایەکی پیر تەنانەت لەسەر پێشمەرگە قسە دەکا و نەزەری خۆی بەسەراحەت

دەڵێ، لەوێدا بۆمان دەردەکەوێ کە مەسەلەن لە ڕەفتاری پێشمەرگەدا دەبێ چ تەغییرێکی بدەین. کە ئەو پیرە بەو شێوەیە قسە دەکا بۆ حیزبی خۆمان وەکوو بەڕێوەبەری زۆر قازانجی هەیە، بۆ نموونە ئەو فیلمانەی کە پارەکە هەڵگیرابوون ئێمە لە کۆبوونەوەی گشتیی کومیتەی ناوەندی یان لە پلینومی کومیتەی ناوەندیدا هەموومان تەماشامان کردوە بۆ ئەو مەبەستە، کە چ دەرسێکی لێ وەرگرین جا کە وابوو دەبینین کە کارەکە زۆر گرینگە. هەم دەبێتە سەنەدێك بۆ مێژوومان بۆ نەسڵەکانی دوارۆژمان هەم لە دەرەوە دەتوانین کەڵکی باشی لێ وەربگرین بۆ ئەوەی کە تەبلیغات بۆ واقعییەتی حیزبەکەمان بکەین. بۆ خەباتی میللەتەکەمان بکەین. ژیانی میللەتەکەمان نیشان بدەینو هەم بۆ ئەوەش کە خودی حیزب بەتایبەتی بەڕێوەبەری دەتوانین کەڵکی باشی لێ وەربگرین بۆ ئەوەی کە تەبلیغات بۆ واقعییەتی حیزبەکەمان بکەین بۆ خەباتی میللەتەکەمان بکەین. ژیانی میللەتەکەمان نیشان بدەینو هەم بۆ ئەوەش کە خودی حیزب بەتایبەتی بەڕێوەبەری دەتوانێ کەڵکی لێ وەربگرێ، ئەو شتانەی کە لەبارە تەشویقیان بکا ئەو شتانەی کە نالەبارە لە بەینیان بەرێو دەتوانم بڵێم دیومانە هەم شتی زۆر باشی تێدا بوە کە جێی شانازییە بۆ ئێمە بەڵام شتی زۆر خراپیشی تێدا بوە، کە عەیبە بۆ حیزبی ئێمە، پێشمەرگەی ئێمە ڕەفتارێکی ئەوتۆی هەبێ هەردووکی تێدا بووە لەبەر ئەو هۆیانەیە کە ئێمە چەندین ساڵە هاتووینە سەر ئەو بڕوایە کە بەرە بەرە هێندێك لەو هاوڕێیانە پەروەردە بکرێن بۆ ئەوەی بتوانن فیلم هەڵ بگرن. تا ببێت بە بەڵگەیەك بۆ دوارۆژی حیزبەکەمان، بەڵام بەتەجرەبەش ئەوەمان بۆ دەرکەوتوە کە هەمووکەس ناتوانێ ببێتە فیلم بەردارو لە هەلومەرجی ئێمەدا دەبێ هێندێك خسووسیەتی هەبێ ئەو فیلم بەردارە، ئەگەر لە وڵاتێکی ئازادی وەکوو بڵێین ئورووپاو ئەمریکادا ئەگەر لەوێ دەژیو دەچێ هونەرەکەی فێر دەبێو دەبێتە فیلم بەردار. بەڵام ڕەنگە ئەو کەسە لە کوردستانی ئێمەدا نەتوانێ هیچ فیلمێك هەڵ بگرێ. چونکە هێدێك خسووسیەتی دیکەی دەوێ کە ڕەنگە تێیدا نەبێ. یەکەم خسووسیەت ئەوەیە کە ئێمە دیارە لە ژیان فیلم هەڵدەگرین بەڵام چونکە لە ژیان بە نیسبەت زۆرتر فیلم هەڵگیردراوە هەتا لە خەبات، بەتایبەتی لە شەڕەکان ئێستا پێمان خۆشە زیاتر لە عەمەلیاتی نیزامی فیلم هەڵگرین. باشە کابرا ئەگەر مەسەلەن کەسێك لە دەرەوە شتێك هەڵدەگرێ زۆر بەکار

نایە. کە وابوو یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەو کەسە کە دەبێتە فیلم هەڵگری حیزبی ئێمە، ئازایەتییە بۆیە ئێمە هاتینە سەر ئەوە کە فیلم بەردار هەڵنەبژێرین لە دەرەوەرا بنێرین کە بچێ فیلم هەڵبگرێ. لە پێشمەرگەکان فیلم بەردار دروست بکەین، پێشمەرگە بکەین بە فیلم بەردار. چونکوو پێشمەرگە بێ ئیدی ئەو تایبەتمەندییەی دەبێ تێدا بێ. لە مەیدانی خەباتدا بووە ئازایەو ئەو ئەگەر ببێتە فیلم هەڵگر ئەو خاسیەتەی لە پێشدا تێیدا هەبوە، ئەوە بێنین پەروەردەی بکەین و بیکەینە فیلمبەردار. دووهەم خاسیەتی دیارە ئەوەیە کە من پرسیارم دەکرد بە خۆڕایی نەبوو، دەبێ ئەو کارەی کەمێك پێ خۆش بێ. چونکە ئەو کارێکی هونەرییە. ناکرێ یەکێك پێی خۆش نەبێ بەزۆری پێی بکەین. رەنگە هێندێك کار ئینسان پێشی خۆش نیە بەزۆر بیکەن ئەوەندەش زەرەری نەبێ بۆ کارەکە. مەسەلەن فەرز کەین یەکێکی دەکەینە پەیك، پێی خۆش نیە هاتوچوو بکا. بەڵام موهیم ئەوەیە نامەکە بەرێت و بیهێنێتەوە، هەرچەند کە لەوێشدا پێی خۆش نەبوو رەنگە درەنگ بڕوا، سەبر بڕواو تەمبەڵی بکا. بەڵام لەوێ ئەوەندە زەرەری نیە، بەڵام لێرە ئەگەر پێی خۆش نەبوو عەلاقەی نەبوو دیارە یانی نەك هەر ئێستاکە باسی دەکەم خاسییەتێکی نیە بەڵام دەبێ کەمێك دڵی خۆی لەسەر دابنێ، کەمێك لەوەی کە خۆی هەیەتی وەکو شتێکی کە خۆی دروستی دەکا. خۆی پەروەردەی دەکا، لە واقیعدا خۆی خەلقی دەکا، ئاوا تەماشای بکا. وەکوو شاعیرێك کە شیعرێکی دادەنێ پێی خۆشە کە شیعرەکەی خۆی دایناوە. چونکە شتێ، لە هەست و دڵی بڵێین ئەو شاعیرە هاتۆتە دەر دەبێ ئەو فیلمەش کە دروستی دەکا، ئەو کەسە بە بەرهەمی هەست و دڵی خۆی بزانێ. بە شتێکی بزانێ کە زۆر لە لای ئەو خۆشەویست و ئازیزە. دەنا ئەگەر ئەوە نەبێ دیارە فیلمەکە ئەو جۆرەی دەبێ تێدا بێ، تێیدا نابێ. پاشان دیارە دەبێ ئەو کەسە هونەرمەندیش بێ. هونەرمەند بەو مانایە کە بەراستی هونەری خۆش بوێ. زۆر کەس هەیە کە ئەوە کە ئەمن دیسان دەپرسم لێرە کە علاقەتان هەیە لە بەر ئەوەیە نەك بەو کارە ئەوە کافی نیە مەسەلەن فەرز دەکەین من لێرە لە کلاسیدا شاگردێکی زۆر باش بووم بەڵام لە نەققاشیدا قەت نەمدەتوانی لە دوازدە زیاتر وەربگرم ئێستاش ئەگەر نەقاشیم بدەنێ بیکێشم ئەگەر وشترێ بکێشم بەراز دەردەچێ کەوابوو ئەمن بە زۆر نابم بە نەققاش. دەبێ شتێکم هەبێ یانی ئامادەیی پێشووشم

هەبێ بۆ ئەوە، هەر ئەوە نەبێ ئەوە ئیدی شتێك نیە بەئاسانی پەروەردە بکرێ. ئەوە دەبێ لە ئینساندا هەبێ، مەسەلەن کاك برایم لاجانی شاعیری باشە ئەوە تێیدا هەیە. خۆ هەموو کەس ناتوانێ شیعر بڵێ. شیعر گوتن شتێکە کە دەبێ ئەوەی کە لیاقەتو ئیستعدادی پێ دەڵێن ئەوەش تێدا هەبێ. کە وا بوو ئەو کەسەی کە ئەو کارە دەکا دەبێ کەمێکیش هونەرمەند بێ، عەلاقەی بەو شتە هەبێ باسمان کرد دەبێ بۆ خۆشی شتێکی تێدا بێ کە ئەو کارە بکا چونکە ئەویش بۆخۆی هوەرێکە سادە نیە هەروا دەبێ، پاشان باسی دەکەین کە لە فیلم هەڵگرتندا دەێ زۆر شتی بخاتە بەرچاو و ئەو ئەگەر هونەرمەند نەبێ یانی کەمێك زەوقی هونەری تێیدا نەبێ دیارە سەرناکەوێ. ئەو فیلم هەڵگرتنە کە هەر لە سەرەتاوە باسم کرد بۆ ئێمە دیارە هونەرە، راستە بەڵام ئێمە دەرسی سیاسیشمان هەیە خۆ نایشارینەوە. بەداخەوە ئێستا وایە ئێمە ئەو ویدئۆو فیلم هەڵگرتنەمان بۆ ئەوە نەهێناوە کە هەرچەند جوانیشە مەسەلەن فەرز دەکەین تەنیا لە گوڵی سوور فیلم هەڵدەگرین چونکە جوانە، ئەو باشە. لە جێگای خۆیدا لە وڵاتی خۆیدا ئەوە دەبێ، ئەوە دەکرێ. هەتا لە فیلمێکی مەسەلەن عەمەلیاتی شەڕیشدا، ئەگەر بتوانین پێکەوە رێکیان بخەین ئەویش دەبێ، بەڵام هەر ئەتۆ تەنیا هەر بۆ ئەوە فیلم هڵبگرێ هەرچەند جوانیش بێ بۆ ئەوەمان نیە نایشارینەوە، پێمان خۆشە ئەو هونەرەش هەلومەرجی ئێستای خەباتەکەماندا کە گرینگترین مەسەلە بۆ ئێمە رزگاریی گەلی کوردە، ئەو هونەرەش لە خزمەتی رزگاری گەلی کورددا بێ، بەوە نامەوێ بڵێم هەر شتێك کە لە خزمەتی رزگاریی گەلی کورددا نەبێ هونەر نیە. با لێمان تێك نەچێ چونکە من بە هیچ شێوەیەك ئەو نەزەرەم نیە. بە پێچەوانە پێم وایە هونەر دەتوانێ هونەر بێو خزمەتی رزگاریی هیچ میللەتێکیش نەکا. ئەوە با لەولا دابنێین بەڵام لە هەلومەرجی ئێستادا ئێمە کە وەك حیزبێکی شۆڕشگێڕ لە مەیدانی خەباتداین دەمانهەوێ کەڵك وەربگرین لەو ئیمکاناتە کە بۆمان پێك هاتوە بۆ ئەوە کە ئەو کارە کە دەیکەین لە خزمەتی ئامانجی حیزبەکەمانو لە خزمەتی ئامانجی گەلەکەماندا بێ کە رزگارییە، کە بریتیە لە دێمۆکراسیو لە خودموختاری. ئەگەر وایە ئەو کەسەی کە فیلم هەڵدەگرێ ناتوانێ بێتەفاوەت بێ نیسبەت بە مەسەلەی سیاسی، جارێ هەر خۆی کە ئێمە پێشمەرگە و کادر فیلم هەڵگرمان هەڵبژاردوە، مانای ئەوەیە کە ئینسانی

سیاسیمان هەڵبژاردوە چونکە پێشمەرگە ئەو کەسەیە کە خۆی دڵخوازانە هاتوە بۆتە پێشمەرگە کە وابوو ئەو کارە بۆ ئێمە کارێکی سیاسییە. چونکە کارێکی سیاسی‌یە ئەو کەسەی کە فیلم هەڵدەگرێ ناتوانێ بێ‌تەفاوەت بێ، ئەو کەسە لە خزمەتی میللەتی کورد لە خزمەتی حیزبەکەی خۆی‌و ئامانجەکانی حیزبەکەی‌دایە. بەڵام مانای ئەوەیە کە ئەو فیلم هەڵگرتنە کارێکی سیاسییە دەبێ ئاواش تەماشای بکەین. دەگەڵ ئەوەی باری هونەرییەکەی لە جێگای خۆیەتی‌و دەبێ رێزی بۆ دابنێین لەگەڵ ئەوە نابێ باری سیاسیی ئەو کارەمان لە بیر بچێ. ئەو کارەی کە ئێمە دەیکەین بۆ هەدەفێکی سیاسی‌و ئامانجێکی سیاسی دەیکەین ئەو پێشمەرگەیە یا ئەو کادرە کە ئەو کارە دەکا ئەویش کارێکی سیاسی دەکا. کارێکی سیاسی زۆر بەنرخیش دەکا. کارەکەی کارێکی گرینگەو ئەوەی دەبێ بزانن بەڵام لەوەرا خاسییەتێکی دیکەش دێتە پێش‌و ئەوەش نابێ لەبیر بچێ ئەوەیش ئەوەیە کە ئەگەر ئەوە کارێکی سیاسییەو ئەگەر ئەو بتوانێ فیلمی باش هەڵبگرێ بۆخۆی کارێکی سیاسی دەکا، دەبێ ئەوەش تێ بگا کە لە چی فیلم هەڵدەگرێ، کە خزمەت بە ئەو هەدەف‌و ئامانجە بکا. بۆ ئەوەی ئەوە باش بزانێ رۆژ بە رۆژ رادەی تێگەیشتنی سیاسیی خۆی زیاتر بەرێتە سەر. ئەوە ئەرکێکی زۆر گرینگە، بۆیەش کە ئێمە داوامان کردوە زۆربەی زۆری ئەو داوایانەش کە نووسراوە. بۆیە دەبێ خوێندەواریشی تا رادەیەك هەبێ، بۆ ئەوە کە بتوانێ نەك هەر لە باری تکنیکی‌یەوە بلێین دوربینەکەی بەکار بێنێ بەڵام لە باری سیاسیشەوە بتوانێ رۆژ بە رۆژ تێگەیشتنی خۆی بەرێتە سەرێ. هەرچی تێگەیشتنی لە باری سیاسی‌یەوە زیاتر بێ ئەوە دەتوانێ باشتر فیلم هەڵبگرێ‌و باشتر تەشخیس دەدا. بۆ ئەوە ئەگەر خەبەرنیگارێکی باش بەراستی دەیهەوێ بچێتە ولاتێك لە پێش هەمووانێدا لەر لەوەی بچێتە ئەو ولاتە هەرچی کتێب‌و رۆژنامە یان بەڵگە هەیە لەسەر ئەو ولاتە ئەوەندە لە دەسترەس‌دایە دەیانهێنێ‌و موتالایان دەکا. بۆ ئەوەی بزانێ وەزعی سیاسیی ئەو ولاتە چیە، ئاگاداری لە سەر ئەو ولاتە زۆر بێ ئەو وەختە دەزانێ چ فیلمێك دەبێ هەڵگرێ، ئەمن لە بیرمە کە بەداخەوە ئەجەل رێگای نەدا، یەڵماز گۆنای کە لەو ئاخرەدا، یانی ساڵێك پێش وەفاتی خۆی ئامادە کردبوو کە لە کوردستان فیلمێکی زۆر موهیم هەڵبگرێ، دەیگوت کە ئەو فیلمی بە ئیستلاح تەواوی ژیانی من دەبێ، ئەوەندە ئەهەمییەتی پێ دەداو بەداخەوە ئیدی نەخۆش

کەوت‌و لە پاشان وەفاتی کردو نەیتوانی بێ، هەر لەو وەختەدا کە بۆخۆی کورد بوو لە کوردستانی تورکیە ژیابوو لەو وەختەوە هەرچی کتێب‌و رۆژنامە هەبوو لەسەر کوردستانی ئێمە سالێك زیاتر بوو کۆی کردبووەو دەستی کردبوو بە موتالاَ کردن بۆ ئەوەی کە خۆی ئامادە بکا لەو بارەوە مەقسوودم ئەوەیە کە هونەری فیلم هەلگرتن ئەوەشی لەگەلە، دەبێ ئەو فیلمانە کە دەبینین کە کۆمەلگایەك زۆر باشی دەرچووە وامدەزانی کە هەروا کامیراشی بە دەستەوە بووە . دووربینی بەدەستەوە بووە، فیلمی هەلگرتووە. نەخێر ئەو فیلمە جاری وا هەیە ٦- ٥ سال پێشتر موتالای لەسەر کراوە، لەسەر چۆنیەتی‌یەکەی، لەسەر داستانەکەی، لەسەر ئەو شوێنەی کە فیلمەکەی تێدا هەلدەگیرێ، لەسەر قارەمانانی ئەو فیلمە، یانی ئامادەیی‌یەکی یەکجار زۆرو دوورو درێژی دەوێ زۆر جار.

جا ئەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لە فیلم هەلگرتن‌دا بە دەیان سال تەجرەبەیان هەیە، چ بگا بە ئێمە کە تازە دەست پێدەکەین، کە وابوو بردنە سەری تێگەیشتنی سیاسی، موتالعەکردن، لەو بارەوە، هەم لە باری سیاسی‌یەوە هەم لە باری ئەوەشەوە کە دەبا ئێمەش لەمەودوا خەریك بین. کتێبی واپەیدا بکەین نیشان بدا کە مەسەلەن فیلم هەلگرێك دەبێ چ بکاو چ ئەکاو چ شێوەیەکی بەکار بێنێ، بۆ ئەوەی لە فیلم هەلگرتن‌دا سەرکەوێ. موهیم ئەوەیە کە ئەو هاورێیانەی فیلم هەلدەگرن لەیەك واقعیەت بگەین‌و نەك هەر ئەوان بەلکوو بەتایبەتی هاورێیانی بەرپرسمان ئەویش ئەوەیە کە ئەو کارە وەزیفەیەکی حیزبیە. کەس حەقی نیە وای چاو لێ بکات ئەوە هاتوە هیچ ناکاو فیلم هەلدەگرێ، شەڕ ناکاو هەر فیلم هەلدەگرێ. نا! ئەوە هەر وابزانە وەك پێشمەرگە لە سەنگەردایە شەڕ دەکا هیچ فەرقی نیە. دەبێ ئێمە لەگەل هاورێیانی بەرپرسیش قسە بکەین هەموو بەرپرسی حیزبی فەرماندەری هێزو بەرپرسی کومیتەی شارستان، سەرلك‌و سەرپەل، دەبێ ئاوا تەماشای فیلم هەلگرەکە بکەن کە ئەوە عەینەن وەکوو ئەوەیە کە لە سەنگەردا بێ‌و تەقەبکا. پێشمەرگەیەو فەرقی نیە. فەرق دابنێین‌و بلێین بابە ئەوە فیلم هەلدەگرێ ئەوە شەڕ ناکا چ ئەهمیەتێکی بۆ ئێمە هەیە. شتی وا نیە دەبێ بەڕاستی خۆشتان لەوە ئاگادار بن پێم خۆشە لە تەرەف دەفتەری سیاسی‌یەوە پێتان را بگەیەنم کە ئەگەر لە هەر جێگایەك ئەحیانەن تووشی ئەوە بوون کە بەرپرسی کومیتەی شارستان یان بەرپرسێکی دیکە،

فەرماندەری هێز، خودای نەخواستە وا بـە چـاوێکی سـووك تەماشـای فیلـم هـەڵگر دەکەن، ئەوە دەبێ ئێمە ئاگادار بکەن ئەوە لە سەرەتاوە پێم گوتن کە دەمانهەوێ بـە هەموو هێزمانەوە پشتیوانی لەو هاورێیانە بکەین کە بەڕاستی دەیانهـەوێ زەحمـەت بکێشن‌و ئەو کارە گرینگەمان بۆ جێبەجێ بکەن کە لە سەرەتادا باسـم کـرد. دیـارە یەکێك لە خسوسیەتە هەرە موهیمەکانیش ئەوەیە. بۆیەش ئێوە لێرە کۆ بوونەوە بـۆ چەند رۆژان کە باری تیکنیکیش باش فێر بن. چوونکە یەکێك کە باش ناتوانێ فیلـم هەڵ بگرێ ، هەموو زەحمەتەکەی بەخۆڕایی دەچێ. دەبێ باش فێر بـێ‌و زۆر دیققـەت بکات، بەرەبەرەش تاقیکردنەوەی هەبێ تەمرین بکا، فێر بێ، چونکە ئەگـەر نـەزانێ دووربینەکەی بەکار بێنێ، ئەوە بە نەزەری مـن تـەواوی ئـەو قسـانەی کـە کردمـان نەتیجەکەی نابێتە شتێکی زۆ رباش. چونکـە دەچـێ فیلمێـك هـەڵدەگرێ، تـەواوی ئەوانەی کە گوتوومانە رەعایەت ناکا. بەڵام ئیمکانی هەیـە لـە بـاری تێکنیکیـەوە شتێك چرکە، تاریکە، دیار نیە، رووناکایی بە ئەندازەی کافی نیە، یان لە جێگایـەك هەڵی گرتوە کە مەسەلەن فیلمەکە باش دیار نیە یـان ئـەوەندە دوورە کـە تەشـخیس نـادرێ. جـا ئـەو فیلمـە فـایدەی نابـێ. کـە وابـوو زۆر زۆر موهیمـە یـەکێك لـە خسووسیەتەکانی هەرە موهیم ئەوەیە کە فێر بێ کە چۆن ئەوە هەڵدەگرێ. لە جێگای دیکە فیلم ساز کە شتێ لە جەرەیانی شۆڕش دەبینی رەنگە چەند مـانگ یـان چـەند ساڵ سەرفی ئەوە دەکەن هەتا یەکێکی فێری فیلـم سـازی‌و فیلـم هـەڵگرتن دەکـەن. دانیشکەدەی هەیە فیلم هەڵگرتن، دانیشگای هەیە، ئەوە نیە هەر وا بە ٤- ٣ رۆژان فێر بێ. بەڵام ئێمە هەموو شتێکمان وایـە، ناچـارین، حـیزبێکی شۆڕشـگێڕین ئـەو کارانەش بە شێوەی شۆڕشگێڕانە بکەین. دەنا ئێمە ئیمکانی ئەوەمان نیـە ١٦- ١٥ کەس بنێرین بچنە مەسەلەن فەرز بکەین دانشـگایەك ٤ سـاڵ لـەوێ بخوێنـن. ئـەوە پاشان کە خودموختاریمان وەرگرت دەتوانین ئەو کارانە بکەین، ئێستا ئێمـە نیازمـان بەوە هەیە، پێداویستیمان بەوە هەیە هەر لێرە لە مەیدانی خەباتدا فێر بن بۆ ئەوەی کە بەڵگە بۆ حیزبەکەمان ساز بکەن، لە دوارۆژدا رەنگە لەوانی هـەرەباش مەسـەلەن هەڵبژێرین بۆ کلاسێکی ٢- ٣- ٤ مانگی بیان نێرین کە بچـن شـتەکانیان تـەکمیل بکەن بەڵام با لە مەیدانی خەباتیشدا لە عەمەلیشدا لە پەراکتیکیشدا هێندێکیـش بۆخۆیان ببینن‌و فێر بن جا ئەو وەختە باشتر دەتوانن لە دوارۆژدا ئەگەر ئیمکانێکیش

پێکهات لە دەرسەکان کەڵك وەرگرێ ئەوە ئەو خسووسیاتانەیە بەگشتی کە دەبێ ئەو کەسەی کە دەیهەوێ فیلم هەڵبگرێ لە حیزبی ئێمەدا دەبێ هەیبێ کە ئەو خسووسیاتانەی هەبوو ئەو وەختە دێینە سەر ئەو مەسەلەیەی کە باشە لە چی فیلم هەڵبگرێ؟ ئێمە چمان دەوێ؟ ئایا دەمانهەوێ هەر شتێکی دیت فیلمی لێ هەلگرن؟ نا. دیارە گوتمان لە دوو جەنبەدا فیلم هەڵدەگیرێ: یەکێکیان لە شێوەی ژیانی گەلی کورد. یەکێکیان لە خەباتی گەلی کوردو دیارە کە بەڕێوەبەری حیزبەکەمانە. ئێستاش پێم وایە لە ژیانی گەلی کورد بەتەواوی فیلم هەڵنەگیراوە. زۆر جەنبەی ژیانی میللەتەکەمان هەر نەناسراوە. ئەو جەنبانە دەبێ ئەو کەسە کە فیلم هەڵدەگرێو کامێرایی پێیەو دوربینی پێیە، فیلم هەلگرە، دەێ ئیستفادەی لێ بکات. لەوەی لە ژیان هەڵدەگرین فیلم دەبێ تایبەتی بێ، کە هەتا ئێستا فیلمی لێ هەڵنەگیرابێ یان نەناسرابێ یان نەماندیبێ تائێستا. بەتایبەتی ئەوە دەگەڕێتەوە سەر ناوچەکە. لە هەر ناوچەیەکی کوردستاندا خەڵك بەشێوەیەکی دیکە دەژی، هێندێك شتی تایبەتی خۆی هەیە. هێندێك شوێنو ئاوایی‌ی تایبەتی خۆی هەیە، شێوەی ژیانی خۆی هەیە، هەتا هەستانو دانیشتنەکەی فەرق دەکا. جلوبەرگەکەی فەرق دەکا. ئەوانە زۆر جالبن بۆ ئیمە کە هەمان بن، هی هەموو بەشەکانی کوردستان. بەڵام زیاتر دیسانەکە لەبەر ئەوەی کە لە خزمەتی رزگاریی میللەتەکەماندا بن، زیاتر ئێمە پێمان خۆشە لە خەباتو بەتایبەتی کە ئەوە زەحمەتترە. بۆیە لە عەمەلیاتی نیزامی فیلم هەڵبگیرێ. ئەوە بۆیە، چونکە نیمانە یان یەکجار زۆر کەمان هەیە. بەداخەوە لە دەرەوەش کەمتر تەماشا دەکرێ. زۆر جار لە واقیعدا نیشان دراوە کە عەمەلیاتی نیزامی تێدا بێ لە فیلمەکەدا بۆ ئەوەی هەم لە ژیانەکە بەتایبەتی بارە تایبەتیەکانی ژیانی ناوچەکان دەگرێتەوەو هەم لە خەباتەکە بەگشتی ئەگە رمیتینگ هەیە، تەزاهوراتێك هەیە، یان خۆپیشاندانێکە هەرچی هەیە لەوانە یا لە هەمووان زیاتر عەمەلیاتی نیزامی هتد... بەڵام ئەو فیلمە کە هەڵدەگرین دەبێ دیسان چەند خاسیەتی هەبێ: ئەوەڵەن دەبێ تەبیعی بێ. هاوڕێیان ئەوەتان لە بیر نەچێ مەسەلەن فەرز دەکەین ئەوە نابێ فیلمەکە لە پێشدا پێشمەرگەکان دەزانن کە من فیلمیان لێ هەڵدەگرم، لە رق دا دەوەستێ یان تفەنگ هاویشتنەکەیان بەشێوەیەك وا دەکەن کە ئینسان دەزانێ دیارە کە تۆ فیلمی هەڵدەگری یا ئەوە

تەبیعی نیە. تەبیعی ئەوەیە نالێم کە هەموو جارێ رەنگە بۆ فیلم هەڵگرەکە هەڵنەکەوێ. بەڵام دەبێ زۆر جار وای لێ بێ کە ئەو کەسانە کە فیلمیان لێ دەگیرێ، ئەقەلەن هەتا ئەو وەختە کە تۆ دەچی فیلمەکەیان لێ هەڵدەگری نەزانن کە تۆ دەتهەوێ فیلمیان هەڵدەرگی لەو لەحزەیەدا رەنگە موتەوەجیە بن، بەڵام دەبێ واقیعییەتە، نابێ لەو لەحزەیەشدا موتەوەجیە بن.و یان دەتهەوێ فیلمەکە تەبیعی بێ یانی ئەوە فایدەی نیە کە من بە شێوەیەك فەرز دەکەین دەمهەوێ لە نان خواردن فیلم هەڵگرم باشە دێنم شتێ دادەنێمو زۆر خاوێنو شیكو پیكو دەڵێم دەبێ ئاوا نانی بخۆنو ئاوا بکەنو تەماشای من بکەنو ئەوە وا نابێو... ئەوە لە واقیعدا بازییە. فیلمی ئێمە سەنەدییە. فیلمی ئێمە بازی نیە. ئەوە بۆ فیلمی بازی دەبێ. داستانێك، چیرۆکێك، چونکە بەداخەوە سوننەتەکە لێرە وا دانراوە تەیفوری بەتحایی‌ی داینا وە کە هەردووکی پێکەوە تێکەڵاو کردون. هەم سەنەدەکەی هەڵگرتوەو هەم هێناویەتی بازی پێکردوون کە ئێوە ئاوا بکەنو منیش فیلمتان لێ هەڵدەگرم. ئەوە دەبێتە بازی. ئەڵام ئەوەی کە تەبیعی‌ترە چۆن لە ژیاندا واقیعییەتەکەی هەیە و چاکترە باری لە بارە، باری باشییەوە دەبێ ئاوا فیلم هەڵگیرێ. چونکە ئەوە واقیعییەتی هەیە. یانی دەبێ شتەکە بەتەواوی تەبیعی بێ چونکوو ئەگەر مەسنووعی بێ، دەسکرد بێ، ئەوە بەکار نایە. جا ئەگەر تەبیعی بوو دیارە فیلمەکە دەبێ واقیعیش بێ. واقیعییەتەکەی نیشان دەدا. ئەوەی کە پێی دەڵێن (رئالیستی)، واقیع‌بینی لەوێدا دەردەکەوێ، واقیعییەتەکە دەبێ لەوێدا نیشان بدرێ.

بەڵام نامهەوێ بچمە نێو فەلسەفەی هونەرو ئەوانە بەڵام پێم خۆشە ئەوەتان لێرە بۆ روون بکەمەوە، لە دوارۆژدا دەبنە هونەرمەندانی ئێمە. ئێمە دوو ئیستلاحمان هەیە یەکێکیان پێی دەڵێن رئالیزم، یەکێکیان پێی دەڵێن ناتورالیسم. رئالیزم یانی واقیع‌بینی. ناتورالیزم یانی لە واقیعدا تەبیعەت پەرەستی. ئێمە کە دەڵێین فیلمەکەمان تەبیعی بێ مەبەستمان ئەوە نیە ئەو واقیعییەتەکە هەیە هەموو هەر فیلمی لێ هەڵگرین. ئێمە مەبەستمان ئەوەیە کە ئەگەر ئەوە بکەین دەبێتە ناتورالیسم یانی تەبیعەت پەرەستی. بەڵام ئەگەر بمانهەوێ هێندێك شت زیت بکەین هێندێك شت بەتایبەتی زیاتر نیشان بدەین، هێندێك شت کە بۆ ئێمە موهیمترە بەرجەستە بکەین لە فیلمەکەماندا باشتر نیشان بدەین ئەوە دەبێتە رئالیست.

مەسەلەن ئەمن دەمهەوێ بۆ نموونە بە قسە بێنم بۆ ئەوەی کە لە فیلمەکەدا بۆخۆتان دەبینن. من دەمهەوێ باسی یەك نەفەر بکەم، کە ئێوە نایناسن باشە دیارە ئێمە حیزبین، لێرە دانیشتووین. ئێوە چاوەڕوانی ئەوەن کە ئەمن بڵێم کە ئەوە چ کادرێکی حیزبی‌یە؟ چەند ساڵە حیزبی‌یە؟و تێگەیشتنی سیاسیی چۆنەو مەسەلەن رادەی خوێندەواری چەندە؟و ئەو شتانە بڵێم یا ئەوەیە کە مەسەلەن نووسیومانە کادری حیزبی دەبێ چۆن بێ. ئەوانەتان پێ بڵێم. بەڵام ئەگەر من لە باتی ئەوە بڵێم مەسەلەن زیاتر ئەوە تەعریف بکەم، دەڵێم مەسەلەن چاوی شینەو سمێڵی نیەو ئەوانە خاسیەتن ئیدی! قیافەی ئەوەیە وەزتی ئەوەندەیە. درێژییەکەی ئەوەندەیە. ئەوانەش خاسیەتن، بەڵام ئایا ئەمن ئەو خاسیەتانەم بە ئێوە گوت، ئێوە لەوە نەتیجە وەردەگرن ئەو پیاوە چۆنە؟ ئەو برادەرەمان چۆنە؟ نەتیجە وەرناگرن چونکە ئێوە دەتانهەوێ بزانن ئەوە سیفاتی ئەخلاقی سیاسی چۆنە؟ تێگەیشتنی چۆنە؟ ئەخلاقی چۆنە هەتا وەکوو ئینسانێکی حیزبی بیناسن، بەڵام بێنن مەسەلەن فەرز بکەین یەکێکیان چاوی شینەو لووتی زۆر گەورەیەو مەسەلەن ئەوەندە سانتیمترە، ئەوەندە قەڵەوە، ئەوەندە کزە، ئەوە خسووسیاتی ئینسان لە واقیعدا ئەوە نیە. خسووسیاتێکی فیزیکی‌یە، جیسمی‌یە کە ئەوە تەئسیرێکی زۆر نیە، لە فیلم هەڵگرتنیشدا ئەوەیە بزانین چ شتێك موهیمە، بەرجەستەی بکەین. نیشانی بدەین، چ شتێکی موهیم نیە لێی گەڕێین. ئەوە لە دوارۆژدا کاتێك فیلم هەڵدەگرن شت لێك بکەنەوە، بۆتان دەردەکەوێ کە مەسەلەیەکی زۆر موهیمەو ئەو دەگەڕێتەوە سەر ئەوە کە رادەی تێگەیشتنی سیاسی کە باسمان کرد کە ئینسان ئەگەر زۆر باش موتالاّ بکا. رادەی تێگەیشتنی سیاسیی خۆی بەرێتە سەرێ هونەرمەندیش بێ ئەو وەختە دەزانێ چی دەبێ زۆر بەرجەستەترە چی دەبێ زۆرتر نیشان بدا. چی دەبێ بەجێ بێڵێ. باشە ئێمە بۆ ئەو مەبەستە کە هەمانە دیارە پێمان خۆشە ئەگەر ئیمکانمان هەبێ لە هەموو شتێك فیلم هەڵگرین‌و هەموو بەڵگەیەکمان هەبێ بەڵام چۆن بۆ خۆتان دەزانن ئەوە ئەو کەسەی کە فیلمەکە هەڵدەگرێ دەبێ کاسیتەکانی بۆخۆی هەڵگرێ‌و ئەوەندەش سووك نیە، ناتوانێ ١٥ - ١٠ نەواریش لەگەڵ خۆی بەرێ. نەوار کەمە مەعموولەن. نەفەر دەبێ ئەوە بزانێ کە چی هەڵدەرگێ. ئەوەی موهیمە کە سەعی نەکا بەخۆڕایی نەوارەکەی بەتایبەتی لێرەدا دەمهەوێ تەکیە بکەمە سەر یەك شت بە تەجرەبە ئەوەم

دیوە کە مەسەلەن ئیدی بەرپرسی کومیتە شارستان داوای لیٚ کـردوە. بۆخـۆی پێـی وابوو دەبێ وابێ یان مەسەلەن فەرماندەی هێزی داوای لیٚ کردوەو بۆخۆشی پێی وابوو دەبێ وابێ. دەبینی کاستێکی مەسەلەن نیوسەعاتە یـان یـەك سـەعاتی کـە بۆمـان هاتوە ٤٥ دەقیقەی بەرپرسی گشتی قسـە دەکـا باشـە ئـەوە بـۆ هیـچ یـەك لـەوێ هەدەفەی کە من باسم کرد هیچیان ئەوەندە ئەهەمییەتی نیە، نـە بـۆ ئێمـە شـتێك دەڵێ وەکو بەڕێوەبەری حیزب کە ئیستفادەیەکی لیٚ بکەین. چونکە سیاسەتی حـیزب روون دەکاتەوە. رەنگە ئێمە زیاتر لەو نەزانین بەقەد ئـەو هـەر لـە سـەر سیاسـەتی حیزب دەزانین. لە دەرەوەش کەس ئەوەی پێ موهیم نیە کە فـلان فـەرماندەری هـێز مەسەلەن فەرزەن ٤٥ دەقیقە قسە دەکا، بەڵگەیەکەیشی نە لە ژیانی خـەڵك نـە لـە خەباتی میللەتەکەمان. ئەگەر لە جێگای کۆبوونەوەیەکی تایبەتیەوە یان دەتانهەوێ شتێکی نیشان بدەن کە بەڵێ پێـش ئـەوەی کـە پێشـمەرگە بچێـت بـۆ عەمـەلیات فەرماندەر بۆیان قسە دەکات یان بەرپرسی کومیتە شارستان، ئەوە رێگای ئەوەیە کە ٣-٢ دەقیقە لە سەرتای قسەکانی نیشان بدەین، ٣-٢ دەقیقە لە ئەوەڵەکەی، ٣-٢ دەقیقە لە نێوەڕاستەکەی، ٣-٢ دەقیقە لە ئاخرەکەیدا ئەوەش بەسـتراوەتەوە بـەوەی دیسان بۆ هەڵبژاردنی بزانێ لە کوێ لە چ جێگایەك چ هەڵبژێریٚو نیشان بـدەی ئـەوە ٦-٥ دەقیقە تەواوە. ئەوی دیکە نـەواری خـۆت خەسـار مەکـە. ئەگـەر یـەك دانـە خۆڕایی نەکردە لە دوارۆژدا فەرماندەری هێزێك داوای کرد کە نەخێر دەبێ تەواو ئـەو قسانەی دەبێ بیکەی بە فیلمو یان بەرپرسی کومیتە شارستانێك، ئەوە پێم وایە ئیدی ئەوە ئەرکی ئێمەیەو دەبێ نەیکەینو ئێمە تەرەف دەبین لەگەڵیان، هەرگیزیش وا نیـە ئێمە لێرە مەبەستمان ئەوەیە کە شتەکە، فیلمەکە بۆ بەکار بێ، بۆ ئەو سێ مەبەستە کە باسم کرد. نە لەبەر ئەوە کە یادگاریێ بۆ ئەو کەسە مەسـەلەن ئێسـتا کاسـێتمان هەیە داومانە بە هاوڕێیەك کە بچێ فیلم هـەڵگرێ، کاسـێتەکەی دوو شـتی تێدایـە یەکێکیان بەرپرسی کومیتە شارستان هەر هی بەرپرسی مەڵبەندی سپی سەنگە، ئـی ئەبووبەکری رادە کە قسە دەکا کە دوورو درێـژە. کـە لـە پاشـان هـەڵگیراوە، دیـارە ئەویش کوا دەبێ بە فیلم؟ دەی باشە ئەوە کراو دەبێتە فیلـم ئـەو پـارە زۆرەی ئێمـە داومانە دەستگایەکی نـەوارمان کڕیـوە، زەحمـەت دەکێشـێو دەیدەنـە پێشـمەرگەو

پێشمەرگەش زۆر جار دەبێ بۆ فیلم هەڵگرتن خۆی لە خەتەر دەخا، ئەوە بۆ ئەوەیە کە ئەوەی بکا. ئەو شتانە بە نەزەری من وازی لیٚ بێنین.

هەر وەها دێینە سەر شتی دیکەش مەسەلەن فەرز دەکەین پێشمەرگە دەڕوا، باشە ئەوە ڕۆیشتنی پێشمەرگە بە خەت لە نێو بەفردا جالبە فیلمی لیٚ هەڵبگیرێ. بەڵام ئیدی ٥ دەقیقە. دوو سێ جار ٢ دەقیقە، نەك نیو سەعات. خۆ پێشمەرگە لە دۆڵێکدا کە دەڕوا هەتا لەو بەندەنە هەتا دەگاتە بەندەنێکی دیکە هەر وا نیو سەعاتی پێ دەچێ. خۆ ئەتۆ مەجبوور نی هەموو نیوسەعاتەکەی فیلم هەڵبگری. دەتوانی قەتعی بکەی دووبارە هەڵ گریەوە. چونکە دیومانە ئەوە تەجرەبەیە بۆیە پێتان دەڵێم ئەوەش هەر وا. لە هەر شتێکی دیکەش کە فیلم هەڵدەگرن مەسەلەن لە نان خواردن کە تێکڕاییە، لە ڕۆیشتنە لە شتی دیکەیە، ئەوەش دەبێ هە ر وا کورت بێ. چونکە ئەو شتانە زۆر نابێ. چونکە هی وا هەیە کە یەك سەعات هەر وا دەخوا. باشە هەر یەك سەعات هەر فیلم هەڵگرم، کە وابوو فیلمەکە تەواو دەبێ نەخێر لە هەوەڵەکەیدا ٣-٢ دەقیقە لە ئاخرەکەیدا کە نیشان بدەم کە پێشمەرگە مەسەلەن لە پێش ئەوەی بچێت بۆ عەمەلیات نان دەخوا، ئیدی ئەوە هەتا ئاخرەکەی نیشان نادەم، چونکە شوکور هێندێك پێشمەرگە هەیە کە هێندە زۆر دەخوا کە نەوارەکە تەواو دەبێ!

مەسەلەیەکی زۆر گرنگتر ئەوەیە کە پێم خۆشە ئیشارەی پێ بکەمو پێم خۆشە لە بیرتان بێ کە ئەوە نەزەری دەفتەری سیاسیی حیزبەکەمانە ئەویش ئەوەیە کە فیلم هەڵگر هیچ کەس هەقی نیە پێی بڵێ چی لە چی فیلم هەڵگرێو لە چی هەڵنەگرێ. دەتوانێ سەرنج رابکێشێ فلان شت جالبەو بەس. ناتوانێ ئەمری پێ بکا. فیلمهەڵگر یانی هونەرمەند. هونەریش ئازادە لە حیزبی ئێمەدا، حیزبی ئێمە حیزبێکە دێموکراتە هیچ کەس ناتوانێ بە زۆر بە هونەرمەند بڵێ دەبێ ئەوەی بکەی. ئەوەتان لە بیر بێ هەر لە ئێستاوە نەچنە ژێر باری ئەوە. چونکە سبەینێ ئەو وەختە هەر هونەرێکی لە وڵاتەکەشمان پەیدا بوو، هێندێ فەرماندەری وا یا بەرپرسی وا پەیدا دەبێ کە نایەڵێ هیچ هونەرێك گوڵ بکا. دەبێ ئەو هونەرە بێ کە ئەو پێی خۆشە. نا ئەوە نیە ، مادام خۆیان پێشنیاریان کردوە کە ئێوە ببن بە فیلم هەڵگرو مادام ئێوە دووربینی یان کامێرای فیلم بەرداریتان پێیە هی حیزبن، مەسئولییەتتان دەدرێتێ بۆ

ئەو کارە ئێوە دیارە دەبێ بە مەسئوولییەتەوە ئەو کارە بکەن. مەسئوولییەتێکی گەورەشە لێرە باسمان کرد، بەڵام کە ئەو مەسئوولییەتەتان وەرگرت هەموو مەسئوولییەتێك سەلاحییەتیشی لەگەڵە. سەلاحییەتی فیلم هەڵگرتن بە ئێوەیە. ئیمکانی هەیە پێشمەرگەی سادەش موتەوەجیهتان بکات. سەرنجتان بۆ ئەوە رابکێشێ ها ئەوە جێگایەکی‌و شتێکی تایبەتی‌یە کە فیلمی لیٚ هەڵگرن. بەڵام هەڵی‌دەگری یان ناگری ئەوە ئیدی تۆی، لە سەلاحییەتی تۆدایە. کەس ناتوانێ بە زۆر پێت بڵێ بە زۆر دەبێ لەوە فیلم هەڵبگری کەسیش ناتوانێ پێت بڵێ ناتوانی لەوە فیلم هەڵمەگرە. ٤٠ کەسەکەش هەر ئەوەیە شتێکی خراپ بووە پێت خۆشە نیشان بدەی ئەوە لە فیلمەکەتدا مەسەلەن بەرێوەبەری حیزبەکەت بزانێ کە خودا نە خواستە پێشمەرگە ئەسیرێکی ئیعدام کردوە. حەقی نیە پێت بڵێ فیلم هەڵمەگرە. زۆر بە جوانی دەتوانێ فیلمی لیٚ هەڵبگرێ. ئەوە چونکە بۆخۆم هاتوومەتە ئێرە، هەر بۆیە بۆخۆم هاتوومە ئێرە دەیتوانی یەکێك لە هاورێیان قسەتان بۆ بکات بۆ ئەوەی کە بزانن کە ئەوە حیزبی دیموکرات لە پشتی سەرتانە، لە پشتتانە، پشتیوانیتان لیٚ دەکات بۆ ئەوەی کە دیارە بەو مانایە نا کە ئێوەش یاخی بن‌و دژی فەرماندەرو بەرپرس رادەوەستن. نەخێر لە مەسئوولییەتی ئەودایە کە بڵێ بە کوێدا دەرۆین. لە مەسئوولییتەتی ئەودایە کە بڵێ چ عەمەلیاتێك دەکەین. هەموو مەسئوولییەتەکە هی وی‌یە. ئەوە لە جێگای خۆیەتی. با لێمان تێك نەچێ. بەڵام مەبەستمان لە کاری تۆدایە لە چی فیلم هەڵدەگری، لە چی فیلم هەڵناگری. ئەو دوانە لە یەك جودان کە پێویستە، مەقسەدم ئەوەیە کە نە ئەو دەبێ بڵێ ئەتۆ حەتمەن دەبێ لەوە فیلم هەڵبگری‌و یان لەوە نابێ فیلم هەڵگری، نە مافی وی‌یە ئەوەت پێ بڵێ، نە مافی تۆشە کە رێگای پێ نیشان بدەی کە عەمەلیات لەوێ بکەو نازانم بکەی‌و بێنی عەمەلیات لە فلان جێ هەڵگری، چونکە باشتر دەتوانم فیلم هەڵگرم هەر عەمەلیات لەوێ دەکەین، رەنگە باشتر فیلم هەڵگیرێ. بەڵام فەرماندەری هێز نەزەری ئەوە بێ کە ئەو عەمەلیاتەی لەوێدا بکەین شەهید زیاتر دەدەین. حەقی ئەوە نابێ بیکا. ئێمە قەت حازر نین یەك شەهیدیش بدەین بۆ ئەوە کە فیلمێکی باش هەڵگرین. ئەو شتەمان لە بیر نەچێ بە هیچ شێوەیەك. ژیانی یەك پێشمەرگە، یەك کادر بۆ ئێمە زۆر لەوە ئەزیزترە. با فیلمەکە هەڵنەگرین، با پێشمەرگە شەهید نەبێ. مەبەستم

ئەوەیە کە تەقسیمی کارەکە روون بێ، هەر کەس سەلاحییەتو مەسئوولییەتی خۆی هەیە بەڵام ئێمە وەکو دەڵێم حیزبێکی دێموکراتینو ئەو کەسەی کە مەسئوولییەتمان داوەتێ وەك هونەرمەند لە فیلم هەڵگرتن، ئازادە لە فیلم هەڵگرتنا بە تەواوی، کەس ناتوانێ زوڵمی لیّ بکا. بەڵام مەسئوولییەتەکەش بە عۆدەی خۆیەتی، سبەینێ ئەگەر شتی خراپی هەڵبژارد چەکی هەڵگرت بۆخۆی مەسئوولە. ئەوە حسێبێکی دیکەشی لیّ دەکەین عەکسی ئەوە شتی باشیشی هەڵگرت تەشویقی دەکەین.

بەڵام دیارە کە مەسئوولییەتێکی دیکەش هەیە. ئەویش ئەوەیە کە ئەو دەبێ ئاگای لە هەموو شتێکی خۆی بێ. ئەوەڵەن هەردووکی پێکەوە بڵێین، ئەزانم زەحمەتە بەڵام هەردووکی پێکەوە لە واقیعدا رێك بخا. هەم بتوانێ ئازایانە فیلم هەڵبگرێ هەم ئیحتیاتی خۆشی بکات. ئەوە ئازایەتی نیە کە خۆ ئەوەندە ئازایەتی نیشان بدەی بچێتە پێش پێشێ شەهید بێ. دەبێ هەم ترسنۆك نەبێ بتوانێ ئەوندە کە پێویستە بە ئیحتیاتەوە بچێو فیلمیش بگرێ. لە عەینی وەختیشدا دیارە نابێ ئیدی ئەوەندە بچێتە پێشێ بە ناوی ئازایەتی کە خۆشی شەهید بکاو فیلمەکەشمان بۆ نەهێنێتەوە. لە هەردوو بارەوە زەرەرمان لیّ بکەوێ. نە ئەوەش نیە. بەڵام ئەوەشی دەبێ لە بەرچاو بێ کە ئەو دەستگای فیلم بەرداریە بۆ ئێمە نزیك بە ٢٥٠ تا ٣٠٠ هەزار تمەن تەواو بووە. تەنیا دەستگاکە باشە، باشە! دەستگایەکی وا دەبێ ئاگای لیّ بێ. نابێ هەر وەك پێشمەرگە ئاگای لە تفەنگی خۆیەتی، بەڕاستی وای ئاگای لیّ بێ کە تفەنگەکەی لەبەین نەچێ، ئەویش دەبێ وەك لە واقیعدا چەکی ئەو برادەرەمان کە فیلم دەگرێ، نابێ هیچ کاستێك کە فیلمی تێدایە ون بێ. چونکە کە بە دەستی دوژمن بکەوێ زۆر ئیستفادەی خراپی لیّ بکا. وا نییە!؟ ئەویش دەبێ لە نەزەر فیلم هەڵگرتندا لە نەزەریدا بگرێ. مەسەلەن فەرز دەکەین ئێمە لێرە ئازادە فیلم هەڵگرتن، ئەو دوکتورە فەرانسەوییانەش کە دێن دەپرسن عەکس هەڵگرتن ئازادە، بەڵام یەك شتیان پێ دەڵێین، عەکس ئەوەش کە پێی دەڵێن "پالرومایت" یەعنی یەك جێ هەموو دەفتەری لە سەر سەرەوە نیشان بدات کە لە واقیعدا ئەوە بۆ تەیارەو ئەوانە، زۆر باشە، ئەوە قەدەغەیە. لێرە ئێمە گوتمان کە فیلمی وا هەڵنەگرن. ئێوەش یانی دیارە هی ئێوە شتێکی دیکە دەڵێم. ئێوە خۆتان دەبێ تەشخیس بدەن کە مەسەلەن من لەم نوقتەیەدام ئێستا ئەگەر فیلم لە فلان }...{ هەڵبگرم رەنگە

مەسەلەن هەتا ئەو نوختەیە دەرباز دەبم کـە خەتـەری ئـەوەی هەیـە کـە مەسـەلەن تووشی دوژمن بێنو لەوێ فیلمەکەمان لە بەین بچێ هەتا ئەوە ئەو فیلمـە هەڵنـەگرن باشترە، لە پاشان هەڵیگرن ئەوانە بە تەشخیس خۆتانە، ئەوە لە مـەیدانی خـەباتدا بۆتان دەردەکەوێ.

بەڵام ئەوەی کە موهیمە ئەوەیە کە بەتایبەتی دەبێ ئاگاتان لەو فیلمانە یانێ ئەو فیلمانە کە هەڵتانگرتوە، دەبێ هەبێ. نابێ ئیدی مەسەلەن بێموبالاتی لەبیرتان بچی یان وای دابنێن سبەینێ بەدەستی دوژمن بکەوێ. ئەوەڵەن بەڵگەی پیرۆزی زۆر باشمان لە دەست چووەو لە پاشان بە دەستی دوژمن کەوتوە کە زیانی هەیە بـۆ ئێمـە، هـەر وەها دەبێ ئاگاتان لە دووربینەکە بێ، بۆ ئەوە کە باش رای بگرن، پیسی هەڵنـەگرن، تۆزو خۆڵی لەسەر نەبێ، خاوێنی بکەنەوە، ئاگاتان لیٚ بێ. لە بەر بـارانی دامـەنێن، لە بەر تاوی گەرم رای مەگرن. ئەوانە بۆخۆتان دەبێ وەبەر چاوی گرن. چونکـە ئـەوە بۆخۆی شتێکی ئەلکترۆنیکیە، زۆر حەساسە، خەراپی دەکا. یەك، دوو جار شتی ئەوا بێموبالاتی بکەن پاشان کار ناکا. لەو مەیدانەش کـە ئێـوە رۆیشـتن خۆتـان دەزانـن سێسەد کیلومیتر لە دەفتەری سیاسی دوورن، ئیـدی ئـەوە دەبێتـە هیـچ، ئـەوە نـە دەتوانن فیلمێك هەڵبگرن نە نەتیجەیەکی دەبێ، ئاگاتان لە باترییەکان بێ کە بـاتری بێ ئەوە دیارە کە حەمەن لە کاتی رۆیـن بـۆ مەنتەقـەشدا پێتـان دەڵێـم کـە دەبـێ خاوێنیان رابگرن. لە جێگای ویشك رابگیرێ، لە جێگای مەرتووب دانەنرێن. چونکـە ئەوە نەتیجەی ئەوە دەبێ کە لە واقیعدا تـەواوی کارەکـەتان لـە نیـوەی رێگـا تێـك دەچێ. هێندێك شت دیارە شتی تیکنیکی کە هەیە حەمەن پێتان گوتراوە، بەڵام پێـم خۆشە من تکراری بکەمەوە زەرەری نەبێ. تـارێخێك کـە دادەنـرێ، تارێخەکـە دەبـێ فەرەنگی بێ، لە تارێخی ئێمەدا نەبێ، مەسەلەن فەرز دەکەین پار، ئـەوە فیلمێکیـان هەڵگرتبوو و هەر پێم وابێ هی کاك حەسەن بوو، لە سـەرەتایدا پاشـان گۆڕیبـووی، دیارە لە سەرەتایدا کە تارێخەکە، تارێخی خۆمـان بـوو پاشـان مەسـەلەن دەنووسـرێ مانگی بڵێین ٦، باشە، مانگی ٦ لە فەرەنگیدا دەبێتە مانگی سـەرەتای هـاوین لـە واقیعدا لە مێژوو تێپەڕیبوو، بەتایبەتی چونکە هی ئێمـە لـە پێشـترە. ئەگـەر هـی خۆمان بکەین لەمێژە تێپەڕیوە. بەڵام وەکو ئەوانە هاتوە بەڵام ئەوان دەڵێن ٦ی ئێمە نیە. بەڵام لە واقیعدا ٦ی ئێمە دەبێتە لە واقیعدا دەبێتە ٩ی وان دەڵێن نـا. ئـەو لـە

٦ی ساڵی نووسراوە. بەو مانایە ئەوە هەر هی مانگی ٥ە. کە وابوو مانگی فەرەنگی زۆر باش فێر بن و مانگی فەرەنگی دابنێن لەسەری. لە بیرتان نەچێ مەسەلەن ئێستا مانگی فەرەنگی، مانگی چوارە. ئێستا لە حالێکدا ئێمە شتەکەمان بۆخۆمان مانگی ئەوەڵ مەسەلەن تازە ٢ مانگی دەستی پێ کردوە. ئەوەتان لە بیر نەچێ، ئەوە دەقیق دابنێن، تاریخەکەی. چونکە بەڵگەیەکە دەمێنێتەوە بۆ تاریخی حیزبەکەمان. ڕۆژێك ئیستفادەی لێ دەکرێ. با بزانین لە کوێ بووە و مەسەلەن تاریخەکەی چ بووە. یەك کاری دیکەش کە دەبێ بیکەن هەر ئەو وەختە کە فیلمەکە هەڵدەگرن دەبێ یادداشتێکی چکۆلەش بۆخۆتان بکەن ئەویش ئەوەیە ئەو فیلمە لە کوێ هەڵگیراوە. تاریخەکەی لەسەرە لە کوێ هەڵگیراوە. لە چ شەرایەتێکدا هەڵگیراوە. چونکە دەبینی فیلمەکە دێتە ئێرە خۆ تۆ ناتوانی مەسەلەن هەتا ئێرەش لەگەڵ فیلمەکە بێی. خۆ ئێمە فیلم دەنێرینە دەفتەری پاریس خۆ ناتوانین هەر فیلمەی فیلم هەڵگرەکەشی لەگەڵ بنێرین. لەوێ تەوزیحی بدا کە مەسەلەن ئەو فیلمە لە کوێ بووە، چ بووە، باشە دەبێ یادداشتێکی موختەسەر بەڵام دەقیق، وردی لێ نووسرابێ کە ئەو فیلمە لە فلان وەخت هەڵگیراوە. تاریخەکەی لەسەر بنووسین.

مەسەلەیەکی زۆر گرینگ هەیە کە لێرە دەمهەوێ پێتان بڵێم؛ ئەویە ئەگەر فیلمێك کە ئێمە دەمانهەوێ لە دەرەو زۆر نیشان بدرێ، دەبێ تاریخەکەی زۆر تازە بێت. خۆ دەبێ زۆر ئەساسی‌یە ئێمە ناتوانین فیلمێك بنێرین کە بێنین ئەوە دوو مانگ لەوە پێش گیراوە نیشان بدات. بەڵام ئەگەر ئەوێ ڕۆژێ فیلمەکە بچێ ڕەنگە دوو ڕۆژ باشترە، ڕەنگە هەتا تەلەویزیون حازر بێ دەست بەجێ نیشانی بدات لەبەر ئەوە ئەگەر ئێوە ڕۆژێك دیتتان کە فیلمی شتێکی ئیستیسنایی‌تان هەڵگرتوە، شتێك کە مەسەلەن یەکجار زۆر گرینگە، یەکجار زۆر ئەساسی‌یە، شەڕێکە کە مەسەلەن زۆر موهیم بووە، تەئسیریشی زۆر بووە، فیلمەکەشی زۆر باش دەرچووە، ئەو فیلمە بنێرن. را مەوەستن هەتا پاییز کە دێنەوە لەگەڵ خۆتان بنێرن دەی قەیدی ناکا، با کاسیتەکەی مەسەلەن ١٥ دەقیقەی لەسەر نەوارەکە با ١٥ دەقیقەی لەسەر بێ، قەیدی ناکا. ئەو ١٥ دەقیقە ئەرزشی زۆری هەیە. ئەوە زوو دەنێرن بگاتە دەستی ئێمە یان مەسەلەن تیمێك کە دێ ئەو فیلمانە کە هەڵتان گرتوون، ئەو فیلمانە بنووسن بۆ دەفتەری سیاسی‌یە بۆ هیچ جێگایەکی دیکە نەینووسن، بۆ سکرتاریا.

وای بپێچن کە فیلمەکە بارانی لیٚ نەداو خەراپ نەبێ. لەوێ بیدەن بە تیمێك بیدا بە دەفتەری سیاسی. هی وایە لە حالەتێکی ئیستیسنایی‌دا لەگەڵ فەرماندەری هێز یان بەرپرسی کومیتە شارستان مەشوەرەت بکەن‌و پێیان بڵێن کە مەسەلەن ئەوەیە. ئەو وەختە بەجودا دەتوانن بە یەك‌دا بە هەر چۆنێك دەبێ بگاتە دەستی ئێمە. تەئسیری زۆرە. ئەگەر ئەواش نەبێ ئەوانی دیکەش را مەگرن هەتا ئاخری پاییز، کە خۆتان دێنەوە ئەوانی دیکەش ئەگەر نەوار پڕ بۆتەوە بنێرن. ئەگەر تیمێك مەسەلەن دەگەڕێتەوە، بە تیمەکەدا بۆمان بنێرن. ئێمە ئیستیفادەی لیٚ دەکەین. ئێستا لێرە بڵێین ١٢ مەڵبەندو کومیتە شارستان دانیشتوە یەکەی ٣-٢ فیلم نەوارمان بۆ بنێرنەوە، هەر شاردیانەوە نازانین چۆن ئیستیفادەی لیٚ دەکەین، بەڵام ئەگەر کەم کەم بێ هەم دەتوانین زووتر ئیستیفادەی لیٚ بکەین.

هێندێك شتیش هەیە کە ئەگەر بۆخۆمانە قەیدی ناکا بۆخۆشمان هەر وایە. ئەوە بۆ دەرەوە نابێ هەر فیلمی لیٚ هەڵبگیرێ یا زۆر کەم یا لە دوورەوە ئەویش مەسەلەی جەنازەیە. جەنازەی کوژراو ناتوانێ لە دەرەوە قەدەغەیە لە فیلم نیشان بدرێ. رەنگە ئێوە نەزانن هیچ تەلەویزیۆنێك هەقی نیە جەنازە نیشان بدات. مەسەلەن ئەوە کە ئەو شتانە لێرە دەبێ، نیە. پێم خۆشە بزانن. نازانن، وا نیە؟ لە دەرەوە فیلمی زۆر لە جەنازەیەك هەڵگرتن درێژو ئەوانە، نیشاندانی ئەوەی کە خوشکە خەجیج لەسەر رادیۆ دەڵێ، ئەوەندە کەلاکیان کەوتوە، ئەوەندەیان ناسراونو ئەوە بووە، ئەوە بۆ دەرەوە هیچ نیە. هیچ تەئسیرێکی نیە رەنگە یەك شتی زۆر کەم لە دەرەوە نیشان بدرێت ئەوی دیکە نیشان بدرێت. مەسەلەن تەنیا ئەو شتە نیشان بدرێت کە جەنازەیەك کەوتوە، دەنا مەسەلەن جەنازەیەك کەوتوەو ریخۆڵەی هاتۆتە دەر، شتی‌وا بۆ دەرەوە نابی. ئەوەتان لە بیر نەچێ. چونکە لە هێندێك لە فیلمەکاندا ئەوەیش هەبووە. بۆیە باسی دەکەم. ئەوە تەجرەبەی ئەو یەك، دوو ساڵەمانە.

من پێم وایە بەگشتی باسی هەموو ئەو شتانەم کرد کە پێویست بوو لێرە باسی بکرێ. هەر چەند تێکۆشام کە کورت‌و موختەسەر باس بکەم. بەڵام پێم وایە کە مەسایل هەمموو باس کراوە. لەگەڵ ئەوە ئەگەر ئێوە پرسیارێکتان هەبێ کە بڵێین دەتوانین لێرە باسی بکەین وەلامی پرسیارەکان بدرێتەوە، لە پاش ئەوەیش کە ئەگەر نەزەرێکتان هەبوو، پێشنیارێکتان هەبوو، لێرە دەتوانن بڵێن، چونکە ئەو کۆبوونەوەیە